زیاتر لە ١٥ ملیۆن دانەی لێ فرۆشراوە

# ٧ خووەکەی کەسانی پێشەنگ

لەگەڵ پێشەکی و پاشکۆیەکی نوێدا

## وانەی بەهێز بۆ گۆڕینی مرۆڤ


ستیڤن ئار. کۆڤی

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: د. شێرکۆ عەبدوڵڵا





Hiwa Foundation

Enable creativity and perfection




223 posts | 18.5k followers | 7 following

Promote | Edit Profile

پەڕەی فەرمی 📚 کتێبی PDF 📚

Public Figure

لێرە

باشترین و بەسودترین و پڕ خوێنەرترین کتێبەکان

بە خۆڕایی و بە شێوەی PDF داگرە

.

Ganjyna

.

لینکی کتێبەکان 👇 ئەم لینکە بکەرەوە بۆ داگرتنی کتێبەکان

drive.google.com/folderview?id=1gk8e3nSJGJLu36xeLUjwdbjgTSVslbo_

Hawraman, Slemani, As Sulaymaniyah, Iraq



Ktebi_PDF

Directions







ناوی کتێب : بەهار هاتە ژیانمەوە

جۆری کتێب : ڕۆمان



ناوی کتێب : با لێبوردە بیت

جۆری کتێب : ڕۆمان




ناوی کتێب : راز

ناوی نوسەر : راندابرن

جۆری کتێب : دەروونزانی







ناوی کتێب: ٧ خووەکەی کەسانی پێشەنگ

ناوی نوسەر: ستیڤن ئارِ. کۆڤی

ناوی وەرگێڕ: د. شێرکۆ عەبدوڵڵا

تایپ و نەخشەسازی: سیروان خەلیل

بابەت: پەروەردەیی

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

چاپخانەی: شڤان

چاپی دووەم – سلێمانی ٢٠١٧

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (١٧٧٠)ی ساڵی (٢٠١٢)ی پێ دراوە.

لە بڵاوکراوەکانی هیوا فاوندەیشن

تەلەفۆن: ٠٧٧٠٩٥١١١١١

ئیمەیڵ: info@hiwafoundation.org وێبسایت:
www.hiwafoundation.org



نرخ: ٨٠٠٠ دینار

## له بارەی "هیوا فاوندەیشن"ەوە

دامەزراوەیەکی قازانجنەویستی سەربەخۆی ئەهلی‌یە، لە ساڵی (٢٠١٢)دا لەلایەن بەڕێز (هیوا رەوف)ەوە لە شاری سلێمانی هەرێمی کوردستانی عێراق دامەزراوە. هیوا فاوندەیشن کار دەکات بۆ گەشەپێدانی تواناکانی خەڵك لە رێگەی بڵاوکردنەوە و پشتگیریکردنی بابەتی داهێنەرانەی پەروەردەییەوە، ئەمەش بە وەبەرهێنان لە سەرمایە مرۆییەکانی کۆمەڵگاکەمان دەزانێت. ئامانجیش لەم کارە گەیشتنە بە ئەنجامی ئەرێنی لە نەوەکانی داهاتودا و یارمەتیدانی تاکەکانی کۆمەڵگەیە بە ژن و پیاوەوە بۆ پێشخستنی تواناکانیان و گەیشتن بە ئامانجە بەنرخەکانیان.

**له ستایشی ( ۷ خووەکەی کەسانی پێشەنگدا )دا کە ستیڤن ئارکۆڤی نوسیویێتی**

"ستیڤن کۆڤی کتێبێکی سەرنجڕاکێشی دەربارەی مرۆڤ نوسیوە. کتێبەکە هێندە پوختە و هێندە بە باشی لە ئارەزووە قوڵەکانی ناخمان تێگەیشتووە و هێندە سودمەندە بۆ ژیانی تایبەتی و رێکخراوەییمان، کە بەلای منەوە باشترین دیارییە پێشکەشی ناسیاوەکانمی بکەم"

وارین بینیس

نوسەری کتێبی (چۆن دەبیتە سەرکردە)

"من تائێستا هیچ مامۆستایەك و هیچ رێنماییکەرێکی بواری گەشەپێدانی چالاکییە تایبەتەکانی مرۆڤم نەبینیوە بتوانێت بەرهەمێکی ئاوا کاریگەر و بەربڵاو بنوسێت. ئەم کتێبە بە جوانترین شێوە گوزارشت لە فەلسەفەی پرنسیپەکانی ستیڤن دەکات.

لەو باوەڕەدام هەرکەسێك ئەم کتێبە بخوێنێتەوە تێدەگات بۆچی من و غەیری منیش هێندە سەرسامین بە وانەکانی کۆڤی"

جۆن پیپەر

سەرۆکی دەزگای پڕوکتەرو گامیڵ

"ستیڤن کۆڤی سوکراتێکی ئەمریکاییە، ئاسۆکانی ئەقڵت دەکاتەوە بە رووی شتە هەمیشەییەکاندا، بەرووی بەهاکان و خێزان و ئاخاوتنەکان و پەیوەندییەکاندا

بریان تراسی

نوسەری "سایکۆلۆجیای ئەنجامدان"

"بناغەکانی ئەم کتێبەی ستیڤن کۆڤی بریتین لە هێز و قایلکردن و هەستو سۆز. ناوەڕۆك و میتۆدی ئەم پرنسیپانە زەمینەیەکی پتەو دەڕەخسێنن بۆ پەیوەندی بەسود. من وەك پەروەردەکارێك پێم وایە ئەم کتێبە شتێکی گرنگ بۆ کتێبخانەکەم زیاد دەکات"

ولیام رۆلف کیار

ئەندامی ئەنجومەنی خوێندنی باڵا لە ویلایەتی ئوتا

"ژمارەیەکی کەمی خەڵکی و خوێندکارانی بەشی کارێگڕی و ڕێکخستن تا ئێستا وەکو ستیڤن کۆڤی بە قوڵی و بە جددی بیریان لە پرنسیپە بنەڕەتییەکان کردۆتەوە. ستیڤن لە کتێبی حەوت خووەکەی کەسانی پێشەنگدا چۆنێتی رابەرایەتیکردنمان بۆ روون ناکاتەوە، بەڵکو فرسەتی بونە ڕابەرمان بۆ دەڕەخسێنێت. فرسەتەکەش بریتییە لەوەی خۆمان بدۆزینەوە و بزانین چ کاریگەرییەکمان هەیە لەسەر خەڵکانی دەوروبەر، بەوەی کە خۆیان سود لە بیروبۆچوونە قوڵەکانی خۆیان ببینن. ئەم کتێبە کتێبێکی گرنگە و دەتوانێت ژیانت بگۆڕێت"

**تۆم پیتەرز**

نوسەری کتێبی "گەڕان بەدوای نایابیدا"

"بایەخی ئەم کتێبە تەنیا هەر ئەوە نییە کە میتۆدێکە بۆ سەرکەوتن لە کارەکەتدا، بەڵکو ئەوەیە کە لە بناغە رەوشتییەکانی پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکانەوە شێوازی ژیان وێنا دەکات"

**برۆسڵ ئێل. کریستنسن**

سەرۆکی دەزگای رادیۆ

"لەکاتێکدا کە دەزگاکانی ئەمریکا زۆر پێویستیان بە چالاککردنەوەی خەڵك و بە دروستکردنی سەرکردە هەیە لە ئاستە جیاجیاکاندا، کۆڤی فەلسەفەیەکی زیندوی وامان پێشکەش دەکات کە نەك هەر چالاکی دەبەخشێت بە ژیانمان، بەڵکو لە کار و پیشەکانیشماندا سەرکەوتنی پێ مسۆگەر دەکەین. ئەم کتێبە تێکەڵەیەکی تەواوە لە حیکمەت و سۆز و ئەزمونی پراکتیکی"

**رۆزابێث موس کانتەر**

نوسەر لە "هارڤارد بزنس ریڤیو" و دانەری کتێبی "کاتێك زەبەلاحەکان فێری سەماکردن دەبن"

"من لە ساڵانی رابردودا هێندە کەوتومەتە ژێر کاریگەریی "ستیڤن"ەوە و هێندە شتی لێوە فێربوم، کە هەر جارێك دەست دەدەمە نوسین توشی دڵەڕاوکێ دەبم لەوەی نەبادا بێ ئەوەی بە خۆم بزانم لاسایی ئەو بکەمەوە. کتێبی ٧ خووەکە لە بابەتی

سایکۆلۆجیای میللی و بڵاوکراوە روکەشەکانی دیکە نىیە. کتێبێکە پشتبەستو بە حیکمەتی قوڵ و بە پرنسیپە رەسەنەکان"

**ریچار ئێم – ئایار**

نوسەری "هاوسەنگی ژیان"

"چۆن منداڵەکان فێری بەهاکان دەکەیت"

"کارێکی زۆرچاك دەکەین ئەگەر خوێندنەوەی ئەم کتێبە بکەینە پێش مەرجی وەرگرتن بۆ هەر کەسێك بیەوێت لە فەرمانگەیەکی دەوڵەتیدا کار بکات. چونکە کاریگەرییەکانی ئەم کتێبە لەرووی رەوشتییەوە لە کاریگەرییەکانی هەمو یاسا و رێنماییەك زیاترە"

**سیناتۆر جاك گارن**

یەکەم سیناتۆر کە چووە فەزا

"کاتێك کە ستیڤن کۆڤی قسە دەکات، بەڕێوەبەرەکان گوێ دەگرن"

**دەنس بزنس مەنث**

"قسەی تێدا نىیە کە کتێبە زۆر کاریگەرەکەی ستیڤن کۆڤی، دەبێتە کتێبە دەرونزانییە هەرە بەناوبانگەکەی ساڵی نەوەدەکان؛ چونکە ئەو پرنسیپانەی کە تاوتوێیان دەکات شەقڵێکی گەردونییان هەیە و لە هەمو بوارەکانی ژیانیشدا قابیلی جێبەجێکردنن. هەروەها ئەم پرنسیپانە وەکو ئۆپەرێت وان، تەنیا هەر جێبەجێکردنێکی هاکەزایی بەس نىیە بەڵکو دەبێت بەردەوام راهێنانیان لەسەر بکەیت."

**ئیریل بایبی** – گۆرانیبێژی ئۆپەریت

میزۆ سترانۆر ئۆپێرای میترۆپۆلیتیان

"ئەم کتێبە مرۆڤ رادەکێشێت و وای لێ دەکات بیر بکاتەوە .. لەراستیدا من هەمیشە ئاماژەی پێ دەدەم"

**ریچارد ئێم دیڤۆس**

سەرۆکی دەزگای ئامەوای

"بردنەوە خووە. هەروەها دۆڕاندنیش. بیست و پێنج ساڵ ئەزمون و بیرکردنەوە و شرۆڤەکردن کۆڤی‌یان هێنایە سەر ئەو باوەڕەی کە تەنیا (٧ خووەکە) مرۆڤە بەختەوەر و تەندروست و سەرکەوتووەکان جیادەکاتەوە لەوانەی کە شکست دەهێنن یاخود قوربانییەکی زۆر دەدەن بۆ بەختەوەریی و ماناکانی ژیان لە پێناوی سەرکەوتێنکی سنورداری کەمبایەخدا"

**رۆن زیمکی**

یەکێك لە نوسەرانی: کەناری خزمەت و خزمەتکردنی ئەمریکا

"ستیڤن ئار. کۆڤی مرۆڤێکی مەزنە. کە دەنوسێت بەرچاوی روونە و ئامانجەکەشی مرۆڤە. یەك کتێبخانەی تەواو لە ئەدەبیاتی سەرکەوتندا هەر هێندەی ئەم کتێبە نرخی هەیە. پرنسیپەکانی ناو کتێبی ٧ خووەکەی کەسانی زۆر کاریگەر گۆڕانێکی راستەقینەی دروست کرد لە ژیانمدا."

**کین بلانچارد**

دکتۆرای فەلسەفە، نوسەری "بەڕێوەبەری یەك خولەك"

"حەوت خووەکە" کلیلی سەرکەوتنە لە هەمو بوارەکانی ژیاندا. کتێبەکە مرۆڤ وا لێ دەکات بیر بکاتەوە

**ئیدوارد ئەی برینان**

سەرۆکی جێبەجێکار لە کۆمپانیای سێرس، رۆبیك و هاوبەشەکانی

"کۆڤی جەخت لەسەر راستی‌یە نەگۆڕەکان دەکاتەوە کە لە خێزان و ژیانی رۆژانە و لە کۆمەڵگادا بەگشتی جێبەجێ دەبن. دوورمان دەخاتەوە لەو بڵاوکراوانەی ئەمڕۆ کە دەیانەوێ قایلمان بکەن. ئەم کتێبە تەنیا هەر وێنەیەکی فۆتۆگرافی نی‌یە، بەڵکو پرۆسەی وێنەگرتنەکەیە و پێویستە هەر بەوشێوەیەش مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت. نە رەشبینە و نە گەشبین بەڵکو لەگەڵ ئەگەرەکاندایە. کتێبێکە باوەڕی بەوە هەیە کە تەنیا خۆمان دەتوانین دەرگای گۆڕین بەرووی ناخی خۆماندا بکەینەوە. زیاتر لە حەوت هۆکار هەن وات لێ دەکەن ئەم کتێبە بخوێنیتەوە."

**ستیڤ لابونسکی**

بەڕێوەبەری جێبەجێکار لە کۆمەڵگای رادیۆ و تەلەفزیۆنی نێودەوڵەتی

"حەوت خووەکەی کەسانی زۆر کاریگەر تا ئێستا پڕفرۆشترین کتێبە"

**گۆڤاری فۆرچن**

"لە کۆمەڵگای خۆماندا نەمبیستووە تا ئێستا کەسێك هێندەی ستیفن ئار. کۆڤی یارمەتی سەرکردەکانی دابێت .. باوەڕناکەم هیچ رۆشنبیرێك لە کۆمەڵگای خۆماندا سود لە خوێندنەوەو جێبەجێکردنی ئەم کتێبە نەبینێت"

**سیناتۆر ئۆرین ج. هاچ**

"یەکێك لە خووە مەزنەکانی کە دەتوانیت لە خۆتدا پەروەدەی بکەیت ئەوەیە حیکمەتەکەی ستیفن کۆڤی فێر ببیت و بیخەیتە ناختەوە. ئەو لەگەڵ پرنسیپەکانیدا راستگۆیە. قسەو کردەوەی یەکن. ئەم کتێبەش دەتوانێت یارمەتیت بدات هەمیشە لە بازنەی براوەکاندا بمێنیتەوە"

**دکتۆر دێنیس ویتلی**

نوسەری سایکۆلۆجیای سەرکەوتن

"کتێبێکی جددیە. پرنسیپەکانی تێڕوانین و سەرکردایەتیکردن و پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکان ئەم کتێبەیان کردۆتە کەرەسەیەکی پراکتیکی بۆ سەرکردەکانی دنیای بزنس لە جیهانی ئەمڕۆدا. زۆر پێم باشە بخوێنرێتەوە."

**نۆلان ئارچیباڵد**

سەرۆك و بەڕێوەبەری جێبەجێکاری کۆمپانیای بلاك و دیکەر

"حەوت خووەکەی کەسانی زۆر کاریگەر سیستمێکی وا پێشنیار دەکات بۆ پەیوەندییەکانمان لەگەڵ خەڵکیدا کە بە دڵنیاییەوە سیستمێکی بەنرخ دەبێت بە مەرجێك خەڵکەکە بیری لێ نەکەنەوە."

**جەیمس سی. فلیچەر**

بەڕێوەبەری ناسا

"بەشداریکردنێکی زۆر جوانە. دکتۆر کۆڤی توانیوێتی خەسڵەتی داهێنەرە گەورەکانمان کۆبکاتەوە و لە چوارچێوەی بەرنامەیەکی بەهێز و ئاساندا نیشانیان

بدات. لە سایەی ئەم کتێبەوە ئێمە ئێستا خاوەنی نەخشەی کردنەوەی ئەقڵی ئەمریکاییەکانین"

**چارڵس گارفیلڵ**

نوسەری: داهێنەرە لوتکەکان.

"حەوت خووەکە" کتێبێکی بێ هاوتایە. لە هەمو کتێبێکی دیکە چاکتر توانوێتی سەرکەوتوانە مرۆڤ هان بدات بەپرسیارێتییە تایبەت و خێزانی و پیشەییەکانی تێکەڵی یەکتر بکات

**پاول ئێچ. تۆمسن**

راگری کۆلێژی کارگێڕی ماریۆت و

نوسەری کتێبی "تازەگەرێتییەکان"

"کۆڤی مرۆڤێکی گەرموگوڕە و بەردەوامیش گەرموگڕتر دەبێت"

**بزنس ویک**

"ماڵئاوا دیل کارینجی. ستیڤن کۆڤی کاریگەرییەکی قوڵتری لەسەر ژیانم دروست کرد. پرنسیپەکانی هەم بەهێزن و هەم قابیلی جێبەجێ کردنیشن. دەستپێشخەری بکە لە کڕین و خوێندنەوەی ئەم کتێبەدا. مرۆڤ هەتا زیاتر لەگەڵ پرنسیپەکانی ئەم کتێبەدا بژی زیاتر هەست بە قوڵبونی ژیانی دەکات"

**رۆبێرت سی. ئالن**

نوسەری: خولْقاندنی سامان، کەوتنەخوارەوە قەدەغەیە

"ئەمریکا لەسەر ئاستی پیشەیی و کەسێتیدا، لە ساڵانی نەوەدەکان پێویستی بەوەیە دەرگاکان بەرووی بەرهەمهێنانی زیاتردا بکاتەوە. باشترین رێگاش بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجە پشتگیرکردنی سەرچاوە مرۆییەکانە. کتێبی حەوت خووەکەی دکتۆر کۆڤی هێڵە سەرەکییەکانی ئەم پشتگیریکردنە دیاری دەکات. پرنسیپەکان ئەوپەڕی ماقوڵن و رێك لەکاتی خۆیدا ئامانجەکە دەپێکن."

**ئێف. جەی. پاك رۆجەرز**

نوسەری کتێبی رێبازی ئای بی ئێم

"ئەم کتێبە لێوانلێوە لە حیکمەتی پراکتیکی بۆ ئەو کەسانەی دەیانەوێت جڵەوی کارو ئایندە و ژیانی خۆیان بگرن بەدەستی خۆیانەوە. من هەمو جارێك کە بەشێکی ئەم کتێبە سەرلەنوێ دەخوێنمەوە تێڕوانینێکی قووڵی دیکەی تیا دەدۆزمەوە کە دەیسەلمێنێت ئەم کتێبە بەڕاستی قوڵ و پتەوە"

**جیفۆرد بینشوتی سێیەم**

نوسەری کتێبی پابەندبوون

"بەشێکی زۆری زانیارییەکانم بەرهەمی چاوکردنە لە خەڵکی و لاساییکردنەوەی کردەوەکانیانە. ئەم کتێبەی ستیڤن لەڕێی توێژینەوە و نیشاندانی نمونە کاریگەرەکانەوە توانیویەتی ئەم ئاڕاستەی چاولێکردنە لە بەرزترین ئاستیدا چالاك بکات".

**فران تارکتۆن**

هۆڵی نیشتمانی

"لەدوای سەردەمی دەیل کارینجی‌یەوە، کۆڤی کاریگەرترین کەسایەتی‌یە کە بە ئامۆژگارییە گەرمو گوڕەکانی توانیبێتی ویلایەتە یەکگرتووەکان بهەژێنێت.

**گۆڤاری یوئێس تودەی**

"گرنگیی خەسڵەتە ئایدیاییە رەوشتییەکان تەنیا هەر ئەوە نی‌یە کە هەمو جارێك بۆڕی خەسڵەتە رەوشتی‌یە بابەتییەکان دەدات بەڵکو هەمیشەش هەستی ئاسودەیی و بەدەستهێنان دەبەخشێت بەو کەسانەی کە لە ژیانی تایبەتی و پیشەییاندا بەدوای مانایەکدا دەگەڕێن"

**لاری ویڵسۆن**

نوسەری کتێبی: گۆڕینی گەمەکە. شێوازە نوێیەکەی فرۆشتن

"بناغە چەسپیوەکان کلیلی سەرکەوتنن. ستیڤن کۆڤی مامۆستای ئەو بناغانەیە. زۆر گرنگە کتێبەکەی بکڕیت. بەلام گرنگتر ئەوەیە بەکاری بهێنیت.

**ئەنتۆنی رۆبنز**

نوسەری: دەسەلاتی رەها

"ئـەم کتێبـە دەربـارەی سروشـتی مـرۆڤ ئـەو راسـتیە حاشـا هەڵنـەگرەی لەخۆگرتووە کە تەنیا لە رۆمانە خەیاڵییەکاندا هەن. تۆ کاتێـك لـە خوێندنـەوەی ئـەم کتێبە دەبیتەوە بۆت دەردەکەوێت کە نەك هەر کۆڤی ستیڤنت ناسیوە بەڵکو ئـەویش تۆ دەناسێت"

**ئۆرسۆن سکۆت کارد**

براوەی هەردوو خەڵاتی (هۆگۆ) و (نیبیولا)

"ستیڤن کۆڤی نرخێکی مەزن دەبەخشێت بە مرۆڤ و رێکخراوەکان، ئەمـەش نـەك هەر لەڕێی قسەکانییەوە. بەڵکو راستگۆیی و تێڕوانینـەکانی هێنـدە قـوڵ و کاریگـەرن کە مرۆڤ دەبەنە ئەودیو سنورەکانی سەرکەوتن".

**تۆم تێفی. کرۆم**

نوسەری: سیحری ململانێ و

یەکێك لە دامەزرێنەرەکانی دەزگای ویندستار

"سەرباری هەمو بەرپرسیارێتی و سـەرقاڵی و کـارو خێـزان و گـەڕان و ئەرکـەکانی دیکەی کـە ئـەم دنیـا پـڕ ململانێیـەی ئـەمڕۆ دەیانسـەپێنێت بەسـەرماندا، کتێبەکـەی سـتیڤن کـۆڤی (٧ خووەکـەی کەسـانی پێشـەنگ) بەرپرسـیارێتی گـەورەی دیکەیـە کـە پێویستە ئاماژەی پێبدرێت."

**ماری ئۆزمۆند**

"لـە کتێبەکەیـدا (٧ خووەکـەی کەسـانی پێشـەنگ) سـتیڤن کـۆڤی حـەوت ژەم خواردنمـان لـە حـەوت قاپـدا پێشکەش دەکـات سـەبارەت بـەوەی مـرۆڤ چـۆن جڵـەوی ژیانی خۆی بگرێتە دەست بۆ ئـەوەی ببێتـە ئەوکەسـە کامڵ و خـاوەن بەرهەمـەی کـە خـۆی مەبەسـتێتی. کتێبەکـە وزەبەخشـە و هـەنگاو بەهـەنگاو ئارەزووەکـانی مـرۆڤ تێردەکات و یارمەتی دەدات لە ژیانی تایبەت و پیشەییدا سەرکەوتن مسۆگەر بکات."

**رۆجەر ستاوباك**

NFL Hall of fame back

"کۆڤی لەم کتێبـەدا ئـەو دەرەنجامـە گرنگەمان نیشان دەدات کـە دەڵێت پێویستـە خەسـڵەتە رەوشـتی‌یـە ئایدیاییـەکان بگێڕینـەوە بـۆ نـاو کۆمـەڵگا. ئـەم کـارەی سـتیڤن مەلۆیەکی گرنگ دەخاتە سەر خەرمانی ئەدەبیاتی خۆ یارمەتیدان".

**د. بیلو کلیمنتز ستۆن**

دامەزرێنەری گۆڤاری سەرکەوتن

"سـتیڤن لـە کتێبەکەیـدا بەئەنقەسـت ژیـان و ئـەو پرنسـیپانەی تێکـەڵی یـەکتری کـردووە کـە مایـەی دروسـتبونی هاوسـەنگین لـەنێوان هزرەکـانی ئـاخ و هەڵسوکەوتە ئاشکراکاندا. ئەمەش هەوێنی هەمو پاکییەکی تاك و کۆمەڵگایە".

**گریگۆری جەی. نیویلی**

باڵوێزی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە سوید

"گرنگی ئەم کتێبە لەوەدایە کە سادەیە بەڵام شتەکان سادە ناکات"

**ئێم. سکۆت پیك**

نوسەری: رێگە چۆڵەکە

"من لە خوێندنەوەی ئەم کتێبەدا قازانج دەکەم.. زۆرترین هزرو رۆشنایی تێدایە"

**نۆرمان ڤینسینت پیەڵ**

نوسەری: هێزی بیرکردنەوەی ئەرێنی

## بەرهەمەکانی دیکەی ستیڤن ئار. کۆڤی

خووی هەشتەم

پەیڕەوکردنی حەوت خووەکە

حەوت خووەکەی خێزانە زۆر کاریگەرەکان

سروشتی رابەرایەتیکردن

مەسەلە گرنگەکان لە پێشەوە

سەرکردایەتیکردنی خاوەن پرنسیپ

دەفتەری مەشقی حەوت خووەکەی کەسانی هەرە کاریگەر

یادداشتی حەوت خووەکەی کەسانی هەرە کاریگەر

## بەرهەمەکانی کۆمپانیای فرانکلین کۆڤی

٧ خووەکەی نەوجەوانانی پێشەنگ

دەفتەری مەشقی ٧ خووەکەی نەوجەوانانی پێشەنگ (بەدەست خۆتە)

یادداشتی ٧ خووەکەی نەوجەوانانی پێشەنگ

ژیان گرنگە

ئەقڵی کار

ئەوەی لە هەموان گرنگترە

١٠ یاسای سروشتی بۆ بەڕێوەبردنی ژیان و کات بە شێوەیەکی سەرکەوتوو

پرنسیپەکانی دەسەڵات

هۆکاری پێشکەوتنە کتوپڕەکان

# سوپاس و پێزانین

هاوکاری و پێکەوەبون زۆر گرنگترە لە سەربەخۆیی و پشت بەخۆبەستن

ئەم کتێبە بەرهەمی کاری بەکۆمەڵی چەندین ئەقڵە. سەرەتاکەی لە ناوەڕاستی حەفتاکانەوە (حەفتاکانی سەدەی رابردووەوە) دەست پێدەکات کاتێك کە بۆ ئامادەکردنی نامەی دکتۆراکەم کەوتمە خوێندنەوەی ئەدەبیاتی دووسەد ساڵ لەسەر بابەتی سەرکەوتن. پێم خۆشە سوپاسی خۆم دەربڕم سەبارەت بەو ئیلهام و حیکمەتەی کە لە ژمارەیەك بیرمەندەوە وەرم گرتن و هەروەها سەبارەت بە پێکهاتە و ناوەڕۆکی ئەو حیکمەتەش کە نەوە دوای نەوە بەردەوامە.

هەروەها سوپاسگوزاری گەلێك خوێندکار و هاوڕێ و هاوکاریشم بەتایبەت هاوکارەکانی زانکۆی (بریگهام یۆنگ) و سەنتەری (کۆڤی بۆ رابەرایەتی). سوپاس بۆ هەزاران گەنج و گەورەساڵ و باوك و مامۆستا و بەڕێوەبەر و ئەوانەی دیکەش کە بەشدارییان کرد بە چاوخشاندنەوەی بابەتەکان و پێشکەشکردنی زانیاری و دەربڕینی پشتگیریی. بابەتەکان و ئیش‌وکارەکان زۆر لەسەرخۆ تێکەڵی یەکتری بون بە جۆرێکی وا کە ئەوانەی دڵسۆزانە و بە قوڵی هاتنە ئیشەکەوە گەیشتنە ئەو باوەڕەی کە ٧ خووەکە شێوازێکی گشتگیر و کامڵە بۆ دەستەبەرکردنی سەرکەوتن و چالاکبون لەسەر ئاستی تاکە کەسی و لەنێوان خەڵکەکانیشدا. هەروەها بۆشیان دەرکەوت لە خووە تایبەتەکانی مرۆڤدا کلیلەکە پێش هەمو شتێك لە پەیوەندی نێوان خووەکاندایە و لە چۆنێتی ریزبەندیکردنیاندایە.

سەبارەت بە بەرهەمهێنان و بڵاوکردنەوەی کتێبەکەش بە پێویستی دەزانم سوپاس و پێزانینی خۆم دەربڕم بۆ:

- ساندراو هەمو مناڵەکانم و هاوسەرەکانیان کە پشتیوانی و هاوکاریی زۆریان نواند بەتایبەت لە گەشتە زۆرو زەوەندەکانمدا کە لە پێناوی ئامادەکردنی بابەتەکانی ئەم کتێبەدا ناچاربوم زوو زوو ئەنجامیان بدەم. ئەوان بە کردەوە هەڵگری پرنسیپەکان بون و دیارە ئەگەر مرۆڤ بە کردەوە پرنسیپێك پەیڕەو بکات ئەوا بە ئاسانییش دەتوانێت روونی بکاتەوە.

- (جۆنی) برام کە خۆشەویستییەکی بەردەوام دەردەبڕێت و خاوەنی ڕۆحێکی بێگەردە و مەسەلەی کتێبەکەی بەهەند وەرگرت و بیروبۆچونی بەسودی هەبو.

- گیانی پاکی باوکم

- دایکم سەبارەت بەو ڕەنج و قوربانییانەی کە پێشکەشی ٨٧ منداڵ و نەوەی زیندوی دەکات و هەرگیز ماندو نابێت لە دەربڕینی خۆشەویستیدا بۆیان

- هاوڕێ و هاوکارەکانم، بەتایبەت بۆ

بیل ماری و ڕۆنی ماکمیلان و لێکس واتەرسۆن، کە زانیارییان دامێ و هانیان دام و ئامۆژگاری پیشەیی و بەسودیان پێشکەش کردم؛

- براو ئەندرسۆن، کە بە ماندوبونی خۆی لە ماوەی زیاتر لە ساڵێکدا توانی بە ڤیدیۆ وێنەی قۆناغەکانی کارکردن لە (٧ خووەکە)دا بگرێت. هەروەها لەژێر سەرکردایەتی ئەمدا توانرا کتێبەکە پوخت بکرێت و چاوی پێدا بخشێنرێتەوە و لەسەر ئاستی مەودایەکی پان‌وپۆڕی دەزگاکاندا هەزاران کەس پەیڕەوی بکەن و ئەوانەی کە بە شێوەیەکی سەرەتایی کەرەسەکانی ئەم بابەتانەیان بینی، هەر هەمویان ئارەزومەندبون کە بابەتەکە بۆ زۆرترین ژمارەی کارمەندەکانیان دابین بکەن و ئەمەش متمانەی زیاتری لا دروست کردین کە بابەتەکەمان شیاوی جێبەجێکردنە"

- (بۆب شیلی) کە یارمەتیدەر بو لە دروستکردنی سیستمێك بۆ کۆمپانیاکەمان ئەمەش گوشارێکی گەورەی لەسەرشانی خۆم و خێزانەکەم لابرد و یارمەتیی دام هەمو کات و توانای خۆم بۆ کتێبەکە تەخان بکەم.

- داڤید کۆنلی کە بایەخ و هێزی (٧ خووەکە)ی بە سەدان دەزگای بازرگانی ناساند بۆ ئەوەی هاوکارەکانم (بلەین لی) و (ڕۆیس کرۆچەر) و (ڕۆجەر میریل) و (ئاڵ سوینتزلەر) و خۆم فرسەتی ئەوەمان هەبێت هەمیشە لە کۆڕو کۆبونەوەکاندا لەسەر ئاستێکی فراوان بیروڕا پێکەوە ئاڵوگۆڕ بکەین.

- نوێنەرە ئەدەبیەکەم، (جان میللەر) و هەروەها (گرێگ لینك)ی هاوبەشم کە لە هیچ ئیشێك ناترسێت. هەروەها بۆ (ستیڤانی سمیث)ی یاریدەدەر و بۆ (رالین

بێکهام والیت) کە زۆر ئازاو داهێنەرانە هەڵمەتی خستنە بازاڕی کتێبەکەیان بەئەنجام گەیاند.

- (بۆب ئەساهینا)ی لێپرسراوی دەزگای بڵاوکردنەوەی (سیمۆن و شۆستەر) کە زۆر بە لێهاتوویی پڕۆژەکەی رابەرایەتی کردو گەلێك پێشنیاری جوانی پێبەخشیم و یارمەتییەکی زۆری دام جیاوازی نێوان قسەکردن و نوسینم بۆ دەربکەوێت.

- هەردوو یاریدەدەری پێشوم (شیرلی) و (هیثەر). هەروەها بۆ یاریدەدەرەکەی ئێستام (مارلین ئەندربۆن) کە بە شێوازێکی بێ وێنە دڵسۆزیی خۆی سەلماند.

- (کین شیلتۆن)ی نوسەر لە گۆڤاری (Executive Excelence) سەبارەت بەوەی چەند ساڵێك لەمەوبەر وێنەیەکی دەرکرد و هەروەها یارمەتیدەریش بو لە وردبونەوە و چاوخشاندنەوە بە بابەتەکەدا و لە داڕشتنی جیاواز جیاوازدا و هەروەها سەبارەت بەو دەستپاکی و خەمخۆرییە زۆرەی کە بۆ راگرتنی ئاستی بەرزی کتێبەکە دەینواندن.

- (ریبیکا میریل) کە یارمەتییەکی گەورەی پێشکەشکردین لە چاپ و بەرهەمهێناندا و هەروەها بابەتەکەی بە بەشێك لە خۆی دەزانی و بەوپەڕی هەستیاری و شارەزایی و دڵسۆزییەوە کاری دەکرد. سوپاسیش بۆ (رۆجەر)ی مێردی کە هەمیشە یارمەتیدەرێکی حەکیم و بەسود بووە.

- (کاری سویم) و (گایلۆردی) کوڕی کە بە تێڕوانینێکی شایستەی سوپاس و رێزەوە بەشدارییان کرد لە پێشخستنی خێرای دەزگاکەماندا.

# ناوەڕۆك

# پێشەکی

لەو کاتەوەی کە کتێبی (٧ خووەکەی کەسانی پێشەنگ) یەکەمجار بڵاوکرایەوە. تاکو ئێستا جیهان گۆڕانێکی دراماتیکی گەورەی بەسەردا هاتووە. ئاڵۆزترە و نیگەرانی و داواکارییەکانی زۆرتربون. مرۆڤ لە سەردەمی پیشەسازییەوە چۆتە سەردەمی زانیاری/ کرێکارانی زانستەوە بە هەمو پێشهاتە زۆر و بەربڵاوەکانییەوە. ئەو کێشەو گیروگرفتانەی کە ئەمرۆ لە ژیانی تایبەتی و خێزانی و ڕێکخراوەییدا رووبەروویان دەبینەوە .. هەرگیز ١٠-٢٠ ساڵ لەمەوپێش تەنانەت پێشبینییش نەدەکران. تەحەدا نوێیەکان تەنیا هەر لەرووی چەندایەتییەوە جیاوازنین لە تەحەداکانی جاران، بەڵکو لە رووی چۆنایەتییشەوە جیاوازن.

ئەم گۆڕانە گرنگ و وەرچەرخێنەرانەی ناو کۆمەڵگا و دنیای بازاڕ و ئابوری وا دەکەن پرسیارێکی زۆر گرنگ سەرهەڵ بدات کە زۆرجار بەم شێوەیە لە منی دەپرسن: ئایا (٧ خووەکەی کەسانی پێشەنگ) هێشتا هەر بایەخیان ماوە؟ کاتێکیش کە لێم دەپرسن ئایا ئەم خووانە ١٠ ساڵی دیکەو بیست ساڵی دیکەو پەنجا ساڵی دیکەو سەد ساڵی دیکە بایەخیان دەمێنێت؟ وەڵامەکەی من بریتییە لەمە: هەتا گۆڕانکارییەکان گەورەتربن و هەتاکو تەحەداکان زەحمەتتربن خووەکان زیاتر شایانی بایەخپێدان دەبن. بۆچی؟ چونکە کێشەو ئازارەکانمان جیهانین و بەردەوام زیادیش دەکەن. لەهەمان کاتیشدا چارەسەرەکانیان ئێستاش و هەمیشەش لەسەر کۆمەڵێك پرنسیپی هەمیشەیی و جیهانی و سەربەخۆی وا دادەڕێژرێن کە هەمو کۆمەڵگا گەشاوە و زیندووەکان بە درێژایی مێژوو پێی ئاشنان.

ئەمانە من دروستم نەکردون و نابمە کوێخاشیان

بەڵکو تەنیا دیارییم کردون و خستومنەتە چوارچێوەیەکی زنجیرەییەوە.

یەکێك لە دەرسە هەر مەزنەکانی کە ژیان فێری کردم ئەمەیە: ئەگەر دەتەوێت دەستت بگات بەوپەڕی ئاواتەکانتدا و زاڵ ببیت بەسەر تەحەدا هەرە مەزنەکانتدا پێویستە ئەو پرنسیپە یاخود ئەو یاسا سروشتییە دەستنیشان بکەیت کە هەژمونی هەیە بەسەر ئەنجامەکانی کە تۆ بەدوایاندا دەگەڕێیت. جێبەجێکردنی پرنسیپەکانیش لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە جیاوازە و پەیوەستە بە توانای

خولقاندن و هێز و بەهرە بێ هاوتاكانەوە. بەڵام لە كۆتاییدا سەركەوتن لە هەر بوارێكدا بەوە زامن دەكرێت كە كردەوەكان هاوئاهەنگ بن لەگەڵ ئەو پرنسیپانەدا كە سەركەوتنەكەیان پێوە بەستراوە.

دیارە زۆركەس ئاوا بیرناكەنەوە، لانی كەم هوشیارانەو بەئەنقەست. هەمیشە دەبینیت چارەسەرە پرنسیپیەكان زۆر پێچەوانەی بیركردنەوەی باوو رەوشتی باوی كەلتوری گشتین. رێگەم بدە با ئەم دژایەتی و پێچەوانەبونە بە هەندێك لەو تەحەدا هاوبەشانە روون بكەمەوە كە دێنە رێی ئێمەی مرۆڤەوە.

**ترس و نائارامی:** زۆركەس لەم سەردەمەدا هەست بە ترس دەكەن. ترس لە ئایندە. هەست دەكەن لە شوێنی كارەكەیاندا هەڕەشەیان لەسەرە. لەوە دەترسن نانبڕاو ببن و نەتواننماڵو منداڵ بەخێو بكەن. ئەمە زۆرجار مرۆڤ ناچار دەكات جۆرە ژیانێك هەڵبژێرێت كە هیچ ریسك و سەركێشییەكی تێدا نەبێت و لەناو خێزان و لە شوێنی كارەكەیدا پشت بە خەڵكی ببەستێت. كاردانەوەی باو بەرامبەر بەم كێشەیە ئەوەیە كە زیاتر و زیاتر سەربەخۆبین. "هەر خەریكی خۆم و شتەكانی خۆم دەبم" كارەكەی خۆم ئەنجام دەدەم. بە باشی ئەنجامی دەدەم و چێژی تەواوی لێ وەردەگرم. سەربەخۆیی دەستكەوت و بەهایەكی گرنگ و تەنانەت چارەنوسیيشە. بەڵام كێشەكە لەوەدایە كە واقیعەكەمان واقیعێكی پێكەوە گرێدراوەو سەربەخۆ نییە و دەستكەوتە هەرە گرنگەكانیشمان بەر لە هەمو تواناو لێهاتوویيەكی ئێستامان پێویستیان بە شارەزایی زۆر هەیە لە هاوكاری و پێكەوە ژیاندا لەگەڵ خەڵك.

**هەر ئێستا دەمەوێت:** خەڵك شتی دەوێت و ئائێستاش دەیەوێت. "پارەم دەوێت، خانوویەكی گەورەی جوانم دەوێت، ئوتومبیلێكی جوانم دەوێت، باشترین و گەورەترین سەنتەری خۆشگوزەرانیم دەوێت، هەمویم دەوێت و شایستەشیانم. هەرچەندە لە كۆمەڵگای ئەمڕۆدا كە كۆمەڵگای كارتی متمانەیە مرۆڤ بە ئاسانی دەتوانێت شتەكەی ئائێستا دەست بكەوێت و دواتر نرخەكەی (پارەكەی) بدات، بەڵام بناغە ئابورییەكان هەمو جارێك ئەو راستییەمان وەبیر دەهێننەوە (هەندێك جار

ئارەزووەکان سنوریيان نىيە و نابنە پاساو. تەنانەت خۆماندوکردنيش بە تەنيا بەس نىيە. گۆڕانکارىيە خێراکانى تەکنەلۆجيا و زيادبونى ململانێکان لە ئەنجامى بەجيهانيبونى بازاڕ و تەکنەلۆجياوە پێويستە هانمان بدەن کە نەك هەر هوشيار و ئاگاداربين، بەڵکو بەردەوام خەريکى نوێبونەوە و خۆ رۆشنبيرکردن بين. پێويستە بەردەوام گەشە بە مێشکمان بدەين و تيژى بکەينەوە و سەرمايەگوزاريش بکەين لە پێشخستنى تواناکانماندا بۆ ئەوەى لە کەڵك نەکەوين. هەميشە سەرکارەکان بەدواى ئامانجى چاکدا دەگەڕێن و دەستيشيان خۆش بێت. کێبڕکێکە لەم سەردەمەدا زۆر توندوتيژە، مانەوە سەنگى مەحەکە. لەم رۆژگارەدا سەرمايە چى دەوێت؟ بەرهەمهێنانى ئەو واقيعەى ئەمڕۆ و پێوەرى سەرکەوتنيش بەردەوامى و گەشەيە. رەنگە لەسەر ئاستى کورتخايەندا کێشەيەکت نەبێت بەڵام پرسيارەکە ئەوەيە ئايا هێندە سەرمايەگوزاريت کردووە بەشى بەردەواميدان و زيادکردنى ئەم گەشەيە بکات بۆ يەك ساڵ، پێنج ساڵ و دە ساڵى ديکە. هەم کلتورەکەمان و هەم ئەقڵييەتى (واڵ ستريت)يش داواى ئەنجامى هەنوکەيى دەکەن. بەڵام زۆر گرنگە هاوسەنگى رابگرين لەنێوان بەديهێنانى سەرکەوتنى هەنوکەيى و سەرمايەگوزاريکردندا لەو توانايانەى کە سەرکەوتنەکانى سبەينىَ بەدى دەهێنن.

ديارە ئەم قسەيە بۆ بوارەکانى تەندروستى و هاوسەرگيرى و پەيوەندييەکانى خێزان و پێويستييەکانى کۆمەڵگاش راستە.

**سەرزەنشتکردن و کڕوزانەوە:**

زۆر ئاسانە مرۆڤ ئۆباڵى هەمو کێشەيەك بخاتە ئەستۆى شتێك. کۆمەڵگاش خووى بەوەوە گرتووە کە خۆى وەکو قوربانييەك نيشان بدات. "ئاخ ئەگەر سەرۆکەکەم ملهوڕێکى هێندە بىَ ئەقڵ نەدەبو .. ئەگەر هێندە بە هەژارىى لەدايك نەبومايە .. ئەگەر لە شوێنێکى چاکتردا بومايە. ئەگەر مناڵەکانم هێندە لاسار نەبونايە. ئاخ ئەگەر بەشەکەى ديکەى کۆمپانياکە هێندە بىَسەروبەر نەبوايە. ئەگەر خەڵکەکە هێندە تەمەڵ و خەمبار نەبونايە، ئەگەر هاوسەرەکەم يەك تۆز چاك بوايە و قسەى لەگەڵدا بکرايە .. ئەگەر بەرهەمەکەمان ئاوا نوشوستى نەهێنايە و ئەگەر .. و ئەگەر .." سەرزەنشتکردنى خەڵکى ديکەو شتى ديکە لەسەر کێشەو ململانێکانى خۆمان رەنگە مەسەلەيەکى ئاسايى بێت و بە شێوەيەکى کاتى

ئازارەکـەمان بیربباتـەوە، بـەڵام لەهـەمان کاتیشـدا دەمانبەسـتێتەوە بـە خـودی کێشەکانەوە. کەسێکم نیشان بـدە هێنـدە بـێ فیـز بێت بەرپرسیارێتی بارودۆخەکەی خۆی بگرێتە ئەستۆ و هێندەش ئازابێت زات بکات هەمو هەنگاوێکی پێویست بنێت بـۆ ئـەوەی داهێنەرانـە بتوانێـت رێی خـۆی لـەناو ئـەو تەحـەدا زەحمەتانـەدا بدۆزێتەوە. تۆ مرۆڤێکی ئاوام نیشان بدە بۆ ئـەوەی منـیش توانـا نائاساییەکەی بڕیار و هەڵبژاردنت نیشان بدەم.

**بـێهیوایی:** بەرهـەمی سەرزەنشـتکردن رەشـبینی و بێهیواییـە. مـرۆڤ ئەگـەر باوەڕی هێنا بـەوەی ئـەم قوربانیـەکی بارودۆخەکەیـە و تەسلیمی چارەنوس بـو، ئیتر هـیچ هیـواو ئارەزویـەکی نامێنێت و گۆشـەگیر و پـرزە لێبـڕاو دەبێت. "مـن دیـل و بارمتەم، بوکە سـەماکەرەم، ئەڵقەیـەکی زنجیرە گەورەکـەم و هیچم پێناکرێت. بـەس پێم بڵـێ مـن چـی بکـەم." زۆر کەسـی بـەهرەداری بـەتوانا ئـەئاوا بیردەکەنـەوە و لـە ئەنجامـدا توشـی خـەمۆکی و بـێ هیـوایی دەبـن. یـەکێك لـە کـەلتورە باوەکـانی مـرۆڤ رەشبینـیـیە. "بۆ ئەوەی لە هیچ شتێك و بە هیچ شێوەیەك نائومێد نـەبیت بەتـەمای هیچ شتێك مەبە." بەڵام بە درێـژایی مێـژوو ئـەو راستـیـیە سـەلمێنراوە کە پرنسیپە پێچـەوانەکە بریتـیـیە لـە هیـواو پێشـکەوتن و هـەروەها دۆزینـەوەی ئـەو راستـییە جوانەیە کە دەڵێت: "من خۆم هێزە خوڵقێنەرەکەی ژیانی خۆمم."

**نەبونی هاوسەنگیی لە ژیاندا:**

ژیان لەم کۆمەڵگایەماندا، کە کۆمەڵگای تەلـەفۆنی مۆبایلە رۆژ بـە رۆژ ئـاڵۆزتـر دەبێت و ئـەرك و نیگـەرانی و داواکارییەکانیشی زیـاتر دەبـن. هـەمو هەوڵـەکانمان بـۆ ئەوەی فریابکەوین بریتین لەوەی زیـاتر کاربکـەین و زۆرتـر بچینە نـاو دۆخەکـەوە و زیاتر و زیاتر دەستکەوت بەدەست بهێنین لـەرێی تەکنـەلۆجیای هاوچـەرخەوە. ئایا بۆچـی ئێمـە هـەتا دێـت زیـاتر خۆمـان لـەم بابەتـە رووکەشـانەدا نـوقم دەکـەین و تەندروسـتی و خێـزان و تایبەتمەنـدێتی و مەسـەلە گرنگـەکانی دیکـەی ژیـان دەخەینە لاوە؟ کێشەکە لە کارەکەماندا نـیـیە کە داینـەمۆی ژیانـە. هـەروەها خـەتای گۆڕانکارییەکان و ئاڵۆزییەکانیش نـیـیە. خەتاکە لەوەدایـە کـە ژیـانی هاوچـەرخمان دەڵێت "زووتر بچۆ بەلای کارەکەتەوە، زیاتر کاربکە، بەرهەمت زیاتر بێت و هـەمو

شتێکت بە قوربانی ئێستا بکە." بەڵام راستییەکە ئەوەیە کە هاوسەنگی و ئاسودەیی مێشك بەمانە دەستەبەر نابن؛ بەڵکو شوێن کەسێك دەکەون کە مەسەلە گرنگەکانی ژیانی لەلا روون و ئاشکرا بێت و بەویست و بەرنامەیەکی کاریگەرەوە هەنگاویان بۆ دەنێت.

### چی بۆ من تێدایە؟

کەلتوری باو فێرمان دەکات کە ئەگەر لە ژیاندا شتێکمان بوێت پێویستە بەدوای یەکەمیدا بگەڕێین. ئەو کەلتورە دەڵێت "ژیان گەمەیەکە، پێشبڕکێیە و رکابەرایەتییە. باشتر وایە براوە بیت تیایدا." هاوکاران و هاوڕێکانی قوتابخانە و تەنانەت ئەندامانی خێزانەکەشمان لێ دەکات بە رکابەر. هەتا ئەوان زیاتریان دەست بکەوێت، ئێمە کەمترمان بۆ دەمێنێتەوە. بێگومان بە رواڵەت هەوڵ دەدەین جوامێری بنوێنین و وا خۆمان نیشان دەدەین کە سەرکەوتنی ئەوان خۆشحاڵمان دەکات. بەڵام لە ناخەوە، زۆربەمان، ئەو سەرکەوتنەمان پێ ناخۆشە و خەفەتی پێدەخۆین. دیارە لە مێژووی شارستانێتیماندا زۆر دەستکەوتی مەزن هەن کە بەرهەمی کاری سەربەخۆ و ویستی سەربەخۆی ئەو رۆحانەن کە سوربون لەسەر بڕیار و کارەکانیان. بەڵام لەسەردەمی کرێکارانی زانیاریدا مەزنترین هەڵکەوت و زۆرترین دەستکەوت بۆ ئەو کەسانەیە کە بڕوایان بە کاری بەکۆمەڵ هەیە و هونەرمەندانە ئەو گیانە پێکەوەییە رێنمایی دەکەن.. مەزنێتی راستەقینە لەو ئەقڵە کراوەیەوە بەدەست دێت کە خۆپەرستێتی رەت دەکاتەوە و لە پێناوی سودی هاوبەشدا پرنسیپی رێزلەیەکگرتن دەچەسپێنێت.

### مەراقی ئەوەی لێت تێبگەن:

کەم پێویستی مرۆڤ هەن هێندەی ئەوە گرنگ بن کە خەڵکەکە لێی تێبگەن، کە دەنگێکی هەبێت گوێی لێ بگیرێت و رێزی بۆ دابنرێت و بنرخێنرێت. هەموشی بۆ ئەوەی ئەوکەسە کاریگەرێتی هەبێت. زۆرکەس باوەڕی وایە کلیلی هەمو کاریگەرێتییەك پەیوەندییە – واتە ئەوەیە کە بیروبۆچونەکەت ئاشکرا بکەیت و راشکاوانە قسە بکەیت. خۆی ئەگەر چاکیش بیری لێ بکەیتەوە دەبینیت ئەم بۆچونە راستەو مەسەلەکە وایە. چونکە لەکاتێکدا کە بەرامبەرەکەت قسەت بۆ دەکات، تۆ

لەبری ئـەوەی بەڕاستی گوێی لێ بگریت بۆ ئـەوەی تـێی بگـەیت، زۆرجار سـەرقاڵی ئـەوە دەبیـت کـە چـۆن وەڵامـی بدەیتـەوە. سـەرەتای راسـتەقینەی دەوروتەنـسیر ئەوکاتەیە کە بەرامبەرەکەت هەست دەکات تۆ کەوتویتـە ژێـر کاریگـەرێتی ئـەوەوە – کە هەست دەکات تۆ تـێی گەیشتویت – کە تـۆ دڵسۆزانە و بـە قـوڵی گوێـت لێ گرتـووە و تـۆ کەسـێکی کراوەیت. بـەڵام زۆربـەمان نـاتوانین بـە قـوڵیی گـوێ بگـرین. نـاتوانین پێشـوەخت ئەجینداکـەمان وا لێ بکـەین بـەر لـەوەی راوبۆچـونی خۆمـان دەربـبڕین هەوڵ بدەین لە بەرامبەرەکـەمان تێبگـەین. کەلتورەکـەمان داوامـان لێ دەکـات و بگـرە گوشاریشـمان دەخاتەسـەر بـۆ ئـەوەی تێبگـەین و کاریگـەرییمان هـەبێت. بـەڵام لەراستیدا مەسەلەکە بەوجۆرە نـییـە. کاریگـەرێتی زادەی لێـك تێگـەیشتنە و ئـەمیش لەوەوە دێت کە لانی کەم لە دوو کەسـەکە یـەکێکیان دەستپێشـخەریی بکـات لـەوەی بـە قوڵیی گوێ بگرێت.

### ململانێ و جیاوازییەکان:

زۆر شـتی هاوبـەش هـەن لـەنێوان خەڵـکیدا بـەڵام لەگـەڵێك شـتی گرنگیشـدا جیاوازییـان هەیـە. بیرکردنـەوەیان جیـاوازە، ئامـانج و پاڵنـەر و ئارەزووەکانیشـیان جیـاوازە و بنەماکانیشـیان هەنـدێ جـار هێنـدە جیـاوازن کـە دەکەونـە ململانـێی یەکتریەوە. ململانێکان بەرهـەمێکی سروشـتی ئـەم جیاوازییانـەن. رێکـاری کۆمەڵـگا سەربارەت بـەم ململانێیـە و چارەسـەرکردنی نـاکۆکی و جیاوازییـەکان ئەوەیـە کـە تـا پێـت دەکرێـت بـراوە بیـت. هەرچـەندە دەسـتکەوتێکی بـاش لـە هونـەری پێکهـاتن و سازشدا هاتۆتەدی کاتێك کە هەردولایەنەکە لە ناوەڕاستی رێگاکـەدا دەگەنـە یـەکتری بێ ئـەوەی هـیچ لایـەنێك بـە تـەواوی تێـك بشکێت یـاخود بـە تـەواوی سـەرکەوتن بەدەسـت بهێنێـت. ئـای چ زیـانێکی گەورەیـە جیاوازییـەکان وا لـە مـرۆڤ بکـات بگاتـە نزمترین خاڵی کۆکەرەوە لەگەڵ بەرامبەرەکەیدا!

ئـای کـە زیـانێکی گەورەیـە نـەتوانیت پرنسـیپەکانت بکەیتـە هاوکارییـەکی داهێنەرانـە بـۆ بـەدیهێنانی چارەسـەری وا کـە باشـتربێت لـەو چارەسـەرانەی پێشـتر هەردولایەنەکە خستبویانە ڕو.

**سستبوون:**

سروشتی مرۆڤ چوار رەهەندییە – جەستە و ئەقڵ و دڵ و رۆح. ئێستا جیاوازی و دەرەنجامەکانی ئەم دو رێکارە بهێنەرە بەرچاوی خۆت:

**جەستە:**

کەلتور چی دەڵێت؟ دەڵێت شێوازی ژیانی خۆت مەگۆڕە؛ نەخۆشی و کێشە تەندروستی‌یەکان بە دەرمان و نەشتەرگەری چارەسەر بکە.

پرنسیپ چی دەڵێت؟ دەڵێت رێگە لە سەرهەڵدانی کێشەو نەخۆشی‌یەکان بگرە بەهاو ئاهەنگکردنی شێوازی ژیانت لەگەڵ بنەما چەسپیوە جیهانی‌یەکانی تەندروستی.

**مێشك:**

کەلتور چی دەڵێت؟ دەڵێت تەماشای تەلەفزیۆن بکە (چێژم پێببەخشە).

پرنسیپەکان چی دەڵێن؟ بە قوڵی و بەربڵاوی بخوێنەرەوە، (خۆرۆشنبیرکردنی بەردەوام.)

**دڵ:**

کەلتور چی دەڵێت؟ دەڵێت پەیوەندییەکانت لەگەڵ خەڵکیدا بۆ قازانج و چێژی تایبەتی خۆت بەکاربهێنە.

پرنسیپەکان چی دەڵێن؟ دەڵێن گوێگرتنی قوڵ و دڵسۆزانە و خزمەتکردنی خەڵکی ئەوپەڕی چێژ و ئاسودەییت پێدەبەخشن.

**رۆح:**

کەلتور چی دەڵێت؟ دەڵێت زیاتر بچەسپە بە رەشبینی و دنیا پەرستی‌یەوە.

پرنسیپەکان چی دەڵێن؟ دەڵێن بزانە کە سەرچاوەی پێویستی‌یە بنەڕەتی‌یەکانمان لە مەسەلە ئەرێنی‌یەکان و واتاداربونی بابەتەکان کە لە ژیاندا بۆیان دەگەڕێین بریتی‌یە لە پرنسیپەکان–واتە لەو یاسا سروشتی‌یانەی کە من باوەڕم وایە خواوەند سەرچاوەکانیانە.

من بانگهێشتت دەکەم کە هەمیشە پێویستی‌یەکانی خۆت و تەحەدا جیهانی‌یەکانیشت لە خەیاڵدا بێت. تۆ بەم کارەت دەتوانیت چارەسەر و رێبازە

راستەقینەکان بدۆزیتەوە. هەروەها دەتوانیت دژایەتی نێوان کەلتوری باو و ئەو رێکارە مەبدەئییە هەمیشەیییانە ببینیت کە سەردەم لەدوای سەردەم ئاشکراتر دەبن.

دوا تێبینیشم دوپاتکردنەوەی ئەو پرسیارەیە کە هەمیشە ئاراستەی خوێندکارەکانی دەکەم: چەند کەس لە سەرەمەرگدا ئاواتەخواز بون لە ژیاندا زیاتر لە ئۆفیسەکانیاندا بونایە یان تەماشای تەلەفزیۆنیان بکردایە؟ کەس. مرۆڤ لە سەرەمەرگدا بیر لە خۆشەویستان و خێزان و ئەو کەسانە دەکەنەوە کە خزمەتیان کردون.

تەنانەت دەروونناسێکی مەزنی وەکو ئەبراهام ماسلۆ لە کۆتایی ژیانیدا بەختەوەری و ئاسودەیی و وەجاخڕوونیی خستبووە پێش خۆ بەدیهێنانەوە. ماسلۆ ئەمەی ناو ناوە لەخۆبوردن.

ئەمە بەلای منیشەوە زۆر راستە. تا ئێستا مەزنترین و ماقوڵترین کاریگەری ناو حەوت خووەکە ئەوەیە کە لە ژیانی منالّ و نەوەکانمدا دەیبینم.

بۆ نمونە (شانون)ی کچەزام کە تەمەنی نۆ ساڵە زۆر مەبەستی بو خزمەتی منالّە بێ دایك و باوکەکانی رۆمانیا بکات و پاش ئەوەی کە منالێکی نەخۆش بەسەریدا رشایەوە و باوەشی پیاکرد، (شانون) نامەیەکی بۆ من و نەنکی نوسی کە دەڵێت نامەوێت چیتر ژیانێکی خۆپەرستانە بژیم. پێویستە هەمو ژیانم بۆ خزمەتکردن تەرخان بکەم. ئەو لە ئاکامی ئەم نامەیەدا چووە رۆمانیا و تا ئێستەش لەوێ خزمەتی خەڵکی دەکات.

هەمو منالّەکانمان هاوسەرگیرییان کردووە و لەگەلّ هاوسەرەکانیاندا کۆمەڵێك ئەرکی مەبدەئی بەڕێدەکەن کە هەمویان خزمەتکردنی خەڵکین. ئێمەش کە بەوشێوەیە دەیانبینین هەست بە وەرچەرخانێکی گەورە دەکەین.

تۆ ئێستا کە دەست دەکەیت بە خوێندنەوەی حەوت خووەکەی کەسانی پێشەنگ، بەڵێنت دەدەمێ کە سەرکێشییەکی سەرنجراکێش فێر دەبیت. ئەوەی فێری دەبیت کەسە خۆشەویستەکەی خۆتی تیا بەشدار بکە. گرنگترین خاڵیش ئەوەیە ئەوەی فێری دەبیت جێبەجێی بکەیت. بیرت نەچێت فێربون ئەگەر کردەوەی لەگەڵدا نەبێت هیچ نییە. زانستی بێ کردەوە لە راستیدا نەزانییە.

من بەش بە حاڵی خۆم بۆم دەرکەوتووە جێبەجێ کردنی حەوت خووەکە خەباتێکی بەردەوامە —بەشی زۆری لەبەرئەوەی کە هەتا باشتر فێری جێبەجێ کردنەکە ببیت، سروشتی تەحەداکە زیاتر دەگۆڕێت، رێك وەکو خلیسکێنەی سەربەفر و گۆڵف و تێنس و وەرزشەکانی دیکە. من کە بە جدی رۆژانە کار بۆ جێبەجێکردنی ئەم خووە مەبدەئی‌یانە دەکەم بە گەرمی بەشدارم لەگەڵتاندا لەم سەرکێشی‌یەدا.

ستیفن ئارِ. کۆڤی
Steghen.Covey@ frank covey. com
www. Stephen covey.com
پرۆڤۆ، ئوتاه
٢٤ی تەموزی ٢٠٠٤

# لەناوەوە بۆ دەرەوە

لەم جیهانەی ئێمەدا نایابی و شێوازی راستی ژیان لێک جیا ناکرێنەوە.

-دەیڤد ستار جۆردن-

لە ماوەی زیاتر لە بیست و پێنج ساڵ کارکردن لەگەڵ خەڵك دا لە شوێنە جیاجیاکانی وەك زانکۆ، راوێژکارییەکانی هاوسەرگیری و خێزانپێکەوەناندا، چەندین کەسم بینیوە کە بە رواڵەت سەرکەوتنی بەرچاویان بەدەست هێناوە، بەڵام لە ناخەوە هەمیشە هەستیان کردووە لە شتێکیان کەمە و پێویستی زۆریان بە هەماهەنگی و کارایی خۆیان و دەرخستنی کاریگەری خۆیان هەبوە. هەروەها لە پەیوەندی ئاسایی و گەشەکردوشدا لەگەڵ دەوروبەردا لەئاستی پێویستدا نەبوون.

وابزانم هەر یەکێك لە ئێمەش هەندێك لەو کێشانەی هەبێت.

"من لە بواری کارەکەمدا چەند ئامانجێکم دانا و دواتر بەدیم هێنان و بە کردەوەش سەرکەوتنی زۆر گەورەم بەدەست هێناوە. بەڵام ئەم سەرکەوتنانە زۆر لەسەر ژیانی تایبەتی خۆم و خێزانەکەم کەوتن. وام لێهاتوە ژن و منداڵەکانم بە باشی نەناسم. تەنانەت لەوەش دڵنیا نیم کە ئایا خۆم دەناسم و دەزانم بەڕاستی چ شتێکم لەلا گرنگە. گەیشتومەتە ئەو پرسیارەی کە بڵێم - ئایا مەسەلەکە ئەوە دەهێنێت؟"

"ئەمساڵ ئەمە پێنجەم جارمە، رێجیمێکی تازەم دەست پێ کردووە. ئەزانم کێشم زیادە و بەڕاستیش دەمەوێت بگۆڕێم. هەموو زانیارییە نوێیەکان دەخوێنمەوە، چەند ئامانجێك بۆ خۆم دەستنیشان دەکەم، ئەنجامی باش و دڵخۆشکەر دەهێنمە بەر چاوی خۆم و بە خۆم دەڵێم دەتوانم ئەو کارە بکەم. کەچی ناتوانم. پاش چەند هەفتەیەکی کەم شکست دەهێنم. بەڕاستی ناتوانم ئەو پەیمانەی بە خۆمی دەدەم بیبەمە سەر.

"چەندین خولی (بەڕێوەبەردن)م یەك لە دوای یەك بینیوە. چاوەڕوانیم لە کارمەندەکانم زۆر بوو. هەوڵی بێ وچانم دەدا وەکو هاوڕێ لەگەڵیان رەفتار بکەم و مامەڵەی نێوانمان راست و دروست بێت. بەڵام لە ناخی خۆمدا هەست ناکەم هیچ وەفایەکیان بۆم هەبێت. لەوباوەڕەدام ئەگەر رۆژێك نەخۆش بم و لەماڵەوە بکەوم، ئەمان زوربەی کاتەکە بە قسەکردنەوە بکوژن. لەخۆم دەپرسم ئایا بۆچی ناتوانم

رایان بهێنم سەربەخۆ و لێپرسراوانە ڕەفتار بکەن - یان ئایا دەتوانم کارمەندی لەمان باشتر بدۆزمەوە؟"

"کوڕە هەرزەکارەکەم یاخی‌یە و فێری مادەی هۆشبەر بووە. هەرچەند هەوڵی لەگەڵدا بدەم، بێ سودە، گوێم لێ ناگرێت. چی بکەم؟"

"ئیشی زۆرم بەسەردا کەتوە. فریای هیچ. هەست بە گوشار و ناڕەحەتی دەکەم. بەردەوام، هەر حەوت ڕۆژەکەی هەفتە خەریکی ڕاکەڕاکم. بەشداری سیمیناری (بەڕێوەبردنی کات)م کردووە و چەندین ڕێگەی جیاوازی بەرنامەدانانم تاقیکردۆتەوە. بە شێوەیەکی گشتی کەمێك سودم لێ بینیوە، بەڵام هێشتا هەست ناکەم کە ئەو ژیانە کامەران و پڕ بەرهەم و ئارامیەم هەبێت کە مەبەستمە."

"دەمەوێت منداڵەکانم فێری ئەوە بکەم ڕێزی کار کردنیان لابێت. بەڵام هەرچییەك بکەن، هەر دەبێت خۆم چاودێرییان بکەم و لەگەڵ هەر هەنگاوێکیاندا، ڕوبەڕووی گلەیی و ناڕەزایەتییەکانیان ببمەوە. خۆم کارەکە بکەم زۆر چاکترە. بۆچی منداڵەکان ناتوانن بە دڵی خۆشەوە کارەکەیان بکەن و هیچ پێویست بەوە نەکات من بیریان بخەمەوە؟"

"بەڕاستی زۆر سەرقاڵم. بەڵام هەندێك جار پرسیاری ئەوەم لا دروست دەبێت کە ئایا ئەم کارەی من دەیکەم لە دوور مەودا دا چ گۆڕانکارییەك دەهێنێتە ئاراوە؟! بەڕاستی حەز دەکەم مانایەك بۆ ژیانم بدۆزمەوە، بموتایە ئەوەتا لەسایەی منەوە ئەم شتانە گۆڕاون."

"هاوڕێ و خزمەکانم دەبینم کە هەندێك سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە و جۆرە ناوبانگێکیان پەیدا کردووە، بە زەردەخەنەوە پیرۆزبایی گەرمیان لێ دەکەم. بەڵام لە ناخدا، خۆم دەخۆمەوە. ئاخۆ بۆچی ئەمجۆرە هەستەم لا دروست دەبێت؟"

"من خۆم دەزانم کە خاوەنی کەسایەتییەکی زۆر بەهێزم و زۆربەی جار دەتوانم جڵەوی مەسەلەکە بگرمە دەست. کەم جار هەیە کاریگەریم لەسەر دەوروبەرەکەم نەبێت. لە هەموو بارودۆخێکدا بیر دەکەمەوە و بەڕاستی وا هەست دەکەم ئەو بیرۆکانەی من دەریاندەبڕم بۆ هەمووان باشترینن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دوودڵم و هەست بە ئارامی ناکەم. هەمیشە پرسیاری ئەوەم لە مێشکدایە کە ئاخۆ خەڵك چۆن لە خۆم و لە بیرۆکەکانم دەڕوانن."

"ژیانم لەگەڵ هاوسەرەکەمدا تەواو بێ تام بووە. ئێستا ئیتر تەنانەت شەڕیشمان نابێت، بەڵام چیتر یەکترمان خۆش ناوێت. چوینەتە لای راوێژکاری خێزانییش و چەندین شێوازمان تاقیکردۆتەوە، بەڵام ناتوانین ئەو هەستە زیندوو بکەینەوە کە پێشتر هەمانبوو."

چەند ساڵێك لەمەوبەر من و ساندرای خێزانم رووبەڕووی کێشەیەکی لەو جۆرە بووینەوە. یەکێك لە کوڕەکانمان لە خوێندنگادا زۆر ناڕەحەت بوو. لە رووی خوێندنەوە زۆر لاواز بوو، ئەو نەك هەر نەیدەتوانی نمرەی باش بەدەست بهێنێت، بەڵکو تەنانەت نەیدەتوانی لە پرسیارەکانیش تێبگات. لە رووی کۆمەڵایەتیشەوە کەسێکی سەرچڵ و نائاسایی بوو، زوربەی کات خۆیشی و ئێمەشی شەرمەزار دەکرد. لەش و لارێکی بچوك و لاواز و ناتەواوی هەبوو - بۆ نمونە تەنانەت پێش ئەوەی تۆپەکەی بۆ بهاون، ئەم داری بەیسبۆڵەکەی دەجوڵاند. خەڵکەکەش پێی پێ دەکەنین.

ساندرا و من بە شەوقێکی زۆرەوە ویستمان یارمەتی بدەین. هەستمان دەکرد ئەگەر "سەرکەوتن"ێکی گرنگ لە ژیانی مرۆڤدا هەبێت، ئەوەیە منداڵەکەی بە باشی پەروەردە و خزمەت بکات. ویستمان بە ئەقڵ و هەڵسوکەوتی خۆمان کار بکەینە سەر ئەقڵ و هەڵسوکەوتەکانی ئەو. هەوڵماندا هانی بدەین و ئەو شێوازانەی پەیڕەوکرد کە مرۆڤ وا لێ دەکەن رۆڵی ئەرێنی ببینێت. "دەی کوڕی خۆم! تۆ دەتوانیت! دڵنیاین کە دەتوانیت. یەك تۆز دەستت بەرزتر بکەرەوە لەسەر دارەکە و مەیجوڵێنە هەتا تۆپەکە لێت نزیك نەبێتەوە." هەرجارێکیش یەك تۆز باشتر ببوایە، ئێمە زۆر هانمان دەدا دەکرد. "ئافەرین کوڕم، بەردەوام بە."

ئەگەر خەڵکەکە پیێ پێ بکەنینانیە، ئێمە بەتوندی سەرزەنشتمان دەکردن. "وازی لێ بێنن. لە کۆڵی ببنەوە. وا خەریکە فێر دەبێت." کوڕەکەشمان دەگریا و دەیوت هەرگیز لەوە زیاتر فێر نابێت و چیتر حەزی لە بەیسبۆڵ نیە.

هەرچییەکمان کرد بێ سوود بوو، زۆر نیگەران بووین. دەمانبینی کە چۆن ئەم کێشەیە کار دەکاتە سەر کەسایەتییەکەی. هەوڵماندا ببینە هاندەری، یارمەتی بدەین و ئەرێنی بین، بەڵام کە شکستەکان چەندبارە دەبوونەوە، کشاینە دواوە و هەوڵماندا لە گۆشەنیگایەکی دیکەوە تەماشای بارودۆخەکە بکەین.

لەم کاتەدا، من لە بواری کارەکەمدا، سەرقاڵی خولێك بوم بۆ گەشەپێدانی سەرکردایەتی لە سەرتاپای وڵاتدا بۆ چەند مەعمیلێك. ئەرکی من بریتی بوو لە ئامادەکردنی بەرنامەیەك دەربارەی پەیوەندی و هوشیاری کە دوو مانگ جارێك بۆ بەشدارانی پرۆگرامی گەشەپێدانی جێبەجێکاری IBM ئامادە دەکرا.

لە کاتی ئامادەکردنی بابەتەکاندا، مەسەلەیەك زۆر سەرنجی راکێشام کە بریتی بوو لە چۆنێتی دروستبوون و کارکردنی هوشیاری. ئەمەش پەلکێشی کردم بەرەو لێکۆڵینەوەی بیردۆزی پێشبینی کردن و بیردۆزەکانی خۆدروست کردن کە پێی دەوترێ "کاریگەری پیگمالیۆن" و بۆم دەرکەوت کە هەستەکانمان لە شوێنێکی سەخت و قوڵی ناخماندان. لەمەوە فێر بووم کە وەك چۆن پێویستە تەماشای جیهان بکەین، بە هەمان ئەندازەش پێویستە تەماشای ئەو هاوێنەیە بکەین کە تەماشای جیهانی پێ دەکەین، چونکە خودی هاوێنەکەش کار دەکاتە سەر چۆنێتی جیهانبینیمان.

ئەو کاتەی ساندراو و من باسی ئەو چەمکانەمان دەکرد کە من لە IBM دا بە دەرس دەموتنەوە و بەراوردمان دەکرد لەگەڵ کێشە تایبەتەکەی خۆماندا، بۆمان دەرکەوت کە ئەو رێگەیەی گرتبومانە بەر بۆ یارمەتیدانی کوڕەکەمان، رێگەیەکی هەڵەیە و هاو ئاهەنگ نىیە لەگەڵ ئەو شێوازەی کوڕەکەمانی پێ دەبینین. چونکە کاتێك کە ئێمە بەوپەڕی راستگۆییەوە قوڵترین هەستی خۆمان تاقیکردەوە، بۆمان دەرکەوت کە لە چاوی ئێمەدا کوڕەکەمان بێ کەڵکە و بە جۆرێك لە جۆرەکان لە هاوڕێکانی دواکەوتوە. ئێمە لە یارمەتیدانی کوڕەکەماندا هەرچییەکمان کردووە گرنگ نىیە، چونکە شکستمان هێنا و ئەو شکستەکەش ئەنجامێکی ئاساییە چونکە ئێمە ئەو پەیامە هەڵەیەمان پێ دابوو کە "تۆ بێ توانایت. لەبەر ئەوە پێویستە بپارێزرێیت."

بۆمان دەرکەوت کە ئەگەر بمانەوێت بارودۆخەکە بگۆڕین، پێویستە یەکەمجار گۆڕانکاری لە خۆماندا بکەین. جا بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی کارا گۆڕان لە خۆماندا دروست بکەین، پێویستە یەکەمجار چەمکەکانمان بگۆڕین.

## خەسڵەتە ڕەوشتییە خودی و ئایدیاییەکان

هاوکات لەگەڵ ئەو کارەدا، من سەرەڕای لێکۆڵینەوە لە بواری هەستکردندا، بە گەرمی سەرقاڵی لێکۆڵینەوەیەکی قوڵ بووم دەربارەی هەموو ئەو نوسراوانەی لەمەڕ

سەرکەوتن نوسراون و لە ساڵی ١٧٧٦ەوە لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا بڵاوکراونەتەوە. بە کردەوە سەدان کتێب و وتار و نوسراوم لە بوارەکانی گەشە بە خۆدان، دەروناسی جەماوەری و خۆ یارمەتیداندا خوێندەوە یان هیچ نەبێت چاوم پیا خشاندن. کرۆکی هەموو ئەو کتێب و نوسینانە بریتی بوو لەو شتانەی کە خەڵکی ئازاد و دیموکرات بە مەرجی ژیانێکی سەرکەوتوی دەزانن.

کاتێك کە لێکۆڵینەکە منی گێڕایەوە بۆ ٢٠٠ ساڵ نوسین دەربارەی سەرکەوتن، تێبینی شێوازێکی سەرسوڕهێنەرم کرد کە لەناو ئەو نوسینانەدا بە ئاشکرا خۆی دەردەخست. ئازاری تایبەتی خۆم و ئازاری ئەو کەسانەی دیکە کە پەیوەندیم لەگەڵیاندا هەبوو، زیاتر هەستی ئەوەیان لا دروست کردم کە سەرکەوتنەکانی ٥٠ ساڵی رابردوو زیاتر سەرکەوتنی رووکەش بوون. پڕ بوون لە هوشیاری دەربارەی وێنەی کۆمەڵایەتی، تەکنیك و چارەسەری خێرا — وەك پلاستەر و حەبی ئەسپرین بۆ چارەسەرکردنی کێشە خێراکان کە هەندێك جار وا دەهاتە بەرچاو کە مەسەلەکەی بەشێوەیەکی کاتی چارەسەر کردبێت - بەڵام کێشە درێژخایەنەکەی پشتییەوە بەبێ دەستکاری دەمایەوە بۆ ئەوەی بۆگەن بکات و جارێکی دیکە دەربکەوێتەوە.

بە پێچەوانەوە، زوربەی هەرە زۆری سەرکەوتنەکانی ١٥٠ ساڵی یەکەم ئەنجامی بابەتێکن کە دەکرێت ناوی بنێین خەسڵەتە رەوشتییەکان - کە خەسڵەتەکانی وەك راستگۆیی، بێ فیزی، سەرڕاستی، میانەڕەوی، ئازایەتی، دادپەروەری، خۆڕاگری، مکوڕی، سەبر، سادەیی و بەشێکن لێی -ژیناننامەکەی بینیامین فرانکلین نمونەیەکی بەرچاوی ئەم جۆرە نوسینانەیە کە لە راستیدا، چیرۆکی ژیانی پیاوێکە رەنجێکی نائاسایی کێشاوە بۆ تێکەڵکردنی ئەو سەرەتا و بنەمایانە لە سروشتی خۆیدا.

خەسڵەتە ڕەوشتییەکان ئەوەمان تێ دەگەیەنن کە ژیانی سەرکەوتوو پێویستی بە چەند بنەمایەکی (پرنسیپێکی) بنەڕەتی هەیە. هەروەها ئەوەشمان بۆ روون دەکەنەوە کە مرۆڤ هەرگیز هەست بە سەرکەوتن و شادی بەردەوام ناکات ئەگەر لەم بنەما سەرەکییانە حاڵی نەبێت و لە ناخی خۆیدا نەیانچەسپێنێت.

بەڵام پاش تەواو بوونی یەکەمین جەنگی جیهانی بە ماوەیەکی کەم، هۆکاری سەرکەوتن لە ئاکاری سروشتییەوە گۆڕا بۆ جۆرە هۆکارێك کە دەتوانین ناوی ئاکارە

وەرگیراوەکانی لێ بنێین. لەو قۆناغەدا سەرکەوتن وایلێهات کە زیاتر وەك چالاکی کەسەکە و کۆمەڵگا و ڕەفتار و هەڵسوکەوت و شارەزایی و توانای تەکنیکی تەماشا بکرێت بەو پێیەی کە ئەمانە ڕەفتاری مرۆڤ گەشەسەندووتر دەکەن. ئەم ئاکارە وەرگیراوانە بە شێوەیەکی سەرەکی دوو ڕێگەیان گرتبووە بەر: یەکێکیان بریتی بوو لە تەکنیکەکانی پەیوەندی لەگەڵ تاك و کۆمەڵدا، ئەوی دیکەیشیان بریتی بوو لە دیدی ئەرێنی بۆ شتەکان (POSITIVE MENTAL ATTITUDE - PMA). بەشێکی ئەم فەلسەفەیە لەو گوتارە گونجاو و هاندەرانەدا خۆی نمایش دەکات کە ئەمانەی خوارەوە چەند نمونەیەکیانن: "هەڵوێستت چۆن بێت پێگەکەت وا دەبێت"، "زەردەخەنە لە خێسە زیاتر هاوڕێت بۆ پەیدا دەکات" و "هەرچییەك مێشکی مرۆڤ وێنای بکات و بڕوای پێ بکات، دەتوانێت بیهێنێتە دی."

بەشەکانی دیکەی ئەم ڕێگەیە بریتین لە دەستکاریکردنی خەڵکی و تەنانەت خەڵەتاندنیشیان. هانی خەڵك دەدەن تەکنیکی ئەوتۆ بەکاربهێنن لای خەڵك خۆشەویست ببن، یان بەدرۆوە خۆیان وا دەربخەن لەگەڵ خەڵکەکەدا ئارەزوی هاوبەشیان هەیە بۆ ئەوەی بە ئامانجی تایبەتی خۆیان بگەن، یاخود هێزی خۆیان دەربخەن و ئەوانی دیکە بترسێنن.

هەندێك لەو نوسراوانەی باسم کردن ئەوە دەسەلمێنن بەشێك لە هۆکارەکانی سەرکەوتن پەیوەستن بە سروشتی مرۆڤەوە، بەڵام ویستویانە ئەو ڕۆڵە بچوك بکەنەوە نەك وەك بنەڕەت و هۆکاری سەرەکی دەری بخەن. خەسڵەتە ڕەوشتییەکان کران بە هۆکارێکی لاوازی سەرکەوتن. ئاراستە سەرەکییەکەش رووی کردە تەکنیکەکانی چارەسەری خێرا، ستراتیجەکانی هێز، تواناکانی پەیوەندیکردن و هەڵوێستی ئەرێنی.

بۆم دەرکەوت من و ساندرا بێ ئەوەی بە خۆمان بزانین لە هەوڵی چارەسەری کێشەی کوڕەکەماندا ئەم ئاکارە وەرگیراوانەمان بەکارهێناوە. هەتا زیاتر بیرم لە جیاوازییەکانی نێوان ئاکارە وەرگیراوەکان و ئاکارە سروشتییەکاندا بکردایەتەوە، زیاتر بۆم دەر دەکەوت کە ساندرا و من زۆر لە هەڵسوکەوتە باشەکانی ئەم کوڕە دوور کەوتوینەتەوە و لە چاوی ئێمەوە کوڕەکەمان هەرگیز نابێت بە هیچ. ئێمە وەك دایك و باوکێکی خەمخۆر بەجۆرێك کوڕەکەمان دەبینی کە جیاواز بوو لە

وێنەی راستەقینەی خۆی و رەنگە ئەمەش کاریگەرییەکی خراپی هەبووبێت. ئێمە ئەوەندەی کێشەکە و چۆنێتی چارەسەرکردنیمان بەلاوە گرنگ بوو، ئەوەندە خەمی چاودێریکردنی کوڕەکەمان نەبوو.

دواتر کاتێ لەگەڵ ساندرادا کەوتینە قسە، بەداخەوە بۆمان دەرکەوت کەسێتی و بیروبۆچوونی خۆمان کاری خراپیان کردۆتە سەر چۆنێتی تێڕوانینی کوڕەکەمان. بۆمان دەرکەوت کە زەفکردنەوەی بەراوردکارییە کۆمەڵایەتییەکان هاوئاهەنگ نەبوون لەگەڵ بنەما سەرەکییەکانی خۆمان و ئەمەش مانای وایە کوڕەکەمان بە مەرجەوە خۆش بوێت و دیارە هەر منالێکیش هەست بکات دایك و باوکی مەرجیان هەیە بۆ خۆشویستنی ئەوا خۆی بە کەسێکی کەمنرخ دێتە بەرچاو.

بیرکردنەوە و دوعا و نزای زۆر، دواجار بە فریامان کەوت و توانیمان کوڕەکەمان بەو شێوە تایبەتەی خۆی ببینین. هەندێك خەسڵەت و توانای شاراوەمان تێدا بینی کە دڵنیا بوین دەتوانن یارمەتیدەری بن. بۆیە بڕیارماندا بە خۆشحاڵییەوە رێگای بۆ چۆڵ بکەین و بوار بدەین کەسایەتییەکەی بە شێوەیەکی سروشتی دەربکەوێت. تێگەیشتین کە رۆڵی سروشتی ئێمە بریتییە لەوەی پشتی بگرین، دڵخۆشی بکەین و رێزی لێ بگرین و بڕوامان پێی هەبێت. بۆیە بە وشیارییەوە کارمان لەسەر هاندەرەکانی خۆمان کرد، بە جۆرێکی وا کە ئێمەی دایك و باوك لەبەر ئەوە رۆڵەکانمان خۆش ناوێت کە هەڵسوکەوتیانمان بەدڵە.

کاتێك کە سەبارەت بە کوڕەکەمان ئەو تێگەیشتنە کۆنەمان واز لێ هێنا و پەرەمان بە چەند هاندەرێك دا لەسەر بنەمای ئەو شتانەی لەلامان بەنرخن، هەستە تازەکانمان وردە وردە دەرکەوتن. ئیتر وەکو جاران هەر خەریکی رەخنەلێگرتن و بەراوردکردنی کوڕەکەمان نەبوین، بەڵکو بەڕاستی پێی دڵخۆش دەبوین. وازمان لەوە هێنا کە کەسایەتییەکی دیکەی بەسەردا بسەپێنین و لەگەڵ خەڵکی دیکەدا بەراوردی بکەین و بەزۆر و بەساقە و بەقوربان بیخەینە چوارچێوەیەکەوە کە گوایە کۆمەڵگا پەسەندی دەکات. ئیتر کوڕەکەمان لەبەرچاومان بوو بە کەسێکی ئاسایی و گونجاوی وا کە بتوانێت بەرگەی ژیان بگرێت و پێویستی بەوە نەبێت ئێمە بیپارێزین لە گاڵتە و توانجی خەڵکی.

ئێمە چونکە فێرمانکردبوو بیپارێزین، کاتێك کە وازمان لێ هێنا، ئەو تا ماوەیەك هەستی بە ناڕەحەتی دەکرد و هەستەکەشی لە ئێمە نەدەشاردەوە. بەڵام ئێمە بەقسەیمان نەکرد و بە ناڕاستەوخۆ پەیامی ئەوەمان پێ ڕاگەیاند کە تۆ مرۆڤێکی تەواویت و پێویستت بە پاراستن نییە.

بە تێپەڕبوونی کات وردە وردە متمانەی بەخۆی پەیدا کردەوە. بە خێرایی و ڕێگەی تایبەتی خۆیشی گەشەی کرد و بووە مرۆڤێکی دیکە. لە ڕوانگەی کۆمەڵگاوە کەسایەتییەکی بەرچاوی پەیدا کرد، هەم لە ڕووی خوێندن و کۆمەڵایەتییەوە و هەم لە ڕووی جەستەییشەوە. گەشەکردنەکەی خێراتر بوو لە گەشەکردنی سروشتی. دوای چەند ساڵێك، گەلێك جار هەڵبژێردرا بۆ سەرۆکایەتی کردنی کۆمەڵە جیاجیاکانی خوێندکاران و بەشداریشی کرد لەو پێشبڕکێ وەرزشییانەدا کە لەسەرتاپای وڵاتدا بەڕێوە دەچوون و نمرەکانیشی هەمیشە باڵا بوون. کەسێتییەکی ڕاستگۆ و خۆشەویست و سەرنجڕاکێشی وای پەیدا کرد کە هەموو کەس ئارەزوو بکات ببێتە هاوڕێی.

ئێستا من و ساندرا باوەڕمان وایە سەرکەوتنە بەرچاوەکانی کوڕەکەمان لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە دەرەنجامی ئەو هەستەیە کە خۆی دەربارەی خۆی هەیبوو، نەك کاردانەوەیەك بێت بۆ ئافەرین و خەڵاتەکانی کۆمەڵگە. ئەمە بۆ من و ساندرا بووە ئەزموونێکی سەرنجڕاکێش. فێری کردین کە لەگەڵ منداڵەکانی دیکەماندا و لە بوارەکانی دیکەی ژیاندا چۆن ڕەفتار بکەین. سەرکەوتنی کوڕەکەمان ئەو جیاوازییە زۆر گرنگەی بۆ دەستنیشان کردین کە لە نێوان ئاکارە سروشتییەکان و ئاکارە وەرگیراوەکاندا هەن. سرودبێژەکەی کەنیسە زۆر بەجوانی ئەم باوەڕەی ئێمەی دەربڕیوە کە دەڵێت: "بە هەموو تواناتەوە دڵی خۆت بگەڕێ و هەرچی خەمێکی ژیان هەیە لێی دەربهێنە."

### مەزنیی سەرەکی و مەزنیی لاوەکی

ئەم ئەزموونەم لەگەڵ کوڕەکەمدا و هەروەها لێکۆڵینەوەکانی لەمەڕ هەست و هوشیاری ئەو هەموو بابەت و نوسراوانەی کە دەربارەی سەرکەوتن خوێندبومنەوە کارێکی وایان کرد گۆڕانکارییەکی گەورە بەسەر بیرکردنەوەکانمدا بێت. لەپڕ

هەموو شتەکان چوونەوە جێگەی خۆیان و دەستبەجێ دەورو تەنسیری ئاکارە وەرگیراوەکانم بۆ دەرکەوت.

ئێمە وەکو مرۆڤ هەر لە منالییەوە بە کۆمەڵێك چەمك و بابەت گۆش دەکرێین کە لە ناخماندا دەچەسپێن. ئێستا دەزانم ئەو بابەت و چەمکە چەسپیوانە تا ئەندازەیەکی بەرچاو لەگەڵ ئەو ئەزمون و رێوشوێنە کتوپڕانەدا دژ بەیەکن کە بۆ چارەسەری دەستوبردی کێشەکان دەیانگرینە بەر. ئەزمونی کارکردنم لەگەڵ خەڵکدا کە چەند ساڵێکی خایاندبو کارێکی وای کرد هۆکاری ئەوەم بۆ دەرکەوێت کە بۆچی ئەو بابەت و مەسەلانەی لە خولەکانی راهێناندا بە دەرس دەموتنەوە لەگەڵ بیروباوەڕی باوی خەڵکدا یەکناگرنەوە.

ئاکارە وەرگیراوەکان بریتین لە گەشەپێدانی کەسایەتی و مەشق و راهێنان لەسەر پەیوەندیکردن و هەروەها بابەتە پەروەردەییەکان لە بوارەکانی ستراتیجی کارتێکردن و بیکردنەوەی ئەرێنی. ئەمانە هەموویان بابەتی بەسودن و هەندێکجاریش بۆ مسۆگەر کردنی سەرکەوتن پێویستن بەڵام مەرجی یەکەم نین. رەنگە لە پلەی دووەمدا جێگایان ببێتەوە نەك لە یەکەم. ئێمەی مرۆڤ هەمیشە بیرو بۆچونەکانمان لەسەر ئەو بناغەیە بینا دەکەین کە نەوەکانی پێش خۆمان دایانڕشتوە بەڵام لە ژیانی رۆژانەماندا بەبێ ئەوەی بەخۆمان بزانین، بەجۆرێك گیرۆدەی بیرو بۆچوونی خۆمان دەبین کە ئەو بناغە پتەوەی نەوەکانی پێش خۆمان بیر نامێنێت. رەنگە هۆکارەکە ئەوەبێت کە ئێمە وا راهاتوین شتێك بچنینەوە کە نەمانڕواندبێت یان هەر ئەسڵەن بیرمان چوبێت زەوییەکە تۆو بکەین.

من ئەگەر کەسایەتییەکی ناشایستەم هەبێت و بە ریاکار و دووڕوو ناسرابم هەرگیز ناتوانم ماوەیەکی دوور و درێژ کاریگەرییم لەسەر دەوروبەر هەبێت، تەنانەت ئەگەر بە شێوەیەکی زۆر زانستییانەش ستراتیج و تاکتیکەکانی کارتێکردن بەکاربهێنم و ئامانجەکەشم ئەوە بێت کە خەڵکەکە خۆیان ماندو بکەن و گەرم و گوڕتر لەگەڵ یەکتری هەڵسوکەوت بکەن. مرۆڤێك کە دەوروبەر متمانەی پێنەکات ناتوانێت ئامانجەکەی بەدەست بهێنێت و هەرچییەك بکات وا لێك دەدرێتەوە کە مەبەستێتی خەڵکەکە بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆی بەکار بهێنێت. کەواتە نە ناوەڕۆکی وتار و پەیامەکەت گرنگە و نە پیرۆزی مەبەستەکەشت. لەوانە گرنگتر

رادەی متمانەی خەڵکە بەتۆ. ئەمە مانای وایە تەنیا چاکە بنەڕەتییەکان دەتوانن گیان بکەن بە بەری تەکنیکەکاندا.

جەختکردنەوەی رووت و قووت لەسەر تەکنیك وەکو ئەو سەعی کردنە بەپەلەیە وایە کە شەوی تاقیکردنەوە دەیکەیت. لەوانەیە خوێندکار هەندێکجار بەو جۆرە سەعی کردنە دەربچێت و بگرە نمرەی بەرزیش بهێنێت بەڵام ئەگەر رۆژانە مافی تەواو بە وانەکانت نەدەیت زەحمەتە بەباشی لێیان تێ بگەیت و هەرگیز نابیتە خاوەنی زانیارییەکی قوڵ.

بێ مانایی ئەم سەعیکردنە بەپەلەیە بە جوانی لەوەدا دەردەکەوێت کە هەمان تەکتیك لە کێڵگە کشتوکاڵییەکاندا بەکاربهێنیت. مەسەلەن بیرت بچێت لە بەهاردا تۆو بکەیت و بە درێژایی هاوین هەر خەریکی کات بەفیڕۆ دان بیت ئینجا لە پاییزدا بکەویتە پەلەپەل بۆ دروێنە کردن. سیستمی کێڵگە سیستمێکی سروشتییە. دەبێت پێشەکی نرخەکە بدەیت و هەنگاوەکانی لە کاتی خۆیاندا هەڵبنێت. پێشینان چاکیان وتوە کە دەڵێن چی بچێنیت ئەوە دەدوریتەوە. لە یاساکانی سروشتدا رێگەیەك نییە ناوی قەدبڕ بێت.

ئەم یاسایە هەڵسوکەوتی مرۆڤ و پەیوەندییەکانیشی دەگرێتەوە. ئەمانیش هەر سیستمی سروشتین و بەو یاسای دروێنەیە کار دەکەن کە باسمان کرد. لەناو سیستمێکی کۆمەڵایەتی دروستکراوی وەك خوێندنگادا مرۆڤ ئەگەر بزانێت چۆن سوود لە یاسا مرۆڤکردەکان وەربگرێت و ئەملاولای یارییەکە تێ بگات، رەنگە بتوانێت نمرەی باش بەدەست بهێنێت. بەڵام ئەمە هەر بۆ یەکجارە و بۆ مەودایەکی کورتخایەنە.

ئەگەر چوارچێوەکە گەورەتر بکەین دەتوانین بڵێین مرۆڤ دەتوانێت سود لە ئاکارە وەرگیراوەکان وەربگرێت بە مەبەستی سەرکەوتن و دابینکردنی دەوروتەئسیرێکی دیاریکراو لەسەر ئەوانی دیکە. بۆ نمونە تۆ لە رێگەی شارەزایی و هەڵسوکەوتی خۆتەوە دەتوانیت بەرامبەرەکەت وا لێ بکەیت باوەڕ بکات خۆشت دەوێت و مەبەستەکەیت لەلا جوانە. ئەمە لە بارودۆخێکی کورتخایەندا سوودی دەبێت بەڵام خەسڵەتێکی سەرەکی نییە، بەڵکو بە پلەی دووهەم دێت و لە پەیوەندییە درێژخایەنەکاندا بە تەنیابالی ناتوانن بەهایەکی بەردەوامیان هەبێت.

لەوە گرنگتر ئەوەیە راستگۆ و خاوەن کەسایەتی بەهێز بێت. کێشەکانی ژیان وا دەکەن پاڵنەرە راستەقینەکان دەربکەون و شکستی پەیوەندییەکانیش جێی سەرکەوتنە کورتخایەنەکان دەگرێتەوە.

زوربەی ئەو کەسانەی کە مەزنیی لاوەکی هەیە (بۆ نمونە کۆمەڵگا دان بە بەهرەکانیدا دەنێت) خاوەنی مەزنیی سەرەکی نین، واتە مرۆڤی چاك نین و درەنگ یان زوو لە پەیوەندییە درێژخایەنەکاندا شکست دێنن. جا ئەو پەیوەندییە لەگەڵ هاوسەر و هاوڕێ و منداڵە هەرزەکارەکانیدا بێت یاخود لە شوێنی کار و پیشەکەیدا بێت. ئەمەش ئەنجامێکی خراپی لێ دەکەوێتەوە کە پێی دەوترێت قەیرانی ناسنامە. واتە گرنگترین رۆڵ لەم بوارەدا رۆڵی خەسڵەتە سروشتیەکانە. وەك ئیمرسۆن دەڵێت (قایم مەڤیژێنە ئەگینا گوێم لە هیچ نابێت.)

دیارە بە دڵنیاییەوە حاڵەتی واش هەیە کە مرۆڤەکە خاوەنی خەسڵەتی سروشتیی بەهێزە بەڵام شارەزای دروستکردنی پەیوەندی نییە. ئەمەش بێ گومان کار دەکاتە سەر چاکیی پەیوەندییەکان بەڵام کاریگەرییەکە لاوەکییە.

بە کورتی دەتوانین بڵێین گرنگ نییە ئێمە چی دەڵێین و چی دەکەین بەڵکو گرنگ ئەوەیە کە ئێمە خۆمان چین؟ هەموومان ئەمە دەزانین و لە ژیانی هەرکەسێکماندا کەسێك هەیە جێی متمانەی تەواوی ئێمەیە چونکە سروشتەکەیان دەزانین. گرنگ نییە ئەو کەسە زمان پاراو بێت یان نا، شارەزای تەکنیکەکانی پەیوەندیکردنە یاخود هیچی لێ نازانێت. ئەو کەسە هەرچۆنێك بێت ئێمە متمانەی پێ دەکەین و بە سەرکەوتوویی کاریان لەگەڵدا دەکەین.

وەك ویلیام جۆرج جۆردن دەڵێت: (دەستی هەموو مرۆڤێك توانایەکی سەیری چاکە و خراپەی تیایە، کە نەستە بێدەنگ و کاریگەرییە نەبینراوەی ژیانێتی. بە کورتییەکەی ئەوەی گرنگە لە مرۆڤدا ئەوە نییە کە هەوڵ دەدات نیشانی بدات، بەڵکو رەنگدانەوەی ناخی راستەقینەی خۆی گرنگە.)

## هێزی پارادایمەکان

ئەم کتێبەی بەردەستت بڕێکی زۆری ئەو بنەمایانەی لەخۆ گرتووە کە چالاکییەکانی مرۆڤ دیاری دەکەن. ئەمانەش لە راستیدا خووەکانی مرۆڤ

پێکدەهێنن کە بنەڕەتی و گرنگن. بریتین لە کۆی سەرجەمی ئەو بەها راست و دروستانەی کە کامەرانی و سەرکەوتنیان لەسەر هەڵدەچنرێت. بەڵام پێش ئەوەی بتوانین بە جوانی لەم حەوت خووە تێ بگەین دەبێ بزانین پارادایم چییە و چۆن دەتوانین بیگۆڕین.

ئاکارە سروشتییەکان و ئاکارە وەرگیراوەکان نمونەی بەرجەستەی پارادایمە کۆمەڵایەتییەکانن. وشەی پارادایم لە بنەڕەتدا وشەیەکی یۆنانییە. چەمکێکی زانستییە و حاڵی حازر بە زۆری وەك هاوواتای مۆدێل و تیۆری و دید و گریمانە یان ئەوەی کە پێ دەوترێت چوارچێوەی مەرجەع (ئەو چوارچێوەیەی کە لەکاتی سەرهەڵدانی کێشەو گیروگرفتدا هانای بۆ دەبەیت) بەکاردێت. لە واتا فراوانەکەشیدا بریتییە لە جیهانبینی. واتا ئێمە چۆن دنیا دەبینین. مەبەست لە بینین نییە بە چاو، بەڵکو جیهانبینی بە واتای بیروبۆچوون و لێتێگەیشتن و شیکردنەوە.

بۆ ئەوەی ئاسانتر لە پارادایمەکان تێ بگەین، وا باشە بەراوردیان بکەین بە (نەخشە). هەمووومان دەزانین نەخشە تەینا بریتی نییە لە خودی شوێنەکە. بەڵکو روونکردنەوەی چەند لایەنێکی دیاریکراوی شوێنەکەیە. پارادایمەکانیش رێك بەو جۆرەن. بریتین لە تیۆری و رونکردنەوە، یاخود مۆدێلی شتێکی دیکە.

گریمان تۆ دەتەوێت بچیتە شوێنێکی دیاریکراو لە شیکاگۆ. ئەگەر نەخشەیەکی شەقامەکەت پێ بێت بە ئاسانی دەگەیتە شوێنی مەبەست. بەڵام ئەگەر نەخشەکە هەڵەبێت بۆ نمونە نەخشەکە لە راستیدا نەخشەی (دیترۆیت) بێت و بە هەڵەی چاپ بووبێت بە نەخشەی شیکاگۆ، ئەوا سەرت لێ دەشێوێت و نەك هەر ناگەیتە شوێنی مەبەست بەڵکو وەڕس و توڕەشت دەکات.

تۆ دەتوانیت هەڵسوکەوتت بگۆڕیت بەوەی زیاتر هەوڵ بدەیت و جددیتر و خێراتر کار بکەیت، بەڵام ئەو هەوڵانەت تەنیا هەر یەك سودیان دەبێت، خێراتر دەتگەیەننە شوێنێکی هەڵە.

دەتوانیت هەڵوێستت بگۆڕیت بۆ نمونە زیاتر ئەرێنی بیت. بەڵام هێشتا هەر ناگەیتە شوێنی مەبەستت. ئەم ئەرێنی بوونە رەنگە تەنیا وات لێ بکات کە گوێی نەدەیتێ. مرۆڤ ئەگەر زۆر ئیجابی بێت ئەوپەڕەکەی وای لێ دێت لە هەر شوێنێك بێت هەست بە دڵخۆشی بکات.

بەڵام گرنگ ئەوەیە هێشتا تۆ هەر بزریت. کێشە بنەڕەتییەکە هیچ پەیوەندی بە هەڵوێستو هەڵسوکەوتی تۆوە نییە بەڵکو ئەوەیە کە نەخشەیەکی هەڵەت بەدەستەوەیە.

تۆ ئەگەر نەخشەیەکی راست و دروستی شیکاگۆت لەبەر دەستدا بێت، رەنگە جدی بوون رۆڵێکی گرنگی هەبێت. هەروەها ئەگەر لە رێگادا تووشی کێشە و گیروگرفت هاتیت هەڵوێستی خۆت بایەخی زۆری دەبێت بەڵام لەمانە هەموو گرنگتر ئەوەیە کە نەخشەکەی دەستت نەخشەیەکی راست و دروست بێت.

مێشکی هەرکامێکمان بگریت ژمارەیەکی زۆر نەخشەی تێدایە کە بە گشتی دوو جۆرن: جۆرێکیان نەخشەی راستییەکانە و پێت دەڵێت شتەکان لە چ شوێنێکدان. جۆری دووەمیشیان نەخشەی بەهاکانە کە پێت دەڵێ شتەکان پێویستە لە کوێدا بن. ئێمە زۆر بە دەگمەن راستی و دروستی نەخشەکان دەخەینە ژێر پرسیارەوە و زوربەشمان هەر نازانین کە ئەو جۆرە نەخشەیەمان هەیە. گریمانەکە وا دادەنێین کە هەقیقەت بەو شێوەیەیە و پێویستە هەر بەو شێوەیەش بمێنێتەوە کە ئێمە دەیبینین.

هەڵسوکەوت و هەڵوێستەکانیشمان بە گشتی لەسەر ئەم گریمانانە گەشە دەکەن. هەمیشە شێوازی تێڕوانینی ئێمە جۆری بیرکردنەوە و چۆنێتی هەڵسوکەوتمان دیاری دەکات. بەڵام پێش ئەوەی زیاتر لەسەر ئەم بابەتە بدوێین، حەزدەکەم بە ئەزمونێکی سەرنجڕاکێشدا بتانبەم. تکایە چەند چرکەیەك تەماشای وێنەکەی لاپەڕەی دواتر بکە و ئینجا تەماشای وێنەی دوای ئەوە بکەو بە وردی پێمان بڵێ چی دەبینیت؟

ژنێك دەبینیت؟ تەمەنی چەندە؟ شێوەی چۆنە؟ بە بڕوای تۆ دەبێت چ کارە بێت؟

رەنگە بتەوێت بەم شێوەیە وەسفی یەکەم وێنە بکەیت: نزیکەی بیست، بیست و پێنج ساڵێك تەمەنێتی. زۆر جوانە. لەسەر مۆدێل دەڕوات. لوتێکی بچوکی هەیە و پۆشتەیە. ئەگەر ژنت نەهێنابێت لەوانەیە حەز بکەیت بیکەیتە هاوڕێ. ئەگەر بەدەست تۆ بێت رەنگە حەز بکەیت وەك مۆدێلی جل و بەرگ دایبمەزرێنیت.

ئەی ئەگەر پێت بڵێم نەخێر هەڵەیت؟ ئەگەر بڵێم ئەمە وێنەی پیرێژنێکی شەست حەفتا ساڵەی ناڕەحەتە و لووتی زلە و بۆ مۆدێلی جل و بەرگیش ناشێت، لەو جۆرە کەسانەیە کە ئەگەر لەسەر شەقام بیبینیت بە پێویستی دەزانیت دەستی بگریت و بیپەڕێنیتەوە.

من و تۆ کاممان راستین؟ جارێکی دیکە تەماشای وێنەکە بکەرەوە. ئایا دەتوانیت پیرێژنەکە ببینیت؟ ئەگەر ناتوانیت تکایە جارێکی دیکە لە وێنەکە ورد ببەرەوە. ئایا ئێستا لوتە چەماوە گەورەکەی دەبینیت؟ شاڵەکەی دەبینیت؟

من و تۆ ئەگەر روو بەڕووی یەکتری دابنیشین و باسی ئەم وێنەیە بکەین، دیارە تۆ ئەوە باس دەکەیت کە دەیبینیت و منیش ئەوە باس دەکەم کە بە چاوی خۆم دەیبینم. دەتوانین لەسەر ئەم مەسەلەیە بەردەوام بین هەتا هەموو زانیارییەکانی خۆمان دەخەینە روو.

بەڵام بەداخەوە من و تۆ ناتوانین روو بەڕوو قسە بکەین، کەواتە بچۆرە لاپەڕە (٤٩) و لەوێ لە وێنەکە ورد ببەرەوە. ئایا ئێستا پیرێژنەکە دەبینیت؟ تکایە پێش ئەوەی دەست بکەیتەوە بە خوێندنەوەی کتێبەکە هەوڵ بدە پیرێژنەکە بدۆزیتەوە.

من یەکەمین جار کە ئەم راهێنانەم بینی چەند ساڵێك لەمەوبەر بوو، لە کۆلێجی بازرگانی هارڤارد. وانەبێژەکە ئەم وێنەیەی بۆ ئەوە بەکار دەهێنا تا بۆمانی بسەلمێنێت کە دەکرێت دوو کەس لەسەر یەك بابەت دوو بۆچوونی جیاوازیان هەبێت و هەردوکیشیان لەسەر هەق بن. ئەمە شتێکی ئەقلانی نیە، بەڵام لە رووی دەروونییەوە راستە.

وانەبێژەکە کۆمەڵێك کارتی گەورەی هێنایە ژوورێ، نیوەیان وێنەی ژنە گەنجەکەی لاپەڕە (٤٨)ی لەسەر بوو، نیوەکەی دیکە وێنەی پیرێژنەکەی لاپەڕە (٧٤). هەموو کارتەکانی بەسەر بەشدارانی خولەکەدا دابەش کرد. وێنەی ژنە گەنجەکەی بەسەر لایەکی پۆلەکەدا و وێنەی پیرێژنەکەش بەسەر لاکەی دیکەدا. داوای لێکردین تەماشای کارتەکان بکەین و ماوەی ١٠ چرکە لێی ورد بینەوە. ئینجا هات لەسەر شاشەکە ئەو وێنەیەی نیشان داین کە لە لاپەڕە (٤٩)ی ئەم کتێبەدایە و هەردوو وێنەکە لەخۆ دەگرێت. دوای دە چرکەکە مامۆستا داوای لێ کردین بۆی باس بکەین

چی دەبینین. زوربەی زۆری ئەو بەشدارانەی کە کارتی ژنە گەنجەکەیان بینیبوو وتیان وێنەی ژنێکی گەنج دەبینین. زوربەی زۆری ئەوانەش کە کارتی ژنە پیرەکەیان بینیبوو وتیان پیرێژنێك دەبینین.

پاشان مامۆستاکە بەشدارێکی هەڵساند و داوایلێکرد ئەوە بۆ بەشدارێکی بەشەکەی دیکەی پۆلەکە باس بکات کە بینیوێتی. لە ئەنجامدا مشتومڕ دروست بوو. ئەم مشتومڕە کێشەکانی خراپ لێکحاڵیبوونی بەجوانی دەرخست.

"ئەوە دەڵێی چی؟ پیرێژنی چی؟ تەمەنی لە بیست و بیست و دوو ساڵ زیاتر نی‌یە"

"چی‌یە را ئەبوێری؟ ئەگەر هەشتا ساڵ نەبێ حەفتای رێکە"

"چیتە، چاوت باش نابینێت؟ ئەمە ژنێکی گەنجی زۆر جوانە. حەز دەکەم بیکەمە هاوڕێ"

"بەو پیرێژنە سەرئاسنینە دەڵێی جوانە؟"

مشتومڕەکە درێژەی کێشا و هەریەکەشیان بەوپەڕی کەللەڕەقییەوە لەسەر قسەکەی خۆی سوور بوو. سەیرەکە لەوەدایە کە زوربەی زۆرمان هەر لە سەرەتاوە دەمانزانی کە وێنەکە دووڕوویەکی دیکەیشی هەیە. کەچی ددانمان پیادا نەدەنا. دوای مشتومڕێکی بێ سوود یەکێك لە بەشداربووان چووە بەردەمی شاشەکە و ئاماژەی بۆ هێڵێکی ناو وێنەکە کرد. وتی: "ئەمە ملوانکەی ملی ژنە گەنجەکەیە" ئەوی دیکە وتی: "نەخێر ئەوە دەمی پیرێژنەکەیە" قسەکردن لەسەر خاڵە ناکۆکەکانی نێوانیان بەردەوام بوو دواجار یەکێك لە بەشداربووان کتوپڕ ئەو وێنەیەی بینی کە ئەوی دیکە باسی دەکات و دووهەمیشیان بە هەمان شێوە ئەو وێنەیەی بینی کە بەشداربووی یەکەم باسی دەکات. لە ئەنجامیشدا ئێمە توانیمان هەردوو وێنەکە ببینین. بەڵام دوای ئەوەی کە چاومان لەسەر وێنەکە لابرد و جارێکی دیکە تەماشامان کردەوە، هەمان ئەو وێنەیەمان بینییەوە کە لە یەکەمین دە چرکەی سەرەتادا بینیبومان.

من لەگەڵ خەڵك و دامەزراوەکاندا زۆرجار ئەم وێنەیە بەکاردەهێنم چونکە مانایەکی زۆر قوڵی تیایە دەربارەی خەڵك و پەیوەندییەکانیان. پێش هەموو شتێك دەورو تەئسیری فێر بوونی مەرجدار نیشان دەدات لەسەر بیروبۆچوونی ئێمە و لەسەر جیهانبینیمان (فێربوونی مەرجدار بریتی‌یە لەو تیۆرییەی کە زانای بەناوبانگ پاڤلۆڤ باسی دەکات لەسەر پرۆسەی فێربوون و لەم رووەوە سەگەکەی پاڤلۆڤ زۆر بەناوبانگە). ئەگەر تەنیا دە چرکە هێندە دەورو تەئسیری هەبێت لەسەر دید و بۆچوونمان ئەی ئاخۆ ئەو راهاتن و فێربوونە مەرجدارەی کە بە درێژایی ژیانمان بۆمان دروست بووە چ کاریگەرییەکی قوڵ و بەربلاوی دەبێت لەسەرمان. کارتێکەرەکانی ژیان و خێزان و قوتابخانە و مزگەوت و کەنیسە و شوێنی کار و خزم و هاوڕێیان و ئەو پارادایمە کۆمەڵایەتییانەی ئێستا و هەروەها ئاکارە وەرگیراوەکان هەموویان پێکەوە بە شێوەیەکی هەست پێنەکراو و بە بێدەنگی کارمان لەسەر دەکەن. بۆمان دیاریدەکەن کە چۆن پارادایمەکان و نەخشەکانمان و مەرجەکانمان دابڕێژین.

هەروەها ئەوەش دەردەخات کە ئەم پارادیمانە هەڵسوکەوت و هەڵوێستی ئێمەن. بەبێ ئەوان ناتوانین هەنگاوێك بنێین. بە کورتییەکەی مرۆڤی راستگۆ ناتوانێت بە

پێچەوانەی قەناعەتی خۆیەوە قسە بکات. بۆ نمونە تۆ ئەگەر لەو ڕێژە زۆرەی خەڵکەکە بیت کە لە وێنەکەدا وێنەی ژنێکی گەنج دەبینن، ئیتر زۆر بەلاتەوە زەحمەت دەبێت بیر لەوە بکەیتەوە لەسەر شەقام دەستی بگریت و بیپەڕێنیتەوە. واتە، بۆچوونت دەربارەی ژنەکە و هەڵسوکەوتت لەگەڵیا پێویستە هاوئاهەنگ بێت لەگەڵ ئەوەدا کە چۆنی دەبینیت.

ئەمە یەکێکە لە خاڵە لاوازەکانی ئاکارە وەرگیراوەکان. ئەگەر بمانەوێت هەر بە ڕواڵەت هەڵوێست و ڕەفتارمان بگۆڕین ئەوا زەحمەتە لە ماوەیەکی دووردا سوودی لێ ببینین، ئەگەر لەو پارادیمانە ورد نەبینەوە کە سەرچاوەی ئەو هەڵوێست و ڕەفتارانەن.

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە پارادایمەکانمان ڕۆڵێکی گەورە دەگێڕن لە دیاریکردنی هەڵسوکەوتمانددا. وەك چۆن ئێمە بڕوامان بە دید و بۆچوونی خۆمان هەیە دەبێ دید و بۆچوونی خەڵکیش بەڕێز بن لەلامان چونکە ئەوانیش بەهەمان ئەندازە باوەڕیان بەو بیروبۆچوونەی خۆیانە. لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت ئەو قسەیە زۆر ڕاستە کە دەڵێت لە کوێ دانیشتبیت هەر لەوێوە دەتوانیت هەستیتە سەر پێ.

ئێمە لە ناخی خۆماندا وا هەست دەکەین بابەتیانە شتەکان دەبینین بەڵام لە ڕاستیدا وا نییە. ئێمە جیهان وەك خۆی نابینین بەڵکو لە چاوی خۆمانەوە دەیبینین و بەو شێوەیە تێی دەگەین کە ڕاهاتوین و بە پرۆسەی فێربوونی مەرجدار لێی حاڵی دەبین. هەر کاتێك دەم بکەینەوە بۆ باسکردنی بابەتێك لە ڕاستیدا باسی خۆمان دەکەین، باسی دید و پارادایمەکانمان دەکەین. ئەگەر کەسێکیش دید و بۆچوونی جیاوازی هەبێت ئێمە بە کەسێکی هەڵەی حساب دەکەین. بەڵام وەك نمونەی وێنەکە بۆی دەرخستین خەڵکانی ڕاستگۆ و باوەڕپێکراو بیروبۆچوونیان لەسەر هیچ بابەتێك مەرج نییە چوونیەك بن. هەریەکە و لە هاوێنە تایبەتەکەی ئەزمونی خۆیەوە شتەکان دەبینێت. بەڵام ئەمە مانای وا نیە شتێك نیە ناوی هەقیقەت بێت. لە لێکدانەوەی وێنەکەدا باسی دوو کەسمان کرد کە هەر یەکەیان پێشتر مێشکیان بە بۆچوونی جیاجیا دەربارەی وێنەکە پڕ کرابوو. کاتێکیش پێکەوە تەماشای وێنەی سێیەم دەکەن هەردوکیان هێڵی ڕەش و بۆشایی

سپی دەبینن. ئەمە هەقیقەتەکەیە. بەڵام هەر یەکەو لێکدانەوەیەکی تایبەتی بۆ ئەو هەقیقەتە هەیە. لێکدانەوەکەش تایبەتە بە ئەزمونی پێشتری خۆیانەوە. بەبێ ئەو جۆرە شیکردنەوەیە هەقیقەت هیچ مانایەکی دیکەی نییە.

ئێمە هەتا زیاتر ئاگاداری پارادایم و نەخشە و گریمانەکان بین و دەورو تەئسیری ئەزمونەکانیشمان بە هەند وەربگرین کە لەسەر بیرکردنەوە و لێکدانەوەمان هەیانە، زیاتر دەتوانین جڵەوی پارادایمەکانمان بگرینە دەست، لێیان ورد بینەوە و بەرامبەر بە هەقیقەتەکان تاقیان بکەینەوە و گوێ لە کەسانی دیکە بگرین و بە سنگێکی فراوانەوە لە بیر و بۆچوونیان ڕابمێنین. دیارە بەمەش دەتوانین وێنەیەکی گەورەتر و دیمەنێکی بابەتیانەتر ببینین.

## هێزی گۆڕانی پارادیم (وەرچەرخانی گەورە)

مەبەست لەو چرکەساتەیە کە ئەوی بەرامبەریشمان وێنەکە بەو شێوەیە دەبینێت کە ئێمە دەیبینین. ئەمە چرکەساتێکی سەرسوڕهێنەرە و گۆڕانێکی چۆنایەتییە (نەوعی) لە بیرو بۆچوندا. وەك ئەوە وایە لەپڕ گڵۆپێك دابگیرسێنیت. ئەم چەمکە یەکەمجار تۆماس کۆهن هێنایە گۆڕێ و لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا بەکاری هێناوە کە ناوی لێ ناوە (پێکهاتەی شۆڕشە زانستییەکان). پوختەی کتێبەکە باسی ئەوە دەکات کە هەموو داهێنانە گرنگەکانی زانست لە سەرەتادا پێچەوانەی ئەقڵی باو و شێوازی بیرکردنەوە و پارادایمەکانی پێشتر بوون.

بەتلیمۆسی گەردونناسی میسری پێی وابوو کە زەوی ناوەندی گەردونە. کاتێك (کۆپەرنیکۆس) ئەو پارادایمەی گۆڕی و خۆری بە ناوەندی گەردون ناوزەد کرد رووبەڕووی بەرگرییەکی زۆر و تەنانەت دادگاییکردنیش بووەوە. بەڵام لەپڕ هەموو شتەکان لێکدانەوەی تازەیان بۆ کرا.

مۆدێلە فیزیاییەکەی نیوتن بریتی بوو لە پارادایمێکی ڕێك و پێك و تا ئێستاش بناغەی ئەندازەی هاوچەرخە. بەڵام تەنیا هەر بەشێکە و بەشێکی ناکاملێشە. جیهانی زانست شۆڕشێکی بەخۆوە بینی کە بریتی بوو لە پارادایمەکەی ئەنیشتاین، پارادایمی ڕێژەیی کە لە رووی پێشبینی و شیکردنەوەوە زۆر لەوەی نیوتن پێشکەوتوتر و بەهادارترە.

تا ئەو کاتەی بیردۆزی میکرۆب گەشەی باشی نەکردبوو ڕێژەیەکی زۆری ژنان و منالان بەسەر سکەکەوە دەمردن، کەسیش نەیدەزانی بۆچی. لە مەیدانەکانی جەنگدا ئەوانەی کە دواتر بەهۆی نەخۆشی و برینی بچوکەوە دەمردن، ژمارەیان زۆر لەوانە زیاتر بوو کە بە برینی گەورە و لە بەرەکانی پێشەوەی شەڕدا دەکوژران. بەلام هەر کە بیردۆزی میکرۆب راگەیەنرا، پارادایمێکی سەرومڕ تازەی پێشکەوتووتر و کاملتر هاتە ئاراوە و بووە هەوێنی گەشە و پێشکەوتنی گرنگ و دراماتیکی لە بواری پزیشکیدا.

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمڕۆش بەرهەمی وەرچەرخانی گەورەی پارادایمە. پێشتر شێوازە تەقلیدییەکەی حوکمڕانی بریتی بوو لە سیستمی پاشایەتی کە مافی پیرۆزی پاشاکانی بەرجەستە دەکرد. بەلام لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا پارادایمێکی نوێ دەرکەوت، حکومەتی خەلك، لە خەلکەوە بۆ خەلك. دیموکراسییەکی دەستوریی وا لەدایك بوو کە هێزی کاری ئازاد کرد و دەرگای بە رووی داهێنانە بێ کۆتاکانی مرۆڤدا کردەوە. پارادایمە تازەکە ئاستێکی وای بۆ ژیان و ئازادی و هیوا و رەهایی راگەیاند کە لە مێژوودا بێ هاوتا بوو.

مەرج نییە هەموو وەرچەرخانێکی پارادایم وەرچەرخانێکی باش بێت. چونکە وەك بینیمان گۆڕان لە ئاکارە سروشتییەکانەوە بۆ ئاکارە وەرگیراوەکان بوونە مایەی دوور کەوتنەوە لە ریشەکانی سەرکەوتن و کامەرانی.

بەلام بەهەرحال وەرچەرخانەکە باش بێت یان خراپ بێت. هێواش و لەسەرخۆ بێت یان کتوپڕ و چاوەڕواننەکراو، ئەنجامەکە هەر یەك شتە. گۆڕینی جیهانبینیمانە لە شێوەیەکەوە بۆ شێوەیەکی دیکە. وەك پێشتریش باسمان کرد پارادیمەکان هەرچۆنێك بن باش بن یان خراپ سەرچاوەی هەلوێست و رەفتارەکانمانن و دواجاریش دەبنە سەرچاوەی پەیوەندییەکانمان لەگەل دەوروبەردا.

زۆر باشم لەبیرە بەیانییەکی رۆژی یەکشەممە بوو لە مێترۆکەی شاری نیویۆرك گۆڕانێکی بچوکی پارادایمم ئەزمونکرد. خەلکەکە بە بێدەنگی دانیشتبوون. هەندێکیان رۆژنامەیان دەخوێندەوە و هەندێکیان دالغەیان لێ دابوو هەندێکی دیکەیشیان چاویان نوقاندبوو. دیمەنێکی ئارام و بێدەنگ بوو.

لەپڕ پیاوێک و کۆمەڵێ منالّی هاروهاج سەرکەوتن. منالّەکان هێندە هاروهاج و قاوقیژکەر بوون کە دەستبەجێ دۆخەکەیان گۆڕی.

پیاوەکە لە تەنیشت منەوە دانیشت و یەکسەر چاوی نوقاند بەحساب بۆ ئەوەی بخەوێت وا دەردەکەوت کە گوێ نەداتە هاروهاجی منالّەکانی و بارودۆخەکەی بەلاوە گرنگ نەبێت. منالّەکان جێیان بە خۆیان نەدەگرت و شتیان دەهاویشت و پەلاماری رۆژنامەی خەلّکەکانیان دەدا. دیمەنێکی زۆر بێزارکەر بوو، کەچی کابرای تەنیشتم مێشێکیش میوانی نەبوو.

لە حالّەتی وادا مرۆڤ بە ئاسانی خۆی بۆ راناگیرێت. پێم سەیر بوو مرۆڤ هەبێت لە ئاست ئەو منالّە هاروهاجانەیدا هێندە بێ شعور بێت. هەر من وا نەبووم، هەموو نەفەرەکانی دیکەیش بێ تاقەت بوبون. بۆیە دواجار پەتم پچڕی و رووم کردە کابراکە پێم وت: بەڕێز منالّەکانت زۆر بێزارکەرن. ناتوانیت سنورێکیان بۆ دابنێیت؟

کابرا بەم قسەیەم چاوی کردەوە و لەوە دەچوو تازە هەستی بەم بارودۆخە کردبێت. لەسەرخۆ وتی: ئۆو راست دەکەی وابزانم دەبێ شتێک بکەم. ئەوی راستی بێت تازە لە نەخۆشخانە گەڕاوینەتەوە. سەعاتێک لەمەوبەر دایکیان مرد. من سەرم لێشێواوە نازانم چی بکەم. وابزانم منالّەکانیش بۆیە وا دەکەن چونکە نازانن چۆن رەفتار لەگەڵ مردنی دایکیاندا بکەن.

وای خوایە گیان چیم بەسەر هات؟! یەکسەر پارادایمەکەم گۆڕا. شتەکانم بە شێوەیەکی دیکە بینی. جۆرە هەستێکی دیکەم لا دروست بوو. هەڵسوکەوتم گۆڕا. بێزارییەکەم نەما. دڵم پڕ بوو لە ئازارەکانی ئەو پیاوە. لە هەستی بەزەیی و هاوسۆزی. (ژنەکەت ئێستا مرد؟ ئۆو. بۆم باس کە چۆن؟ دەتوانم یارمەتیت بدەم؟) لە یەک چرکەدا هەموو شتەکان گۆڕان.

دیارە زۆر کەس کاتێک کە توشی قەیرانی گەورە دەبن و مەترسی لەسەر ژیانیان هەبێت گۆڕانی گەورە لە بیرکردنەوەیاندا روو دەدات. ئەو کاتە مەسەلە گرنگەکان ریزبەندییەکی جیاواز وەردەگرن. هەمان گۆڕانکاری لە حالّەتی دیکەیشدا روو دەدەن. بۆ نمونە کاتێک کە ئەرکێکی نوێت پێ دەسپێردرێت یان دەچیتە ژیانی هاوسەرگیرییەوە، یان دەبیتە نەنک و باپیر و .. تاد.

بێگومان ئاکارە وەرگیراوەکانیش قابیلی گۆڕانن و دەتوانین چەندین هەفتە و

مانگ و ساڵ تێپەڕێنین لەو بوارەدا. بەڵام بە هیچ جۆرێك هێندەی گۆڕینی جیهانبینی دەوروتەئسیر لەسەر هەڵوێست و ڕەفتارمان دروست ناکات.

ئێمە ئەگەر بمانەوێت گۆڕانکاری بچوکی ڕێژەیی لە ژیانماندا ئەنجام بدەین دەتوانین کار لەسەر هەڵوێست و هەڵسوکەوتەکانمان بکەین بەڵام بۆ ئەنجامدانی گۆڕانکاری گرنگ پێویستە کار لەسەر پارادایمە بنەڕەتییەکانمان بکەین.

وەك (تۆرۆ) دەڵێت (هەزار جار گەڵاکانی خراپە دەبڕن ئینجا یەکجار دەکێشن بە ڕەگەکەیدا) ئێمەش تەنیا ئەوکاتە دەتوانین پێشکەوتنی بەرچاو بەدەست بهێنین کە واز لە بڕینی گەڵاکانی هەڵوێست و ڕەفتارمان بهێنین و بکێشین بە ڕەگەکەدا، بەو پارادایمەی کە هەڵوێست و هەڵسوکەوتەکانی پێ دەژین.

## بینین و بوون

بێگومان مەرج نییە هەموو گۆڕانەکانی پارادایم کتوپڕ و خۆڕسك و خێرا بن. جیاواز لەو گۆڕانی پارادایمە کتوپڕەی کە لە میترۆکە بەسەرمدا هات، گۆڕانی من و ساندرا گۆڕانێکی هێواش و قورس و ئەنقەست بوو. ئێمە بەرامبەر کوڕەکەمان یەکەمجار ڕێگایەکمان گرتەبەر کە بریتی بوو لە بەرهەمی چەندین ساڵی فێربونی مەرجدار و راهاتن و ئەزمونی ئاکارە وەرگیراوەکان. ئێمەی باوك و دایك چی فێر بوبوین دەربارەی سەرکەوتنی خۆمان، هەوڵمان دەدا بە هەمان پێوەر کوڕەکەمان بە سەرکەوتن بگەیەنین. بەڵام بۆمان دەرکەوت کە ئەو کارە هەڵەیە و تا پارادایمە بنەڕەتییەکانمان نەگۆڕی، نە گۆڕانکاری بنەڕەتی گەورە لە خۆماندا بەدی هات و نە لە بارودۆخەکەشدا.

ئێمە بۆ ئەوەی کوڕەکەمان بە شێوەیەکی جیاواز ببینین پێویستی دەکرد خۆمان، من و ساندرا، جیاواز بین لە جاران. لەبەر ئەوە و بە مەبەستی گەشە پێدانی کەسێتی خۆمان کۆمەڵێك پارادایمی تازەمان دروستکرد.

وەك پێشتر باسمان کرد پارادایمەکان بریتین لە کەرەسەکانی جیهانبینی وەك دید و بۆچوون و تێگەیشتن و لێکدانەوە و .. تاد. دیارە ئەمانەش هیچیان لە کەسێتی مرۆڤەکە جیا ناکرێنەوە. بوونی هەرشتێك راستەوخۆ پەیوەستە بە چۆنێتی بینینیەوە لە ڕەهەندەکانی مرۆڤدا (بەوەی چۆن شتەکان دەبینین). ئەوەی دەیبینین

پەیوەندییەکی بەهێزی بە بوونی ئێمەوە هەیە. ئێمە هەرگیز ناتوانین وەرچەرخانی گەورە لە دید و بۆچوونماندا بکەین ئەگەر پێشتر خودی خۆمانمان نەگۆڕیبێت. ئەم یاسایە پێچەوانەکەشی راستە.

تەنانەت ئەو وەرچەخانەی لە پارادایمی خۆمدا ئەزمونمکرد لە میترۆکەی ئەو بەیانییەدا، لە ناوەڕۆکدا پەیوەست بوو بە خەسڵەتە بنەڕەتییەکانی کەسێتی خۆمەوە و رەنگە ئەگەر کەسێکی دیکە لە جیاتی من بوایە وەرچەرخانەکە تیایدا رووی نەدایە.

مەبەستمە بڵێم سەبارەت بە رووداوی ناو میترۆکە هەرکەسێکی دیکە لەبری من لەوێ بوایە، رێك وەکو من پارادایمەکەی نەدەگۆڕا و لەدوای بیستنی هەواڵەکە جگە لە هەستێکی تاڵی پەشیمانی و خۆ بەتاوانبار زانین هیچی دیکەی لەلا دروست نەدەبوو. بەڵام بێگومان دڵنیام کەسانی دیکەیش هەن کە لە من زیاتر هەستیارن و ئەگەر لەوێ بونایە دەیانزانی بێدەنگ بوونی باوکەکە دەرهەق بە هاروهاجی مناڵەکانی هۆکارێکی شاردراوەی هەیە بۆیە هیچ ناڕەزایەتییەکیان دەرنەدەبڕی.

پارادایمەکان بەهێزن چونکە ئەو هاوێنەیە دروست دەکەن کە دنیای پێ دەبینین. ئەو هێزەی کە لە گۆڕانی پارادایمەکانەوە دروست دەبێت هەوێنی سەرەکییە بۆ هەر گۆڕانێکی بنەڕەتی، چ گۆڕانی خێرا و چاوەڕواننەکراو یاخود هێواش و بە ئەنقەست.

## ئەو پارادیمەی کە لەسەر بناغەی پرنسیپەکان دروستکراوە ( پارادیمی مەبدەئی )

ئاکارە سروشتییەکان لەسەر ئەو بیرە بنەڕەتییە بەندن کە هەندێك پرنسیپ هەن چالاکییەکانی مرۆڤ دیاری دەکەن-بریتین لەو یاسا سروشتییانەی لە مرۆڤدا هەن و وەك یاسای کێش کردن لە بواری فیزیادا، ئەمانیش لە ژیانماندا راست و نەگۆڕ و واقیعین.

بیرۆکە و هەقیقەت و کاریگەری ئەم بنەمایانە لە ئەزمونێکی دیکەی گۆڕانی پارادایمدا لە نوسینەکەی (فرانك کۆك)دا دەبینرێت کە لە گۆڤاری (پرۆسیدینگ)ی پەیمانگای هێزە دەریاییەکاندا بڵاو کرایەوە.

دوو کەشتی جەنگی بەمەبەستی راهێنان ئەرکی ئەوەیان پێ سپێردرا کە لە کەش و هەوایەکی سەختدا بۆ ماوەی چەند رۆژێك مانۆڕ بکەن. من لە کەشتییەکەی پێشەوەدا بووم و لە شەودا ئەرکی چاودێریم پێ سپێردرا.

لەبەر ئەوەی ناوبەناو دنیا دەبو بە تەم، توانای بینین لاواز بوو، بۆیە کاپتنەکە لەسەر پردەکە مایەوە بۆ ئەوەی چاودێری هەموو چالاکییەکان بکات.

تۆزێك دوای تاریکبوون، چاودێرەکەی سەر باڵی کەشتییەکە وتی لە لای راستەوە روناکی هەیە.

کاپتن هاواری کرد "ئایا وەستاوە یان جوڵاو؟"

چاودێرەکە وەڵامی دایەوە "وەستاوە کاپتن" ئەمەش مانای وابوو ئەگەر هەروا بەردەوام بین، پاش ماوەیەکی کەم لەگەڵ ئەودا دەدەین بەیەکدا.

کاپتان کابرای (نیشاندەر)ی بانگ کرد و پێی وت "ئەو کەشتییە ئاگادار بکەرەوە: بلێ ئەگەر لەسەر ئەم رێڕەوە بڕۆین توشی پێکدادان دەبین، ئامۆژگاریت دەکەین بیست پلە رێرەوەکەت بگۆڕە."

ئاگادارکراینەوە کە "ئێمە ئامۆژگاری ئێوە دەکەین بیست پلە رێڕەوەکەتان بگۆڕن."

کاپتنەکە وتی" بلێ من کاپتنم، بیست پلە رێڕەوەکەت بگۆڕە."

وەڵامەکە بەم شێوەیە بوو "من دەریاوانی پلە دووم، بۆ تۆ وا باشترە بیست پلە رێڕەوەکەت بگۆڕیت."

کاپتن توڕە بووبوو. بە توڕەییەوە وتی "بلێ من کەشتی جەنگیم. رێڕەوەکەت بیست پلە بگۆڕە."

لە رووناکییەکەوە وەڵاممان پێگەیشت "من تاوەری روناکیم. رێڕەوی چی بگۆڕم؟"

ئێمە رێڕەومان گۆڕی.

گۆڕانی پارادایم بریتی‌یە لەو "ئەها"یەی دەیکەین کاتێك کە دواجار رەهەندێکی جیهان (یان بارودۆخەکە) بە شێوەیەکی جیاواز وێنا دەگەین یان تێی دەگەین. ئەو گۆڕانی پارادایمەی کە کاپتن ئەزمونی کرد -بە ئێمەشەوە کە ئەم نوسینە دەخوێنینەوە - بارودۆخەکە دەخاتە بەر روناکییەکی تەواو جیاواز. دەتوانین ئەو راستییە ببینین کە کاپتنەکە بەو تێگەیشتنە کەمەوە نەیتوانی تێی بگات - ئەمەش راستییەکی زۆر گرنگە بۆ ژیانی رۆژانەمان، وەك چۆن بۆ کاپتنی ناو تەمومژەکە گرنگ بوو.

بنەماکان وەك تاوەرەکانی روناکی وان. بریتین لە یاسای سروشتی کە ناتوانین پێشێلیان بکەین. وەك چۆن سیسیل بی. دیمیل دەربارەی بیروباوەڕەکان لە فیلمە

بەناوبانگەکەیدا بەناوی "دە فەرمانەکە"دا دەڵێت "مەحاڵە بتوانین یاسا بشکێنین. تەنیا دەتوانین خۆمان لە بەرامبەر یاسادا بشکێنین."

لە کاتێکدا کە رەنگە مرۆڤەکان ژیان و هەڵسوکەوتی خۆیان لە رووی ئەو پارادایم و نەخشانەوە ببینن کە بەهۆی ئەزمون و بارودۆخەکانەوە دروست بوون، ئەم نەخشانە خودی هەرێمەکە نین. ئەمانە بریتین لە "هەقیقەتە خودییەکان"، تەنیا هەوڵێکن بۆ باسکردنی هەرێمەکە.

بەڵام "هەقیقەتە بابەتییەکە" خودی هەرێمەکەیە و "تاوەری روناکی" بیرباوەڕەکانە کە حوکمی گەشە و شادی مرۆڤ دەدەن کە بریتین لەو یاسا سروشتییانەی کە لە تان و پۆی هەموو کۆمەڵگە شارستانییەکانی مێژوودا چنراون و بناغەی هەموو خێزان و دامەزراوەیەکی سەقامگیر و پێشکەوتوو پێک دێنن. ئیتر مەسەلەی ئەوەی تا چ ئاستێك نەخشەکەی ناو مێشکمان لەگەڵ شوێنە راستەقینەکەدا هاوتایە، نابێتە هۆی گۆڕانی ئەو هەقیقەتەی لە هەرێمەکە هەیە.

هەقیقەتی ئەم بنەمایانە یان ئەم یاسا سروشتییانە بۆ هەموو ئەو کەسانە بە ئاشکرا دەردەکەوێت کە بە قوڵی بیردەکەنەوە و لە خولەکانی مێژووی کۆمەڵایەتی ورد دەبنەوە. ئەم بنەمایانە هەمو جارێك دەردەکەونەوە. مرۆڤ چۆن ئەم بیروباوەڕانە دەناسێت و هاوئاهەنگ لەگەڵیاندا دەژی رۆڵی گرنگی هەیە لەوەی مانەوە و ئارامی دەیانبات یا بەرەو لەتوپەت بوون و لەناوچوون.

ئەو بنەمایانەی کە من باسیان دەکەم هزری شاردراوەی تەمومژاوی و "دینی" نین. لەم کتێبەدا هیچ بنەمایەك ناوترێتەوە کە تاقانە بێت و تایبەت بێت بە باوەڕ و ئایینێکی دیاریکراو، بەوەی خۆشمەوە. ئەم بیروباوەڕانە بەشێکن لە هەموو دینە سەرەکییەکانی کە هەن و ماونەتەوە، هەروەها لە سیستمە ئاکاری و فەلسەفییە کۆمەڵایەتییە هەمیشەییەکان. ئەمانە خۆیان بەڵگەی خۆیانن و هەموو کەسێك بە ئاسانی دەتوانێت پشتڕاستیان بکاتەوە. وەك ئەوە وایە کە ئەم بیروباوەڕ و یاسا سروشتییانە بەشێك بن لە بوونی مرۆڤ، لە ئاگایی مرۆڤ، لە ویژدانی مرۆڤ. وا دەردەکەوێت لە هەموو مرۆڤەکاندا هەبن. بەبێ گوێدانە مەرجەکانی کۆمەڵگا و پابەندبوون پێیانەوە. هەرچەندە لەوانەیە بەهۆی هەلومەرج و ناپابەندییەوە نوقم بووبن یان خەوێنرابن.

بۆ نمونە، دەتوانم ئاماژە بکەم بۆ بنەمای دادپەروەری، کە هەموو تێگەیشتنێکمان لە یەکسانی و دادپەروەری لەوەوە سەرچاوە دەگرێت. وا دیارە مناڵە بچوکەکان بیرۆکەی دادپەروەرییان تیادا چاندرابێت سەرەڕای ئەو ئەزمونە نادادپەروەرییانەی بارودۆخەکە کە بەسەریاندا دێت. زۆر پێناسە و ڕێگەی بەدەستهێنانی جیاواز بۆ دادپەروەری هەیە، بەڵام هەرچۆنێك بێت ئاگاییەکی شێوە جیهانی دەربارەی بیرۆکەکە هەیە.

نمونەی دیکەش هەن وەك دەستپاکی و راستگۆیی. ئەمانە بناغەی متمانە دادەڕێژن کە پێکهێنەری سەرەکی هاوکاری و گەشەی کەسێتی و پەیوەندییەکانە.

یەکێکی دیکە لە نمونەکان کەرامەتی مرۆڤە. راگەیاندنەکەی سەربەخۆیی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا باس لەم بنەمایە دەکات. "ئێمە ئەم راستییانەی خوارەومان لەلا روون و ئاشکرایە: هەموو مرۆڤەکان بە یەکسانی دروستکراون و دروستکەرەکەیان چەند مافێکی پێبەخشیون کە نابێت زەوت بکرێن، بۆ نمونە مافی ژیان، ئازادی و هەوڵدان بۆ کامەرانی."

بنەمایەکی دیکەیش، بریتییە لە خزمەت، یان بیرۆکەی بەشداریکردن. یەکێکی دیکە بریتییە لە چالاکی و هەڵکەوتویی. بنەمای لەباردابوونیش هەیە، بیرۆکەی ئەوەی ئێمە مەلۆتکەین و دەتوانین گەورە ببین و گەشە بکەین و شتی زیاتر و زیاترمان لەباردا بێت، بەهرەی زیاتر و زیاترمان تیا دروست ببێت. بنەمایەکی دیکە کە زۆر پەیوەندی بە لەباردابوون هەیە ئەویش بنەمای گەشەکردنە - کە بریتییە لە پرۆسەی ڕێگە کردنەوە بۆ ئەو شتانەی لەبارماندایە و گەشەدان بە بەهرەکانمان، کە هاوکات پێویستمان بە چەند بنەمایەکی دیکە هەیە وەك خۆڕاگری، پشوودرێژی و هاندان.

بنەماکان بریتی نین لە کردار. کردار بریتییە لە چالاکی یان کردەیەکی تایبەت. ئەو کردارەی کە لە هەلومەرجێکی دیاریکراودا سەرکەوتو دەبێت، مەرج نییە لە هەلومەرجێکی دیکەدا هەمان سەرکەوتن بەدەست بهێنێت، وەك ئەو دایك و باوکانەی کە دەیانەوێت منالی دووەمیان رێك وەك منالی یەکەمیان پەروەردە بکەن، دواتر بە کردەوە بۆیان دەردەکەوێت کە ئەمە کارێکی ئەستەمە.

لە کاتێکدا کە کردارەکان پەیوەستن بە هەلومەرجەوە، بنەماکان کۆمەڵە

راستییەکی قوڵ و بنەڕەتین کە لە سەرتاپای جیهاندا دەکرێت جێبەجێ بکرێن. بنەماکان بەسەر تاکەکاندا، بەسەر هاوسەرگیریدا، بەسەر خێزاندا، بەسەر دامەزراوە هەمەچەشنە تایبەتی و گشتییەکاندا جێبەجێ دەبن. کاتێک ئەم پرنسیپانەیان لێ دروست دەکرێت، هێزی ئەوە دەدەنە خەڵك کە بتوانن چەندین چالاکیی جیاجیا ئەنجام بدەن و لەگەڵ بارودۆخە جیاجیاکاندا مامەڵە بکەن.

پرنسیپ بریتی نییە لە بەها. کۆمەڵە دزێك رەنگە چەند بەهایەکیان هەبێت، بەڵام هەندێك لەو پرنسیپە بنەڕەتییانە پێشێل دەکەن کە لەسەرەوە باسمان کردن. پرنسیپەکان بریتین لە خاکەکە (وڵاتەکە). بەهاکان نەخشەکانن. کاتێك پرنسیپە راست و دروستەکان دەنرخێنین، هەقیقەتمان دەست دەکەوێت - کە بریتییە لەوەی شتەکان وەك خۆیان بناسین.

بنەماکان بریتین لەو رێنیشاندەرانەی هەڵسوکەوتی مرۆڤ کە سەلمێنراوە خۆڕاگرن و نرخی هەمیشەییان هەیە. بنەڕەتین. ناتوانیت مشتومڕیان دەربارە بکەیت چونکە خۆیان سەلمێنەری خۆیانن. یەکێك لە رێگە سادەکان بۆ روونکردنەوەی خەسڵەتی خۆسەلمێنەریی ئەو بنەمایانە ئەوەیە بیر لەوە بکەیتەوە کە ژیانێکی باشت هەبێت کە لەسەر پێچەوانەی ئەم بنەمایانە بنیاد نرابێت. گومان دەکەم کەسێك هەبێت بە جددی وا بیربکاتەوە کە نادادپەروەری، فێڵ، سوکێتی، بێ سوودی، کەمتوانایی، یان گەندەڵی بتوانن ببنە بناغەیەکی بەهێز بۆ خۆشی و سەرکەوتنی بەردەوام. رەنگە خەڵك مشتومڕ بکەن دەربارەی چۆنێتی پێناسەکردن و دەربڕین و بەدەستهێنانی ئەم پرنسیپانە، بەڵام لە ویژدان و ئاگاییماندا چێنراوە کە ئەم پرنسیپانە هەن.

تا زیاتر نەخشەکان و پارادایمەکانمان بەسترابن بەم پرنسیپ و یاسا سروشتییانەوە، وردتر و کاراتر دەبن. نەخشە دروستەکان بێ ئەندازە کاریگەریی لەسەر کارایی کەسێتی و پەیوەندییەکانمان دروست دەکەن، زیاتر لە هەر هەوڵ و رەنجێك کە بیدەین بۆ گۆڕینی هەڵوێست و هەڵسوکەوتەکانمان.

## پرنسیپەکانی گەشەکردن و گۆڕان

باق و بریقی ئاکارە کەسێتییەکان و هێزەی ڕواڵەتییەکەی لەوەدایە کە ئامرازێکی ئاسان و خێرایە بۆ بەدەستهێنانی شێوازێکی بەرزی ژیان — دەسەڵات و سامان و پەیوەندی چاك و پتەو لەگەڵ خەڵکیدا. بێ ئەوەی بە هەنگاوە سروشتی‌یەکانی کارو گەشەکردندا تێبپەڕێیت کە پێویستن.

دیارە ئەمە تەنیا هەر قسەیەکی بەتاڵە. وەك ئەو سیحرە منالانەیە وایە کە دەڵێت "ئادەی ببە بە فلان شت" یان لەو خەیاڵە دەچێت کە لەپڕ مرۆڤ دەوڵەمەندببێت، بێ هیچ خۆماندوکردنێك. مەسەلەکە بە ڕواڵەت ڕەنگە شتێکی کردەنی بێت بەڵام لە واقیعدا وانی‌یە.

ئاکارە کەسێتییەکان کڵاوی بابردون و مرۆڤ دەخەڵەتێنن. پەیڕەوکردنی ئەم کارانە بە مەبەستی بەدەستهێنانی ئامانجە بەرز و چارەسەرە خێراکان وەك ئەوە وایە بە ڕێنمایی نەخشەیەکی شاری دیترۆیت بتەوێت بچیتە شوێنێکی دیاریکراو لە شیکاگۆ.

(ئێریك فرۆم) چاودێرێکی زرنگی ڕەگ و بەروبومەکانی ئەم ئاکارە کەسێتیانەیە و دەڵێت:

"ئێمە ئەمڕۆ مرۆڤێك دەبینین وەکو ڕۆبۆت ڕەفتار دەکات، نە خۆی دەناسێت و نە لێی تێدەگات، ئەم ڕۆبۆتە تەنیا (یەك) کەس دەناسێت کە دەبوایە ئەو کەسە خۆی بوایە. کەسێك کە لەبری قسەی چاك و بەکەڵك هەر خەریکی چەنەبازی‌یە، کەسێك کە زەردەخەنەیەکی دەستکرد شوێنی پێکەنینە ڕاستەقینەکەی گرتۆتەوە. کەسێك کە نائومێدییەکی خەمبار شوێنی بە ئازارە ڕاستەقینەکەی لێژ کردووە. سەبارەت بەم جۆرە مرۆڤە دەتوانین دوو (شت) بڵێین. یەکێکیان ئەوەیە کە ئەم مرۆڤە لەرووی خۆڕسکی و کەسێتی‌یەوە ناتەواوە و دەردەکەی دەرمانی نی‌یە دووەمیش ئەوەیە کە ئەم مرۆڤە یەکێکە لە ملیۆنانی وەکو ئێمە کە بەسەر زەویدا دێین و دەچین."

لە ژیاندا بە شێوەیەکی گشتی، چەند قۆناغێکی زنجیرەیی هەن بۆ گەشەکردن و پێشکەوتن. منال لە پێشەوە فێری تلدان دەبێت، ئینجا دانیشتن و پاشان گاگۆلکێ و ئینجا ڕۆیشتن و ڕاکردن. هەر قۆناغێك لەو قۆناغانە (گرنگە) و کاتی دەوێت و ناتوانرێت تێبپەڕێنرێت.

ئەم قسەیە بۆ هەمو قۆناغەكانی ژیانیش، بۆ تێكڕای بوارەكانی گەشەكردنیش ڕاستن. هەم بۆ ئەو كەسە ڕاستە كە دەیەوێت فێری ژەنینی ئامێرێكی مۆسیقا ببێت، هەم بۆ ئەو كارمەندەش كە دەیەوێت گفتوگۆی كاریگەر فێرببێت لەگەڵ هاوكارەكەیدا. هەم بۆ تاك تاكی كۆمەڵگا ڕاستە، هەم بۆ هاوسەرگیری و خێزان و دامودەزگاكانیش.

ئێمە هەمومان ئەم ڕاستییە دەزانین و پرنسیپی پلەبەندیمان قبوڵە لە بواری بابەتە سروشتییەكاندا، كەچی تێگەیشتنیمان بۆی زەحمەت و نامۆیە لە بوارەكانی سۆزداریی و پەیوەندییە مرۆڤایەتییەكان و تەنانەت لە بوارە تایبەتەكانی خۆشماندا. ئەگەر تێشیبگەین ئەوا قبوڵكردنی و هەڵكردن لەگەڵیدا نامۆتر و زەحمەتترە. لە ئاكامی ئەمەشدا ئێمە زۆر جار ڕێگە كورتكراو و قەدبڕەكان دەگرینە بەر، بەو هیوایەی كە بازدان بەسەر هەندێك لەو قۆناغە گرنگانەدا كات و ماندووبونێكی زۆرمان بۆ دەگێڕێتەوە و لەهەمان كاتیشدا چاوەڕوانی ئەنجامی چاك دەكەین.

بەڵام ئایا قەدبڕكردنی ئەو گەشەكردنە سروشتییە لە ڕێڕەوی ئەش‌ونماكردن و گەشەكردنماندا چ ئاكامێكی لێ دەكەوێتەوە؟ بۆ نمونە تۆ ئەگەر لە یاری تێنسدا ئاستێكی مام ناوەندیت هەبێت و بتەوێت لە ئاستێكی بەرزتردا یاری بكەیت بۆ ئەوەی هەڵوێستێكی باشترت لەبارەوە وەربگیرێت ئایا ئەنجامەكە چۆن دەكەوێتەوە؟ ئایا تەنیا هەر نیاز و بیركردنەوەی باش بەسن بۆ ئەوەی بتوانیت لە یاریزانێكی پیشەیی ببەیتەوە؟

یان چی ڕوودەدات ئەگەر شتێكی سەرەتایی لە ئامێری پیانۆ بزانیت بەڵام بچیت لە كۆنسێرتێكدا وەكو مۆسیقا ژەنێكی پیشەیی پیانۆ لێ بدەیت؟

وەڵامەكان ڕوون و ئاشكران. مەحاڵە بتوانیت پلە بەندییەكانی بواری گەشەكردن تێبپەڕێنیت یاخود فەرامۆشی بكەیت. ئەمە شتێكە دژی یاساكانی سروشت. هەوڵی قەدبڕكردن تەنیا هەر شكست و نائومێدی لێ دەكەوێتەوە.

ئێستا پێوەرێك بهێنەرە بەرچاوی خۆت لە (١٠) پلە پێكهاتبێت. تۆ ئەگەر لە ئاستی پلەی دووەمدا پۆلێن كرابیت و ئارەزومەندبیت بگەیتە پلەی پێنجەم، ئەوا پێویستە یەكەمجار بەرەو ئاستی سێیەم هەنگاو بنێیت. "گەشتی هەزار میل بە یەكەم هەنگاو دەست پێدەكات" و مرۆڤیش هەمو جارێك دەتوانێت تەنیا (یەك) هەنگاو بنێت.

تۆ ئەگەر بوار بە مامۆستاکەت نەدەیت لەڕێی پرسیار و تاقیکردنەوەوە ئاستەکەت دیاری بکات ئەوا هەرگیز نە فێر دەبیت و نە گەورە دەبیت. مرۆڤ ناتوانێت بەردەوام خۆی بە پێچەوانەی ئەو شتەوە دەربخات کە لەراستیدا وایە، چونکە دواجار راستییەکە هەر دەردەکەوێت. لە کاروانی فێربوندا یەکەم هەنگاو ئەوەیە ددان بنێیت بە نەزانییەکەی خۆماندا. ثۆرۆ Thoreau فێری کردوین کە "گەشەکردنمان پێویستی بەوەیە کە لەبیرمان بێت ئێمە نەزانین، بەڵام ئەگەر هەمیشە خۆمان بە زانا بزانین چۆن نەزانبونی خۆمان بیر دەکەوێتەوە؟"

بیرمە جارێکیان دوو کیژی گەنج، کە کچی برادەرێکم بون، بە گریان هاتنە لام و باسی دڵڕەقی و توندوتیژی باوکیان بۆ کردم کە چۆن تێیان ناگات و ئەمانیش ناتوانن لەوبارەوەیە قسەی لەگەڵدا بکەن چونکە دەترسن دەرەنجامەکە خراپتری لێ بێت، هەرچەندە زۆر پێویستیان بە سۆز و لێتێگەیشتن و رێنمایی دایك و باوکیان هەبو.

من لەگەڵ باوکەکەیاندا قسەم کردو بۆم دەرکەوت ئەو تەواو ئاگاداری دۆخەکەیە و دەزانێت چی روودەدات. ئەو هەرچەندە وتی بەڵێ من مرۆڤێکی تورەو کەم چیکڵدانەم، بەڵام قبوڵی نەبو بەرپرسیارێتی ئەنجامەکان بگرێتە ئەستۆ و ددانی بەوەشدا نەنا کە لەرووی سۆزدارییەوە بە باشی گەشەی نەکردووە. فیزو خۆ بە گەورە زانین لەم کابرایەدا زۆر لەوە بەهێزتر بون دەستپێشخەری بکات و رەفتاری بگۆڕێت.

ئێمە لە پێناوی دروستکردنی پەیوەندیی کاریگەردا لەگەڵ هاوسەر و منداڵ و هاوڕێ و هاوکارەکانماندا پێویستە فێر ببین گوێ بگرین. ئەمەش مەسەلەیەکە هێزێکی سۆزداریی گەورەی پێویستە. گوێگرتن پشوودرێژیی و کرانەوەی پێویستە. کەسێك کە گوێ دەگرێت مانای وایە مەبەستێتی تێبگات. ئەمانەش -پشوو درێژی و کرانەوە و ئارەزووی تێگەیشتن - خەسڵەتی بەرزی مرۆڤن. هیچ لەوە ئاسانتر نییە لە ئاستێکی نزمی سۆزدارییەوە رەفتار بکەیت و هەر خەریکی ئامۆژگاریکردن بیت.

لە بواری وەرزش و مۆسیقادا مرۆڤ زەحمەتە بتوانێت خەڵکەکە چەواشە بکات و ئاستی راستەقینەی خۆی بشارێتەوەو بە درۆوە خۆی دەربخات. لەبەرئەوە لەم

بوارانەدا ئاستی گەشەکردنمان روون و ئاشکرایە. بەڵام لەبوارەکانی گەشەکردنی کەسایەتی و سۆزداریماندا مەسەلەکە هێندە ئاشکرا نییە. بەئاسانی دەتوانین بە بەرچاوی هاوبەشەکەمان یاخود کەسێکی نەناسیاوەوە پۆز لێ بدەین و بە جۆرێکی دیکە خۆمان بنوێنین. چۆنمان بوێت دەتوانین وا خۆمان دەربخەین و تا ماوەیەکیش بێ هیچ کێشەیەك لەسەر ئەو رەفتارە بەردەوام ببین. تەنانەت دەتوانین فێڵ لە خودی خۆشمان بکەین. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕم وایە کە ئێمە زۆربەمان خۆمان دەناسین و تەنانەت بەشێکی زۆری ناسیاو و هاوکاریشمان دەماننناسن.

من لە زۆر بواردا، بە تایبەت لە بواری بازرگانیدا، ئەنجامی ئەو هەوڵانەم بینیوە کە ویستویانە پلەبەندییە سروشتییەکەی گەشەکردن قەدبڕ بکەن، بۆ نمونە، کاتێك کە بزنسمانەکان ویستویانە لەڕێی پەیڕەوکردنی کەلتورێکی نوێوە ئەوە رابگەیەنن کە گوایە دەیانەوێت بەرهەمەکە چاکتر بکەن و متمانەی کڕیار بەدەست بهێننەوە و خزمەتییان بکەن بە وتاری پڕ باق‌وبریق و رووی خۆش و دەست تێوەردانی دەرەکی، یاخود بە تێکەڵکردنی کۆمپانیاکان و بەدەستهێنانی زۆرەکی و .. تاد. بەڵام بزنسمانەکان بەم رەفتارەیان ئەو راستییە فەرامۆش دەکەن کە ئەم هەڵوێستە قۆرخکارییانە متمانە کەم دەکەنەوە و کاتێکیش ئەم ئامرازانە شکست دەهێنن، ئەوان یەکسەر بەدوای ئامرازگەلی دیکەدا دەگەڕێن لەناو سیستمی ئاکارە رەوشتییە خودییەکاندا کە سەرکەوتن مسۆگەر دەکەن – هەمیشە پرنسیپەکان و هەنگاوەکانی پلەبەندییە سروشتییەکان فەرامۆش دەکەن کە پێویستن و بناغەی کەلتورە متمانەدارەکانن.

بیرم دێت چەندین ساڵ لەمەوبەر منی باوك ئەم پرنسیپەم پێشێل کرد، ئەویش ئەو رۆژە بو کە جەژنی یادی سێ ساڵەی لەدایکبونی کچەکەم بو. کە چومەوە ماڵەوە تەماشام کرد کچەکەم چۆتە گۆشەیەکەوە بە تەنیا و هەمو دیارییەکانی لەخۆی کۆکردۆتەوە و بە ئامان و زەمان قایل نابێت هیچ مناڵێك لەگەڵیدا یارییان پێبکات. سەرنجم دا زۆرێك لە باوکی ئەو مناڵانە تەماشای رەفتارە خۆپەرستانەکەی کچەکەم دەکەن. ئەو هەڵوێستە بۆ من زۆر ناخۆش بو، بەتایبەت کە هەر ئەو ماوەیە من لە زانکۆ موحازەرەم دەگوتەوە دەربارەی پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکان. لە دڵی خۆمدا دەمگوت ئەو خەڵکە چاوەڕێی چی لە من دەکەن و کچەکەم چ رەفتارێك دەنوێنێت!!

دۆخی ژوورەکە زۆر شڵەژابو. منداڵەکان هەموویان کۆمەڵیان لە کچەکەم بەستبو، دەیانویست رێگەیان بدات یاری بەو دیارییانە بکەن کە خۆیان لەم بۆنەیەدا بۆیان هێنابو. کچەکەشم زۆر کەللەڕەقانە نەیدەهێشت و قایل نەدەبو. ئیتر منیش لە دڵی خۆمدا وتم "پێویستە کچەکەم فێر بکەم کە بەشداریکردن بەهایەکی گەورەی هەیە و یەکێکە لەو شتە گرنگانەی کە ئێمە بڕوامان پێیەتی."

لەسەرەتادا داواکارییەکی بچکۆلەم لێ کرد، وتم "ئازیزەکەم تکایە هاوڕێکانت بەشدار بکە لەو یارییانەی کە بە دیاری پێشکەشیان کردویت"

وەڵامەکەی زۆر ئاشکرابو: نا

هەنگاوی داهاتوم ئەوەبو هەوڵ بدەم قایلی بکەم. "ئازیز گیان ئەگەر تۆ رێگەیان بدەیت لە ماڵەکەی خۆتدا بەشداربن لە یارییەکانتدا، ئیتر کە تۆ چوویتە ماڵی ئەوان ئەوانیش بەشدارت دەکەن لە یارییەکانیاندا"

ئەمجارەش یەکسەر وەڵامی دامەوە: نا

ئیتر زیاتر هەستم کرد تیاماوم و ناتوانم کاربکەم لەسەر بڕیارەکە. شێوازی سێیەم کە گرتمەبەر شێوازی بەرتیلپێدان بو. بەوپەڕی نەرمونیانییەوە پێم وت "ئازیزەکەم، ئەگەر بەشداریان بکەیت، شتێکی زۆر خۆشم بۆ داناویت. بنێشتێکت دەدەمێ"

بە دەنگی بەرز هاواری کرد: بنێشتم ناوێت

بەمە ئیتر توڕەیی دایگرتم، بۆیە لە هەوڵی چوارەمدا پەنام بردە بەر هەڕەشەو ترساندن: "با ئەوانیش لەگەڵتدا یاری بکەن ئەگینا خراپت چاو پێدەکەوێت"

بە دەم گریانەوە وتی "گرنگ نییە. ئەو یارییانە یاری خۆمن و بەشی کەسی لێ نادەم."

دواجار پەنام بردە بەر زۆرەملێ و هەندێك لە یارییەکانم لێ سەند و دام بە منداڵەکانی دیکە "دەی منداڵینە وەرن یارییان پێبکەن."

رەنگە کچەکەم پێویستی بەوە بوبێت یەکەمجار هەستی خاوەنداریێتی تاقی بکاتەوە پێش ئەوەی بتوانێت بیبەخشێت. (لەڕاستیشدا هەر وایە. من ئەگەر خاوەنی شتێك نەبم ئایا دەتوانم بیبەخشم" من وەکو باوکی ئەو پێویست بو پێشگەپشتوانەتر ئەو ئەزمونەم فێربکردایە. بەڵام لەو چرکەساتەدا راوبۆچونی ئەو باوکانەم زۆر لا گرنگتر بو لە ئاستی نەشونماکردن و پێگەیشتنی کچەکەم و

پەیوەندی نێوانمان. ئەو رەفتارەی من بە سادەیی بریتی بو لە راگەیاندنی برپارێك کە من لەسەر هەقم و پێویستە ئەو رێگە بە منالەکانی دیکە بدات یاری لەگەڵدا بکەن و ئەگەر وانەکات مانای وایە هەڵەیە. رەنگە من بەو کارەم زیادەرەوییم کردبێت لە سەپاندی هەڵوێستێك بەرزتر لە هەڵوێستی خۆی کە لێی چاوەڕوان بوم و هۆکارەکەشی ئەوەبو کە من لە ئاستێکی نزمدا بوم بەپێی پێوەرە تایبەتەکانی خۆم چونکە نەمدەتوانی و حەزم نەدەکرد پشودرێژی بنوێنم و هەوڵ بدەم لێی تێبگەم، لەبەر ئەوە وام لێ رادەبینی کە شتەکانی ببەخشێت. جا بۆ قەرەبوکردنەوەی سەرنەکەوتنم لەو هەوڵەدا پەنام بردە بەر هێزی پێگەو دەسەڵاتی خۆم و بەزۆر ناچارم کرد ئەوە بکات کە من دەمەوێت.

بەڵام سەپاندنی هێز لاوازیی دروست دەکات. ئەو کەسە لاواز دەکات کە پەنای بۆ دەبات چونکە ئیتر وای لێ دێت بۆ رۆزگارکردنی شتەکان پشت بە هۆکارە دەرەکییەکان ببەستێت. هەروەها لاوازییش لەو کەسەدا دروست دەکات کە ملکەچ کراوە. رێی ئەوەی لێ دەگرێت بە رێگایەکی سەربەخۆ و ئەقلانی بیر بکاتەوە و گەشە بکات. هەروەها رێ لە پێوەرە ناوخۆییەکانیش دەگرێت. دواجاریش سەپاندنی هێز پەیوەندییەکانیش لاواز دەکات چونکە لەبری هاوکاریکردنی یەکتری، ترس باڵادەست دەبێت و هەردولا زیاتر پەنا بۆ خۆسەپاندن و هەڵوێستی بەرگریکاری دەبەن. ئینجا ئایا سەرچاوەی هێزە سەپێنراوەکە چی بەسەردێت کە رەنگە قەوارەیەکی مەزن بێت یاخود هێزێکی جەستەیی بێت یاخود دەسەڵات و پۆستێك بێت؛ سیمبولێکی نیشتمانی بێت، دیاردەیەك بێت، رابردویەکی شکۆدار بێت .. تاد. ئایا ئەم سەرچاوەیە پێگەکەی خۆی لەدەست دەدات؟

من ئەگەر پێگەیشتوتر بومایە ئەوا بە دڵنیاییەوە پشتم بە هێزە شاراوەکەی ناخی خۆم دەبەست بۆ ئەوەی لە گەشەکردن و بەشدارییکردن تێبگەم و توانای خۆشەویستی و پەروەردەکردنم هەبێت و کچەکەمم سەرپشك دەکرد خۆی ئازاد بێت لەوەی ئایا حەزی لێیە رێ بە منالەکان بدات یاری لەگەڵدا بکەن یان نا. رەنگە دواتریش بمتوانیایە منالەکانی دیکە بە یارییەکی خۆشەوە سەرگەرم بکەم و ئەو هەمو گوشارەم لەسەر کچەکەم هەڵبگرتایە. من لەم ئەزمونەوە فێربوم کە ئەگەر منالْ بەراستی هەست بە خاوەندارێتی بکات و دڵنیابێت لەوەی ئەو شتە موڵکی خۆیەتی

ئەوا بەوپەڕی ئـازادی و خۆڕسکی‌یـەوە منداڵەکانی دیـکەش بـە شێوەیەکی سـروشتی بەشـدار دەکـات. پـوختەی ئەزمونـەکەم ئـەوەبو کـە هـەمو کـاتێك گـونجاو نییـە بـۆ فێرکردن. کات هەیە فێرکردن تیایدا گونجاوە و کاتی واش هەیـە بەکـەڵکی فێرکـردن نایەت. کاتێك کەشەکە لەبار نـەبێت و لایەنـەکان تـوڕەیی دایگـرتبن و پەیوەندییـەکان لە قەیراندا بن ئەوا هەر هەوڵێك بدەیت بـۆ فێرکـردن وا لێـك دەدرێتـەوە کـە شێوازێکە لە خۆسەپاندن و رەتکردنەوە. بەڵام ئەگەر منداڵەکەمان بـە هێمنـی بـردە پەنایەکەوە و پەیوەندییەکانیش لە ئاستێکی باشدا بون و سـەبارەت بـە مەسـەلەکە گفتوگۆمـان کـرد و بایەخی ئامانجەکەمان رون کردەوە ئەوا ئەنجامەکە زۆر کاریگـەرتر دەبێت. لەمـەوە بۆم دەردەکەوێت کـە مـن لـەروی سۆزدارییەوە هێنـدە پێگەیشتو نـەبوم کـە ئەوکاتـە بتـوانم ددان بـە خۆمـدا بگـرم و پشـودرێژی بنـوێنم. رەنگـە هەسـتکردن بـە خاوەندارێتی وا پێویست بکات بکەوێتـە پـێش هەستی بەشدارییکردنی راستەقینە و واش دێتـە بەرچاو کـە زۆربـەی ئـەو کـەسانەی بـێ‌هـیچ ئـەملاو ئەولایـەك شتەکانیان دەبەخشـن یـاخود بـە پێچـەوانەوە هـەمو بەخشـش و بەشـدارییەك بـۆ هاوسـەرو خێزانـەکانیان رەت دەکەنـەوە رەنگـە هـەرگیز تـامی خاوەنـدارێتی‌یـان نەچەشـتبێت و هەستیان بە ناسنامە و بـەهای تایبـەتی خۆیـان نـەکردبێت. هاوکاریکردنی راستەقینەی منداڵەکانمان بۆ ئەوەی گەشە بکەن پێویستی بـەوە هەیـە پشودرێژییەکی زۆر بنـوێنین تا بتـوانین هەسـتی خاوەنـدارێتی‌یـان تیـادروست ببێـت، هـەروەها هێـندەش حـەکیم بـین بتـوانین تێیـان بگەیەنیـن بەخـشندەیی چـەند شـتێکی بەهـادارە. پێویستـە خۆشمـان لـەم مەسەلەیەدا سەرمەشق و نمونە بین.

## کێشەکە لەوەدایە چۆن کێشەکە دەبینین

خەڵك خۆشحـاڵ دەبن کـە دەبینـن روداوی خـۆش لـە ژیـانی کـەس‌و خـێزان و رێکخراوە خاوەن پرنسیپەکانیاندا رودەدەن. سەرسـامی خۆیـان دەنـوێنن لەئاست ئـەو پێگەیشـتویی و کەسـایەتییە بـەهێزەدا، لەئاسـت ئـەو یەکگرتوییـەی خێـزان و کـاری پێکەوەییەدا، لەئاست ئەو کەلتورە نەرم‌و پڕ لە هاوکارییەدا.

داواکاری خێراشیان رەنگدانەوەیـەکی ئاشکرای پارادیمە بنەڕەتییەکانیانـە. ئـەوان کە دەپرسن چۆن ئـەو کـارەت بەئـەنجام گەیانـد. ئایا منـیش فێردەکـەیت؟ لەراستیدا

مەبەستیان ئەوەیە بڵێن هەندێك ئامۆژگاری و ڕێگاچارەی خێرامان پێ بڵێ ئازارەکانمان بیر بباتەوە.

لەئەنجامیشدا دەتوانن هەندێ کەسی وا بدۆزنەوە کە وەڵامدەری داخوازییەکانیان بێت و ئەو شتانەیان فێر بکات. تا ماوەیەکی کەمیش لە ڕواڵەتدا وا دەردەکەوێت کە ئەم ئامراز و شارەزاییانە توانیویانە ئامانجەکانی خۆیان بپێکن، نەك هەر ئەوە بەڵکو ڕەنگە لەڕێی هەڵوێستی ئازارشکێن و ئامرازە کۆمەڵایەتییەکانەوە بەشێك لە کێشە دێرین و تازەکان کەم بکەنەوە.

بەڵام نەخۆشییە درێژخایەنە شاراوەکان هەردەمێنن و کۆمەڵێك نیشانەی نوێی دیکەشیان لێ دەردەکەوێت. خەڵکەکەش هەتا زیاتر بەدوای چارەسەری خێرادا بگەڕێن و خوو بدەنە کێشەو ئازارە تیژو کتوپڕەکان ئەوا ئەم شێوازە زیاتر کاریگەری خراپ دەکاتە سەر نەخۆشییە درێژخایەنە شاراوەکان. ئەو شێوازەی کە کێشەکەی پێ دەبینین خۆی لە خۆیدا کێشەیە.

دەتوانیت جارێکی دیکەش بگەڕێیتەوە بۆ هەندێك لەو مەسەلانەی کە لەسەرەتای ئەم بەشەدا باسمان کردن، هەروەها دەشتوانیت بگەڕێیتەوە بۆ دەوروتەئسیری شێوازی بیرکردنەوە بە ڕێکارە خودییەکان.

"من لە بواری کارگێڕی باشدا چەندین خولی ڕاهێنانم بینیوە. شتی زۆر لە کارمەندەکانی ژێر دەستی خۆم رادەبینم و ئەوپەڕی هەوڵ دەدەم بە باشی مامەڵەیان بکەمو ڕوخۆشو نەرمو نیان بم لەگەڵیاندا. بەڵام هەست ناکەم ئەوان هیچ هەستێکی باشیان هەبێت بەرامبەر بە من. لەو باوەڕەدام کە ئەگەر ڕۆژێك نەخۆش بکەوم و نەچمەوە بۆسەرکارەکەم ئەوان زۆربەی کاتەکە لە دەوری حەوزەکەی فەرمانگە کۆدەبنەوەو خەریکی چەنەبازی دەبن. نازانم بۆچی ناتوانم رایان بهێنم لەسەر ئەوەی سەربەخۆ بنو هەست بە بەرپرسیارێتی بکەن، یان کارمەندی وا بدۆزمەوە کە بتوانن شتی وا بکەن؟"

ئاکارە ڕەوشتییە خودییەکان پێم دەڵێت کە من دەتوانم کارێکی دراماتیکی وا بکەم کە مەسەلەکان هەڵگێڕێتەوە و ئەوانەی ژێردەستی خۆم وا لێ بکات دڵیان لە خۆشیان پیس ببێتو سوپاسگوزاری ئەم دۆخەی ئێستایان بن. یاخود تێکەڵی

پرۆگرامێکی راهێنانی هاندەری وابن کە ناچاریان بکات تەواو پابەندبن یاخود تەنانەت هەوڵ بدرێت خەڵکی وا بخرێتە شوێنیان کە کارەکانیان باشتر رابپەڕێنن.

بەڵام ئایا ئەم چوارچێوە رواڵەتییەی پابەندنەبون دەتوانێت پرسیاری ئەوە لە فەرمانبەرەکان بکات کە ئایا من بەڕاستی لە پێناوی ئەوپەڕی قازانجی ئەواندا کار دەکەم؟ ئایا هەستی ئەوەیان هەیە من وەکو رۆبۆت تەماشایان دەکەم؟ ئایا ئەم قسەیە هیچ راستییەکی تێدایە؟ ئایا من لە ناخی خۆمدا ئەمان بەم شێوەیە دەبینم؟ ئایا رێی تێدەچێت بەشێك لە کێشەکە ئەوە بێت من چۆن تەماشای ئەوانە دەکەم کە کارم لەگەڵدا دەکەن؟

هەمومان وا هەست دەکەین ئەرکێکی زۆرمان لەپێشە، بەڵام هەرگیز کاتی تەواویشمان لەبەردەستدا نییە. "رۆژ تا ئێوارە لەژێر گوشاردام و هەست بە ناڕەحەتی دەکەم، هەمو رۆژێك حەوت رۆژی رەبەق لە هەفتەیەکدا. چەندین کۆڕو سیمینار چوم دەربارەی بەڕێوەبردنی کات. هەروەها نیو دەرزەن نەخشەی جیاجیاشم تاقی کردۆتەوە، ناڵێم ئەوانە هیچ سودیان نەبووە بەڵام هێشتا هەست بە ناسودەیی ناکەم و ئەو ژیانە هێمن و بەسودەم نییە کە خۆم دەمەوێت؟"

ئاکارە رەوشتییە خودییەکان دەڵێن پێویستە رێگەیەکی دەربازبون هەبێت — پلانێکی نوێ یاخود سیمینارێکی وا کە یارمەتیم بدات مامەڵە لەگەڵ ئەم هەمو گوشارانەدا بکەم بە شێوەیەکی کاریگەرتر.

بەڵام ئایا رێی تێدەچێت وەڵامەکە لێهاتویی نەبێت؟ ئایا بەرهەمی زۆرتر لەکاتی کەمتردا هیچ جیاوازیەك دروست دەکات؟ یاخود تەنیا دەبێتە زیادکردنی تێکڕای ئەو کاتەی کە من کاردانەوە دەنوێنم بەرامبەر بەو بارودۆخ و مرۆڤانەی کە پێدەچێت ژیانی منیان کۆنترۆڵ کردبێت.

ئایا شتێك هەیە وا پێویست بکات من قوڵتر و بنەڕەتییانەتر ببینم؟ پارادیمێکی ناخی خۆم کە کاربکاتە سەر ئەو شێوازەی من سروشتی خۆم و ژیانی خۆم و کاتی خۆمی پێدەبینم؟

"ژیانی هاوسەریم فلات و بێ تامە. چیتر خەریکی شەڕ و دەنگەدەنگ نین؛ بەڵام چیتر یەکتریشمان خۆش ناوێت. چوینە لای راوێژکارییش؛ گەلێ شێوازیشیمان تاقی کردۆتەوە، بەڵام نەمانتوانی ئەو گڕو تینە زیندو بکەینەوە کە جاران بۆ یەکتری هەمانبو."

ئاکارە رەوشتی‌یە خودییەکان دەڵێت پێوستە کتێبێکی نوێ یاخود کۆڕێك هەبێت خەڵك تیایدا کۆببنەوە بۆ ئەوەی بە ئاشکرا هەستی خۆیان دەرببڕن بە جۆرێکی وا یارمەتی هاوسەرەکەم بدات بتوانێت باشتر لێم تێبگات. یاخود رەنگە ئەمە شتێکی بێسود بێت و هیچ چارێکم نی‌یە جگە لەوەی کە تەنیا پەیوەندی‌یەکی نوێ دەتوانێت ئەو خۆشەویستی‌یەم بۆ دابین بکات کە لێم ون بووە.

بەڵام ئایا رێی تێدەچێت کێشە راستەقینەکە خودی هاوسەرەکەم نەبێت؟ ئایا رێی تێدەچێت ئەوەی بەدوای خاڵە لاوازەکانی هاوسەرەکەمدا دەگەڕێت و گەورەیان دەکات من بم و خۆم هۆکاری ئەوەبم لە ژیاندا بەم شێوەیە رەفتارم لەگەڵدا بکرێت؟

ئایا سەبارەت بە هاوسەرەکەم و هاوسەرگیری و پێناسەی خۆشەویستی راستەقینە من خاوەنی پارادیمێکی بنەڕەتی وام کە سەرچاوەی ئەم کێشەیەم بێت؟

ئایا ئێستا بۆت دەرکەوت کە پارادیمەکانی ئاکاری خودی چ رۆڵێکی کاریگەریان هەیە لە زیادکردنی ئەو شێوازەی کە کێشەکانی خۆمانیان پێ دەبینین و چۆن هەوڵی چارەسەرکردنیان دەدەین؟

ئێمەی مرۆڤ پێ بزانین یان نەزانین زۆربەمان دەرباز بوین لەو خەیاڵەی کە بەڵێنە بەتاڵەکانی ئاکارە خودی‌یەکان هەڵگریانن. من لە ئەنجامی گەڕان و ئەو کارکردنەمدا لەگەڵ رێکخراوەکاندا دەبینم بەڕێوەبەرەکانی کە قوڵ بیر دەکەنەوە هیچ شتێك هێندەی سایکۆلۆجیای هاندان و ئەو قسەکەرە (ئیلهامبەخش)انە پشتیان ساردناکاتەوە کە هیچیان نی‌یە بیڵێن جگە لە چیرۆکی خۆشی پڕ لە قسەی هیچ‌وپوچ.

بەڕێوەبەرە ستراتیجی‌یەکان گەوهەرو میکانیزمیان دەوێت. هەر بە چارەسەری ئازارشکێن و رواڵەتیی قایل نابن. دەیانەوێت کێشە درێژخایەنەکان چارەسەر بکەن کە هۆکاری راستەقینەن. هەروەها دەیانەوێت جەخت بکەنە سەر ئەو پرنسیپانەی کە ئەنجامی دورمەودایان لێ دەکەوێتەوە.

## ئاستێکی نوێی بیرکردنەوە

ئەلبێرت ئەنیشتاین ئەم تێبینیەی هەبو: "مرۆڤ ناتوانێت کێشە سەرەکییەکانی کە دێنە رێی بەو هەمان ئاستی بیرکردنەوەیە چارەسەر بکات کە لەکاتی سەرهەڵدانی کێشەکاندا هەیبوە."

ئێمە ئەگەر سەرنج لە ناخی خۆمان و لە دەوروبەر بدەین و لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو کێشانە بکەین کە لە ژیاندا هاتونەتە ڕێمان و کارلێك بکەین لەگەڵ ئاکارە ڕەوشتییە خودییەکاندا، وردە وردە تێدەگەین کە کێشەکان کێشەی قوڵو گەوهەریین و ناتوانرێت بەو ئاستە ڕواڵەتییە چارەسەر بکرێن کە کێشەکان سەریان تیا هەڵدا.

ئێمە پێویستمان بە ئاستێکی تازەو قوڵتری بیرکردنەوە هەیە، پێویستمان بە پارادیمێکە لەسەر ئەو پرنسیپانە هەڵچنرابێت کە بە وردی باسی هەرێمە کاریگەر و تایبەتەکەی مرۆڤ دەکات و پێکەوە کارلێك دەکەن — بۆ چارەسەرکردنی ئەو مەسەلە قوڵانەی کە مایەی نیگەرانین.

لەڕاستیدا ئەم ئاستە نوێیەی بیرکردنەوە بریتییە لە بابەتی ئەم کتێبە (٧ خووەکەی کەسانی پێشەنگ). کتێبەکە ڕێکارێکە لەسەر بناغەی پرنسیپ و ئاکارە ئایدیالییەکان و ڕێکارێکە کە لە ناوەوە بۆ دەرەوە مامەڵە دەکات لەگەڵ چالاکییەکانی تاك و کۆمەڵ. لە ناوەوە بۆ دەرەوە یاخود لە ناخەوە بۆ ئاشکرا - واتە ئەوەی سەرەتا لە خودی خۆتەوە دەست پێبکەیت. نەك هەر ئەوە، بەڵکو ڕەسەنتر و قوڵتر ئەوەیە سەرەتا بەو بەشەی ناخی خۆت دەست پێبکەیت کە لە هەموان قوڵترە — واتە بە پارادیمەکانت و بە کەسایەتیت و بە پاڵنەرەکانت. ئەم ڕێکارە مانای وایە تۆ ئەگەر بتەوێت لەگەڵ هاوسەرەکەتدا ژیانێکی بەختەوەرت هەبێت، پێویستە خۆت ئەو کەسە بیت کە وزەی ئەرێنی بەرهەم دەهێنێت و خۆی لە پشتگیریکردن و دروستکردنی وزەی نەرێنی بەدوور دەگرێت. ئەگەر ویستیشت مناڵە هەرزەکارەکان زیاتر گوێڕایەڵت بن و ئەوپەڕی بەختەوەریت پێ ببەخشن، خۆت ببە بەو باوکەی/ دایکەی کە میهرەبانتر و کراوەتر و خۆڕاگرتر و بەسۆزترە. ئەگەر ئارەزومەندشیت لە بواری کارو پیشەکەتدا ئازادتر و دەستکراوەتر بیت، ببە بەو کارمەندەی کە لە هەموان زیاتر هەست بە لێپرسینەوە دەکات و دەستی یارمەتی درێژ دەکات و بەشداریی هەیە. ئەگەر ویستیشت جێگەی باوەڕو متمانە بیت، شایستەی متمانە بە. ئەگەر ویستیشت لە بەهرەیەکی ددانپیانراودا مەزنێتی لاوەکی بەدەست بهێنیت، سەرەتا جەخت بخەرەسەر مەزنێتی سەرەکیی کەسایەتیت.

ڕێکاری (لە ناوەوە بۆ دەرەوە) پێمان دەڵێت سەرکەوتنە کەسێتییەکان (تایبەتەکان) دەکەونە پێش سەرکەوتنە دەستەجەمعییەکانەوە. هەروەها پێشمان

دەڵێن مرۆڤ پێش ئەوەی بەڵێن بە خەڵکی بدات و بیباتە سەر، پێویستە بەڵێن بە خودی خۆی بدات و بیشیباتەسەر. ئەم ڕێکارە پێمان دەڵێت مرۆڤ کارێکی بێهوودە دەکات ئەگەر کەسایەتی بخاتە پێش ڕەفتارەوە (کەسایەتی خودیی پێش کەسایەتی نمونەیی)، یاخود هەوڵ بدات پەیوەندییەکان لەگەڵ خەڵکیدا چاك بکات بەر لەوەی لەگەڵ خودی خۆیدا چاکیان بکات.

لە ناوەوە بۆ دەرەوە پرۆسەیەکی هەنگاو بەهەنگاوە. پرۆسەیەکی بەردەوامە بۆ نوێکردنەوە لەسەر ئەو یاسا سروشتیانەی کە حوکمی گەشەکردن و پێشکەوتنی مرۆڤیان بەدەستە. ئەمە گەشەکردنێکی لولپێچییە بەرەو سەرەوە کە دەمانگەیەنێتە شێوازگەلێکی بڵندتری هاوکاریی کاریگەرانە لەگەڵ خەڵکی و سەربەخۆبونی بەرپرسیار.

من بەهۆی پیشەکەمەوە هەلی کارکردنم بۆ هەڵکەوتووە لەگەڵ زۆر کەسدا — کەسانی سەرنجڕاکێش، بەهرەدار، کەسانێك کە زۆر خولیای بەختەوەری و سەرکەوتنن، کەسانێك کە هەمیشە دەگەڕێن و لێکۆڵینەوە دەکەن، کەسانێك کە ئازار دەگەیەنن. من لەگەڵ بزنسمان و مامۆستای زانکۆ و کۆمەڵە و ڕێکخراوی مەدەنی و ئایینی و لەگەڵ خێزان و چەندین ژن و مێرددا کارم کردووە .. لەو ماوە درێژەی کارکردنیشمدا هەرگیز نەمبینیوە شتێك هەبێت سەرچاوەکەی لە دەرەوە بێت بۆ ناوەوەو بتوانێت چارەسەرێکی هەمیشەیی بۆ کێشەکان بدۆزێتەوە، یاخود ببێتە مایەی بەختەوەرییەکی هەمیشەیی و سەرکەوتنێکی بەردەوام.

من بە کردەوە بینیومە هەمو بەرهەمێکی پارادیمی لە دەرەوە بۆ ناوەوە بریتیی بووە لە خەڵکی بەدبەختی خەمبار کە هەست دەکەن هیچیان پێ ناکرێت و بوونەتە قوربانیی؛ کەسانێك کە هەر بەدوای خاڵە لاوازەکانی کەسانی دیکەدا دەگەڕێن و لەو باوەڕەدان کە ئۆباڵی هەمو پەستی و خامۆشییەکیان لە ئەستۆی بارودۆخەکەیاندایە. من چەندین نمونەی هاوسەرگیریی بەدبەخت و ناخۆشم بینیوە کە ژن و مێردەکە هەردوکیان حەزیان کردووە کەسێکی دیکە هاوسەریان بوایە، هەردوکیان تەنیا هەڵەو کەموکورتییەکانی ئەوی دیکە دەبینێت. لەناو کۆمپانیاکاندا چەندین جار ململانێ و ناکۆکیی گەورەم بینیوە کە بونەتە مایەی بەفیڕۆدانی کاتێکی زۆر و

تـەرخانکردنی وزەو مانـدوبونێکی گـەورە بـۆ دارشـتنی یاسـا و رێنماییگـەلێك کـە کارمەندەکان چار بکەن بە جۆرێك رەفتار بکەن گوایە متمانە لەناویاندا بەرگەماڵە.

خێزانەکەی ئێمە لە سێ ناوچە ژیاون کە لە ناوچە هەرە گەرمـەکانی گۆی زەویـن — ئـەفریقای باشـور و ئیسـرائیل و ئایرلەنـدا — و بـاوەڕم وایـە سەرچـاوەی کێشـە هەمیشـەییەکان لـەم ناوچـانەدا زاڵبـونی پـارادیمێکی کۆمەڵایـەتـی‌یـە کـە شـتەکان لـە دەرەوە بـۆ نـاوەوە دەبینێـت. گروپـەکان لـەو سـێ شـوێنەدا بڕوایـان وایـە کێشـەکە لـە دەرەوەدایـە و ئەگـەر بەرامبەرەکـە (ئـەوەی دەرەوە) نـەما یـاخود گۆڕانکاریی کـرد لـە خۆیدا ئەوا کێشەکە چارەسەر دەبێت.

بۆ زۆربەی خەڵکەکە لەراستیدا رێکـاری لـە نـاوەوە بـۆ دەرەوە بـە وەرچـەرخانێکی درامـاتیکی حسـاب دەکرێـت لـە پارادیمـدا، چـونکە خـووگرتن بـە مەسـەلەکانەوە و پارادیمە کۆمەڵایەتیەکەی ئێستا کاریگەریی گەورەیان هەیە لەسەر ئاکاری خودی.

بـەڵام لـە روانگـەی ئـەزمونی کەسـێتی و پیشـەیمەوە کـە لەگـەڵ هـەزاران کەسـدا هەڵسـوکەوتم کـردووە و هـەروەها بـەهۆی لێکۆڵینـەوەی ورد لەسـەر ئـەو کەس‌وکۆمەڵـگایانەی کـە لـە مێـژوودا سـەرکەوتنی مـەزنیان بەدەسـت هێنـاوە گەیشتومە ئەو باوەڕەی کە بەشێکی زۆری پرنسیپەکانی (٧ خووەکە) وان لە قوڵایی نـاخ و ویـژدان و هۆشـی گشـتماندا. ناسـینەوەو گەشـەپێدان و وەگەڕخسـتنیان بـۆ جێبـەجێکردنی مەبەسـتە گرنگـەکانمان وا پێویسـت دەکـەن بـە شـێوازێکی جیـاواز بیربکەینەوە و پارادیمەکەمان بگۆڕین بۆ ئاستێکی تازەو قوڵی (لە ناوەوە بۆ دەرەوە).

من تەواو لەسەر ئـەو بـاوەڕەم کە ئەگـەر بـەردەوام هـەوڵ بـدەین بـۆ تێگەیشـتن و چاندنی ئەو پرنسیپانە لە ژیانماندا دەتوانین بـەردەوام ئـەو راسـتـی‌یـە بدۆزینـەوە کـە شاعیری گەورە تی. ئێس. ئیلیوت تێبینی کردووە:

پێویسـتە هـەرگیز دەسـتبەرداری گـەڕان و دۆزینـەوە نـەبین. دۆزینـەوەکانمان هـەمویان دەمانگەیەننـە خـاڵی دەسـتپێکردن و وامـان لێ دەکـەن سـەرلەنوێ شـوێنەکە بناسینەوە.

# ٧ خووەکە

## دیدێکی گشتی

"ئێمە ئەو شتەین کە بەردەوام دووپاتی دەکەینەوە. لەبەرئەوەی هەڵکەوتن کردار نی‌یە بەڵکو خووە."

ئەرستۆ

کەسایەتی مرۆڤ لە بنەڕەتدا کۆمەڵێك خووی ئاوێتەیە. حیکمەتێکی بەناوبانگ هەیە دەڵێت: بیرۆکەیەك بچێنە کردارێك بەرهەمەکەیەتی. کردارێك بچێنە خوویەك بەرهەمەکەیەتی. خوویەك بچێنە کەسایەتییەك بەرهەمەکەیەتی. کەسایەتییەك بچێنە چارەنوسێك بەرهەمەکەیەتی.

لە ژیانی ئێمەدا خوو هۆکارێکی بەهێزە و لەبەرئەوەی شێوازێکی نەگۆڕی هەیە و زۆرجار سەرچاوەکەی نەستە، دەبینین ڕۆژانە و بە شێوەیەکی هەمیشەیی کەسایەتیمان دەردەبڕێت و کاریگەربونمان یان ناکاریگەربونمان بەرهەم دەهێنێت. پەروەردەکاری مەزن، (هۆراس مان Horace Mann) دەڵێت: "خوو وەکو گوریسێك وایە. هەر ڕۆژەی تاڵێکی لێ دروست دەکەین و هێندە نابات پچڕاندنی مەحاڵ دەبێت". من بەشی کۆتایی قسەکە بەڕاست نازانم چونکە باوەڕم وایە دەتوانرێت تاڵەکان لێك جیابکرێنەوە و تێك بشکێنرێن. خو دوو جۆری هەیە، یان وەرگیراوە یاخود وەرنەگیراوە. بەڵام شتێکی نەگۆڕ نی‌یە. پێویستی بە پەیڕەوکردن و پابەندبونێکی مەزن هەیە. ئەو کەسانەی کاتی خۆی گەشتی ئاسمانی کەشتییەکەی ئەپۆلۆیان بینی لە شوێنی خۆیاندا وشك بون کاتێك کە بۆ یەکەمجار لە مێژووی مرۆڤایەتیدا پیاوێکیان بینی چووە سەرمانگ و گەڕایەوە. هیچ سەرسام بون و

ستایشکردنێك نەیدەتوانی وەسفی ئەو چەند رۆژە پڕ لە رووداوە بکات. بۆ گەیشتن بەوێ، کەشتیوانەکانی ئاسمان دەبوایە بە تەواوی رزگار ببن لە هێزە نائاساییەکەی کێشی زەوی. جا لەبەرئەوە وزەیەکی یەکجار زۆر لە خولەکە سەرەتاییەکانی دەستپێکردندا سەرف کرا، واتە لە چەند کیلۆمەتری سەرەتای گەشتەکەدا، وزەیەك سەرف کرا زیاتر بو لەو وزەیەی کە رۆژانی داهاتو سەرف کرا بۆ بڕینی نزیکەی نیو میلۆن میل.

دیارە خووەکانیش هێزێکی گەورەی کێشکردنیان هەیە، زۆر زیاتر لەوەی کە زۆربەمان پێشبینی دەکەین و ددانی پێدا دەنێین.. تێکشکاندنی خووە قوڵەکانی ناخی مرۆڤ وەك ئیش دواخستن و کەمچیکڵدانەیی و خۆپەرستی و رەخنە و هەروەها ئەو خوانەی دیکەش کە پرنسیپە بنەڕەتییەکانی چالاکبونی مرۆڤ پێشێل دەکەن مەسەلەیەکە تەنیا بە ویستی بەهێز و هەندێك گۆڕانکاریکردنی بچوك لە ژیانـدا نایەتەدی بەڵکو شتەکە زۆر لەوە زیاترە. دەستپێکردن هەوڵ و تێکۆشانێکی گەورەی دەوێت. بەڵام هەرکاتێك لە مەودای هێزی راکێشانەکە رزگارمان بو ئەوکاتە ئیتر ئازادییەکەمان چەند رەهەندێکی تەواو نوێ وەردەگرێت.

هێزی راکێشان، وەك هەمو هێزە سروشتییەکانی دیکە، یان لەگەڵماندایە و یارمەتیمان دەدات یاخود دژایەتیمان دەکات. چونکە دوورنییە لە هەندێك خوودا هێزی راکێشانەکە ببێتە رێگر لەوەی رووبکەینە شوێنی مەبەست. بەڵام لەهەمان کاتیشدا هەر هێزی راکێشانە یەکپارچەیی ئەم جیهانەی راگرتووە، بە جۆرێك کە ئەستێرەکان لە خولگەی خۆیاندا بمێننەوەو سیستەمەکەی گەردون گۆڕانی بەسەردا نەیەت. هێزی راکێشان کاریگەرییەکی یەکجار زۆری هەیە ئەگەر ئێمە بتوانین چالاکانە بەکاری بهێنین. بەهەمان شێوەش دەتوانین هێزی راکێشان لەمەڕ خووەکان وا بەکاربهێنین ببێتە مایەی خولقاندنی یەکپارچەیی و دروستکردنی ئەو سیستەمەی کە بۆ مانەوە و چالاکیەکانمان پێویستن.

## پێناسەی خووەکان

بۆ مەبەستەکانی ئەم کتێبە (خوو) وا پێناسە دەکەین کە خاڵی بەیەکگەیشتنی زانیاری و لێزانین و ئارەزووە.

**زانیاری:** واتە بزانیت پێویستە چی بکەیت و بۆچی پێویستە بیکەیت. لێزانین چۆنێتی ئەنجامدانێتی.

**(ئارەزوو)**ش پاڵنەر و حەزی ئەنجامدانەکەیە. کەواتە بۆ ئەوەی شتێك لە ژیانماندا بکەین بە خوو، پێویستە ئەو سیانە ئەو هەرسێکیمان هەبێت.

رەنگە پەیوەندی نێوان من و هاوکارەکانم یاخود من و هاوسەرەکەم یان من و منداڵەکانم شتێکی کاریگەر نەبێت چونکە هەرچەندە بەردەوام بیروبۆچونی خۆمیان پێ دەڵێم، بەڵام هەرگیز گوێیان لێ ناگرم و هەتاکو بەشوێن پرنسیپە راست و دروستەکانی پەیوەندییە مرۆڤایەتییە ئاڵوگۆڕکراوەکاندا نەگەڕێم، نەك هەر گوێ ناگرم بەڵکو ناشزانم گوێگرتن بۆ خۆیشم پێویستە. یان جاری وا هەیە کەسەکە تەنانەت ئەگەر ئەو راستییەش بزانێت کە مامەڵەی باش لەگەڵ خەڵکیدا پێویستی بە گوێگرتن هەیە لێیان، بەڵام شارەزایی نییەو نازانێت بە چاکی و وریایی گوێ لە کەسێکی دیکە بگرێت.

دیارە تەنیا هەر ئەمانەش بەس نین کە مرۆڤ بزانێت گوێ گرتن پێویستە و شارەزاییشی هەبێت لە گوێگرتندا بەڵکو پێویستە ئارەزوی گوێگرتنیشی هەبێت. بەبێ ئەو ئارەزووە دووانەکەی دیکە بەس نین و گوێگرتن نابێتە خوویەك لە ژیانی کەسەکەدا. کەواتە ئەگەر بمانەوێت شتێك بکەین بە خوو پێویستە لە هەرسێ بوارەکەدا کاربکەین.

گۆڕانکاری لە تێڕوانیندا پرۆسەیەکە رووەو هەوراز—گۆڕینی بوونە کە (پێکهاتەکە) دەبێتە مایەی گۆڕانکاریی لە تێڕوانیندا. گۆڕانیش لە تێڕوانیندا خۆی دەبێتە گۆڕانی پێکهاتەکە. بەم شێوەیە و لەڕێی بزوتنەوەمانەوە بە ڕێڕەوە لولپێچییە رووەو هەورازەکە و هەروەها بە کارکردنمان لەسەر سێکوچکەی زانیاری و لێزانین و ئارەزوو دەتوانین ئاسۆی نوێ بخوڵقێنین لە بواری چالاکییە کەسێتی و دەستە جەمعییەکانماندا و هەروەها تێکشکاندنی ئەو پارادیمە کۆنانەی کە ساڵەهای ساڵ سەرچاوەی هەستکردنێکی درۆزنانە بون بە ئاسایش و سەلامەتی.




**خووە چالاکە کاریگەرەکان**

**پرنسیپ و شێوازەکانی رەفتار کە ئاخنراونەتە ناخەوە**

ئەم پرۆسەیە هەندێکجار پرۆسەیەکی بەئازارە. گۆڕانکارییەکە پێویستە پاڵنەرەکەی بەدیهێنانی ئامانجێکی باڵاتر بێت و ئارەزووی ملکەچکردنی ئەو شتە بێت کە هەست دەکەیت ئێستا دەتەوێت بۆ ئەو شتەی کە دواتر دەتەوێت. بەڵام ئەم پرۆسەیە لەهەمان کاتیشدا کامەرانیمان پێدەبەخشێت (ئامانج و مەبەستی بونمان). دەتوانین بڵێین یەکێك لە پێناسەکانی کارمەرانی بریتییە لە بەرهەمی حەز و توانای قوربانیدان بەو شتەی کە ئێستا دەمانەوێت لەپێناوی ئەو شتەدا کە لە کۆتاییدا دەمانەوێت.

## پلەبەندییەکەی پێگەیشتن

حەوت خووەکان بریتی نین لە کۆمەڵێکی سەربەخۆی هاندەر و ئامۆژگاریی داڕێژراو. بەڵکو بە هاوئاهەنگی لەگەڵ یاسا سروشتییەکانی گەشەکردندا ئەم

خووانە ئامرازێکی دیکەو پلەبەندکراوی کامڵ دروست دەکەن بۆ پێشخستنی چالاکییەکانی تاك و کۆمەڵ چونکە لێبڕاوانە هانمان دەدەن بە ئاراستەی گەشەکردنی پلە بە پلە بەوەی کە لە دۆخی پشت بەستن بە خەڵکییەوە بگەینە دۆخی سەربەخۆبون و (پشت بەخۆبەستن) و لەوێشەوە بۆ دۆخی هاوکاریکردن لەگەڵ دەوروبەردا (یەکتر تەواوکردن). هەر یەکێك لە ئێمە لەسەرەتای ژیانماندا منالێکی شیرەخۆرەبوین، لە هەمو شتێکماندا پشتمان بە خەلکی دیکە بەستووە کە ئەرکی پەروەردەکردن و پشتگیری و چاودێریکرنمانیان گرتبووە ئەستۆ. بەبێ ئەم پەروەردەکردنە ناتوانین چەند سەعاتێکی کەم یاخود چەند رۆژێك زیاتر بژین، بەڵام ورده ورده و بە تێپەڕبونی مانگ و ساڵ وامان لێ دێت لەروی جەستەیی و سۆز و هزر و دارایییەوە زیاتر پشت بە خۆمان ببەستین تا لە کۆتایدا چاودێری و بەڕێوەبردنی خۆمان لەئەستۆی خۆمان دەبێت و خۆمان ئاراستەکانی خۆمان دیاریی دەکەین و پشت بە خۆمان دەبەستین. مرۆڤ هەتا زیاتر گەشە بکات و بگاتە قۆناغی پێگەیشتن زیاتر درك بەوە دەکات کە هەمو شتەکانی ناو سروشت هاوکاری لەگەڵ یەکتردا دەکەن و یەکتری تەواو دەکەن. سیستمێکی ژینگەیی رێك و پێك هەیە کە حوکمی هەمو سروشتی بەدەستە بەکۆمەڵگاشەوە. هەروەها ئەو راستییەشمان بۆ دەردەکەوێت کە ئاسۆ باڵاکانی سروشت جۆرێك لە پەیوەندی هەیە بە پەیوەندییەکانی مرۆڤەوە لەگەڵ یەکتریدا، واتە ژیانی مرۆڤیش یەکتر تەواوکەرە.

بەم جۆرە دەبینین گەشەکردنمان لە شیرەخۆرییەوە بۆ قۆناغی پێگەیشتن بەپێی یاسا سروشتییەکە بەڕێوە دەچێت. ئەم گەشەکردنەش گەلێك رەهەندی هەیە چونکە مەرج نییە گەیشتنمان بە لوتکەی پێگەیشتنی جەستەیی لەهەمان کاتدا پێگەیشتنێکی هزری و سۆزدارییشمان بۆ دابین بکات. لەلایەکی دیکەشەوە ناتەواوی جەستەیی مانای ئەوە نییە کەسەکە لەروی هزری و سۆزدارییشەوە ناتەواوە.

لە چوارچێوەی پلەبەندبونی پێگەیشتندا مەسەلەی پشت بەستن بە خەڵکانی دیکە پارادیمی (تۆ)یە — تۆ چاودێریم دەکەیت و دێیت بە دەنگمەوە و تۆ یارمەتیم نادەیت و من ئەنجامەکان دەخەمە ئەستۆی تۆ.

بەڵام سەربەخۆیی پارادیمی (من)ە — من دەتوانم بیکەم، من بەرپرسیارم، من

پشت بە خۆم دەبەستم، من هەڵدەبژێرم.

بەڵام یەکتر تەواوکردن پارادیمی (ئێمە)یە – ئێمە دەتوانین بیکەین، دەتوانین هاوکار بین، دەتوانین تواناو بەهرەکانمان کۆبکەینەوەو پێکەوە شتێکی گەورەتر بخوڵقێنین.

مرۆڤی پشت بەستوو بۆ ئەوەی بگاتە مەبەست پێویستی بە خەڵکی دیکەیە. مرۆڤی سەربەخۆ دەتوانێت بە هەوڵی تایبەتی خۆی مەبەستەکەی بهێنێتە دی، بەڵام ئەوانەی یەکتری تەواو دەکەن هەوڵەکانی خۆیان دەبەستنەوە بە هەوڵ و چالاکییەکانی ئەوانی دیکەوە بۆ بەدەستهێنانی مەزنترین سەرکەوتن.

من ئەگەر لەرووی جەستەییەوە مرۆڤێکی پشت بەستو بم – ئیفلیج و پەککەوتە بم یان لەرووبەکەوە ناتەواو بم – پێویستم بە تۆیە یارمەتیم بدەیت. ئەگەر لەرووی سۆزدارییەوە پشت بەستوو بم ئەوا راوبۆچونی تۆ دەربارەی من ئارامیم پێ دەبەخشێت و هەست بە نرخ و بەهاکانی خۆم دەکەم. واتە ئەگەر تۆ منت خۆش نەوێت دەڕوخێم.

پشت بەستنی هزرییش ئەوەیە کە من پشت بە تۆ ببەستم بیرم بۆ بکەیتەوە، تۆ بیر لە مەسەلە و کێشەکانی ژیانی من بکەیتەوە.

بەڵام ئەگەر لەرووی جەستەیییەوە سەربەخۆ بم بە باشی دەتوانم خۆم کارەکانی خۆم ئەنجام بدەم. سەربەخۆبونی ئەقڵییش وام لێ دەکات خۆم بیر بۆخۆم بکەمەوە و لە ئاستێکی دیاریکراوی بیرکردنەوەوەدا بگەمە ئاستێکی دیکە. دەتوانم مەسەلەکان شی بکەمەوەو خوڵقێنەرانە بیربکەمەوە و بیرو بۆچونەکانم رێك بخەم و بە شێوەیەك دەریان ببڕم کە خەڵکی لێم تێبگەن.

ئەگەر لەرووی سۆزدارییشەوە سەربەخۆ بم ئەوا لە ناخەوە هەست دەکەم من لەسەر هەقم. ناخم ئاراستەم دەکات. هەستکردنم بەوەی بەنرخم لەوەوە سەرچاوە ناگرێت کە کەسێکی خۆشەویستم یان بە باشی هەڵسوکەوتم لەگەڵدا دەکرێت.

لەمەوە بە ئاسانی تێدەگەین کە پشت بەخۆ بەستن پێگەیشتوترە لەوەی پشت بە خەڵکی ببەستین. سەربەخۆ بون و پشت بەخۆبەستن دەستکەوتێکی مەزنە. لە خودەوەیە و بۆ خودە بەڵام ئەم ئاستەش هێشتا باڵاترین ئاست نییە.

بەهەرحاڵ پارادیمی باوی ئەمڕۆ زۆر ستایشی پشت بەخۆبەستن دەکات کە

ئامانجی ئاشکرای بەشێکی زۆری خەڵك و بزوتنەوە کۆمەڵایەتییەکانە. پشت بەخۆبەستن بەشێکی بەرچاوی زۆربەی بەرنامەکانی گەشەپێدانە لە کاتێکدا کە بەهاکانی وەکو پەیوەندی و هاوکاری و کاری بەکۆمەڵ لە پلەکانی خوارەوە دادەنێت. لایەنێکی گەورەی ئەوەی وای لێ کردوین جەخت لەسەر پشت بەخۆبەستن بکەینەوە کاردانەوەیە بەرامبەر بە پشت بەستن بە خەڵکی. واتە بۆ رەتکردنەوەی ئەوەیە کە رێگە بدەین خەڵکی کۆنترۆڵمان بکەن و بمانچەوسێننەوە و بچوکمان بکەنەوە و بە ویستی خۆیان بمانهێنن و بمانبەن.

چەمکی یەکتر تەواوکردن کەمی لەسەر وتراوەو زۆربەمان بە باشی تێی نەگەیشتوین. تەنانەت هەندێکیشمان وای دەبینین کە لایەنێك لە پشت بەستنی تێدایە بە خەڵکی. لەبەر ئەوە دەبینین خەڵك، وە زۆرجار لەبەر هۆکاری خۆپەرستی، واز لە هاوسەرو منداڵەکانیان دەهێنن و هەمو شێوەکانی بەرپرسیارێتییە کۆمەڵایەتییەکان رەتدەکەنەوە. هەموشی لەژێر دروشمی پشت بەخۆ بەستندا.

ئەم جۆرە کاردانەوەیە کە گوایە خەڵکی ئازادو رەتکەرەوەی کۆت و بەندەکان دروست دەکات و چییان پێخۆش بێ وا دەکەن لەراستیدا جۆرێکی زۆر خراپترن لە پشت بەستن بە خەڵکی دیکە کە دەربازبون لێی مەحاڵە چونکە زیاتر لەوەی هۆکارە دەرەکییەکان سەپاندبێتیان، لە ناخی کەسەکەوە هەڵقوڵاوە. بۆ نمونە ئەوەی کە رێگە بدات لاوازیی کەسێکی دیکە ژیانی ئەم وێران بکات یان ئەوانەی وا هەست دەکەن قوربانی دەستی خەڵك و رووداوگەلێکن لە دەرەوەی دەسەڵاتی ئەمان.

بێگومان ئێمە پێویستە هەوڵی گۆڕینی بارودۆخەکان بدەین. بەڵام کێشەی پێگەیشتن مەسەلەیەکی تاکەکەسییە و پەیوەندی زۆر کەمی بە بارودۆخەکانەوەیە. زۆرجار دەبینین سەرەڕای باشبونی بارودۆخەکانیش پشت بەستن و ناکاملی هەر بەردەوام دەبێت.

سەربەخۆیی راستەقینە هێزی ئەوەمان پێدەبەخشێت ببینە مرۆڤی بکەر نەك لەژێر بەزەیی کردەوەکانی خەڵکیدا بین. مرۆڤی سەربەخۆ نە پشت بە بارودۆخەکە دەبەستێت و نە بە خەڵکانی دیکە. لەبەر ئەوە سەربەخۆیی ئامانجێکە شایستەی ئەوەیە بەدی بهێنیت، بەڵام سەرباری ئەمەش ئامانجی کۆتایی ژیانی کاریگەر پشت بەخۆ بەستن نییە. بیرۆکەی سەربەخۆیی و پشت بەخۆ بەستن بە تەنیا لەگەڵ

مەسەلەی یەكتر تەواوكردندا ناگونجێت. ئەو كەسانەی كە پشت بەخۆ بەستن پەیڕەو دەكەن و هێندە پێگەیشتو نین لە چوارچێوەی یەكتر تەواوكردندا لەگەڵ خەڵكیدا بیربكەنەوە و چالاكی بنوێنن ڕەنگە لەسەر ئاستی تاكەكەسی مرۆڤی سەركەوتو بن بەڵام ناتوانن ببنە سەركردەو ئەندامی كارە دەستەجەمعییەكان، چونكە بەرهەمی پارادایمی یەكتر تەواوكردن نین كە پارادایمێكی پێویستە بۆ بەدیهێنانی سەركەوتن لە دنیا واقیعییەكەی هاوسەرگیری و خێزان و دامودەزگاكاندا.

ژیان بە سروشتە رووتەكەی خۆی بەرزترین ئاستی یەكتر تەواوكردنە لەگەڵ خەڵكیدا. لەبەر ئەوە تۆ ئەگەر بتەوێت لە روانگەی پشت بەخۆ بەستنەوە ئەوپەڕی چالاكی و دەوروتەئسیرت هەبێت وەكو ئەو كەسەت لێ بەسەردێت كە بیەوێت بە داری گۆڵف تێنس بكات. ئامرازەكە هەرگیز لەگەڵ واقیعەكەدا ناگونجێت.

چەمكی یەكتر تەواوكردن لەگەڵ خەڵكیدا قوڵتر و پێشكەوتوترە. من ئەگەر لەرووی جەستەیی‌یەوە یەكتر تەواوكردن پەیڕەو بكەم و متمانەم بە خۆم هەبێت و بێتواناش نەبم ئەوا لەهەمان كاتدا درك بەوە دەكەم كە ئێمە، من و تۆ، كاتێك پێكەوە كار دەكەین دەتوانین دەستكەوتی زۆرباشتر چنگ بخەین زیاتر لەوەی كە من بە تەنیاو لە باشترین دۆخی خۆمدا بەدەستی دەهێنم.

یەكتر تەواوكردنیش لە بواری سۆزدارییدا وام لێ دەكات بگەمە ئەوپەڕی متمانە بەخۆكردن. لەهەمان كاتیشدا درك بەوە دەكەم كە چەند پێویستم بە خۆشەویستی و بەخششی خەڵكانی دیكەیە. یەكتر تەواوكردنیش لە بواری هزردا وام لێ دەكات تێبگەم چەند پێویستم بەوەیە كە بەشداریكردنی خەڵك لە بیركردنەوەكاندا چ دەرەنجامێكی چاكی دەبێت.

من ئەگەر بەرنامەی یەكتر تەواوكردن لەگەڵ خەڵكیدا پەیڕەو بكەم هەل ئەوەشم بۆ هەڵدەكەوێت قوڵتر و جدیتر بەشداری بكەم و دەستم بگات بە سەرچاوەی توانا فراوانەكانی خەڵكانی دیكەدا. یەكتر تەواو كردن لەگەڵ خەڵكیدا ڕێگایەكە تەنیا ئەو كەسانە دەتوانن هەڵی ببژێرن كە سەربەخۆن و پشتیان بەخۆیان بەستووە. مرۆڤی پشت بەستوو بە خەڵكانی دیكە توانای ئەوەی نییە بچێتە ژێر ئاڵای هاوكاریكردن لەگەڵ خەڵكدا چونكە خاوەنی كەسایەتییەكی وا

نی‌یە رێگەی ئەوەی پێبدات. هێندە خاوەنی خۆی نی‌یە بەشی ئەو بڕیارە بکات.

لەبەرئەوە خووەکانی یەك و دوو و سێ ئەم کتێبە باس لە مەسەلەی خۆ کۆنترۆڵکردن دەکەن. ئەم خووانە وا لە مرۆڤ دەکەن لە دۆخی پشت بەستن بە خەڵکی‌یەوە بڕۆن بۆ دۆخی یەکتر تەواوکردن. ئەمە وەکو سەرکەوتنەکانی تاکە کەسی وایەو گەوهەری گەشەکردنی کەسایەتییە.

سەرکەوتنەکانی تاکە کەسی دەکەونە پێش سەرکەوتنە دەستەجەمعی‌یەکانەوە. کەس ناتوانێت ئەم پڕۆسەیە پێچەوانە بکاتەوە چونکە وەکو ئەوە وایە پێش تۆو کردن بەروبومەکە دروێنە بکەیت.

مرۆڤ ئەگەر بەراستی سەربەخۆ بێت مانای وایە خاوەنی ئەو بناغە پتەوەیە کە بتوانێت کاریگەر بێت و لەگەڵ خەڵکیدا یەکتر تەواو بکات.

کەسایەتی مرۆڤی سەربەخۆ دەبێتە ئەو بنکەیەی دەتوانێت لێوەی دەرپەڕێت بە شێوەیەکی چالاك و لە چوارچێوەی سەرکەوتنە تایبەتەکاندا کە بە تەواوی دەگونجێن لەگەڵ ئاراستە تایبەتەکان و رەهەندەکانی کاری دەستەجەمعی و هاوکاری و پەیوەندی (خووەکانی ژمارە چوار و پێنج و شەش).

ئەمە مانای وانی‌یە کە مرۆڤ ئەگەر لە خووەکانی یەك و دوو و سێدا کەسێکی نمونەیی نەبێت ئەوا ناتوانێت کاربکات بە خووەکانی چوار و پێنج و شەش. گومانی تێدا نی‌یە کە تێگەیشتن لە ریزبەندی کردن بایەخەکان یارمەتی دەرت دەبن لە پێشکەوتنندا بەلام من هەرگیز داوای ئەوەت لێ ناکەم چەندین ساڵ خۆت گۆشەگیر بکەیت بۆ ئەوەی خووەکانی یەك و دوو و سێ بە تەواوی تێبگەیت. ئێمە وەکو بەشێك لەم جیهانەی کە یەکتر تەواوکردن لەگەڵ خەڵکیدا پەیڕەو دەکات پێویستە هەمو رۆژێك بچینەوە ناو ئەم جیهانە. بەلام کێشە توندو تیژەکانی ئەم جیهانە زۆر بە ئاسانی دەتوانن مەسەلە درێژخایەنەکانی کەسایەتی بشارنەوە.

لەبەرئەوە تێگەیشتنی ئەو دۆخەی کە ئێستا تێیدایت و کاریگەریتی ئەو دۆخە لەسەر هەمو مامەڵەیەکت لە چوارچێوەی یەکتر تەواوکردندا یارمەتیدەرێکی باشت دەبن بۆ ئەوەی هەمو تواناکانت چڕ بکەیتەوەو هاوئاهەنگیان بکەیت لەگەڵ یاسا سروشتی‌یەکانی گەشەکردندا. خووی ژمارە حەوت تایبەتە بە نوێکردنەوە — نوێکردنەوەی رێکخراو و هاوئاهەنگ لەگەڵ هەر چوار بوارەکەی ژیاندا. ئەم خووە

چوارچێوەی هەمو خووەکانی دیکەیە و ئەوانی لەخۆ گرتووە. خووی ژمارە حەوت بریتییە لەو چاکسازییە بەردەوامەی کە گەشەکردنە لولپێچییە رو لە هەورازەکە دەخولقێنێت. وات لێ دەکات باشتر و قولتر لەیەک بەیەکی خووەکان تێبگەیت و لە ئاستێکی بڵندتر و گەشەسەندوتردا ئەنجامیان بدەیت.

وێنەکێشراوەکەی لاپەڕەی دوایی ریزبەندی حەوت خووەکەو هاوکاری نێوانیان نیشان دەدات. هەمو جارێکیش کە باسی پەیوەندی و هاوئاهەنگی خووەکان بکەین وێنەکە دوپات دەکەینەوە.

## پێناسەکردنی کاریگەرێتی

حەوت خووەکە لە بنەڕەتدا خووی کاریگەرێتین. ئەمانە چونکە لەسەر پرنسیپ داڕێژراون زۆرترین سودی درێژخایەنیان لێ دەکەوێتەوە. ئەم خووانە دەبنە بناغەی کەسایەتی مرۆڤ و نەخشەیەکی وا راست و دروست دەهێننە بەرهەم کە مرۆڤ بتوانێت لە سایەیەوە کێشەکان بە باشی چارسەر بکات و فرسەتەکان بگەیەنێتە ئەوپەڕ و بەردەوامیش پرنسیپەکانی دیکە تێبگات و جێبەجێیان بکات. لەسەر لولپێچە رووەو هەورازەکەی گەشەکردن. حەوت خووەکە خووی کاریگەرێتین لەبەر هۆکارێکی دیکەش. ئەویش ئەوەیە کە پارادایمی ئەم خووانە هاوئاهەنگن لەگەڵ یاسایەکی سروشتیدا، کە پرنسیپێکە من پێی دەڵێم هاوسەنگی نێوان بەرهەم و توانای بەرهەم (ب/تب) کە زۆر کەس خۆی بۆ لەناودەبات. بیرۆکەی ئەم پرنسیپەش دەتوانرێت لە چیرۆکە ئەفسانەیییەکەی هێلکە ئاڵتونییەکەوە روون بکرێتەوە.

چیرۆکە ئەفسانەیییەکە باسی جوتیارێکی هەژار دەکات کە رۆژێک لە رۆژان دەبینێت قازەکەی لەسەر شتێك کرکەوتووە دەدرەوشێتەوە. یەکەمجار باوەڕی بە چاوی خۆی نەکرد بەڵام دواتر کە دەستی لێ داو بە باشی لێی وردبۆوە بۆی دەرکەوت هێلکەیە و هێلکەیەکی ئاڵتونییشە.

هێلکەکە بریتی بو لە هێلکەیەکی ئاڵتونی روت. جوتیارەکە بڕوای بەوە نەکرد بەخت هێندە یاوەری بێت ئەم سامانە زۆرەی بۆ دەستەبەر بکات، بەڵام مەسەلەکە لە دووەم رۆژیشدا دوپات بووەوە. ئیتر رۆژ لەدوای رۆژ جوتیارەکە کە لە خەو هەڵدەستا یەکسەر رایدەکرد بۆ کولانەی قازەکەو هێلکەیەکی ئاڵتونیی هەڵدەگرتەوە

بەمەش وردە وردە دەوڵەمەند بو تا وای لێ هات سامانێکی زۆری پێکەوە نا.

بەڵام هەتا ئەم دەوڵەمەندتر دەبو هەڵپەو تەماعەکانیشی زیادیان دەکرد. وای لێ هات خۆی پێ ڕانەگیرێت و بەرگەی ئەوە نەگرێت شەو و ڕۆژێکی رەبەق چاوەڕێ بکات قازەکە هێلکەیەکی بداتێ بۆیە بڕیاری دا سەری ببڕێت و بە یەکجار هەمو هێلکەکانی دەست بکەوێت بەڵام کاتێک کە سکی قازەکەی هەڵدڕی تەماشای کرد چۆڵ و هۆڵە، یەك هێلکەی ئاڵتونیشی تێدانەبو. بەم جۆرە جوتیارەکە ئەو قازەی لەناوبرد کە سەرچاوەی بەرهەکەی بو.




پارادایمی ٧ خووەکە

من پێم وایە ئەم چیرۆکە ئەفسانەیی‌یە یاسایەکی سروشتی لەخۆ گرتووە، باسی ئەو پرنسیپە دەکات کە بریتی‌یە لە پێناسە بنەڕەتی‌یەکەی کاریگەرێتی.

زۆربەی خەڵك لە گۆشەنیگای هێلکە ئاڵتونی‌یەکەوە کاریگەرێتی دەبینن: هەتا بەرهەمت زیاد بێت، کارت زیاد دەبێت و کاریگەرێتیت زیاد دەبێت.

بەڵام وەك چیرۆکەکە بۆی روونکردینەوە کاریگەرێتی راستەقینە لە دوو بەش پێك دێت، بەشە بەرهەمهێنراوەکە (کە هێلکە ئاڵتونی‌یەکەیە) و سەرچاوەی بەرهەمهێنان یاخود توانای بەرهەمهێنان (کە قازەکەیە). مرۆڤ ئەگەر لە ژیانیدا رێبازێکی پەیڕەوکرد کە هەر چاوی لە هێلکە ئاڵتونی‌یەکان بێت و گوێ نەداتە قازەکە ئەوا هێندەی پێناچێت ئەو سەرچاوەیەی لەکیس دەچێت کە هێلکە ئاڵتونییەکەی بۆ دابین دەکات. لەلایەکی دیکەوە، مرۆڤ ئەگەر تەنیا هەر قازەکە بەهەند وەربگرێت و واز لە ئامانجەکە بهێنێت کە هێلکە ئاڵتونی‌یەکەیە ئەوا زۆری پێ ناچێت سەرمایەکەی لەکیس دەچێت و هەرچی‌یەکی هەیە لە بەخێوکردنی قازەکەدا خەرجی دەکات.

کرۆکی کاریگەرێتی لە هاوسەنگیدایە– ئەوەی کە من پێی دەڵێم هاوسەنگی بەرهەمهێنان و توانای بەرهەمهێنان.

(ب/تب) ب بریتییە لە بەرهەمهێنان یاخود بەدیهێنانی ئامانجە خوازراوەکان و وەکو هێلکە ئاڵتونی‌یەکانە. توانای بەرهەمهێنانیش بریتی‌یە لەو سەرچاوەیەی کە هێلکە ئاڵتونییەکان دەکات.

## سێ جۆر ملك

بە شێوەیەکی بنەڕەتی سێ جۆر ملك هەن: ماددی و دارایی و مرۆیی. با ئێستا پێکەوە تەماشای هەر یەکێك لەو سێ ملکە بکەین. چەند ساڵێك لەمەوبەر ئامێرێکی چیمەنبڕم کڕی - ملکێکی ماددی – و بەردەوام هەر بەکارم دەهێنا بێ هیچ خزمەتکردنێك. ئامێرەکە دوو وەرز بە باشی کاری کرد، بەڵام ئیتر وردە وردە پەکی کەوت. کاتێکیش کە دەستم کرد بە چاککردن و تیژکردنەوەی بۆم دەرکەوت نیوەی جاران توانای هەیە. واتە ئیتر بە کردەوە کەڵکی نەما.

بەڵام ئەگەر توانای بەرهەمهێنانم پەیڕەوبکردایە – زوو زوو چاکم

بکردایەتەوەو خزمەتم بکردایە. تائێستاش هەر دەمتوانی بەکاری بهێنم و چێمەنی باخەکەی پێ ببڕم. بەمەش ناچار نەدەبوم کاتێکی زیاتر بەفیڕۆ بدەم و پارەیەکی زیاتر خەرج بکەم بۆ کڕینی ئامێرێکی نوێ لەوەی خەرجم دەکرد ئەگەر خزمەتم بکردایە. ئێمە زۆرجار لەپێناو دەستکەوت و ئامانجی کورتخایەندا توانایەك یاخود ئامرازێکی ماددی بەکەڵك لەناو دەبەین — وەك ئوتومبێل و کۆمپیوتەر و جلشۆر— و تەنانەت جەستەو ژینگەش. پاراستنی هاوسەنگی لەنێوان بەرهەمهێنان و توانای بەرهەمهێناندا وا دەکات بە شێوەیەکی زۆر باشتر سود لە ملکە ماددیەکانمان وەربگرین.

ئەم هاوسەنگی‌یە بەهەمان شێوەش زۆر کاریگەریی هەیە لەسەر ملکە داراییەکانمان. خەڵك زۆرجار پرنسیپ و بەرژەوەندییان لێ تێکەڵ دەبێت. ئایا تۆ رۆژێك لە رۆژان لەپێناوی بەرزکردنەوەی ئاستی ژیانتدا پرنسیپت پێشێل کردووە؟ واتە لەپێناوی هێلکەی زیاتردا قازەکەت لەناوبردووە! پرنسیپی نزم توانای بەدەستهێنانی قازانجی کەمی هەیە. سەرمایەش ئەگەر کەم بێت وردە وردە بچکوتر دەبێتەوە تا وای لێ دێت تەنانەت پێویستییە بنەڕەتییەکانیشی پێدابین ناکرێت.

گرنگترین سەرچاوە داراییەکەمان ئەوەیە توانای پارەپەیداکردنمان هەبێت. لەبەرئەوە ئەگەر بەردەوام لە هەوڵدا نەبین بۆ چاککردنی توانای بەرهەمێنانمان ئەوا وردە وردە ئەگەرەکانی بەردەممان بچوك و بچوکتر دەکەینەوە. لەو پێگەیەی خۆماندا گیردەخۆین و خەمی ئەوەمان دەبێت کە ئاخۆ بەڕێوەبەرەکەمان و دەزگاکەمان رایان چی‌یە لەسەرمان. وامان لێ دێت بکەوینە هەڵوێستی بەرگریکردنەوە و لەرووی ئابورییشەوە خۆمان پێبەخێو نەکرێت. دیارە ئەمەش بە هیچ شێوەیەك پێی ناوترێت کاریگەرێتی.

لە بواری مرۆییشدا راگرتنی هاوسەنگی لەنێوان بەرهەمهێنان و توانای بەرهەمهێناندا هەمان بایەخی سەرەکی هەیە. بەڵکو بایەخەکەی زیاترە چونکە مرۆڤ توانای کۆنترۆڵکردنی توانا ماددی و داراییەکانی هەیە.

لە بواری هاوسەرگیریدا، ئەگەر ژن و مێردەکە هەر لە خەمی هێلکە ئاڵتونییەکاندا بون (واتە بەرژەوەندییەکان) و کەمتر دڵیان لای پەیوەندی نێوانیان و چۆنێتی راگرتنی بێت، ئەوا هیچ هەست و بایەخێکیان دەرهەق بە یەکتری نامێنێت،

چرکەساتەکانی سۆز و نەرمونیانی فەرامۆش دەکەن کە رۆڵێکی گرنگیان هەیە لە قولکردنی پەیوەندییەکانیاندا. بەمجۆرە دەست دەکەن بەوەی چۆن یەکتری بچەوسێننەوە و بۆ مەرامی تایبەتی خۆیان یەکتر بەکار بهێنن، خوو دەدەنە پێویستییە تایبەتەکانی خۆیان و پاساو بۆ هەڵوێست و رەفتارەکانیان دەهێننەوە و بەدوای بەڵگەو شایەتدا دەگەڕێن بۆ تۆمەتبارکردنی ئەوی دیکە. ئیتر خۆشەویستی و میهرەبانی و هەستو سۆز بەرەو پوکانەوە دەڕۆن و رۆژ لەدوای رۆژ قازەکە دەردەکەی کاریگەتر دەبێت.

ئەی سەبارەت بە پەیوەندی باوك و دایك بە مناڵەکەیەوە؟ منالی بچوك زۆر لاوازە و هەڕەشەی هەمو شتێکی لەسەرەو بە تەواوی چاوی لەدەستی دایك و باوکێتی. لەبەرئەوە زۆر ئاسانە پرنسیپی کارگەرێتی (بەرهەمهێنان) توانای بەرهەمهێنان فەرامۆش بکرێت. (راهێنان، پەیوەندیکردن، لەخۆگرتن، گوێگرتن.) زۆر ئاسانە بەکاری بهێنێتو دەستکاری بکەیتو بەئارەزووی خۆت هەڵیسوڕێنیتو چیت لێبوێت بەدەستی بهێنیتو هەر ئێستاش، چونکە تۆ گەورەتریت و زیرەکتریت و لەسەرهەقیت. لەبەرئەوە چ عەیبێکی تیایە فەرمانیان پێبکەیت. ئەگەر پێویستیشی کرد لێیان تورە ببە و سەرزەنشتیان بکەو بیانترسێنە و پێداگری بکە لەسەر رێبازەکەی خۆت.

هەروەها دەشتوانیت نازیان بدەیتێ و بەردەوام دڵت لای هێلکە ئاڵتونییە کۆمەڵایەتیەکە بێت بەوەی هەوڵ بدەیت لێت رازی بن و هەمیشە جڵەویان بۆ شل بکەیت، بەمەش وا رادێن کە هیچ حسابێك بۆ سنور و پێشبینیەکان نەکەن و گوێ نەدەنە هیچ دیسپلینێك و هیچ بەرپرسیاریەتیەك نەگرنە ئەستۆ. ئەم دوو حاڵەتەش – سەرکوتکردنیش و جڵەو بۆشلکردنیش – هەردوکیان سەر بە ئەقڵیەتی هێلکە ئاڵتونییەکەن. دەرەنجامەکەش ئەوەیە کە یاخود بەردەوام دەبیت لەسەر ئەو رێبازەی کە هەڵتبژاردووە یاخود خۆشەویستیت دەست دەکەوێت. بەڵام ئایا، بەم دوو شێوازە، قازەکە چی بەسەردێت؟ ئایا منالەکە پاش چەندین ساڵ، لە کاروانی ژیاندا، چۆن دیسپلینی دەبێت و چۆن هەست بە لێپرسینەوە دەکات و چۆن باوەڕی بە خۆی دەبێت بڕیاری راست هەڵبژێرێت و ئامانجی گرنگ بهێنێتە دی؟

ئـەی پەیوەنـدیی نێوانتـان چـی بەسـەردێت؟ کاتێـك کـە دەگاتـە قۆناغـە هەستیارەکەی هـەرزەکاریی، کـە قۆنـاغی قـەیرانی ناسنامەیە ئایـا لـە روانگـەی ئـەو ئەزمونەوە کە لەگەڵ تۆدا هەیەتی باوەڕ دەکات کە تـۆ پـێش ئـەوەی گـوێی لێ بگریت حـوکمی بەسـەردا نادەیـت و ئایـا تـۆ بەڕاسـتی لـە ناخـەوە دەتـەوێت وەکـو مرۆڤێك بایـەخی پێدەیـت و تـۆ شایسـتەی متمانـەپێکردنیت لـە هـەمو بارودۆخێکـدا؟ ئایـا پەیوەندییەکـە هێنـدە بـەهێزە کـە بتوانیـت لێـی نزیـك ببیتـەوە و پەیوەنـدیی پێـوە بکەیت و کاری تێبکەیت؟

گریمـان تـۆ پێـت خۆشـە کچـەکەت ژوورێکـی پـاكو تـەمیزی هـەبێت. ئەمـە بەرهەمهێنانەکەیە (ب) واتە هێلکە ئاڵتونـییەکەو دەتـەوێت پـاکی بکاتـەوە، ئەمـەش توانای بەرهەمهێنان (بت)ە. کەواتە کچەکەت وەکو قازەکە وایـەو توانـای بەرهـەمێهانـە کە هێلکە ئاڵتونییەکە دەکات.

بەڵام ئەگەر پارادایمەکەت تـەنیا هـەر لەسـەر تـوخمی بەرهەمهێناکـە بێـت واتـە هەر ئەوەت بەلاوە مەبەست بێت کە ژوورەکـە پـاك و تـەمیز بێـت، کەواتـە زۆری لێ دەکەیت، تەنانەت لەوانەشە هەڕەشەی لێ بکەیت و بقیژێنیت بەسەریدا. کەواتـە تـۆ لەپێناوی هێلکە ئاڵتونییەکەدا ئامادەیت دڵخۆشـی و تەندروسـتی قازەکـە بکـەیت بـە قوربانی.

ئێستا با پێکەوە لەو ئەزمونە خۆشە وردبینـەوە دەربـارەی توانـای بەرهـەمهێنان کـە مـن لەگـەڵ یـەکێك لـە کچـەکاندا توشـی هـاتم. ئێمـە خۆمـان ئامـادە دەکـرد بـۆ بۆنەیەکی تایبەت کە هەمو جارێك لەگەڵ هەریەك لە منداڵەکانمـدا رێکمـان دەخسـت و بۆمان دەرکەوت کە وادە پێشنیارکراوەکە زۆر لەگەڵ رووداوەکەدا دەگونجێت.

بۆیە لە کچەکەم نزیکبومەوەو پێم وت ئازیزەکەم ئەمشەو شـەوی تۆیـە. حـەزت لە چیـیە بیکەیت؟ وەڵامی دامەوە هیچم ناوێ بابە.

- نا بە ڕاستی حەزت لە چییە؟

دواجار وتی ئاخر ئەوەی کە من حەزم لێیەتی تۆ بەدڵ حەزت لێ نـییە.

وەڵامـم دایـەوە: بەڕاسـتیمە ئازیزەکـەم. شـتەکە بەدەسـت تۆیـە. حـەزت لـە چـی بێت ئەیکەم.

وەڵامی دامەوە مادام وای لێ هات حەزئەکەم جـەنگی ئەستێرەکان ببینم بـەڵام تـۆ

حەزت لێ نییە، تۆ ئەوجارە لەکاتی فیلمەکەدا خەوت لێ کەوت. حەزت لە فیلمی خەیاڵی نییە، لەبەرئەوە وازی لێ بێنە.

- نا ئازیزەکەم ئەگەر تۆ حەزت لەوەبێت منیش حەزم لێیەتی.

٭ بابە گیان خۆت سەغڵەت مەکە. مەرج نییە ئێمە هەمو جارێك لەم بۆنەیەدا ئاهەنگ بگێڕین.

ئینجا تۆزێك بێدەنگ بو، پاشان وتی: ئەزانی بۆچی تۆ حەزت لە جەنگی ئەستێرەکان نییە؟ لەبەرئەوەی تۆ لە فەلسەفە و مەشقەکانی (جێدی) سوارچاك تێناگەیت.

وتم: چی؟

وتی: تۆ لەو بابەتانەی خۆت تێدەگەیت کە بە دەرس دەیانڵێیتەوە بابە؟ ئەوان رێك وەك مەشقەکانی جێدی سوارچاك وان.

- بەڕاست؟ دە کەواتە با بچین بۆ جەنگی ئەستێرەکان.

ئەوەبو رۆیشتین و کچەکەم لە تەنیشتمەوە دانیشت و پارادایمەکەی پێبەخشیم. بوم بە شاگرد و خوێندکاری و مەسەلەکە زۆر سەرنج راکێش بو. وام لێ هات بتوانم لە پارادایمێکی نوێوە فەلسەفەو مەشقی (جیدی) سوارچاك تێبگەم لە بارودۆخە جیاوازەکاندا. ئەو ئەزمونەی تایبەت بە (ب) واتە بەرهەمهێنان شتێك نەبو لەوەوپێش نەخشەی بۆ کێشرابێ، بەڵکو بەروبومێکی خۆڕسکی سەرمایەگوزاری کردن بو لە بواری توانای بەرهەمهێناندا. ئەزمونەکە هەم شتێکی زۆر قبولکراو بو هەم واشی لێ کردین کە پابەندی بین بەڵام چێژمان لێ وەرگرت (لە هێلکە ئاڵتونییەکان) چونکە بەو شێوەیە قازەکەش (کە بریتییە لە پەیوەندی باشی زۆرچاك) خۆراکی پێدرا.

## توانای بەرهەمهێنانی رێکخراوەیی

هەمو پرنسیپێکی باش کۆمەڵێك رەهەندی زۆر بایەخداری هەیە. یەکێك لە رەهەندەکان ئەوەیە رەوا بێت و بتوانرێت لە بارودۆخە جیاوازەکاندا جێبەجێ بکرێت. من پێم خۆشە لەم کتێبەدا پێکەوە هەندێ لەو رێوشوێنانە باس بکەین کە بواری جێبەجێ کردنی ئەم پرنسیپانە دەگونجێنن لە دەزگا جۆراوجۆرەکاندا بە خێزان و تاکەکانی کۆمەڵیشەوە.

مـرۆڤ کاتێـك شکسـت دەهێنێـت لـە راگرتنـی هاوسـەنگی نێـوان بەرهـەمهێنان و توانـای بەرهەمهێنانـدا بـەهۆی بـەکارهێنانی سەرچـاوەو کەرەسـە مادییـەکانی نـاو دەزگاکانیـان ئـەوا لـە کاریگـەرێتی دەزگاکـە کـەم دەکەنـەوەو تەنانـەت هەنـدێ لـە قازەکانیش مردار دەبنەوە.

بـۆ نمونـە ئـەو کارمەنـدەی کـە بـۆ ئـەوەی سەرۆکەکەی لێـی رازی بێـت و خـەڵاتی بکات هێندە ئەو مەکینەیە ئیش پێدەکات کە ئـەم پێیـەتی. شـەو و رۆژ ئیسراحەتی ناداتێ و پاکی ناکاتەوەو خزمـەتی ناکات. ئـەو بـەم کارە بەرهـەمهێنان زیاد دەکات و کرێی تێچون دادەبەزێنێت کە قازانج دەگەیەنێتـە کەشـکەلانی فەلـەك. لـە ماوەیـەکی کەمیشـدا پلەکـەی بـەرز دەکرێتـەوەو خـەڵات وەردەگرێـت و هێلکـە ئاڵتونییـەکانی دەست دەکەوێت.

بەڵام ئەو کەسەی کە دێتە شوێنی ئەم کابرایە ئامێرێکی بۆ دەمێنێتـەوە کـە وەکو قـازێکی نـەخۆش وایـە. ژەنگـی هـەڵهێناوەو خێراخێـراش لـەکار دەکـەوێت. هـەروەها ناچار دەبن پارەی تیا خەرج بکەن بۆ چاککردنەوەی. دیارە ئـەو ماوانـەش کـە پـەکی دەکەوێت زیانێکی زۆری ماددی بە دەزگاکە دەگەیەنێت .. بەمـەش کـرێی تێچونەکان دەگاتـە کەشـکەلانی فەلـەك و قـازانج کـەم دەبێتـەوە. بـەڵام ئایـا کـێ بەرپرسـیاری لەدەستچونی هێلکە ئاڵتونییەکانە؟ تـۆ! نـەخێر کارمەندەکەی پێش خـۆت کـە هـەمو هەڵاڵـەی سەرچـاوەی بەرهەمهێنانەکـەی بـۆ خـۆی هەڵمـژی، بـەڵام سیسـتمە ژمێرپاریەکـە تـەنیا هـەر بەرهـەمهێنانی ئامێرەکـە دەبینێـت لەگـەڵ قـازانج و مەسرەفەکانیدا.

راگرتنـی هاوسـەنگی هـەردوو توخمەکـەی بەرهـەمهێنان و توانـای بەرهـەمهێنان بایـەخێکی تایبـەتی هەیـە لـەکاتی جێبـەجێ کردنیدا لەسـەر ئـامرازە مرۆییـەکانی دام‌ودەزگاکان کە مەبەستمان کارمەندان و کڕیارەکانە.

یەکێك لە چێشتخانەکان ناوبـانگێکی زۆر باشـی پەیـداکرد بـەوەی کـە شـۆربایەکی زۆر بـەتامی ماسـی هەبـو. نیـوەڕوان ئـەو چێشتخانـەیـە بەرنەدەکـەوت. پـاش ماوەیـەك سـەرمایەگوزارێکی نـوێ هـات و چێشـتخانەکەی کـڕی. ئـەم سـەرمایەگوزارە تـەنیا هـەر هێلکـە ئاڵتونییەکـەی بـەلاوە گـرنگ بـو لەبەرئـەوە بڕیـاری دا ئـاوی زیـاتر بکاتە شۆرباکەوە. لە مـاوەی مانگێکدا کـرێی تێچون کـەمی کـردو داهـات وەکـو خـۆی

مایەوە. کڕیارەکان وردە وردە لێی تەکینەوە. متمانە نەماو چێشتخانەکە تا دەهات خراپتر دەبو. خاوەنەکەی زۆر هەوڵی دا مەسەلەکە چارەسەر بکات بەڵام کەڵکی نەبوچونکە لەوەوپێش گوێی نەدابووە کڕیارەکان و متمانەیانی لەدەست دابو ئەمەش وایکرد توانای بەرهەمهێنان لەدەست بدات و هیچ پەیوەندییەکی پێیانەوە نەمێنێت. ئیتر ئەو قازەش نەما کە هێلکەی ئاڵتونی دەکرد.

هەندێك دامودەزگا هەن کە شەو و رۆژ باسی کڕیار دەکەن. بەڵام هەمو ئەو کەسانە فەرامۆش دەکەن کە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ کڕیارەکانیدا هەیە، ئەوانیش کارمەندەکانن. توانای بەرهەمهێنان پرنسیپێکی هەیە دەڵێت پێویستە هەمیشە رێك بەو شێوەیە رەفتار لەگەڵ کارمەندەکانتدا بکەیت کە پێت خۆشە ئەوان لەگەڵ باشترین کڕیاری تۆدا بینوێنن. بەکرێگرتنی کرێکار کارێکی ئاسانە بەڵام راگرتنی دڵی ئەو کرێکارە زەحمەتە. دڵ سەرچاوەی جۆش‌وخرۆش و شوێنی دڵسۆزییە. ئەو کارمەندەی کە لەلاتە رەنگە هەشت سەعاتەکەی خۆی کاربکات بەڵام گرنگ ئەوەیە مێشکی لای کارەکەی بێت. مێشك سەرچاوەی داهێنان و لێهاتویی و ئەو گەنجینەیەیە کە کۆتایی نایەت. کرۆکی توانای بەرهەمهێنان ئەوەیە کە کارمەندەکان وەك خۆبەخش ببینیت رێك وەکو کڕیارەکان کە ئەوانیش خۆبەخشن چونکە بەراستی کارمەندیش خۆبەخشە. ئەوان ئەگەر خۆبەخش نەبن ناتوانن باشترین مولکی خۆیانت پێ ببەخشن کە دڵ‌و مێشکیانە.

من جارێکیان لەگەڵ کۆمەڵێك کەسدا بوم کە یەکێکیان لەوی دیکەی پرسی دەنگوباست چۆنە لەگەڵ کارمەندە تەمەڵ و بێ تواناکانتدا. یەکێك وەڵامی دایەوە نارنجۆکیان تێ‌دەگرم. زۆربەیان ئەم وەڵامەیان پێ‌خۆش بو کە رێبازێکی یەکلاکەرەوەیە لە چاودێری کارگێڕیدا و دەڵێت یان چاکیان کە یان پاکیان کە.

یەکێك لە ئامادەبوان پرسیاری کردو وتی کێ لاشەکان کۆدەکاتەوە؟

- لاشەی لێ نابێت.

کەسەکەی دیکە پرسیاری کرد: ئەی بۆ لەگەڵ کڕیارەکانتدا هەمان شت ناکەیت؟ پێیان بڵێ ئەگەر شتەکە ناکڕن فەرمو خێرا بچنە دەرەوە.

وەڵامی دایەوە: کڕیار نابێ وا رەفتاری لەگەڵدا بکرێ.

- ئەی بۆچی لەگەڵ کارمەندەکاندا دەکرێت؟

★ چونکە ئەوان لای تۆ ئیش دەکەن.

- وا بیردەکەیتەوە؟ ئیتر چۆن چاوەڕوان دەبیت دڵسۆزت بن و بە باشی ئیش بکەن. بەراست چەند کەس وازی هێناوە؟

★ ئەوە بەراستیتە؟ لەم سەردەمەدا کارمەندی دڵسۆز کوا ماوە؟

کەس هیچی بەلاوە گرنگ نییە. نایەتە سەر کارەکەی و هەر ئەوەندە دەزانیت واز دەهێنێت و ئیشێکی دیکە دەدۆزێتەوە.

- ئەم جەختکردنە لەسەر هێلکە ئاڵتونییەکان و ئەم ئاراستە و پارادایمە بە هیچ شێوەیەك کارێکی گونجاو نییە بۆ وەبەرهێنانی وزە گەورەکانی دڵ و مێشکی مرۆڤێکی دیکە. دیارە بەدیهێنانی دەستکەوتێکی گەوهەری لە ماوەیەکی کەمدا مەسەلەیەکی گرنگەو هیچ گومانێکی تێدا نییە بەڵام ئەمە گرنگترین شت نییە.

کاریگەرێتی لە هاوسەنگیدایە. بەبێ دەستبەرکردنی هاوسەنگی، کاریگەری نایەتەدی. زیادەڕەوی کردن لە جەختکردنەسەر بەرهەمهێنان دەبێتە تێکچونی باری تەندروستی و پەککەوتنی ئامێرەکان و لێ رۆیشتنی حساباتە بانقییەکان و لەتوپەت بونی پەیوەندییەکان. بەهەمان شێوەش زیادەڕەوی کردن لە هەڵسوکەوت کردندا لەگەڵ توانای بەرهەمهێناندا وەکو ئەو کەسە وایە کە رۆژی سێ چوار سەعات رابکات و دڵخۆش بێت بەوەی کە دە ساڵی زیادە هاتۆتە سەر تەمەنی بێ ئەوەی بزانێت ئەو دە ساڵەی تەمەنی لە راکردندا بەسەردەبات.

یان وەکو ئەو کەسە وایە کە هەمیشە هەر دەخوێنێت و دەخوێنێت بێ ئەوەی هیچ بەرهەمێکی هەبێت و لەسەر هێلکە ئاڵتونییەکانی خەڵکی دیکە دەژی.

راگرتنی هاوسەنگی لەنێوان بەرهەمهێنان و توانای بەرهەمهێناندا یان لەنێوان هێلکە ئاڵتونییەکە (بەرهەمهێنان) و تەندروستی و بەختەوەری قازەکەدا (ئەوەی کە توانای بەرهەمهێنانی هەیە) زۆرجار بانگەوازێکی زەحمەتەو کەم کەس دەچێتە ئەقڵییەوە. بەڵام من ئەمە بە کرۆکی راستەقینەی کاریگەرێتی دەزانم کە هاوسەنگی بەدی دەهێنێت لە بەینی هەردو بەرژەوەندییە کورتخایەن و درێژخایەنەکەدا. هاوسەنگی دەهێنێتە دی لەنێوان پلەی زانستی و بەخشینی پارەی فێربونەکە. هاوسەنگی دەهێنێتە دی لەنێوان ئەوەی پێت خۆش بێت ژورێکی پاکوتەمیز

ببینیت و ئەوەی کە پەیوەندییەکی وات هەبێت لەگەڵ کچەکەتدا کە خۆی بڕیار بدات ژوورەکە پاك بکاتەوە- بە خۆشحاڵییەوە پاکی بکاتەوە بێ ئەوەی کەسێکی دەرەکی چاودێری بکات.

جەختکردنەسەر هێلکە ئاڵتونییەکان ئەو پرنسیپەیە کە دەتوانیت لە ژیانی خۆتدا تاقی بکەیتەوە کاتێك کە لە پێناوی بەرهەمی زیاتردا مۆمەکە لە هەردو سەرییەوە دادەگیرسێنێت پاشان هەر هیلاکی و نەخۆشییت بۆ دەمێنێتەوە بێ ئەوەی توانای بەرهەمهێنانی هیچ شتێکت هەبێت بەڵام هاوشەنگی ئەوەیە کە شەو خەوێکی قوڵت لێ دەکەوێت و ئیتر بەیانییەکەی خەبەرت دەبێتەوە و ئامادەیت بۆ کاروبەرهەمهێنان. تۆ دەتوانیت لە پێناوی بەدەستهێنانی مەبەستەکەتدا گوشار بخەیتە سەر بەرامبەرەکەت بەڵام دواتر دەبینیت پەیوەندییەکەی نێوانتان هیچ گڕوتینێکی تیا نەماوە؛ یاخود خۆت تەرخان دەکەیت بۆ سەرمایەگوزاریکردن لە پەیوەندییەکداو کەچی دەبینیت تواناو ئارەزوی پەیوەندی و کارکردنتان پێکەوە پێویستی بە وەرچەرخانێکی گەورە هەیە. هاوسەنگی نێوان ب/ تب کرۆکە راستەقینەکەی کاریگەرێتییە. ئەمە لە هەمو بوارێکی ژیاندا پشتڕاست دەبێتەوە. گرنگ نییە لەگەڵیدابیت یان دژی بیت، گرنگ ئەوەیە هەیە. ئەم هاوسەنگییە وەکو بورجی رێنمایی پاپۆڕەکان وایە لە دەریادا. ئەو پێناسەو پارادیمەی کاریگەرێتییە کە حەوت خووەکەی ئەم کتێبەی لەسەر داڕێژراون.

## چۆن ئەم کتێبە بەکاردەهێنیت؟

پێش باسکردنی (حەوت خووەکەی کەسانی پێشەنگ) پێم خۆشە پێشنیاری دو وەرچەرخانی پارادامیت بۆ بکەم کە دەستکەوتەکانت لەم کتێبە چەند بەرامبەر دەکەن.

یەکەم، پێم باشە کە تۆ ئەم بابەتە وەکو کتێبێك نەبینیت بەو مانایەی کە شتێکە یەکجار بیخوێنیتەوەو بیخەیتە سەر رەفەیەك.

رەنگە پێت باش بێت یەکجار بەتەواویی کتێبەکە بخوێنیتەوە بۆ ئەوەی بەگشتی لێی تێبگەیت، بەڵام بابەتەکانی ناو ئەم کتێبە وا داڕێژراون کە لە پرۆسەی گۆڕین و گەشەکردنی بەردەوامدا "هەمیشە هاوڕێت بێت. بابەتەکان وا رێك خراون کە وردە

ورده شتەکانی تیا کۆببنەوەو لە کۆتایی هەمو خوویەکیشدا چەند پێشنیارێکی جێبەجێکردن دانراوە بۆ ئەوەی بتوانیت باشتر تێی بگەیت و بەپێی توانای خۆت جەخت بخەیتە سەر هەر خویەك کە دەتەوێت.

کە قوڵیش دەبیتەوە لە تێگەیشتن و جێبەجێکردنی بابەتەکانیدا، دەتوانیت هەر کاتێك بتەوێت بگەڕێیتەوە سەر پرنسیپە تایبەتەکانی خووە جیاجیاکان و ئینجا کار بۆ فراوانکردنی ئارەزووەکانت و زانیاری و شارەزاییەکانت بکەیت.

دووهەم، پێشنیارت بۆ دەکەم کە وەرچەرخانێکی وا لە پارادیمتدا دروست بکەیت کە بەشدارییکردنت لەم کتێبەدا لە رۆڵی خوێندکارەوە ببێت بە مامۆستا. رێکارێکی لە ناوەوە بۆ دەرەوە بگرەبەرو بەو نیازەوە بیخوێنەرەوە کە ئەوەی فێری دەبیت لە ماوەی چلوهەشت سەعاتی داهاتودا بۆ کەسێکی نزیکی خۆتی باس بکەیت و گفتوگۆی لەسەر بکەن.

بۆ نمونە تۆ ئەگەر بابەتی هاوسەنگی نێوان بەرهەمهێنان و توانای بەرهەمهێنان بەو نیازە بخوێنیتەوە کە لە ماوەی چلوهەشت سەعاتی داهاتودا بۆ کەسێکی دیکەی روون دەکەیتەوە ئایا هەروەکو جاری جاران دەیخوێنیتەوە. تکایە هەر ئێستا ئەم مەسەلەیە تاقی بکەرەوەو برگەی کۆتایی ئەم بەشە بەوشێوەیە بخوێنەرەوە کە بۆ کەسێکی دیکەی روون بکەیتەوە. بەو نیازەوە کتێبەکە بخوێنەرەوە کە ئەمرۆ سبەی بۆ هاوسەرەکەت و منداڵەکەت و هاوکارەکەت و هاوڕێیەکتی روون دەکەیتەوە. واتە هەر گەرماوگەرم تیایدا دەبیتە مامۆستا ئینجا ببینە بزانە چۆن گۆڕانکارییەك لە دڵ و دەروونتدا دێتە دی.

من بەڵێنت دەدەمێ پەیڕەوکردنی ئەم شێوازە لە بەشە جیاجیاکانی کتێبەکەدا نەك هەر وات لێ دەکات ئەوەی دەیخوێنیتەوە بیرت بمێنێت بەڵکو ئاسۆی تێڕوانینیشت بۆ مەسەلەکان فراوانتر دەبێتو قوڵتر لە شتەکان تێدەگەیت و ئارەزوی جێبەجێکردنیشت زیاتر دەبێت. سەرباری ئەمانەش کە تۆ بەوپەڕی پاکی و راشکاوییەوە کەسێکی دیکە بەشداردەکەیت لە بابەتەکەدا ئەوا بەرامبەرەکەت دڵی لێت پاك دەبێتەوەو هەرچی بیروبۆچونێکی خراپی هەبوبێت لەسەرت دەستبەجێ نامێنن. ئیتر تۆ لەبەرچاوی ئەوکەسەی کە فێری دەکەیت دەبیتە مرۆڤێکی گەورە کە هەمیشە دەگۆڕێت و گەشە دەکات و خوێندکارەکانت زیاتر ئامادە دەبن بۆ

هاوکاری و پشتگیریکردنت لە کارەکەتداو رەنگە دەستبخەنە ناو دەستیشتەوە بۆ بەرجەستەکردنی حەوت خووەکە لە ژیانتدا.

## چاوەڕوانی چی دەکەیت؟

مارلین فیریگسۆن زۆر راست دەکات کە دەڵێت: گۆڕینی مرۆڤ بەدەست کەس نییە بەدەست خۆیەتی، هەریەکێك لە ئێمە پاسەوانی دەروازەی گۆڕانەو دەرگاکەشی هەر لە ناوەوە دەکرێتەوە. کەس ناتوانێت دەروازەی کەسێکی دیکە بکاتەوە، نە بە پاڕانەوەو نە بە گفتوگۆ.

تۆ ئەگەر بڕیار بدەیت دەروازەکەی خۆت بکەیتەوە لەپێناوی تێگەیشتن و جێبەجێ کردنی راستەقینەی پرنسیپەکانی ناو حەوت خووەکە ئەوا من بە هەمو باوەڕو متمانەیەکەوە دڵنیات دەکەمەوە کە گەلێك رووداوی ئەرێنیت تێدا روودەدات.

یەکەم، هەرچەندە گەشەکردنەکەت وردە وردە دەچێتە پێشەوە بەڵام کاریگەرییەکەی کۆتایی زۆر دراماتیکی دەبێت. ئایا تۆ لەگەڵمدا نیت کە پرنسیپی هاوسەنگی نێوان بەرهەمهێنانو توانای بەرهەمهێنان ئەگەر بەهەمو وردەکارییەکییەوە لە ژیاندا جێبەجێ بکرێت زۆربەی خەڵك و دامودەزگاکان دەگۆڕێن؟

کردنەوەی دەروازەی گۆڕان بەرووی سێ خووەکەی یەکەمدا کە پێیان دەوترێت خووەکانی سەرکەوتنی تایبەت یان کەسێتی، دەرەنجامێکی کۆتایی هەیە. ئەو دەرەنجامەش بریتییە لە زیادبونێکی بەرچاوی متمانە بەخۆکردن. تۆ ئیتر خۆت دەناسیت — سروشتی خۆت و بەهاکانی ناخ و توانا بێ وێنەکەت لە هاوکاریکردندا — کە خۆیشت بە باشی ناسی چاکتر دەتوانیت ئامانجەکانت روون بکەیتەوە و رۆ بچیتە ناو پەیڕەوکردنی ئەو بەهایانەی کە باوەڕت پێیانە. مرۆڤ ئەگەر هەست بکات ناسنامەیەکی هەیە و دەستپاکەو خۆڕاگرە و گوێڕایەڵی بەها راست و دروستەکانی ناخی خۆیەتی ئەوا لە خەڵکانی دیکە زیاتر هەست بە کامەرانی دەکات و شتێك نابێت لێی ناڕازی بێت. مرۆڤی لەوجۆرە لە چاوی خەڵکەوە خۆی هەڵناسەنگێنێت و حەزی لەبەراوردکاری نییە بەڵکو لە ناخی خۆیەوە تەماشای خۆی دەکات و خۆی هەڵدەسەنگێنێت. راست و هەڵە لەلای ئەو کاریگەرییەکی کەمیان هەیە.

خاڵێکی سەرنجڕاکێشی مایەی پێکەنین ئەمەیە کە مرۆڤی لەوجۆرە کەمتر بایەخ

بە بیروبۆچونی خەڵکی دەدات لەسەرخۆی، بە پێچەوانەوە گوێ ناداتە ئەو شتانەو زیاتر ئەوەی لا مەبەستە خەڵککە چۆن تەماشای خودی خۆیان و جیهانەکانیان دەکەن. مرۆڤی لەوجۆرە ژیانی سۆزداری خۆی لەسەر خاڵە لاوازەکانی خەڵك دروست ناکات بەڵکو وای دەبینێت کە گۆڕانکاری ئەوکاتە ئاسان و پێویستە کە ئەگەر هەستی کردشتێك لە ناخی‌دا هەیە مەحاڵە بگۆڕێت.

خۆ ئەگەر بە چاکییش لە سێ خووەکەی دواتر وردبییتەوە کە پێیان دەوترێت خووەکانی سەرکەوتنی دەستەجەمعی ئەوا نەك هەر هەمو تواناو ئارەزووەکانت بۆ روون دەبێتەوە بەڵکو لێیانەوە دەردەپەڕیت بۆ راستکردنەوەو دوپاتکردنەوەی ئەو پەیوەندی‌یە گرنگانەی کە تێك چون یاخود نەماون. پەیوەندی‌یە باشەکان لە باریانـدا هەیە چاکتر و قوڵتر ببن، زیاتریش بچەسپێن و توانای داهێنان و بەرگەگرتنیان هەبێت و رووبەرووی مەترسی‌یەکان ببنەوە.

بەڵام خووی حەوتەم ئەگەر لە ناخی مرۆڤدا ببێتە خوویەکی رەسەن ئەوا هەر شەش خووەکەی پێش خۆی نوێ دەکاتەوە و سەربەخۆیی بۆ مرۆڤ دابین دەکات و وای لێ دەکات زۆر چالاکانە لەگەڵ دەوروبەرەکەیدا یەکتری تەواو بکات. حەوتەمین خوو بوارت بۆ دەڕەخسێنێت پاتری‌یەکانت چارج بکەیتەوە. تۆ ئێستا هەرچییەك بیت دڵنیابە کە تۆ بریتی نیت لە خووەکانت. مرۆڤ دەتوانێت نمونە کۆنەکان بگۆڕێت، ئەو نمونانەی کە دەبنە مایەی رەفتاری وێرانکەر و لە جێگەیان نمونەی باش دابنێت کە بریتین لە خووە تازەکانی کاریگەرێتی و بەختەوەری و متمانە لە پەیوەندی‌یەکاندا.

بەوپەڕی دڵسۆزی‌یەوە داوات لێ دەکەم لەگەڵ خوێندنەوەی ئەم خووانەدا دەروازەکانی گۆڕان و گەشەکردن بکەرەوە. لەگەڵ خۆتدا پشودرێژ بە. گەشەکردنی ناخ مەسەلەیەکی هەستیارە، کارێکی پیرۆزە و هیچ سەرمایە گوزارییەك لەم سەرمایەگوزاریکردنە گرنگتر نی‌یە.

دیارە ئەمە مەسەلەیەك نی‌یە بە خێرایی بێتە بەر، بەڵام دڵنیا بە هەست بە قازانجەکانی دەکەیت و بەرهەمە چاکەکانی دەستبەجێ دەبینیت. یاخود وەکو تۆماس پەین دەڵێت: شتێك بە ئاسانی دەستت بکەوێت نرخی نی‌یە، ناوازەییەکە نرخ دەبەخشێت بە بابەتەکە، هەر خوا خۆی دەزانێت چۆن نرخ بۆ کەرەسەکانی دابنێت.

## بەشی دووەم

# سەرکەوتنی تایبەتی



## خووی یەکەم

# دەستپێشخەر بە



# پرنسیپەکانی خۆبینین

هیچ راستییەک لەوە ئاشکراتر نییە کە مرۆڤ دەتوانێت بە هەوڵو تەقەلای هۆشیارانەی خۆیەوە ژیانی خۆی پێشبخات

هێنری داڤید پۆرۆ

کە ئەم کتێبە دەخوێنیتەوە هەوڵبدە لە خۆت جیاببیتەوە. هەوڵبدە هەس‌وهۆشت بخەیتە سوچێکی بنمیچی ژوورەکەو لەوێوە خۆت ببینیت. بە چاوی ئەقڵ لەوێوە خۆت ببینە کە دەخوێنیتەوە. ئایا دەتوانیت وەکو کەسێکی دیکە تەماشای خۆت بکەیت؟

ئینجا ئێستا هەوڵی شتێکی دیکە بدە. بیر لەو مەزاجە بکەرەوە کە ئێستا تێیدایت. ئایا دەتوانیت دیاری بکەیت؟ هەست بە چی دەکەیت؟ دۆخی ئەقڵیی ئێستای خۆت چۆن وەسف دەکەیت؟

ئێستا ماوەی یەك خولەك بیربکەرەوە لە چۆنێتی کارکردنی مێشکت. ئایا بێدار و خێرایە؟ ئایا هەست بەوە دەکەیت کە دووکەرت بویت لەنێوان ئەم راهێنانە ئەقڵییەو هەڵسەنگاندنی ئەنجامەکەیدا؟ ئەم کارانەی کە ئەنجامت گەیاندن تەنیا لە توانای مرۆڤدان. سەرومڕ تایبەتن بە مرۆڤ. گیانلەبەرەکانی دیکە ئەم توانایەیان نییە. ئێمە بەم توانایە دەڵێین خۆ – ئاگایی یاخود بیرکردنەوە لە پرۆسەی بیرکردنەوەی خۆت. لەبەر ئەمەیە مرۆڤ زاڵە بەسەر هەمو شتێکی جیهاندا و دەتوانێت نەوە لەدوای نەوە پێشکەوتنی گرنگ بەدەست بهێنێت. ئێمە بریتی نین لە هەستەکانمان. بریتی نین لە مەزاجەکانمان. تەنانەت بریتیش نین لە بیرۆکەکانمان. ئەو تاقە هەقیقەتەی کە دەتوانین بیر لەم شتانە بکەیتەوە، جیامان دەکاتەوە لەو شتانە و لە دنیای ئاژەڵانیش. خۆئاگایی تواناماں دەداتێ بچینە ئەولاوە و تەنانەت بیر لەوەش بکەینەوە کە چۆن خۆمان دەبینین کە چۆن پارادیمەکەی خۆمان دەبینین – کە گرنگترین پارادیمی کاریگەربونمانە.

کاریگەرییەکانی خۆئاگایی تەنیا هەر لەسەر ئاراستەو هەڵسوکەوتەکانمان نین، بەڵکو کاریگەرێتیان لەسەر ئەوەش هەیە کە خەڵکانی دیکە چۆن دەبینین. خۆئاگایی

نەخشەی تۆیە لەسەر سروشتی راستەقینەی رەگەزی مرۆڤ.

لەراستیدا هەتا ئەم مەسەلەیە بەهەند وەرنەگرین (چۆن خۆمان و خەڵکانی دیکە دەبینین) ناتوانین لە بەرامبەرەکەمان تێبگەین کە چۆن خۆیان دەبینین و چ هەستێکیان هەیە دەربارەی خۆیان و جیهانەکەیان. تۆ ئەگەر ئەمە دەربارەی من نەزانیت ئەوا لە روانگەی نیازو تێگەیشتنەکانی خۆتەوە لێکدانەوە بۆ هەڵسوکەوتەکانم دەکەیت، کەچی بەخۆیشت دەڵێیت مرۆڤێکی بابەتی.

ئەم بەهەند وەرنەگرتن و لێك تێنەگەیشتنە توانا تایبەتەکانی خۆمان و توانای پەیوەندیکردن بە خەڵکیشەوە سنوردار دەکات. بەڵام لەرێی خۆ ئاگاییەوە، کە توانایەکی سەرومڕ مرۆڤانەیە، دەتوانین چاوبە پارادیمەکانماندا بخشێنینەوە تا بزانین ئایا لەسەر بناغەی راستییەکان دامەزراون یاخود لەسەر پرنسیپەکان، یاخود دەرەنجامی بارودۆخەکان و خۆراهێنانەکانن.

## ئاوێنە کۆمەڵایەتییەکە

مەبەست لە ئاوێنەی کۆمەڵایەتی راوبۆچونی خەڵکە لەسەر تۆ، ئەو قسانەی کە لە پاشملە و بەرەو ڕوو پێتی دەڵێن. وەکو ئەو ئاوێنەیە وایە کە لە سێرك و کەرنەڤاڵەکاندا هەن و کە تەماشای خۆتی تیا دەکەیت وێنەیەکی پێکەنیناوی و دزێو دەبینیت. ئاوێنە کۆمەڵایەتییەکە بریتییە لە پارادیمی ئێستاکەی کۆمەڵگاو لەو بیروبۆچون و لێك تێگەیشتەی کە هەیەتی، هەروەها لە پارادیمی خەڵکەکەی دەروبەرمان، جا ئەگەر ئێمە تەنیا لەم ئاوێنەیەوە خۆمان ببینین، وەك ئەوە وایە تەماشای ئاوێنە شێتەکە بکەین.

"هەرگیز لەکاتی خۆیدا نایەیت"

"ئەرێ بۆچی هەرگیز ناتوانیت شتەکان بە ڕێکوپێکی دابنێیت"

"هەبێ و نەبێ تۆ هونەرمەندیت"

"بەقەد مانگایەك دەخۆیت"

"چۆن دەرچوویت؟ ئەقڵم نایبڕێ"

"مەسەلەکە زۆر ئاسانە، بۆچی تێناگەیت؟"

ئەم تێڕوانینانە تێڕوانینی رەهان و لە سیاقی راستەقینەی خۆیان دەرچوون.

ڕەنگدانـــەوە نـــین بەڵـــکو بۆچـــوونن. لێکدانـــەوەی خولیاکـــان و خاڵـــە لاوازەکـــانی کەســـەکەیە و زیـــاتر بایـــەخ بـــە تێکردنـــەکان دەدات وەك لـــەوەی ڕەنگدانـــەوە ڕاستەقینەکەی کەسەکە ببینێت.

ڕەنگدانـەوەی پارادیمـە کۆمەڵایەتییەکـەی ئێسـتا پێمـان دەڵێـت کـە مـرۆڤ زیـاتر کەوتۆتە ژێـر دەوروتەئسیری بارودۆخـەکان و خۆڕاهێنانەکانـەوە. گومـانی تێـدا نیـیە کە خۆڕاهێنان (ڕاهاتن لەسـەر شتێك) ڕۆڵێکـی ئێجگار مـەزنی هەیـە لەسـەر ژیانمـان، ئەمە ڕاستیـیەکە و نکوڵی لێ ناکرێت. بـەڵام ئەگـەر بڵێیت کـە ئێمـە تـەنیا بەرهـەمی ئەم خۆڕاهێنانـەین و هیچ دەسـەڵاتێکمان بەسـەریدا ناشکێت، مەسـەلەیەکی دیکەیـە و نەخشەیەکی تەواو جیاواز دەخوڵقێنێت.

لەڕاستیدا ژمارەی نەخشە کۆمەڵایەتییەکان سیانن – واتـە سێ دانـە تیـۆری هـەن کە بۆ لێکدانەوەی سروشتی مرۆڤ، زۆر ناسراون و خەڵکەکە بە شـێوەیەکی گشـتی ئـەم سێ تیۆرییـەی قبوڵـە چ بـە تـاك و چ پێکـەوە. تیـۆری یەکـەم: حەتمییـەتی بۆمـاوەیی دەڵێت باپیرانت بەرپرسیاری ڕەفتاری تۆن. کە تووڕەیی دامنادەگرێت خـەتای ئەوانـە و خەسڵەتێکە لە (دی. ئێن. ئەی)یەکەماندا. ئەم خەسڵەتەی تووڕەیـیـە نـەوە بـە نـەوە دەڕوات و ئێمە لە باوو باپیرانمەوە تووشی دەبین. ڕەگەزیش لـەم ڕووەوە ڕۆڵـی بەرچاوی هەیە. بۆ نمونـە تـۆ ئەگـەر بـە ڕەچەڵەك ئایرلەنـدی بیـت ئـەو خەسـڵەتی تووڕەبوونـەت زیاتر تێدا دەردەکەوێت چونکە ئایرلەندییەکان بەشێوەیەکی گشتی تووڕەن.

حەتمییەتی دەروونی: ئەم تیۆرییە دەڵێت ڕەفتـاری تـۆ هەرچییەك بێـت بـاوك و دایکت وایان لێ کردویت. ئەزمون و بەسەرهاتەکانی قۆناغی منـاڵی کاریگـەریی قوڵیـان هەیە لەسەر پێکهاتە و ئاڕاستەکانی کەسایەتی مرۆڤ. بۆ نمونە کەسـێکی شـەرمن بیـت و توانای ڕووبەڕووبونەوەی جەماوەرت نەبێت دڵنیابە دایك و باوکت وایـان پـەروەردە کردویت. ئـەو کەسـەی کـە ئەگـەر هەڵەیـەکی لەدەست بقەومێت یەکسـەر هەسـت بـە تـاوانێکی گـەورە دەکـات، هۆکارەکـەی ئەوەیـە کـە لـە قـوڵایی ناخییـەوە هەسـت بـەو کاریگەرییانـە دەکـات لەسـەر ویـژدانی کاتێـك کـە لاوازو بـێ توانـا بـووە و لـە هـەمو شتێکدا پشتی بـە خـەڵکی دیکە بەستووە، بـیری دەکەوێتـەوە کـە چـۆن جاران ئەگـەر کەموکوڕییـەکی لێ دەربکەوتایە لـە مەسـەلەیەکدا چـۆن ویـژدانی خـۆی سـزای دەداو پەراوێز دەخراو بەراورد دەکرا بە کەسێکی دیکە.

حەتمییەتی ژینگەیی: ئەم تیورییە دەڵێت هۆکاری سەرەکی بارودۆخی ئێستا لە ئەستۆی ژینگەو کەسانی دەوروبەرتە – بەڕێوەبەرەکەت، هاوسەرەکەت، هەرزەکارە لەخۆ بایییەکە، یاخود رەنگە بارودۆخی ئابوری و سیاسی وڵاتەکەت هۆکارەکە بن. واتە لەو ژینگەیەی دەوروبەری تۆدا کەسێك یاخود شتێك بەرپرسیاری ئەم دۆخەی ئێستای تۆن.

شیاوی باسە کە هەرکام لەو سێ تیۆرییە لەسەر تیۆرییەکەی (کارلێك/ کاردانەوە) دارێژراوە. کە زۆرجار ئێمە دەیبەستینەوە بە تاقیکردنەوە بەناوبانگەکەی پاڤلۆڤ لەسەر سەگ. پوختەی ئەمەش دەڵێت ئێمە وا فێرکراوین و وا راهاتوین (ناچارکراوین) کە بەرامبەر هەر کارلێکێك کاردانەوەیەکی دیاریکراومان هەبێت.




ئەم تیۆرییانەی باسمان کردن تا چەند دەتوانن بە وردی وەسفی ئەرکەکان و کاریگەرییەکانی ژینگەمان بۆ بکەن؟ ئەم ئاوێنانە تا چەند دەتوانن وێنە راستەقینە بێ گەردەکەی سروشتی مرۆڤمان نیشان بدەن؟ ئایا ئەمانە لەوجۆرە پێشهاتانەن کە خۆیان خۆیان بەدی دەهێنن؟ ئایا لەسەر ئەو بنەماو پرنسیپانە دامەزراون کە ئێمە کاریگەرییەکان و دەسەڵاتەکانیان لە ناخی خۆماندا هەست پێدەکەین؟

## لەنێوان کارلێك و کاردانەوەدا

بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانە با پێکەوە تەماشای بەسەرهاتە سەرنجڕاکێشەکەی (ڤیکتۆر فرانکڵ) بکەین.

ڤیکتۆر فرانکڵ، وەك کەسێکی پەروەردەکراو بە پرنسیپەکانی دەرونزانیی شوناسیی فرویدی، باوەڕی تەواوی بە حەتمییەت هەبو کە دەڵێت رووداوەکانی قۆناغی منداڵیت کاردەکەنە سەر کەسایەتی و رەفتارت و بە شێوەیەکی بنەڕەتی ژیانت کۆنتڕۆڵ دەکەن. سنور و پێوەرەکانی ژیانت دیاری کراون و هیچی وات پێ

ناکرێت لە ئاستیاندا. (فرانکڵ)یش هەم دەروونناس بو هەم جولەکە بو. لە ئۆردوگاکانی مەرگی ئەڵمانیای نازیدا زیندانی کراو ئەزمونی هێندە سەخت و ترسناکی بەسەرداهات کە مرۆڤی ئاسایی ناوێرێت بیانهێنێتە بەرچاوی خۆی. هاوسەرەکەی و براکەی و باوکیشی و دایکیشی هەموویان لەناوچون.

هەندێکیان لە ئۆردوگاکەدا مردن و هەندێکیشیان رەوانەی فڕنەکان کران و سوتێنران. هەمو خێزانەکەی لەناوبران، بێجگە لە خوشکەکەی. فرانکل خۆیشی ئەوەندە ئەشکەنجە دراو سوکایەتی پێکرا کە لە ژماردن نایەن. هەمو چرکەیەکیش بەتەمای ئەوەبو لە فڕنێکدا بیسوتێنن یاخود ببێتە یەکێك لەو رزگاربوانەی کە ئەرکیان بریتی بو لە کۆکردنەوەی لاشەی کوژراوەکان و لابردنی خۆڵەمێشی سوتێنراوەکان.

رۆژێکیان کە لە ژوورێکی تەنگەبەردا بە رووتوقوتی دانرابو، بەرە بەرە درکی بە شتێك کرد کە دواتر خۆی ناوی لێ نا "ئازادیی کۆتاییەکانی مرۆڤ". واتە ئەو ئازادییەی کە تەنانەت نازییەکانیش ناتوانن نامەحرومی بکەن لێی. زۆردار دەتوانێت دەوروبەر و ژینگەکەی مرۆڤ بە تەواوی بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە و چۆنی بوێت وای لێ بکات. هەرچییەکی بوێت لە جەستەی مرۆڤ دەتوانێت بیکات. بەڵام، وەك ڤیکتۆر فرانکڵ بۆی دەرکەوت، ناتوانێت وات لێ بکات توانای چاودرێری کردنی خۆتت نەبێت. واتە ناتوانێت هەستی خۆئاگایی لە مرۆڤەکە بسەنێتەوە. فرانکڵ دەیتوانی لە ناخی خۆیدا بڕیار بدات مەسەلەکانی دەوروبەر چۆن کاری تێبکەن. پانتایی نێوان کارلێکەرەکەو کاردانەوەی ئەم بەرامبەر کاردانەوەکە شتێکە هێز و ئازادییان تێدایە. ئازادی و هێزی هەڵبژاردنی جۆری کاردانەوەکە.

لەم ئەزمونەیدا، فرانکڵ خۆیی لە چەندین هەڵوێستی جۆراوجۆردا دەهاتە پێش چاو. بۆ نمونە وای خۆی دەهاتە بەرچاو کە لە ئۆردوگاکە ئازادکراوە و دەرس بە خوێندکارەکانی دەڵێتەوە. خۆیی دەهاتە پێش چاو کە لە هۆڵی دەرسوتنەوەدا باسی ئەو ئەزمون و بەسەرهاتانە بۆ خوێندکارەکانی دەگێڕێتەوە کە لەکاتی ئەشکەنجەدانیدا فێریان بوبو.

فرانکڵ لەرێی زنجیرەیەك لەو مەشق و راهێنانە ئەقڵی و ویژدانی و رەوشتی‌یەوە و هەروەها لەرێی بەکارهێنانی بیرەوەریی خەیاڵەوە ئازادییە

ساکارەکەی خۆی پەیڕەو دەکرد کە وردە وردە نەشونمای دەستپێکردبو، بەمەش وای کرد بتوانێت لە پاسەوانانی زیندانەکە ئازادتر بێت؟ پاسەوانەنانی زیندانەکە ئازادیی زۆریان هەبو. بواری ژیانیان هەبو لە چوارچێوەی دەوروبەرەکەیاندا شت هەڵبژێرن، بەڵام ئەو لەوان ئازادتر بو، توانای زیاتری هەبو سود لەو ئازادییەی وەربگرێت. ئەمە وای لێ کرد ببێتە ئیلهامبەخش بۆ دەوروبەرەکەی، تەنانەت بۆ هەندێك لە پاسەوانەکانی و درێژکردنی دەستی یارمەتی بۆ خەڵکانی دیکە بۆ ئەوەی بتوانن سەرباری کوێرەوەرییەکانیش، واتایەك بدۆزنەوە و لەناو زیندانیشدا هەست بە سەربەرزی و رێزی خۆیان بکەن.

فرانکڵ لەوپەڕی ناخۆشی و هەستکردندا بە سوکایەتی، توانی سود لە توانا بێ هاوتاکەی مرۆڤ وەربگرێت کە خۆئاگایی‌یە و پرنسیپێکی سەرەکی بدۆزێتەوە لە سروشتی مرۆڤدا، پرنسیپی ئەوەی کە لە ماوەی نێوان کارلێك و کاردانەوەدا مرۆڤ ئازادیی هەڵبژاردنی هەیە (ئازاد ئەوەی چی هەڵدەبژێرێت).

بەهرە سروشتییەکانمان کە بەڕاستی دەمانکەنە مرۆڤی بێهاوتا، لەناو ئەو ئازادییەدان: چونکە ئێمە بێجگە لە توانای درك بە خۆکردن توانای خەیاڵکردنیشمان هەیە کە توانایەکە وامان لێ دەکات بتوانین وێنەیەك بخوڵقێنین لەدیوی ئەودیوی واقیعەکەی ئێستامان. هەروەها خاوەنی ویژدانیشین — واتە درککردنە قوڵەکەی ناخ بە راست و هەڵە و درککردنی ئەو پرنسیپانەی ژیانی ئێمەیان کۆنترۆڵ کردووە و هەروەها بزانین هزرو کردارەکانمان تا چەند لەگەڵیاندا دەگونجێن. هەروەها ئێمە خاوەنی ویستی سەربەخۆین. واتە توانای کارکردن و بڕیاردان لەسەر بناغەی خۆئاگایی خۆمان و ئازاد لە هەمو کارلێکەرەکانی دیکە.

هەمو زیندەوەرەکانی دیکەی سروشت، بە گیاندارە باڵا زیرەکەکانیشەوە لەم بەهرانە نامەحرومن و ئەگەر زاراوەکانی دنیای کۆمپیوتەر بەکاربهێنین دەڵێین ئەمانە لە چوارچێوەی غەریزەو مەشقەکاندا پرۆگرام کراون و دەتوانرێت لەڕێی مەشق و راهێنانەوە وایان لێ بکرێت ببنە بەرپرسیار، بەڵام ناتوانن بەرپرسیارێتی راهێنانەکە بگرنە ئەستۆ و ناتوانن ئاڕاستەی بکەن. ناتوانن پرۆگرامەکە بگۆڕن و تەنانەت لێشی بێ ئاگان.

بەڵام ئێمەی مرۆڤ لە سایەی ئەو نیعمەتە سروشتییانەوە، دەتوانین پرۆگرامی تازەی وا بۆ خۆمان بنوسین کە بە تەواوی دووربن لە غەریزەکان و راهێنانەکانمان. هەر لەبەر ئەمەیە تواناکانی ئاژەڵان تاڕادەیەك سنوردارن و تواناکانی مرۆڤ سنوریان نییە، بەڵام ئەگەر وەك ئاژەڵ بژین و شوێن غەریزە و ژینگەو بارودۆخەکەمان بکەوین و بیرەوەرییە دەستە جەمعییەکانمان سەرچاوەمان بن ئەوا بە دڵنیاییەوە ئێمەش سنوردار دەبین.

لەراستیدا سەرچاوە بنەڕەتییەکەی ئەم پارادیمی حەتمەییەتە دەرەنجامی لێکۆڵینەوە و شرۆڤەکردنی گیانلەبەرانی وەکو مشك و مەیمون و سەگ و کۆترە و هەروەها هی لێکۆڵینەوەیە لە خەڵکانی دیکە کە نەخۆشی دەرونی و دەماریان هەیە. لەکاتێکدا ئەم لێکۆڵینەوانە رەنگە هەندێك سودی دیاریکراو بە شرۆڤەکاران بگەیەنێت، بەڵام مێژووی مرۆڤ و هێزی خۆئاگاییمان بۆمانی دووپات دەکەنەوە کە ئەم نەخشەیە بە هیچ شێوەیەك ناتوانێت سروشتی مرۆڤ وەسف بکات.

نیعمەتە سروشتییە بێ هاوتاکانمان ئێمە جیادەکەنەوە لە دنیای ئاژەڵان و هەتا زیاتر سود لەو نیعمەتانە وەربگرین و برەویان پێ بدەین، زیاتر دەتوانین توانا مرۆییەکانی ناخی خۆمان بەدی بهێنین، چونکە ماوەی نێوان کارلێك و کاردانەوە مەزنترین توانای ئێمەی تیایە. توانای هەڵبژاردن.

## گیانی دەستپێشخەری چی یە؟

لە چوارچێوەی دۆزینەوەی پرنسیپە سەرەکییە گەوهەرییەکەی سروشتی مرۆڤدا، فرانکڵ نەخشەیەکی وردی بۆ خوی – مرۆڤ دارشت. ئینجا لەڕێی ئەو نەخشەیەوە یەکەمین و گرنگترین خوی مرۆڤە هەرە کاریگەرەکانی خستە روو کە گیانی دەستپێشخەرییە.

لەکاتێکدا ئەم وشەیە یەکێکە لە وشە هەرە بەناوبانگەکانی ناو ئەدەبیاتی زانستی کارگێڕی، بەڵام هێشتا لە زۆربەی قاموسەکاندا نەنوسراوە. گیانی دەستپێشخەری تەنیا هەر ئەوە نییە جڵەوی مەسەلەکە بگریتە دەست. بەڵکو مانای ئەوەیە کە ئێمە مادام مرۆڤین، خۆمان بەرپرسیاری ژیانی خۆمانین. رەفتارەکانمان رەنگدانەوەی بڕیارەکانمانن نەك هی بارودۆخەکانمان. ئێمە دەتوانین هەست و

سۆزمان بخەینە ژێر رکێفی بەهاکانەوە. ئێمە توانای دەستپێشخەری و بەرپرسیارێتی دروستکردنی رووداومان هەیە.

تەماشای وشەی بەرپرسیارێتی بکە لە زمانی ئینگلیزدا. ریسپۆنسیبڵ – لە دوو وشەی ریسپۆنس (کاردانەوە)و (توانا) وەرگیراوە. واتە توانای کاردانەوە. توانای هەڵبژاردنی کاردانەوەکەت. ئەوکەسەی کە خاوەنی گیانێکی بەرزی دەستپێشخەرییە ئەو بەرپرسیارێتییە دەزانێت. هەرگیز لۆمەی بارودۆخ و مەرجەکان و خۆراهێنان ناکات سەبارەت بە رەفتاریان. چونکە دەزانێترەفتار دەرەنجامی هەڵبژاردنێکی هوشیارانەیە، کە زیاتر پابەندی بنەماکانە نەك بەرهەمی بارودۆخەکان کە هەست و سۆز دروستی کردون.




نمونەی گیانی دەستپێشخەریی

ئێمە لەبەرئەوەی بە سروشت دەستپێشخەرین، کەواتە ئەگەر ژیانمان بریتی بو لە بارودۆخەکە و خۆراهێنانەکان، هۆکارەکە ئەوەیە ئێمە بە بڕیاری هوشیارانە یاخود بە هەڵە، بڕیارمان داوە ئەو شتانە بەهێز بکەین بۆ ئەوەی کۆنترۆڵمان بکەن.

بڕیاری لەوجۆرە کاردانەوەیە. مرۆڤی کارلێکراو زۆرجار دەکەوێتە ژێر کاریگەریی ژینگە فیزیاییەکەیەوە. ئەگەر کەشوهەوا باش بێت ئەویش باشە. ئەگەر

خراپ بێت کاردەکاتە سەر مەزاج و ڕەفتار و چالاکییەکانی. بەڵام خەڵکی دەستپێشخەر کەشوهەوای خۆی لەگەڵ خۆیدا هەڵدەگرێت. باران بێت یاخود خۆرەتاو، هیچ جیاوازییەك لای ئەم دروست ناکات. مرۆڤی دەستپێشخەر مرۆڤێکە بنەماکان ئاراستەی دەکەن. ئەگەر بنەماکە ئەوەبێت کارەکە بە چاکی ئەنجام بدات ئەوا کەشوهەواکە هەرچۆنێك بێت لای ئەم هیچ کاریگەرییەکی نابێت.

مرۆڤی کارلێکراو دەشکەوێتە ژێرکاریگەریی ژینگە کۆمەڵایەتیەکەوە (کەش و هەوای کۆمەڵایەتی). ئەگەر بەرامبەرەکە باش ڕەفتاری لەگەڵدا بکات ئەمیش باشە، ئەگەر خراپ بێت لەگەڵیدا، ئەمیش دەست دەکات بە بەرگری لەخۆکردن و خۆپاراستن. مرۆڤی کارلێکراو ژیانی سۆزداریی خۆی لە ڕوانگەی هەڵسوکەوتی خەڵکییەوە دروست دەکات. هێز دەبەخشێت بە لاوازیی خەڵکانی دیکە بۆ ئەوەی کۆنترۆڵی بکەن.

تەنیا مرۆڤی دەستپێشخەر دەتوانێت گوژمەکان بخاتە ژێر ڕکێفی بەهاکانەوە. مرۆڤی کارلێکراو دەکەوێتە ژێر کاریگەرییەکانی هەست و بارودۆخ و دەوروبەر و مەرجەکانەوە. بەڵام مرۆڤی دەستپێشخەر لەژێر ئاراستەی بەهاکانیدایە. ئەو بەهایانەی کە هەڵقوڵاوی ناخن و بە چاکی بیریان لێ کراوەتەوەو هەڵبژێردراون.

لەڕاستیدا مرۆڤی دەستپێشخەر ئەگەر کارلێکە دەرەکییەکانیش ماددی بن یاخود کۆمەڵایەتی بن یاخود دەروونی، کاریان تێدەکات. بەڵام چۆنێتی کاردانەوەکانیان (هەستی بن یاخود نەستی) جۆرە کاردانەوەیەکن بەهاکان ئاراستەیان دەکات.

وەك ئیلیانۆر ڕۆزفلت دەڵێت: "کەس بەبێ ڕەزامەندیی خۆت ناتوانێت ئازارت پێ بگەیەنێت" و بە دەردی گاندی دەڵێت: "کەس ناتوانێت ڕێزی خۆتت لا کەم بکاتەوە ئەگەر خۆت ڕێگای پێ نەدەیت". ڕازیبون و قبوڵکردنی ئەوەی بە سەرمان دێت زۆر لە خودی ڕووداوەکان زیاتر ئازارمان دەدات.

من دەزانم قبوڵکردنی ئەم ڕاستییانە کارێکی ئاسان نییە، چونکە ئێمە ساڵەهای ساڵە بەدبەختی و ناخۆشییەکانی ژیانمان خستۆتە ئۆباڵی بارودۆخ و ڕەفتاری خەڵکانی دیکەوە. بەڵام هەتاکو ددان بەوەدا نەنێم کە بارودۆخی ئەمڕۆی خۆم ئەنجامی بڕیارەکانی دوێنی خۆمە ناتوانم بە متمانەوە بڵێم ئەوا بڕیارم دا شتێکی جیاواز هەڵببژێرم. جارێکیان کە لە (سکرامانتۆ) لە موحازەرەیەکدا باسی گیانی دەستپێشخەریم دەکرد و لە گەرمەی قسەکردندا بوم، ژنێك هەستایە سەرپێ و زۆر

بە توندی قسەی کرد. هۆڵەکەش قەرەباڵغ بو، هەمو ئاوڕیان لێ دایەوە و ئەویش یەکسەر هەستی بە ئیحراجبونێکی زۆر کردو دەستبەجێ لە شوێنی خۆی دانیشتەوە. بەڵام وادیاربو نەیدەتوانی خۆی کۆنترۆڵ بکات، لەبەرئەوەی هەر قسەی لەگەڵ دەوروبەرەکەی خۆیدا دەکردو زۆر خۆشحاڵ دیاربو.

منیش زۆر مەبەستم بو مەسەلەکە تێبگەم بۆیە خواخوام بو زوو موحازەرەکە تەواو بێت و یەکسەر چوم بۆلای و داوام لێ کرد مەسەلەکەمان تێبگەیەنێت.

لە وەڵامدا وتی: "ئەگەر بیلێم باوەڕم پێ ناکەیت" ئینجا تۆنی دەنگی بەرزتر کردەوە وتی: من هەمو کاتەکەم وەکو پەرستارێك بە خزمەتکردنی کابرایەکەوە خەساردەکەم، کە باوەڕ ناکەیت چەندە پێنەزان و لە هەموشت ناڕازییە. هیچ ئیشێکی منی بەدڵ نییە. لە هەمو تەمەنیدا تەنیا یەك جاریش سوپاسی نەکردوم، نەك هەر ئەوە، بەڵکوو وا دەزانێ هەرنیم. ئەم کابرایە ژیانی لێ کردوم بە دۆزەخ و هیچ شوێنێك نییە هەستی خۆمی تیا دەربڕم لەناو خێزانەکەم زیاتر. من و پەرستیارەکانی دیکە تەواو گیرمان خواردووە بەدەستییەوە و ئەمانەوێ دوعای لێ بکەین خوابیکوژێت.

کەچی تۆ بە هەمو جورئەتێکەوە دەڵێیت گوایە هیچ شتێك ناتوانێت بەبێ ڕەزامەندیی خۆم ئازارم بدات و زیانم پێبگەیەنێت و ئێمە خۆمان ئەو ژیانەمان هەڵبژاردووە کە تیایدا دەژین. بۆیە منیش لەناچاریدا هەڵسام و وام کرد. شێوازێکی دیکە نەبو گوزارشت لە بێزاری خۆمی پێبکەم بەرامبەر بەو قسەیەی تۆ.

بەڵام دواتر بە قوڵی بیرم لە مەسەلەکە کردەوە و پرسیارم لە ناخی خۆم کرد کە ئایا ئاخۆ من هێزو توانای ئەوەم هەیە کاردانەوەکانم هەڵبژێرم ؟!

کاتێك کە چومە بنجو بناوانی مەسەلەکەوە و بۆم دەرکەوت بەڵێ ئەو هێزو توانایەم هەیە و کە بۆم دەرکەوت خەتای خۆمە ئەم ژیانە ناخۆشەم هەڵبژاردووە، ئیتر هەستم بەو ڕاستییە کرد کە دەتوانم ڕێگایەك هەڵبژێرم هێندە کڵۆڵ نەبم. لەو چرکەساتەدا بو کە هەستامە سەرپێ. هەستم کرد وەك ئەو دێوە وام لە زیندانی ناو قۆرییەکە هاتبێتە دەرێ و حەزمکرد پڕ بە دنیا هاوار بکەم بڵێم من ئازادو سەربەستم. من لە زیندان هاتومەتە دەرێ و ئیتر لەمەولا کەس ناتوانێت بە هەڵسوکەوتی خۆی کۆنترۆڵم بکات."

ئەو ئازارەی کە دەیچێژین، ئازاری ئەو شتە نییە کە لێمان روودەدات، بەڵکو ئازاری کاردانەوەکانمانە بەرانبەر ئەو شتانە. بێگومان زۆر ئاساییە و کەس نکۆڵی لەوە ناکات کە هەندێك (شت) لەڕووی ئابورییەوە ئازارمان دەدات و هەندێکی دیکە لەڕووی جەستەییەوە زیانمان پێدەگەیەنێت.. بەڵام هەرگیز پێویست ناکات کەسایەتیمان و ناسنامە بنەڕەتییەکەمان زیانیان پێبگات. لەراستیدا ئەوە ئەزمونە سەختەکانمانن کە دەبنە مەحەك و کەسایەتیمان دیاری دەکەن و هێزەکەی ناخمان پتەو دەکەن و ئازادی ئەوەمان پێ دەبەخشن کە لە هەڵوێستە دژوارەکانی ئایندەدا چۆن رەفتار بکەین و کەسانی دیکەش هان دەدات لەسەر هەمان رێباز بڕۆن.

فرانکڵ یەکێك بو لەو خەڵکە زۆرەی کە توانییان لە بارودۆخە سەختەکاندا ئازادی تایبەتی خۆیان برەو پێبدەن بۆ رزگارکردن و هاندانی خەڵکانی دیکە. ژیاننامەی دیلەکانی جەنگی ڤێتنام بەڵگەنامەیەکی دیکەیە کە روونی دەکاتەوە ئەو ئازادییە تایبەتەی مرۆڤ چ هێزێکی گەورەی هەیە لە وەرچەرخاندنی مرۆڤدا و بەکارهێنانی ئەو ئازادییە بە شێوەیەکی بەرپرسیارانە و راست و دروست چۆن دەتوانێت کاربکاتە سەر کەلتوری زیندان و زیندانییەکانی جاران و ئێستاش.

هەر یەکێك لە ئێمە رۆژێك لە رۆژان کەسێکی ناسیوە کە هەرچەندە بارودۆخی زۆر سەخت و دژواریشی رووبەروو بۆتەوە، کە رەنگە نەخۆشییەکی قورس بوبێت یان پەککەوتنێکی گەورە، کەچی هەر ورەیەکی بەرز و جوانیان هەبووە. پابەندبونیان بەو ورەو گیانەوە بونەتە سەرچاوەی ئیلهام بۆ ئێمە. هیچ هەستێك لەوە بەهێزتر و تەمەندرێژتر نییە کە ببینیت کەسێك بەسەر ئازارو کێشەو موعاناتەکانیدا بەرزبۆتەوەو لە بارودۆخەکە بەهێزتر بووەو تێی پەڕاندووە و هەڵگر و گوزارشکەری بەهایەکە جوانی و بەرزی و ئیلهام دەبەخشێت بە ژیان.

یەکێك لە قۆناغە سەرنجڕاکێشەکان و پڕ لە واتا قوڵەکانی ژیان ئەو ماوەیە بو کە من و ساندرای هاوسەرم لەگەڵ هاوڕێیەکی زۆر نزیك و خۆشەویستی ساندرادا بەسەرمان برد. هاوڕێکەی ناوی (کارۆڵ) بو کە دووچاری نەخۆشی شێرپەنجە بوبو. کارۆڵ دەستە خوشکی ساندرا و هاوڕێی دێرینی بو. ماوەی بستوپێنج ساڵی رەبەق یەکێك بو لە هاوڕێ هەرە نزیك و خۆشەویستەکانی ساندرا.

لە قۆناغە کۆتاییەکانی نەخۆشییەکەی کارۆڵدا، هاوسەرەکەم هەمیشە لەلای

دەمایەوە و یارمەتی دەدا لە نوسینەوەی بیرەوەرییەکانیدا. کاتێکیش کە پاش ئەو دانیشتنە دوورودرێژو زەحمەتانە دەگەڕایەوە ماڵێ زۆرر سەرسامی نیشان دەدا بەرامبەر بە ئازایەتی هاوڕێکەی و ئارەزووی ئەوەی کە پەیامی تایبەت بۆ مناڵەکانی جێبهێڵێت کە لە قۆناغە جیاجیاکانی ژیاندا پێیان بدرێت.

کارۆڵ کەمترین دەرمانی دژە ئازاری دەخوارد، لەبەرئەوە توانی تا ئەندازەیەکی زۆر پارێزگاری لە توانا ئەقڵی و سۆزدارییەکانی خۆی بکات و پاشان بە دەنگێکی نزم بیرەوەرییەکانی دەگێڕایەوە بۆ ئەوەی ساندرا بیاننوسێتەوە. کارۆڵ خاوەنی گیانێکی دەستپێشخەربو، ئازابو، بایەخی بە خەڵکییش دەدا تا ئەو سنورەی کە بووە سەرچاوەی ئیلهام بۆ زۆرێك لە کەسانی دەوروبەری.

من هەرگیز ئەو رۆژەم بیرناچێتەوە کە بۆ بەیاننیەکەی کارۆڵ کۆچی دوایی کرد. ئەو رۆژە بە قوڵی تەماشای چاوەکانی کارۆڵم کرد و هەستم بە ئازارێکی بێ کۆتایی کرد کە کەسێك "دەیچێژێت خاوەنی بەهایەکی گەورەیە. لە چاوەکانیدا هەستم بە رەسەنی و میهرەبانی و هاوکاری و خزمەتگوزاریی و خۆشەویستی و رێزو پێزانین کرد.

سالآنێکی زۆر، من گەلێك جار پرسیارم لە خەڵکی کردووە کە ئایا چەندیان خەڵکانی گرنگ و خاوەن ئامانج و ئاراستەی مەزنیان دیوە لە سەرەمەرگدا. کەسانی خزمەتگوزارو بە سۆزو میهرەبانی وا کە لەپێناوی خزمەتکردنی خەڵکیدا شێوازی تایبەت و بێوێنەیان گرتۆتەبەر. تێبینیم کرد، لە چواربەش، بەشێکی خەڵکەکە ئەو ئەزمونەیان هەبووە. کاتێکیش کە لێم پرسیون ئاخۆ چەندیان هەرگیز ئەو کەسانەیان بیر ناچێتەوە چونکە کاریگەرییان لەسەر ئەمان هەبووە و بونەتە سەرچاوەی ئیلهام بۆیان و هانیان داون دەستپێشخەریی پێویست بۆ ئەنجامدانی کاری جوامێرانەتر و پێشکەوتوتر. وەڵامەکە هەر هەمان وەڵامی پرسیاری پێشوو بو. لە چوار بەش بەشێکیان، واتە هەر هەمان رێژەکەی پێشوو.

ڤیکتۆر فرانکڵ باوەڕی وایە کە ژیان سێ بەهای حەتمی تیایە — ئەزمونیی، واتە ئەوەی کە لێمان روودەدات، خوڵقێنەر واتە ئەوەی کە لە واقیعدا دروستی دەکەین و ئاڕاستەیی، یاخود شێوازی کاردانەوەمان بەرامبەر بارودۆخە سەختەکانی وەك نەخۆشییەکی کوشندە. ئەزمونی تایبەتی خۆم لەگەڵ خەڵکیدا بۆم دەسەلمێنێت کە

گۆشـەنیگای فـرانکڵ راسـتە – بـەرزترینی ئـەو بەهایانـە، ئاڕاسـتەییەکەیە، واتـە پارادیمەکـە یـاخود دروسـتکردنەوەکە. گـرنگترین مەسـەلە لەوەدایـە کـە چـۆن کاردانەوەمان دەبێت بەرامبەر ئەزمونەکانی ژیان.

زۆرجـار بـارودۆخی سـەخت دەبێتـە هـۆی وەرچـەرخانی پارادیمـەکان، کـە چوارچێوەی نـوێ بـۆ شـێوازی جیهـانبینیو خـۆبینین دەخولقێنێت. ئـەم تێڕوانینـە هەرە فراوانە دەبێتەرەنگدانەوەی ئـەو بنەمـایانەی کـە هەمومـان بـەرزدەکەنەوە و ئـیلهاممان پێدەبەخشن.

## چۆن خاوەنی دەستپێشخەری بین؟

سروشتی بنەڕەتیمان ئەوەیە کە بکەربین نەك کار لێکراو. مـرۆڤ ئەگـەر بتوانێت خـۆی کاردانـەوەکانی هەڵبـبـژێرێت بەرامبـەر رووداوەکـان ئـەوا هێـزی ئـەوەی دەبێـت خۆی بارودۆخەکان بخولقێنێت. دەستپێشخەریی مانـای ئـەوە نیـیە جـرپن و شـەڕانی و ئێسك گران بیـت. دەستپێشـخەریی بریتییـە لـەوەی درك بـە بەرپرسـیارێتی خـۆمـان بکەین لە دروستکردنی رووداوەکاندا.

مـن سـاڵانێکی دوورودرێـژ کـە ئامۆژگـاری کەسـێکم بکردایـە بـۆ بەدەسـتهێنانی کارێکی چاکتر، پێم دەگوت دەستپێشـخەریی زیـاتر و زیـاتر نیشـان بـدە. پێم دەگـوت شایستەیی و زیرەکی خۆی تاقی بکاتەوە.

پێم دەگوتن پیشەسازی بخوێنن و تەنانـەت زانیـارییش بەدەسـت بهێـنن دەربـارەی کێشە تایبەتەکانی ئـەو دەزگایانـەی کـە ئـەمان حـەزیان لێیـەتی. پاشـان بـە جـددی لـە خۆیان بپرسن بزانن چۆن دەتـوانن چارەسـەر بـۆ ئـەو کێشـانە بدۆزنـەوە. ئەمـە پـێی دەوترێت (فرۆشتنی چارەسـەر) و بریتییـە لـە پارادیمێکی بنـەڕەتی بـۆ سـەرکەوتن لـە کارەکەتدا.

ئەوانـەی بـەم شـێوەیە ئامۆژگـارییم کـردون، هەمیشـە ئامۆژگارییەکـەیان قبـوڵ بـووە. زۆربـەی خەڵکەکـە تێدەگـەن کـە ئـەم شـێوازە یارمەتیـدەرێکی کاریگـەرە بـۆ دامەزرانـدن و پلەبەرزبونـەوە. بـەڵام لەگـەڵ ئەمەشـدا زۆربـەی زۆریـان نـاتوانن هەنگاوی پێویست لە بواری دەستپێشخەریدا بنێن و وا بکەن شتەکە روودات.

"نازانم لەکوێ شایستەیی و زیرەکی خۆم تاقی بکەمەوە."

"چۆن دەتوانم لە پیشەسازی تێبگەم و ئاگاداری کێشەی دەزگاکان ببم؟ کەس یارمەتیم نادات."

"چۆن بزانم ئایا دەتوانم چارەسەر بۆ کێشەکان بدۆزمەوە یان نا؟"

زۆربەی خەڵکی هەمیشە چاوەڕوانی ئەوەن شتێك رووبدات، یاخود کەسێك بێت بایەخیان پێبدات. بەڵام ئەوەی کە لە کۆتاییدا پۆستی باشی دەست دەکەوێت ئەوەیە کە گیانی دەستپێشخەریی هەیە. ئەوەی کە خۆی دەبێتە چارەسەر نەك بە سەرچاوەی کێشە. کەسێکە کە دەستپێشخەریی دەکات بۆ ئەنجامدانی هەمو کارێکی پێویست و هاوئاهەنگی دەکات لەگەڵ بەها راست و دروستەکاندا.

کاتێك لە ماڵی ئێمەدا کەسێك، تەنانەت منداڵە بچوکەکانیش، هەڵوێستێکی نابەرپرسیارانە وەردەگرێت بەوەی چاوەڕوان بێت کەسێکی دیکە کارێك بکات یاخود چارەسەرێك پێشکەش بکات. پێی دەڵێین "(تکایە واو و دال بەکاربهێنە) وزەو دەستپێشخەریی."

لەراستیدا، هەندێك جار پێش ئەوەی قسەکە لە دەممان بێتە دەرەوە دەڵێت دەزانم.

هاندانی کەسێك بەوەی پابەندبێت بە ئامانجەکانی بەرپرسیارێتییەوە سوکایەتیکردن نییە بەو کەسە بەڵکو رێزلێگرتنێتی. گیانی دەستپێشخەریی شتێکە لە سروشتی مرۆڤ جیانابێتەوە.

هەندێك جار هێزە بزوێنەرەکەی ئەو گیانی دەستپێشخەرییە (ماسولکەکان) لە حاڵەتی مت بوندا دەبێت، بەڵام هەیە و نەمردووە. کە تۆ رێز لە گیانی دەستپێشخەریی کەسێك دەگریت، مانای وایە هەر هیچ نەبێت لایەنێکی روون و نەشێواوی وێنەی ناو ئاوێنە کۆمەڵایەتییەکەی نیشان دەدەیتەوە.

بێگومان ئاستی کاملبونی کەسەکە مەسەلەیەکی گرنگە. کەس چاوەڕێی ئاستێکی بەرزی هاوکاری ناکات لە کەسێك کە خۆی لەڕووی سۆزدارییەوە پشتی بە خەڵکی دیکە بەستووە و سەربەخۆ نییە. بەڵام بە دڵنیاییەوە دەتوانین سروشتە بنەڕەتییەکەی خۆیی بیربخەینەوە و کەشوهەوایەکی وا بخوڵقێنین مرۆڤ بتوانێت هەلەکان بقۆزێتەوەو لە چارەسەرکردنی کێشەکاندا زیاتر پشت بەخۆی ببەستێت.

### بکەر یان کارلێکراو؟

جیاوازی نێوان ئەوانەی شێوازی دەستپێشخەری پەیڕەو دەکەن و ئەوانەی کە شێوازی وا پەیڕەو ناکەن، ڕێك وەکو جیاوازی نێوان ڕۆژ و شەو وایە. مەبەستم ئەوە نیيە بڵێم جیاوازی نێوان کاریگەرییەکانیان بە ڕێژەی ٢٥٪ یاخو ٥٠٪، بەڵکو باسی جیاوازییەك دەکەم کە دەگاتە ٥٠٪ زیاتریش، بەتایبەت ئەگەر کەسانی دەستپێشخەر – زیرەك و هوشیار بون و لە بەرامبەرەکەیان تێگەیشتن.

مەسەلەکە پێویستی بە دەستپێشخەری هەیە بۆ دروستکردنی هاوسەنگییەکی کاریگەر لەنێوان بەرهەم و توانای بەرهەمهێناندا. مەسەلەکە پێویستی بە دەستپێشخەرییە بۆ برەودان بە حەوت خووەکە چونکە کاتێك سەرنج لە شەش خووەکەی دیکە دەدەیت بۆت دەردەکەوێت کە هەموویان پەیوەستن بە مەسەلەی دەستپێشخەرییەوە. هەموویان‌داوات لێ‌دەکەن تۆ دەستپێشخەریی بکەیت و ئەگەر چاوەڕێ بکەیت خۆت ببیتە ئامانجی کردەوەکانی خەڵکانی دیکە ئەوا دەبیتە کەسێکی کارلێکراو. گەشەکردن‌و فرسەتەکانیشت پەیوەستن بەوەی کە تۆ کام ڕێگا هەڵدەبژێریت.

ماوەیەك لەمەوبەر من لەگەڵ کۆمەڵێکدا کارم دەکرد کە پسپۆڕییەکەیان لەبواری بیناسازیدا بو. ئەم کۆمەڵە بریتی بون لە نوێنەری بیست دەزگای جیاواز کە هەرسێ مانگ جارێك کۆدەبونەوە بۆ ئەوەی بە ڕاشکاوی باسی فرۆش و کێشەکانیان بکەن.

ئەو کۆبونەوەیە هاوکات بو لەگەڵ بێبازاڕییەکی گەورەدا، بەتایبەت لەم بوارەدا کە ئاکامە خراپەکانی ڕەنگیان دابووەوە لە ئابوری وڵاتدا بە شێوەیەکی گشتی. کە کۆبونەوەکە دەستی پێ‌کرد، ئاشکراترین خاڵی هاوبەشی نێوانیان شکست‌و نائومێدی بو.

لە ڕۆژی یەکەمی کۆبونەوەکەدا پرسیارێك دانرابو گفتوگۆی لەسەربکەین کە دەڵێت: "ئەوە چی‌یە تووشی بویت؟ ورياکەرەوەکە چی‌یە؟ دیارە لەو ماوەیەدا دەزگاکان دووچاری زۆر کێشە بوبون. گوشارەکانی دەوروبەر بەهێزبوون، بێکاری بەربڵاوبو، زۆرێکیش لەم کەسانە ناچاربون لەپێناوی پاراستنی دەزگاکانیاندا دەستبەرداری هاوڕێکانیان ببن. لەکۆتایی ئەو ڕۆژەدا ئامادەبوان زیاتر هەستیان بە داڕوخان و نائومێدی دەکرد.

لە دووەمین رۆژدا پرسیارەکەی کە دانرابو گفتوگۆی لەسەر بکرێت ئەمەبو: "لە ئایندەدا چی روودەدات؟" ئێمە هەمو ئەگەرو پێشبینیەکانمان تاوتوێ کرد لەسەر ئەو گریمانەیەی کە ئەم بارودۆخە کاردەکاتە سەر ئایندەیان. لە کۆتایی ئەو رۆژەدا نائومێدی زیاتر باڵی کێشا بەسەریاندا و مەسەلەکە بەرەبەرە خراپتر دەبو بۆ ئەوەی هیچ هیوایەك لە ئاسۆدا دەربکەوێت. هەموانیش درکیان بەمە کردبو.

بەڵام لە رۆژی سێیەمدا بڕیارمان دا جەخت بکەینە سەر ئەم پرسیارە ئەرێنیە "کاردانەوەکەی ئێمە چی دەبێت؟ ئێمە بەتەماین چی بکەین؟ چۆن دەتوانین جڵەوی دەستپێشخەریکردن بگرینە دەست؟".

لە دانیشتنەکەی سەرلەبەیانیدا باسی کاروبارەکانی کارگێڕی و کەمکردنەوەی خەرجییەکانمان کرد. لە دانیشتنەکەی دوای نیوەڕۆشدا باسی زیادکردنی پشکەکانمان کرد لە بازاڕدا و زۆر بە قوڵی لەو دوو مەسەلەیە وردبوینەوە .. ئینجا بایەخی تایبەتیمان دا بەو مەسەلانەی کە خەسڵەتێکی روون و قووڵی پراکتیکییان هەیە، ئەو شتانەی کە قابیلی جێبەجێکردنن. بەمجۆرە لە کۆتایی کۆبوونەوەکەی ئەو رۆژەدا رۆحێکی تازە باڵی بەسەرماندا کێشا کە لێوانلێوبو لە هیواو تێگەیشتنی ئەرێنی و سەرسامبون.

لەکۆتایی رۆژی سێیەمدا دەرەنجامی کۆنگرەکەمان لە وەڵامێکی سێبەشیدا کورت کردەوە بۆ ئەو رستەیەی کە دەیپرسی: "چالاکییەکانمان لە چ دۆخێکدان؟"

بەشی یەکەم: ئەوەی کە رووبەرووی بوینەوە شتێکی باش نیە. ئاماژەکانیش دەڵێن مەسەلەکان بەردەوام روو لە خراپبونی زیاتر دەکەن پێش ئەوەی سەرەتاکانی چاکبونەوە دەرکەون.

بەشی دووەم: بەڵام ئەوەی ئێمە بە نیازین ئەنجامی بدەین شتێکی زۆرچاکە، چونکە کاروبارە کارگێڕییەکان باشتر ئەنجام دەدەین و خەرجییەکان کەم دەکەینەوە و پشکەکانیش زیاتر دەکەین و زیاتر بەشداریی دەکەین لە بازاڕدا.

بەشی سێیەم: بەمجۆرە چالاکییەکانمان لە جاران باشترن. دە ئێستا با بزانین مرۆڤی کارلێکراو رای چییە بەرامبەر بەم مەسەلەیە؟ هێواش کە. خۆت لەراستییەکان مەدزەرەوە. رەنگە بتوانیت ماوەیەك لەسەر ئەم بیرکردنەوە ئەرێنییە و شێوازی خۆهاندانە بەردەوام ببیت. بەڵام ئەمڕۆ بێت یان سبەی ناچار

دەبێت رووبەڕووی راستییەکان ببیتەوە".

ئەمەیە جیاوازییەکەی نێوان بیرکردنەوەی ئەرێنی و دەستپێشخەریی. ئێمە بەراستی رووبەرووی راستییەکان دەبینەوە و خۆمان لە واقیعەکە نادزینەوە. نە لە بارودۆخەکەی ئێستا رامانکردووە و لە پێشبینییەکانی ئایندەش. بەڵام لەهەمان کاتیشدا ئەو واقیعەمان لەبیرخۆمان نەبردۆتەوە کە ئێمە هێزی ئەوەمان هەیە دەرهەق بەم واقیع و پێشبینییانە کاردانەوەیەکی ئەرێنی هەڵبژێرین. خۆ دزینەوە لەم واقیعە مانای قبوڵکردنی ئەوەیە کە بڵێین رووداوەکانی دەوروبەرمان چارەنوسمان دیاری دەکەن. هەمو بەشێکی کۆمەڵگا، هەمو چالاکییەکی بازرگانی و هەمو دامودەزگایەك بە خێزانیشەوە دەتوانن دەستپێشخەرییان هەبێت. دەتوانن داهێنان کۆبکەنەوە لەگەڵ وزە شاردراوەکانی ئەو کەسانەی کە گیانی داهێنانیان تێدایە بۆ خولقاندنی ژینگەیەکی دەستپێشخەر لەو دەزگایانەدا: نابێت دەزگاکان لەژێر بەزەیی بارودۆخەکانی دەوروبەردا بن، بەڵکو دەتوانن گیانی دەستپێشخەرییان هەبێت بۆ بەدیهێنانی ئامانج و بەها هاوبەشەکانی ئەو خەڵکانەی کە مەبەستیانە.

## گوێگرتن لە زمانەکەی خۆمان

لەبەرئەوەی هەڵوێست و رەفتارمان هەڵقوڵاوی پارادیمەکانمانن، کەواتە ئەگەر خۆئاگاییەکەمان بەکارهێنا بۆ تێگەیشتن و تاقیکردنەوەیان، ئەوا دەتوانین نەخشە نهێنییەکانی ناخی خۆمانی پێبدۆزینەوە. بۆ نمونە شێوەی قسەکردنمان ئاماژەیەکی زۆر راستگۆیە کە پێمان دەڵێت تا چ ئەندازەیەك گیانی دەستپێشخەرییمان تێدایە.

مرۆڤی کارلێکراو بە جۆرێکی وا قسە دەکات کە هیچ بەرپرسیارێتییەکی نەکەوێتە ئەستۆ.

"ئیتر من ئاوام، چی بکەم" (مانای وایە من کەسێکی راپێچراوم، هیچ شتێك بەدەست خۆم نییە.)

"ئەو کابرایە شێتم دەکات" (مانای وایە من بەرپرسیانیم. هەست و سۆزم لەدەرەوەی خۆم کۆنترۆڵ کراوە.)

"ناتوانم بیکەم. فریاناکەوم" (واتە شتێکی دەرەوەی خۆم – بێکاتی- منی کۆنترۆڵ کردووە.)

"ئاخ ئەگەر هاوسەرەکەم یەك تۆز پشووی درێژبوایە" (واتە رەفتاری کەسێکی دیکە کۆتوپێوەندی کردوم.)

"ناچارم بیکەم" (واتە خەڵکانی دیکە، یاخود بارودۆخ ناچارم دەکەن ئەو کارە بکەم. من ئازاد نیم لە هەڵبژاردنی رەفتار و کارەکانمدا.)

| زمانی مرۆڤی کارتێکراو | زمانی مرۆڤی دەستپێشخەر |
| --- | --- |
| هیچم پێ ناکرێت | با تەماشابکەین بزانین ئەگەرەکانی دیکە چین |
| من ئاوام، وا ئیش دەکەم | |
| ئەم کابرایە شێتم دەکات | دەتوانم رێگەیەکی دیکە بگرمەبەر |
| ئەوان هەرگیز رێ بەو شتە نادەن | دەتوانم خۆم کۆنترۆڵ بکەم |
| ناچارم ئەو کارە بکەم | دەتوانم قەناعەتیان بگۆرم |
| ناتوانم | هەوڵدەدەم وەڵامێکی گونجاو بدۆزمەوە |
| مەجبورم | هەوڵدەدەم |
| ئاخ ئەگەر | پێم باشە |
| | بە دڵنیاییەوە دەیکەم |

ئەم زمانە هەڵقوڵاوی پارادیمی حەتمیبونە و سەرومڕ بریتییە لە گواستنەوەی بەرپرسیارێتی. کە دەڵێم من بەرپرسیارنیم مانای وایە من ناتوانم کاردانەوەکەم هەڵبژێرم.

جارێکیان خوێندکارێك لێی پرسیم: "رێم دەدەیت لە پۆلەکە بچمە دەرێ چونکە دەبێت برۆم، یاریمان هەیە"

"ناچاریت برۆیت یان خۆت هەڵتبژاردووە کە برۆیت؟"

"ناچارم"

"ئەی ئەگەر نەچیت؟"

"چۆن نەچم؟ لە تیپەکە دەرم دەکەن"

"پێت خۆشە دەرت بکەن؟"

"نەخێر پێم خۆش نییە".

"کەواتە تۆ خۆت بریارت داوە برۆیت چونکە دەتەوێت بەردەوام بیت لەگەڵ تیپەکەدا. باشە ئەی ئەگەر ئەم موحازەرەیەت لەکیس بچێت چی روودەدات؟"

"نازانم!"

"باش بیربکەرەوە. ئەگەر لە موحازەرەکە ئامادە نەبیت چی روودەدات؟"

"خۆ لە خوێندن دەرناکرێم. دەردەکرێم؟"

"ئەگەر نەچیت بۆ یارییەکە، لە تیپەکە دەرت دەکەن. ئیتر یاری ناکەیت. ئەمە ئەنجامێکی سروشتییە. ئەی ئەگەر پۆلەکە جێبهێڵیت، ئەنجامە سروشتییەکەی چی دەبێت؟"

"وابزانم فێربونی شتێکم لەکیس دەچێت"

"زۆر راستە. کەواتە پێویستە هەردوو ئەنجامەکە لەگەڵ یەکتریدا بەراورد بکەیت و بڕیار بدەیت. من بومایە لەجیاتی تۆ دەچووم بۆ یارییەکە. یارییەکەم هەڵدەبژارد. بەڵام هەرگیز مەڵێ ناچارم بچم" بە کزۆڵییەوە وتی "ئەوە هەڵدەبژێرم، بچم بۆ یارییەکە"

بە سوعبەتەوە پێم وت "یەعنی موحازەرەکەی منت لەکیس بچێت؟"

یەکێك لە کێشە ترسناکەکانی "زمانی کارتێکراو" ئەوەیە کە دەبێتە جۆرە پێشبینیکردن و ئاماژەیەك خۆی مەبەستەکانی خۆی بهێنێتەدی بە جۆرێکی وا کە ئەوکەسە خۆی دەخاتە پەنای جۆرە پارادیمێکەوە بێچارە و ئاڕاستەکراوە و چەندین بەڵگەش نیشان دەدات کە بۆچونەکەی ئەم بسەلمێنێن. بڕوای تەواوی بەوەیە کە ئەم کەسێکی قوربانیی‌یە و هیچ شتێك بەدەست خۆی نی‌یە. نە ژیان و نە چارەنوسی.

هەمیشە لۆمەی دەرەوەی خۆی دەکات. لۆمەی هێزەکان و بارودۆخەکانی دەرەوە، تەنانەت لۆمەی ئەستێرەکانیش دەکات (ئەستێرەکانی بەخت) و دەڵێت ئەوان بەرپرسیاری ئەم وەزعەی ئەون نەك خۆی.

لە سیمینارێکدا من باسی گیانی دەستپێشخەریم دەکرد، لەپڕ یەکێك لە ئامادەبوان هەستاو لێی پرسیم: "ستیڤن، من ئەم قسانەی تۆم زۆر پێخۆشە، بەڵام هەمو شتێك بارودۆخی خۆی هەیە. بۆ نمونە ژیانی هاوسەرگیری من تەماشاکە. من بەڕاستی نیگەرانم. من و ژنەکەم تەواو گۆڕاوین. ئەو هەستەی کە ئێستا بەرامبەر یەکتری هەمانە وەکو هەستەکەی جاران نی‌یە. وا هەست دەکەم نە من ئەوم خۆش دەوێت و نە ئەویش منی خۆش دەوێت. نازانم چی بکەم؟"

لێم پرسی: "بە هیچ شێوەیەك ئەو هەستەی جارانتان بەرامبەر یەکتری نەماوە؟

وەڵامەکەی دامەوە: "نەخێر نەماوە. سێ منداڵمان هەیە کە بەراستی خەمیان دەخۆین. بەرای تۆ چی بکەم؟

پێم وت: "خۆشت بوێ"

وتی: "پێم وتیت، وتم هیچ هەستێکم بەرامبەری نەماوە".

"خۆشت بوێ"

"لێم تێناگەیت. هەستی خۆشەویستی نەماوە"

"کەواتە خۆشت بوێت. ئەگەر هەستەکە نەمابێت باشترین هۆکارە بۆ ئەوەی خۆشت بوێت"

"بەڵام چۆن خۆشم دەوێت کە خۆشم نەوێت؟"

"هاوڕێ گیان خۆشەویستی بەرهەمی خۆشویستنە. خۆشویستن واتە خزمەتکردن و قوربانیدان لەپێناویدا. گوێی لێ بگرە. ڕێزی بگرە، ڕۆڵەکە ببینەو بۆی بسەلمێنە .. ئایا پێت خۆشە ئەم کارانە بکەیت؟

لە هەمو دەقە ئەدەبیە جوانەکانی کۆمەڵگا پێشکەوتووەکاندا خۆشویستن کردارە، بەڵام کەسانی کارتێکراو دەیکەن بە هەست. هەستەکان پاڵیان پێوە دەنێن: هۆلیوود بەشدارە لەو مەسەلەیەدا کە بگەینە ئەو باوەڕەی ئێمە هیچ بەپرس نین و ئێمە تەنیا بەرهەمی هەستەکانمانین. بەڵام ئەم سیناریۆ هۆلیودیە ڕاستییەکان دەرناخات. ئەگەر هەستوسۆز کۆنترۆڵی ڕەفتار و کردەوەکانمان دەکات، خەتاکەی خەتای خۆمانە کە وازمان لە بەرپرسیاریێتی ئەرکەکانمان هێناوە و ڕێمان بە هەستەکانمان داوە کۆنترۆڵمان بکەن.

مرۆڤی دەستپێشخەر خۆشەویستی دەکات بەکردار. خۆشەویستی شتێکە دەکرێت. قوربانیدانە، خۆفیداکردنە، وەك ئەو دایکەی کە کۆرپەیەك دەهێنێتە دنیاوە. ئەگەر دەتەوێت لە خۆشەویستی تێبگەیت لە ڕەفتاری ئەو کەسانە وردببەرەوە کە قوربانی دەدەن لەپێناوی خەڵکانی دیکەدا، تەنانەت لەپێناوی خەڵکی واشدا کە ئازاریان دەدەن و خۆشیان ناوێن. ئەگەر باوکیت، سەرنج لەو خۆشەویستییە بدە کە بەرامبەر منداڵەکەت هەتەو قوربانی بۆ دەدەیت. خۆشەویستی بەهایەکە بە کردەوە بەرجەستە دەکرێت. مرۆڤی دەستپێشخەر هەستەکان دەخاتە ژێر ڕکێفی بەهاکانەوە. خۆشەویستی هەستێکە دەتوانیت بەدەستی بهێنیتەوە.




## بازنەی مەراق / بازنەی کاریگەرێتی

ڕێگەیەکی نایابی دیکە بۆ ئەوەی توانای لەخۆئاگابونمان سەبارەت بە دەستپێشخەریمان ئەوەیە تەماشای خۆمان بکەین بزانین زۆربەی وزەو کاتی خۆمان لەکوێدا بەسەردەبەین. هەریەکێك لە ئێمە کۆمەڵێك بابەت و مەسەلە هەن بەلایەوە زۆر گرنگن و بایەخیان پێدەدات. مەراقی ئەون — تەندروستی خۆی، ژیان و کێشەی منالەکانی، گیروگرفتەکانی کار، کێشە داراییەکان، مەسەلەکانی سیاسەت، ژینگە و .. تاد. جا بۆ جیاکردنەوەی ئەم مەسەلانە لەوانەی کە لە هیچ ڕوویەکی ئەقڵی و سۆزدارییەوە جێگەی بایەخ و مەراقی ئێمە نین دەتوانین بە بازنەیەك جیایان بکەینەوە، ئەوانەی لەناو بازنەکەدان ئەو شتانە بگرێتەوە کە گرنگ و بایەخدارن. بازنەکەش ناودەنێین بازنەی مەراق.

ئێمە کە تەماشای بابەتەکانی ناو بازنەی مەراق دەکەین، بە ئاشکرا هەست دەکەین هەندێکیان بە هیچ شێوەیەك لە کۆنترۆڵی خۆماندا نین و ناتوانین هیچیان لەبارەوە بکەین. بەلام کۆمەڵێك بابەت و مەسەلەی دیکە هەن دەتوانین کەم تا زۆر

کاریگەریمان هەبێت لەسەریان. بابەتەکانی جۆری دووەم دەتوانرێن لەناو بازنەیەکدا کۆبکرێنەوە بە ناوی بازنەی کاریگەرێتی.




جا بۆ ئەوەی بزانیت رێژەی دەستپێشخەرییەکەت لە چ ئەندازەیەکدایە تەماشای خۆت بکە بزانە زۆربەی کات و وزەی خۆت لەناو کام بازنەدا بەسەردەبەیت.



## مرۆڤی دەستپێشخەر

**(وزەی ئەرێنی دەبێتە هۆی گەورەبونی بازنەی کاریگەرێتی)**

**مرۆڤی دەستپێشخەر تواناکانی خۆی لە بازنەی کاریگەرێتیدا چڕدەکاتەوە. ئیش لەسەر ئەو بابەتانە دەکات کە دەتوانێت شتێکیان لەبارەوە بکات. سروشتی وزەکەیان ئەرێنی‌یە، بەردەوام گەورەو بەرفراوان دەبێت و دەبێتە هۆی گەورەبونی بازنەی کاریگەرێتییەکەی.**

**بەڵام مرۆڤی کارتێکراو تواناکانی خۆی لە بازنەی مەراقدا چڕدەکاتەوە. بایەخ بەو شتانە دەدات کە ئەم هیچی پێناکرێت لەئاستیاندا، بۆ نمونە لاوازی فلانەکەس، کێشەکانی ژینگەو دەوروبەر. ئەم بایەخدان و فۆکەسکردنە وای لێ دەکات ئیتر هەر بۆڵەی بێت و ئەموئەو تاوانبار بکات. بە زمانێکی کارتێکراو قسە دەکات و هەتا بێت زیاتر هەست بەوە دەکات کە ئەو قوربانییەکی دەوروبەرو بارودۆخەکەیە. ئەو وزە نەرێنی‌یەی کە لەم رەفتارەوە دروست دەبێت هەروەها فەرامۆشکردنی ئەو بابەت و مەسەلانەی کە دەتوانێت شتێکیان لەبارەوە بکات دەبنە هۆی بچوکبونەوە و پوکانەوەی بازنەی کاریگەرێتییەکەی.**



## مرۆڤی کارتێکراو

**(وزەی نەرێنی دەبێتە مایەی بچوکبونەوەی بازنەی کاریگەریتی)**

مرۆڤ هەتا زۆر لە بازنەی مەراقدا بمێنێتەوە زیاتر و زیاتر بابەتەکانی ناو ئەو بازنەیە بەهێز دەکات تا کۆنترۆڵی بکەن. واتە ئەو گیانی دەستپێشخەرییە ناخاتەگەڕ کە بۆ بەدەستهێنانی گۆڕانی ئەرێنی پێویستە.

پێشتر من باسی کوڕەکەمی خۆمم بۆ کردن کە لە خوێندندا کێشەی گەورەی هەبو. من و ساندرای هاوسەرم زۆر خەفەتمان بەوە دەخوارد کە لە خوێندندا بە ئاشکرا لاوازیی پێوە دیارە و هەروەها خەفەتمان بە رەفتاری خەڵکەکەش دەخوارد لەگەڵیدا.

بەڵام ئەمانە لەناو بازنەی مەراقماندا بون. چەندێك وزەو کاتی خۆمان لەو بازنەیەدا بەسەربرد، هیچمان نەکرد بەهیچ، جگە لەوەی زیاتر و زیاتر هەستمان بە ناتەواوی و بێتوانایی خۆمان بکەین و کوڕەکەشمان زیاتر و زیاتر وا لێ بکەین پشت بەخۆی نەبەستێت.

بەڵام هەر لەگەڵ دەستمان دایە ئەوەی لە بازنەی کاریگەریماندا ئیش بکەین و جەختمان کردە سەر پارادیمەکانمان، یەکسەر توانیمان وزەیەکی ئەرێنی وا بخولقێنین کە ئێمەی بە تەواوی گۆڕی و لەئەنجامیشدا کاری کردە سەر کوڕەکەمان. بە کارکردن لەسەرخۆمان، نەك لەسەر بارودۆخەکان. توانیمان کاریگەری لەسەر بارودۆخەکان دروست بکەین.



هەندێك جار لە ئاكامی پۆستێك یاخود پەیوەندییەك یاخود سامانێکەوە وا رێك دەکەوێت بازنەی کاریگەرێتی کەسەکە گەورەتربێت لە بازنەی مەراقەکانی

دیارە ئەم جۆرە پێگەیە کورتبینیەکی ویژدانیی گەورەیە کە توشی خۆمانی دەکەین و جۆرە شێوازێکی ژیانی خۆپەرستانەی کارتێکراوە کە فۆکەس دەکاتە سەر بازنەی مەراق.

هەرچەندە ریزبەندیکردنی مەسەلەکان هەنگاوێکی گرنگە بۆ بەکارهێنانی دەوروتەئسیری خۆیان، بەڵام خەڵکە دەستپێشخەرەکان خاوەنی بازنەی مەراقێکی وان کە لانی کەم هێندەی بازنەی کاریگەرێتییەکەیان دەبێت و ئامادەن بەرپرسیارێتی بەکارهێنانی تواناکانی خۆیان قبوڵ بکەن.

## کۆنترۆڵی راستەوخۆ و کۆنترۆڵی ناڕاستەوخۆ و بێ کۆنترۆڵ

ئەو کێشانەی رووبەڕوویان دەبینەوە سێ جۆرن: کۆنترۆڵی راستەوخۆ (ئەو کێشانەی کە پەیوەستن بە هەڵسوکەوتی خۆمانەوە)؛ کۆنترۆڵی ناڕاستەوخۆ (ئەو کێشانەی کە پەیوەستن بە هەڵسوکەوتی خەڵکانی دیکەوە)؛ بێ کۆنترۆڵ (ئەو کێشانەی کە هیچمان پێناکرێت دەربارەیان وەك رابردومان و ئەو واقیعانەی کە هەڵوێستەکان دەیسەلمێنن) رەفتاری مرۆڤی دەستپێشخەر لە چارەسەرکردنی هەرسێ جۆری کێشەکەدا بەشێوەیەکە کە یەکەم هەنگاو هەمویان بخاتە بازنەی کاریگەرێتیەکانیەوە.

کێشەکانی جۆری کۆنترۆڵی راستەوخۆ بەوە چارەسەر دەبن کە ئیش لەسەر خووەکانمان بکەین. ئەم کێشانە بە ئاشکرا لەناو بازنەی کاریگەرێتییەکانماندان. ئەمانە بریتین لە سەرکەوتنە تایبەتەکانی خووی یەکەم و دووەم و سێیەم.

کێشەکانی جۆری کۆنترۆڵی ناڕاستەوخۆ بەوە چارەسەردەبن کار لەسەر گۆڕینی میتۆدی ئیشکردنمان بکەین. ئەمانە سەرکەوتنە گشتییەکانی خووی چوارەم و پێنجەم و شەشەمن. من خودی خۆم توانیومە نزیکەی (٣٠) رێگەی جیاواز لەسەر کاریگەرییەکانی مرۆڤ دیاری بکەم - لێرەدا جیاوازی رووبەڕووبونەوە لە لاسایکردنەوە وەك جیاوازی نێوان نمونە و مۆدێل وایە لەلایەك و لەگەڵ قەناعەتپێکردندا لەلایەکی دیکەوە. مرۆڤی ئاسایی هەمیشە سیان چوارێك لەو

میتۆدانەی هەیە کە بەردەوام دووبارەیان دەکاتەوە. میتۆدەکان زۆرجار بە پرۆسەی ئەقلانیکردنی مەسەلەکە دەست پێدەکات. ئەگەر ئەمە سودی نەبێت ئیتر یان لە دەستی هەڵدێت یاخود رووبەڕووی دەبێتەوە. ئای کە ئازادییەکی گەورەیە مرۆڤ بتوانێت فێری شێوازی تازە ببێت بۆ کارکردنە سەر خەڵکانی دەوروبەری، نەك هەر خەریکی شێوازە کۆنە شکستخواردووەکان بێت کە خەڵکانی دیکە دەقیان پێوەگرتوون.

سەبارەت بە کێشە بێ کۆنترۆڵەکانیش باشترین شێوازی رەفتارکردن لەگەڵیاندا ئەوەیە هەستو سۆزت بەرامبەریان بگۆڕیت – بەدەمیانەوە پێبکەنیت، راستگۆییان قبوڵیان بکەیت و فێرببیت چۆن لەگەڵیاندا بژیت. تەنانەت ئەگەر حەزیشت لێیان نەبو. بەمشێوەیە ئیتر کێشەکان هێزەی ئەوەیان نابێت کۆنترۆڵت بکەن. با ئیلهام لەو دوعا بەناوبانگەوە وەربگرین کە دەڵێت: "خودایە ئازایەتی ئەوەم پێببەخشە ئەو شتانە بگۆڕم کە پێویستن و دەتوانم بیانگۆڕم، هێندەش ئارامیم پێببەخشە بتوانم ئەو شتانە قبوڵ بکەم کە ناتوانم بیانگۆڕم، ئەوەندەش ئەقڵ و حیکمەتم بدەری بزانم کام بابەتەم پێدەگۆڕێت و کامەیانم پێ ناگۆڕێت".

کۆنترۆڵەکە راستەوخۆبێت یان ناڕاستەوخۆ بێت یاخود هەر لە ئەسڵا بێ کۆنترۆڵ بێت هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێت مادام یەکەم هەنگاوی چارەسەرکردنیان بەدەست خۆمانە. گۆڕینی خووەکانمان و گۆڕینی میتۆدی ئیشکردنمان و گۆڕینی سەرنجدانمان لە کێشە بێ کۆنترۆڵەکان هەر هەموویان لەناو بازنەی کاریگەرێتی خۆماندان.

## فراوانکردنی بازنەی کاریگەرێتی

راستییەکی ئیلهامبەخشە ئەگەر بزانیت کە شێوازی کاردانەوەت بەرامبەر بە بارودۆخەکە، کاریگەرییەکی گەورەی هەیە لەسەر بارودۆخەکە. مەسەلەکە وەك هاوکێشە کیمیاوییەکان وایە، ئەگەر بەشێکی هاوکێشەکە بگۆڕین ئەوا بە دڵنیاییەوە ئەنجامەکەش دەگۆڕێت.

من ماوەی چەندین ساڵ لەگەڵ رێکخراوێکدا کارم دەکرد کە سەرۆکەکەی کەسێکی زۆر بەتواناو گورجوگۆڵ بو. دەیزانی کێ چۆن بیردەکاتەوە، کەسێکی داهێنەرو بەهرەدار و بەتواناو چالاك بو. هەمو کەس ئەم راستییەی دەزانی. بەڵام هەڵسوکەوتی لە بەڕێوەبردندا تاکڕەوانە و دیکتاتۆری بو. هەموانی وەکو "قەراش"

تەماشا دەکرد کە نەتوانن هیچ بڕیارێك بدەن. شێوازی ئیشکردنی لەگەڵ کارمەندەکانیدا بەمجۆرەبو: بڕۆ ئەمە بکە .. بچۆ بۆ ئەوێ. ئەوەبکە. ئێستا وابکە .. من خۆم بڕیارەکە دەدەم ..".

دەرەنجامی کۆتایی ئەم جۆرە هەڵسوکەوتە بریتی بو لەوەی کەسەکانی دەوروبەری بچن لە ڕاڕەوەکەدا کۆمەڵ کۆمەڵ ڕاوەستن و لەناو خۆیاندا گلەیی لەم بکەن. کەسێك گوێی لە قسەکانیان بوایە کە هەموی قسەی جوان و ڕێكوپێك بون وای دەزانی ئەمانە بەڕاستی دەیانەوێت دۆخەکە چاك بکەن. بەڵام شتەکە هەر قسەبو، قسەیەکی بێ کۆتایی و بەو مەبەستەش بو هەمو بەرپرسیارێتییەك لە خۆیان دووربخەنەوە و بیخەنە ئەستۆی سەرۆکەکەیان کە ئەو خاڵە لاوازانەی هەیە.

یەکێك دەیوت: "ڕەنگە باوەڕ نەکەن. ئەو ڕۆژە هاتە بەشەکەی ئێمە و دەستی کرد بە بۆڵەبۆڵ. ئێمە کارەکەمان تەواو کردبو، کەچی بڕوبیانوی دنیای لێ دۆزییەوە و وتی: "بەم شێوەیە قبوڵم نییە." ڕەنجی چەند مانگێکی داین بە بادا. بەڕاستی ئیدارەی لەگەڵدا ناکرێت. بەڕاست زۆر ماوە خانەنشین بکرێت؟"

یەکێکی دیکە هەڵ دەداتێ و دەڵێت: "هێشتا تەمەنی پەنجاو نۆ ساڵە داماو، دەبێت شەش ساڵی دیکە خۆت ڕابگریت"

"شەش ساڵی چی؟ هەرگیز باوەڕناکەم ڕۆژێك لەڕۆژان خۆی خانەنشین بکات".

بەڵام یەکێك لە بەڕێوەبەرەکانی ئەو دەزگایە کەسێکی ئەرێنی بو. ئەوەی پاڵی پێوەدەنا هەستوسۆز نەبو، بەهاکان بو .. دۆخەکەی هەڵسەنگاندو تێی گەیشت و ئەنجامە پێشبینیکراوەکانیشی خستە پێش چاوی خۆی. بەئاگا بو لە خاڵە لاوازەکانی سەرۆك: بەڵام لەبری ئەوەی ڕەخنەیان لێ بگرێت، وای بە باشتر زانی بیانگۆڕێت. لە هەر مەسەلەیەکدا شێوازی سەرۆکەکە لاوازبوایە، ئەم دەهات قەرەبوی دەکردەوە بۆ کارمەندەکان و هەوڵی دەدا وایان تێبگەیەنێت کە ئەمە شتێکی لاوەکییە. بایەخی زۆری بە خاڵە بەهێزەکانی سەرۆك دەدا — بە تێڕوانین و بەهرەو داهێنانەکانی ئەم بەڕێوەبەرە. بایەخی دابو بە بازنەی کاریگەرێتییەکەی خۆی، هەرچەندە سەرۆکەکە ئەمیشی وەکو بەردەستێك تەماشا دەکرد، بەڵام ئەم هەوڵی دەدا شتێك بکات لە پێشبینیکردنی سەرۆکەکە زیاتربێت. پێش وەخت دەیزانی سەرۆك پێویستی بەچی

دەبێت و دەیزانی لە ناخەوە حەزی بە چی‌یە. لەبەرئەوە ئەگەر داوای زانیارییەکی لێ بکردایە، ئەم دەهات شرۆڤەیەکی بۆ دەخستە سەرو چەندین راسپاردە و بیرو بۆچونی خۆیشی لە ڕوانگەی ئەو شرۆڤەیەوە پێشکەش دەکرد.

ڕۆژێك دووبەدوو لەگەڵ سەرۆکدا دانیشتبوم پێی وتم: "ستیڤن، ئەم کابرایە شتی وای کردەوە ئەقڵم نایبڕێت. ئەم کابرایە نەك هەر زانیاریە داواکراوەکانی دامێ بەڵکو کۆمەڵێك زانیاری زیادەیشی پێشکەش کردم کە ڕێك ئەم زانیاریانەبو من دەمویستن. سەرەڕای ئەوەش مەسەلەکەی لە چوارچێوەیەکدا بۆ شیکردومەتەوە کە بەلای منەوە گرنگە. چەندین راسپاردە و پێشنیاریشی خستۆتەسەر.

"راسپاردەکان هاوئاهەنگ بون لەگەڵ شیکردنەوەکەدا. هەروەها شیکردنەوەکەش لەگەڵ زانیارییەکاندا دەهاتەوە. پیاوێکی زۆر بەتوانا. مرۆڤ لەگەڵ پیاوی وادا زۆر بەختەوەرەو خەمی هیچی نابێت. بەڕاستی دەزانێت بەرپرسیارێتی چی‌یە."

لە کۆبونەوەی داهاتویدا لەگەڵ کارمەندو بەڕێوەبەرەکاندا، سەرۆك هەمان راسپاردەکانی جارانی هەبو "ئەوە بکە .. ئەمە بکە .." بەڵام کە دەگەیشتە ئەم بەڕێوەبەرە لێی دەپرسی: تۆ ڕات چی‌یە؟ (بازنەی کاریگەرێتیەکەی فراوان بووە.)

ئەم مەسەلەیە خاووخلیچکی ناو دەزگاکەی جولاند و ئەقڵە کارتێکراوەکان لە رارەوەکانەوە دەستیان کرد بە تەقاندنی موشەکەکانی ڕقو کینە دژ بەم پیاوە ئەرێنی‌یە.

شتێکی سروشتی‌یە کە ئەو مرۆڤەی گیانی دەستپێشخەریکردنی تێدا نەبێت خۆی لە هەمو بەرپرسیاریەتییەك دەدزێتەوە. سەلامەترین هەڵوێست ئەوەیە بڵێیت: "من بەرپرسیارنیم". بەڵام راستیەکە شتێکی دیکە، بەرپرسیارە بەڵام شایستەی بەرپرسیارێتی نی‌یە. چونکە زۆر قورسە بڵێیت هێزی ئەوەم هەیە خۆم جۆری کاردانەوەکەم هەڵبژێرم و ئەو کاردانەوەیەی کە هەڵمبژاردووە بۆتە هۆی ئەوەی بکەومە ژینگەیەکی خراپ و پڕ لە شەڕو پێکدادان، بەتایبەت ئەگەر ساڵەهای ساڵ لەسەرئەوە راهاتبم کە بە بیانوی لاوازیی کەسێکی دیکەوە خۆم لە بەرپرسیارێتی ئەنجامەکان بدزمەوە.

لەبەرئەوە ئەم کارمەندو بەڕێوەبەرانە کەوتنە کۆکردنەوەی زانیاری زیاتر و موشەکی زیاتر و بەڵگەی زیاتر بۆ ئەوەی خۆیان لە بەرپرسیارێتی بدزنەوە.

بەڵام ئەم کابرایە بەرامبەر ئەمانیش کەسێکی دەستپێشخەربو. وردە وردە بازنەی کاریگەرێتی‌یەکەی بەرووی ئەوانیشدا فراوان بو. بازنەکە بە ئەندازەیەکی وا گەورەبو کە هیچ کەسێك لە دەزگاکەدا هیچ کارێکی گرنگی لێ نەدەوەشایەوە ئەگەر ئەم کابرایە دەستی تێدا نەبوبێت و لەسەری رازی نەبوبێت، تەنانەت سەرۆکەکەش. لەهەمان کاتیشدا سەرۆکەکە هەستی بە هەڕەشە نەدەکرد، چونکە هێزی ئەم کابرایە تەواوکەری هێزو قەرەبوکەرەوەی لاوازییەکانی سەرۆك بو. بەمجۆرە سەرۆك بووە خاوەنی هێزی دووکەس و هەروەها بە خاوەنی تیمێکی یاریدەدەریش.

سەرکەوتنی ئەم پیاوە پەیوەست نەبو بە بارودۆخەکەی خۆیەوە. زۆرکەسی دیکە هەبون لەهەمان بارودۆخدا. ئەو جیاوازییەی کە ئەم کابرایە هێنایە ئاراوە بەرهەمی کاردانەوە هەڵبژێردراوەکان بو بەرامبەر بە بارودۆخەکە. بەرهەمی بایەخدان بو بە بازنەی کاریگەرێتییەکانی خۆی.

هەندێك کەس وا دەزانن دەستپێشخەری واتە توندوتیژی و خۆسەپاندن و بێ رەحمی. نەخێر مەسەلەکە هەرگیز وانی‌یە. مرۆڤە ئەرێنی‌یە دەستپێشخەرەکان کەسانی خۆسەپێن نین، بەڵکو خەڵکی زیرەکن، بەهاکان پاڵیان پێوە دەنێن. واقیعەکە دەخوێننەوە و دەزانن پێویستە چی بکەن.

کەسێکی وەکو گاندی بهێنەرە بەرچاوی خۆت. لەکاتێکدا کە دوژمنەکانی ئەم لە دەزگاکانی یاسادانانەدا رەخنەی ئەوەیان لێ دەگرت بەقسەی سەوزوسور وەك ئەمان رەخنە لە ئیمپراتۆریی بریتانیا ناگرێت کە گەلی هیندی سەرکوت کردووە، گاندی بە کێڵگەو مەزراکاندا دەگەڕاو زۆر هێواش‌و هێمن و لەسەرخۆ بازنەی کاریگەرێتییەکەی لەسەر جوتیارەکان فراوان دەکرد و لەگەڵیاندا شەپۆل شەپۆل بە دێهاتەکاندا دەگەڕا و پشتگیریان دەکرد و بڕواو متمانەیان بۆی تازە دەکردەوە. ئەم پیاوەی کە بێ ئەوەی هیچ پۆستێکی وەزاریی هەبێت و خاوەنی هیچ پێگەیەکی سیاسی بێت دواجار توانی بە ئازایەتی و هاوسۆزی و رۆژوگرتن و باوەڕپێهێنان، ئینگلتەرا بهێنێتە سەرچۆك و کۆتایی بەو داگیرکاری‌یە سیاسییە بهێنێت کە سێسەد ملیۆن کەس دەینالاند بەدەستیەوە. هونەرەکەشی لەمەدا هەموی بۆ بازنەی کاریگەرێتییەکەی دەگەڕێتەوە کە بەردەوام فراوان و فراوانتر دەبو.

**هەبون و بوون**

یەکێك لە ڕێگەکانی دیاریکردنی بازنەی مەراق جیاکردنەوەی (هەبونەکان) لە (بوونەکان.)ە بازنەی مەراق پڕە لە هەبونەکان:

- ئاخ ئەگەر پارەم هەبوایە ئەو خانووە بکڕم ....
- ئاخ ئەگەر بەڕێوەبەرەکەم نەختێك سۆزی هەبوایە ....
- خۆزگە هاوسەرەکەم سەبری زیاتری هەبوایە ....
- خۆزگە منالی گوێڕایەڵترم هەبوایە ....
- ئەگەر ئەو بڕوانامەیەم هەبوایە ....
- ئەگەر کاتی زیاترم هەبوایە بۆ خۆم ....

بەڵام بازنەی کاریگەرێتی پڕە لە بوونەکان – دەتوانم پشوودرێژتر بم، ئاقڵ بم، رۆح سوك بم. واتە بازنەیەکە تایبەتە بە بایەخدان و فۆکەس کردن.

کرۆکی هەمو کێشەیەك لەوەدایە کە وابزانیت کێشەکە لە دەرەوەیە. کە تۆ دەڵێیت کێشەکە لە دەرەوەیە ئەوا بتەوێت و نەتەوێت لە خۆتی بەهێز دەکەیت و تۆ دەکەویتە ژێر کۆنترۆڵیەوە. گۆڕینی پارادیم لای ئەم ئەقڵییەتە ئەوەیە لە دەرەوە بێیتە ناوەوە – هەتا ئەوەی دەرەوە نەگۆڕێت ئێمە ناگۆڕێین.

بەلام رێبازی دەستپێشخەری ئەوەیە گۆڕانەکە لە ناوەوە بەرەو دەرەوە بێت: جیاواز بیت، ببیتە کەسێکی جیاواز، ببیتە هۆکاری گۆڕانێکی ئەرێنی لەوەی دەرەوەدا – من دەتوانم داهێنەرتر بم، دەوڵەمەندتر بم، هاوکارتر بم، روخۆشتر بم.

یەکێك لە چیرۆکە پەسەندکراوەکانی لای من چیرۆکی حەزرەتی یوسفە (د.خ) کە لە میسر بە کۆیلەیەتی فرۆشرا. ئەوکاتە ئەو لە تەمەنی ١٧ ساڵیدا بو. خۆ ئەوکاتە زۆر ئاسان بو لای عەزیزی میسر بکرۆزێتەوە و گلەیی بەختی خۆی و زوڵمی براکانی بۆ بگێڕێتەوە بەڵام یوسف کەسێکی دەستپێشخەربو. لەسەر بوونەکان کاری دەکرد بۆیە پاش ماوەیەکی کەم کاروباری ماڵی عەزیزی روبەڕوکرایەوە. عەزیز هەمو متمانەیەکی پێدەکرد.

پاشان رۆژگار هات و لە بارودۆخێکی دژواردا خرایە زیندانەوە کە ١٣ ساڵی تیا مایەوە. لەو قۆناغەشدا لاوازی نیشان نەدا. لەوێشدا هەر دەستپێشخەر بو. ئیشی لەسەر بازنەکەی ناوەوە دەکرد، لەسەر بوونەکان نەك لەسەر هەبونەکان. بۆیە پاش

ماوەیەکی کەم توانی هەمو زیندانەکە و دواتریش هەمو میسر بەڕێوە ببات، تەنیا فیرعەون لەو بەدەسەڵاتتر بو. من دەزانم ئەم میتۆدە گۆڕانێکی بنەڕەتی بەدی دەهێنێت لە پارادیمی زۆربەی خەڵکەکەدا. هیچ لەوە ئاسانتر نییە گلەییەکە بخەیتە سەرخەڵکی دیکە. گلەیی بخەیتە سەر بارودۆخەکە و سەر دەوروبەر بەڵام لەڕاستیدا بەرپرسیارێتییەکە لە ئەستۆی خۆماندایە. خۆمان دەتوانین ژیانی خۆمان کۆنترۆڵ بکەین و دەورو تەئسیری بەهێزمان هەبێت لەسەر بارودۆخەکە ئەویش بە هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی بوونەکان.

بۆ نمونە تۆ ئەگەر لە ژیانی هاوسەرگیرییتدا کێشەیەکت هەبێت ئاخۆ چ قازانجێك لەوەدا دەکەیت کە هەر باسی هەڵەکانی هاوسەرەکەت بکەیت. کە بەرپرسیارێتییەکە لەسەر خۆت لاببەیت و خۆت وەکو قوربانییەکی بێدەسەڵات نیشان بدەیت و لە هەڵوێستێکی نەرێنیدا خۆات قەتیس بدەیت. هەروەها کاریگەرێتیشت لەسەری کەم دەکەیتەوە. پەیڕەوکردنی ئەم شێوازی تۆمەتبارکردن و رەخنەلێگرتن و گلەیی لێ کردنە تەنیا ئەوەی لێ دەکەوێتەوە کە باوەڕ بە لاوازیی خۆت بکەیت. رەخنەکانت لەو رێبازە خراپتر دەبێت کە دەتەوێت راستی بکەیتەوە. پەیڕەوکردنی ئەو شێوازە وات لێ دەکات توانا ئەرێنییەکانت لەسەر هەڵوێستەکە بەرەبەرە بچوکتر ببنەوەو لە کۆتاییدا نەمێنن.

من ئەگەر بەڕاستی بمەوێت هەڵوێستی خۆم چاك بکەم دەتوانم ئیش لەسەر ئەو تاقە شتە بکەم کە لە کۆنترۆڵی خۆمدایە ئەویش خودی خۆمە. دەبێ دەست لە هەوڵی گۆڕینی هاوسەرەکەم هەلگرم و جەخت بکەمە سەر خاڵە لاوازەکانی خۆم. دەتوانم هەوڵی ئەوە بدەم کە ببمە هاوسەرێکی مەزن و سەرچاوەی خۆشەویستی و میهرەبانی و پشتگیرییەکی بێ قەیدو شەرت. بەو هیوایەی هاوسەرەکەشم هەست بەو هێزی دەستپێشخەرییە بکات و بەو شێوازە ئەرێنییەی من کاردانەوە نیشان بدات. هاوسەرەکەم وا بکات یان نەیکات باشترین رێگا هەر ئەوەیە برەو بە خۆم بدەم و لەسەر بوونەکانی خۆم کاربکەم. ئەمە کورتترین رێگەیە بۆ ئەوەی مرۆڤ ببێتە کەسێکی کاریگەر.

سەبارەت بە کارکردن لە بازنەی کاریگەرێتیدا گەلێك رێگا هەن - گوێگرێکی باش بە، هاوسەرێکی میهرەبانتر بە، خوێندکارێکی باشتر بە، کارمەندێکی دڵسۆزتر و

یارمەتیدەرتر بە. هەندێك جار گرنگترین بابەتی دەستپێشخەریی ئەوەیە کە دڵخۆش بیت، کە راستگۆیانە بزە بخەیتە سەر لێوەکانت. بەختەوەری و بەدبەختی هەردوکیان دو هەڵبژاردنی ئەرێنین چونکە هەندێ بابەت هەن، بۆ نمونە کەشوهەوا، هەرگیز ناکەونە ناو بازنەی کاریگەرێتییەوە بەڵام ئەگەر ئێمە ئەرێنی بین دەتوانین هەمیشە کەشوهەوا کۆمەڵایەتی و ماددیەکە لەگەڵ خۆماندا بگێڕین. کامەرانی رێ لەوە ناگرێت ئەو شتانە قبوڵ بکەیت کە حاڵی حازر کۆنترۆڵەکەیان بەدەست تۆ نییە. گرنگ ئەوەیە بایەخ بەو شتانە بدەین کە لە دەسەڵاتی خۆماندان.

## سەری ئەوسەری دارەکە

پێش ئەوەی ژیانمان بەشێوەیەکی کۆتایی ئاراستەی بازنەی کاریگەرێتیمان بکەین پێویستە لەناو بازنەی مەراقدا بیر لەو مەسەلە گرنگانە بکەینەوە کە شایستەی بیر لێ کردنەوەی قوڵ بن و ئەوانیش بریتین لە پێشهات و هەڵە.

ئێمە لە هەڵبژاردنی ئەوکارەدا ئازادین کە ئەنجامی دەدەین بەڵام بە هیچ شێوەیەك لە هەڵبژاردنی پێشهاتەکانیدا ئازاد نین. پێشهاتەکان لەژێر کۆنترۆڵی یاسا سروشتییەکاندان. دەکەونە ئەودیو بازنەی مەراقەکانمانەوە. تۆ ئازادیت دەتوانیت لەبەردەمی ئوتومبیلێکدا راوەستیت کە بەخێرایی بەرەو روت دێت بەڵام دەرئەنجامەکەی بەدەست تۆ نییە و تۆ بڕیاری لەسەر نادەیت. مرۆڤ دەتوانێت لە هەڵسوکەوتیدا ساختەچی بێت. ئەوە بەدەست خۆیەتی. پێشهاتە کۆمەڵایەتییەکانی ئەم جۆرە رەفتارەش هەمیشە وەکو یەك نین. بۆ نمونە جاری وا هەیە کە کەس هەست بەوە ناکات کە کابرا ساختەچییە بەڵام پێشهاتە سروشتییەکانی ئەو ساختەچێتییە لەسەر کەسایەتی مرۆڤ هەمیشە وەکو یەکەو ئەنجامێکی نەگۆڕی هەیە.

هەڵسوکەوتی مرۆڤ لەژێر حوکمی پرنسیپەکاندایە. پێکەوە ژیان و هەڵکردن لەگەڵیاندا ئەنجامی ئەرێنی دەبێت، بەڵام پێشێلکردنی پرنسیپەکان پێشهاتی خراپی لێ دەکەوێتەوە. کەواتە راستە ئێمە ئازادین لە هەڵبژاردنی شێوازی کاردانەوەماندا بەرامبەر بە هەر هەڵوێستێك بەڵام هەڵبژاردنی ئەو هەڵوێستە هەڵبژاردنی

پێشهاتەکانیشیێتی (کە تۆ ئەمسەری دارەکە بەرز دەکەیتەوە جەمسەرەکەی ئەوسەریشی بەرز دەکەیتەوە.)

بێگومان لە ژیانی هەریەکێك لە ئێمەدا چرکەساتی وای تێدایە کە دواتر بۆمان دەرکەوتووە ئەو دارەی هەڵمانگرتووە دارە مەبەستەکە نەبووە. هەڵبژاردنەکانمان ئەنجامی وای لێ کەوتۆتەوە کە باشتر وابو لێمان رونەدەن و ئەگەر بۆمان هەڵکەوێتەوە جارێکی دیکە ئەوا بە دڵنیاییەوە بە شێوازێکی دیکە رەفتار دەکەین. ئێمە ئەم هەڵبژاردنانەمان ناودەنێین هەڵەکانمان و ئەمانە شایستەی بایەخ پێدانن بەڵام لە پلەی دووەمدا.

سەبارەت بەو کەسانەش کە زۆر لە کارەکانی رابردویان پەشیمانن ئەوا پێویستە بزانن کە هەڵەکانی رابردوش لەناو بەزنەی مەراقدان. نە دەتوانین سەرلەنوێ بانگیان بکەینەوە، نە دەشتوانین دەستیان لێ بشۆین و نە دەشتوانین کۆنترۆڵی ئەنجامەکانیان بکەین.

یەکێك لە کوڕەکانم، کە لە یاری فتبۆڵێندا لە هێڵی بەرگریدابو، فێربوبو لەنێوان گێمەکاندا گاز لە قۆڵی کراسەکەی خۆی بگرێت وەك جۆرێك لە پێداچونەوە بەرامبەر بەو هەڵانەی کە خۆی یان یەکێك لە یاریزانەکانی دیکە دەیانکرد بۆ ئەوەی ئەو هەڵەیە کارنەکاتە سەر یارییەکەی لەوەوپاشیان. پەیڕەوکردنی گیانی دەستپێشخەری بەرامبەر هەر کێشەیەك ئەوەیە کە دەستبەجێ دانی پێدابنێین و راستی بکەینەوە و لێوەی فێرببین. هەر ئەمەیە شکست دەکات بە سەرکەوتن. تی. جەی. واڵسۆن دامەزرێنەری کۆمپانیای ئای بی ئێم دەڵێت سەرکەوتن لە سەری ئەوسەری شکستدایە.

بەڵام تەنیا ددانىنان بە هەڵەکەدا بەبێ ئەوەی راستی بکەیتەوە و لێوەی فێرببیت بەس نییە. ئەوە خۆی لەخۆیدا هەڵەیەکە لە جۆرێکی دیکە و بەرەو ئەوەت دەبات فێڵ لە خۆت بکەیت و بڕوبیانو بۆ کردەوەکانت بهێنیتەوە. هەروەها واشت لێ دەکات هەوڵ بدەیت خەڵکەکە بهێنیتە سەر ئەو باوەڕەی کە ئەو رەفتارەت رەفتارێکی ناقڵانەیە. ئەم جۆرە هەڵەیە و ئەم جۆرە پاساو هێنانەوەیە هەڵەکەی یەکەم گەورەتر دەکات و هێزو بایەخێکی زیاتری پێدەدات و وای لێ دەکات زیاتر ناخی مرۆڤەکە بریندار بکات.

ئەوەی کە زیاتر لە هەمو شتێك ئازارمان دەدات ئەوە نییە کە بەرامبەرەکەمان دەیکات، تەنانەت هەڵەکانی خۆشمان نین بەڵکو چۆنێتی کاردانەوەمانە بەرامبەر بەوشتانە. ئەوکەسەی کە مارێکی ژەهراوی پێوەی دەدات و بەدوای مارەکەدا رادەکات هیچی دەستگیرنابێت زیاتر لەوەی کە وادەکات ژەهرەکە خێراتر بە جەستەیدا بڵاوببێتەوە. لە حاڵەتی وادا چاکتر وایە خێرا ژەهرەکە لە لەشت دەربکەیت.

کاردانەوەت بەرامبەر بە هەر هەڵەیەك کاردەکاتە سەر جۆری چرکەساتەکەی دوای خۆی لەبەرئەوە زۆر گرنگە دەستبەجێ ددان بە هەڵەکەتدا بنێیت و راستیشی بکەیتەوە بۆ ئەوەی لە چرکە ساتەکەی دواتردا بەهێزتر نەبێت و ئێمەش بتوانین هێزێك بهێنینەوە بەرخۆمان.

## بەڵێن و بەڵێن نەشکاندن

بەڵێن و بەڵێن نەشکاندن مەسەلەیەکە دەکەوێتە چەقی بازنەی کاریگەرێتییمانەوە. ئەو بەڵێنانەی کە بە خۆمان و بە خەڵکانی دیکەی دەدەین ئاشکراترین ئامرازی گوزارشتکردنن لە ئەرێنیبونی خۆمان.

هەروەها کرۆکی گەشەکردنیشمانە. ئێمە لەرێی بەهرەو خۆئاگایی و ویژدانەوە کە سروشتی مرۆڤایەتی پێی بەخشیوین دەتوانین بزانین لە کام بواردا لاوازین و لەکام بواردا پێشکەوتوین و کام بەهرەیەمان پێویستی بە برەوپێدان هەیە و کام بوارەیە کە پێویستە بیگۆڕین یان لە رێڕەوی ژیانماندا دووری بخەینەوە. ئێمە لەرێی زانیاری و لەرێی بەکارهێنانی بەهرەی خەیاڵ و ویستی سەربەخۆوە بۆ بایەخدانی تەواو بەو تێگەیشتنە بۆ بەڵێنپێدان و دیاریکردنی ئامانج و پابەندبون پێیەوە — دەتوانین کەسایەتییەکی بەهێز بنیادبنێین و واقیعێکی وا بهێنینە ئاراوە کە هەمو شتێکی دیکەی ئەرێنی لە ژیانماندا کارێك بێت کردەنی.

کەواتە ئێمە دو میتۆدمان لەبەردەستدایە بۆ ئەوەی دەستبەجێ کۆنترۆڵی ژیانی خۆمان بکەین. دەتوانین بەڵێنێك بدەین و جێبەجێی بکەین، یاخود دەتوانین ئامانجێك دیاری بکەین و هەوڵی بەدیهێنانی بدەین. تۆ کە بەڵێنێك دەدەیت، (تەنانەت بەڵێنی زۆر بچوك و سادەش) و پابەندی دەبیت مانای وایە لە ناخی خۆتدا دەستت کردووە بە دروستکردنی سەرڕاستییەك کە هۆشیاری ئەوەت

پێدەبەخشێت کۆنترۆڵی خۆت بکەیت و هەروەها هێندەش هێزو غیرەتت دەداتێ کە بەرپرسیارێتی زیاتر بگریتە ئەستۆ لە ژیانتدا. مرۆڤ کە بەڵێن دەدات و بەڵێنەکە دەباتە سەر، وردە وردە سەرراستیەکەی گەورەدەبێت.

گرنگترین شێواز بۆ پێشختسنی خووە بنەڕەتییەکانی کاریگەربوون ئەوەیە بەڵێن بە خۆت بدەیت. بەمە ئیتر هەمو زانیاری و شارەزایی و ئارەزووەکان دەکەونە ژێر کۆنترۆڵی خۆتەوەو دەتوانیت بەئاسانی هاوسەنگییان لەنێواندا دروست بکەیت. گەورەبونی رەهەندەکانیشیان دەبێتە مایەی قوڵکردنەوەی تواناکانت بۆ بەرجەستەکردنی ئەو پرنسیپانەی کە ئەم خووانەی لەسەر بنیادنراون و هەروەها کەسایەتیشت هێندە بەهێزدەکات کە بتوانیت لە رێبازێکی هاوسەنگدا هەنگاو بنێیت بە مەبەستی ئەوەی لە ژیاندا زیاتر و زیاتر کاریگەربیت.

## گیانی دەستپێشخەری: ئەزمونە سی رۆژییەکە

بۆ ئەوەی گیانە دەستپێشخەرییەکەی خۆمان بناسین و کار بۆ پێشخستنی بکەین، مەرج نییە وەکو (ڤیکتۆر فرانکڵ) بە ئەزمونی ئۆردوگاکانی ئیعدامکردندا تێبپەڕێن. مرۆڤ لە رووداوەکانی ژیانی رۆژانەوە فێردەبێت ئەرێنیانە هەڵسوکەوت لەگەڵ گوشارە نائاساییەکانی ژیاندا بکات. ئەمەش لەوەدا رەنگ دەداتەوە کە چۆن بەڵێن دەدەین و چۆن دەیبەینەسەر، لە ترافیکدا چۆن رەفتار دەکەین، چۆن وەڵامی کڕیارێکی تورە دەدەینەوە و لەگەڵ منالێکی لاساردا چۆن دەجولێینەوە. لەوەدا رەنگ دەداتەوە کە چۆن تەماشای کێشەکانمان دەکەین و هەوڵەکانمان لەکوێدا چڕدەکەینەوە. لەو زمانەدا رەنگ دەداتەوە کە قسەی پێدەکەین.

بۆ ئەوەی گیانی دەستپێشخەری خۆتت بۆ دەربکەوێت، ماوەی سی رۆژی بەردەوام خۆت بخەرە ژێر تاقیکردنەوەوە. ئەم ئەزمونە بکەو سەرنج لە ئەنجامەکانی بدە. ماوەی سی رۆژ تەنیا لەناو "بازنەی کاریگەرێتیەکدا" هەڵسوکەوت بکە. بەڵێنی بچوک بچوک بەخۆت بدەو جێبەجێیان بکە. روناکی و رێنمایی بە نەک حاکم و قازی، نمونە بە نەک رەخنەگر: بەشێک بە لە چارەسەر نەک بەشێک لە کێشەکە.

ئەم مەسەلەیە لە ژیانی هاوسەری و لەناو خێزان و لە پیشەو کارەکەتدا جێبەجێ بکە. بەرگری لە خاڵە لاوازەکانی خەڵکی مەکە و برو بیانوش بۆ ئەوانەی

خۆت مەهێنەرەوە. ئەگەر هەڵەیەکت کرد دەستبەجێ ددانی پێدابنێ و راستی بکەرەوە و لێوەی فێرببە. مەسەلەکە لە خانەی گلەیی و تۆمەتبارکردندا نیشان مەدە. لە کارەکانتدا خوو بدەرە ئەو شتانەی کە لە دەست خۆتدان .. هەوڵ و تێکۆشانەکانت لە پێناوی کەسایەتی خۆت و بونی خۆتدا چڕبکەرەوە.

بە چاوی سۆزەوە تەماشای خاڵە لاوازەکانی بەرامبەرەکەت بکە، نەك بە چاوی تۆمەتەوە. کێشەکە لەو شتەدا نییە کە نەیکردووە. یان پێویست بو بیکات، بەڵکو لەو کاردانەوەیەدا کە خۆت بەرامبەر هەڵوێستەکە هەڵتبژاردووە. لەو کارەدایە کە پێویستە بیکەیت. هەرگیز وا بیرمەکەرەوە کە کێشەکە لە دەرەوەیە. چونکە ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە خۆی لەخۆیدا کێشەیە.

برەودانی رۆژانە بەو ئازادییە ساوایەی کە لێی بەرخورداریت دەبێتە مایەی فراوانبونی ئازادییەکە. بەڵام ئەو کەسانەی کە سود لەم ئازادییە وەرناگرن و بەکاری ناهێنن دەبنە جێبەجێکاری ئەو سیناریۆیانەی کە باوك و دایك و هاوڕێ و کۆمەڵگا دەینوسن.

ئێمە خۆمان بەرپرسیاری چالاکییەکانی خۆمان و بەختەوەری خۆمان و تاڕادەیەکیش بارودۆخی خۆمانین.

(سامونیل جۆنسن) لەمبارەیەوە دەڵێت: "سەرچاوەی رازیبون پێویستە لە ئەقڵەوە هەڵبقوڵێت. ئەوکەسەی کە ئامادەیە هەمو شتێك بگۆڕێت بێجگە لە مەیل و ئارەزووەکانی، لەراستیدا ژیانی خۆی لە هەوڵی بێسەمەردا بەفیڕۆ دەدات و لەو کوێرەوەرییە زیاتر هیچی چنگ ناکەوێت کە دەیویست نەیهێڵێت.

بەرپرسیارێتی، لە ریشە ئینگلیزییەکەوە توانای کاردانەوەیە و بەردی بناغەی هەمو چالاکییەك و هەمو خویەکی دیکەی کاریگەربوونە کە لەمەولا باسیان دەکەین.

## چەند پێشنیارێك بۆ جێبەجێکردن

١. رۆژێکی تەواو تەرخان بکە بۆ گوێگرتن لە قسەکانی خۆت و لە قسەی خەڵکانی دەوروبەرت. بزانە چەندجار هەم خۆت و هەم دەوروبەرەکەت ئەو قسانە دەکەن کە قسەی مرۆڤی کارتێکراوە، بۆ نمونە: "ئاخ ئەگەر ..". ناتوانم .. "ناچارم ..".

٢. بە پشت بەستن بە ئەزمونی رابردووی خۆت، مەسەلەیەك هەڵبژێرە کە دەزانیت کارتێکراوانە رەفتاری لەگەڵدا دەکەیت. ئینجا بە سودوەرگرتن لە سیاقی بازنەی کاریگەرێتیت پیایدابچۆرەوە. بزانە چۆن دەتوانیت دەستپێشخەرانە رەفتاری لەگەڵدا بکەیت. بە باشی بیری لێ بکەرەوە .. لە مێشکی خۆتدا ئەزمونەکە بخەرەکار، خۆت بهێنەرە بەرچاو کە دەستپێشخەرانە رەفتار دەکەیت. ماوەی نێوان کارلێك و کاردانەوەکە وەبیرخۆت بهێنەرەوە. بەڵێن بەخۆت بدە کە سەربەستانە بڕیار بدەیت.

٣. لە ژیانی تایبەتی خۆت یاخود لەناو کارەکەتدا کێشەیەك هەڵبژێرە کە هۆیەك بێت لەو هۆیانەی توشی نائومێدیان کردویت. ئینجا بە وردی دیاریبکە بزانە ئەو کێشەیە راستەوخۆیە یاخود ناڕاستەوخۆیە یاخود بە تەواوی بێکۆنترۆڵەو ئینجا ئەو یەکەمین هەنگاوە دەستنیشان بکە کە لە سنوری بازنەی کاریگەرێتیی خۆتدا دەتوانیت بیگریتە بەر بۆ چارەسەری کێشەکە و ئینجا جێبەجێی بکە.

٤. ئەزمونە سی رۆژییەکەی تاقیکردنەوەی گیانی دەستپێشخەری ئەنجام بدەو بزانە ئەو گۆڕانکارییانە چین کە لە بازنەی کاریگەرێتیدا دێنە ئاراوە.

## خووی دووەم

# کە دەستت پێکرد با کۆتاییەکەت لەخەیاڵدا بێت



## پرنسیپەکانی خۆڕابەرایەتیکردن

**تێکڕای ئەو مەسەلانە ئاسانن کە لەپاش و پێشمانن و بەراورد ناکرێن بەو شتانەی کە لە ناخماندان**

**لە قسەکانی ئۆلیڤەر وینزل هۆڤەر**

کە ئەم چەند لاپەڕە کەمەی خوارەوە دەخوێنیتەوە تکایە شوێنێکی تەنیا هەڵبژێرە کە هیچ کەس خوێندنەوەکەت پێ نەبڕێت. مێشکت ساف بکەو هیچی تێدا مەهێڵەرەوە، تەنیا بۆ ئەم خوێندنەوەیە نەبێت و بۆ ئەو شتەی کە داوات لێ دەکەم ئەنجامی بدەیت. گوێ مەدەرە هیچ شتێك و بیر لە خشتەی کارو لە ئیش و ئەرکەکان و لە خێزان و هاوڕێ و کەس‌وکار مەکەرەوە، تەنیا دڵ بدەرە خوێندنەوەی بڕگەکانی خوارەوە و مێشکت بکەرەوە.

وا بیهێنەرە بەرچاوی خۆت کە بەرێکەوتویت بۆ بەشداریکردن لە ڕێوڕەسمی بەخاکسپاردنی کەسێك، کە زۆر خۆشەویستە لەلات. دەگەیتە شوێنی مەبەست و لەوێ چاوت بە خزمان و کەس‌وکارو هاوڕێیان دەکەوێت و هەست بەو خەم و دڵتەنگیە هاوبەشە دەکەیت کە مردنی ئەوکەسە سەرچاوەکەیەتی. دەڕۆیت و کە دەگەیتە جەنازەکە، کتوپڕ لەگەڵ خۆتدا ڕووبەڕوو دەبیتەوە کە ئەمە جەنازەی خۆتە و ڕۆژەکەشی سێ ساڵی دیکەیە.

لەو ڕێوڕەسمەدا بەرنامەکە وایە چوارکەس قسەی تێدا بکەن. یەکەم قسەکەر ئەندامێکی خێزانەکەتە. منداڵەکەت، براکەت/ خوشکەکەت، ئامۆزا/ خاڵۆزا، خاڵ/ مام، باپیر/ نەنك .. تاد. کە لەسەرتاسەری وڵاتەوە هاتون بۆ بەشداریکردن لە ناشتنی تەرمی تۆدا. قسەکەری دووەم یەکێکە لە هاوڕێکانت، کەسێك کە بتوانێت لە خەڵکەکە بگەیەنێت تۆ چۆن مرۆڤێك بویت. قسەکەری سێیەمیش یەکێك دەبێت لە هاوکارەکانت و چوارەمین قسەکەریش نوێنەری ڕێکخراوێك دەبێت لە ناوچەکە.

ئێستا بە قوڵی بیربکەرەوە. پێت خۆشە هەریەکە لەو چوار قسەکەرە چی دەربارەی تۆ و ژیانی تۆ بڵێن؟ پێت خۆشە قسەی ئەوان وەك هاوسەر و دایك و باوك

چ رەنگێک بداتەوە؟ حەزدەکەیت منداڵەکانت و ئامۆزاکانت چۆن باست بکەن؟ پێت خۆشە بڵێن چۆن هاورێیەکی هاورێکانت بویت، هاوکارەکانت و هاوپیشەکانت چی بڵێن لەبارەتەوە؟

پێت خۆشە ئەو خەڵکە لە تۆدا کەسایەتییەکی چۆنیان بینیبێت؟ پێت خۆشە کام دەستکەوت و چالاکییەی تۆیان بیربکەوێتەوە؟ بە وردی سەرنج لەو خەڵکە بدەو بزانە چ گۆڕانکارییەکت لە ژیانیاندا دروست کردووە؟

پێش ئەوەی درێژە بدەیت بە خوێندنەوەی ئەم بەشە، بیرو بۆچوونەکانی خۆت بنوسە. ئەمە یارمەتیت دەدات چاکتر لە خووی دووەم تێبگەیت.

## کە دەستت پێکرد کۆتاییەکەت لە خەیاڵدا بێت. یانی چی؟

تۆ ئەگەر بە جددی ئەو جەنازەیەی خۆتت هێنابێتە بەرچاو، مانای وایە بۆ چرکەیەک دەستت بە یەکێک لە بنەماو بەها قوڵ و سەرەکییەکانی خۆتدا گەیشتووە. مانای وایە پەیوەندییەکی کورتت دروست کردووە لەگەڵ سیستمی خۆئاراستەکردنی خۆتدا کە لەناو چەقی بازنەی کاریگەرییەکانتدایە. بە وردی سەرنج لەم قسانەی جۆزێف ئەدیسۆن بدە:

"کە لە دەوروبەری خۆمدا تەماشای گۆڕی مرۆڤە مەزنەکان دەکەم هەرچی هەستی حەسودیکردن هەیە لە ناخمدا نامێنێت و بزر دەبێت. کاتێکیش ئەو نوسینانە دەخوێنمەوە کە دەربارەی مردنەکانیان نوسراون هەموو ئارەزووە سەرکێشەکانم بزر دەبن. کاتێک کە دایک و باوکێک دەبینم رۆڵەیان مردووە دڵم خەریکە بۆیان دەبێت بە ئاو. کاتێکیش کە گۆڕی دایک و باوکەکە دەبینم بێهودەیی خەفەتخواردنم بیر دەکەوێتەوە بۆ ئەوان و بۆ خۆیشمان کە هەمان چارەنوسمان لەپێشە. کاتێکیش کە پاشا و ناحەزەکانیان لەدوامەزنزڵیاندا دەبینم و کاتێک کە گۆڕی ئەو سەرکردە سیاسی و ئاینییانە دەبینم کە جیاوازییەکانیان بونەتە مایەی دابەشکردنی جیهان .. بە خەمباری و سەرسوڕمانییەوە تەماشای ئەو ناکۆکی و ململانێ بێکەڵکانە دەکەم کە ئەمانی کردە گروپ و حیزبی جۆراوجۆر. کاتێکیش کە تەماشای مێژووە جۆراوجۆرەکانی سەر گۆڕەکان دەکەم. هی ئەوانەی کە دوێنێ مردون و ئەوانەش کە شەشسەدساڵ لەمەوبەر، بیر لە رۆژی قیامەت دەکەمەوە کە خەڵکەکە هەمو بە

شێوەیەکی یەکسان زیندو دەکرێنەوەو چاویان بە یەکتری دەکەوێتەوە."

هەرچەندە خووی دووەم بەسەر زۆرینەی بارودۆخ و ئاستە جیاجیاکانی ژیاندا جێبەجێ دەبێت، بەڵام چاکترین و گرنگترین جێبەجێکردنی (کە دەستت پێکرد با کۆتاییەکەت لەبەرچاوبێت) ئەوەیە کە هەر ئەمرۆ کۆتایی ژیانی خۆت بهێنەبەرچاو لە چوارچێوەی ئەو پارادیم و چوارچێوەیەوە کە هەمو مەسەلەکانت دەدەن لە سەنگی مەحەك. تۆ دەتوانیت لە کرۆکی مەسەلە گشتییەکەوە کە خۆت بە تۆخمێکی هەرە گرنگی دەزانیت، هەڵسوکەوتی رۆژانە و هەفتانە و مانگانەی خۆت هەڵبسەنگێنیت.

مرۆڤ ئەگەر ئەم یاسایە بە راشکاوی پەیڕەو بکات و هەمیشە بیری لای کۆتایی کارەکە بێت، دەتوانێت بزانێت فلانە ئیش تا چەند لەگەڵ یاساکەدا دەگونجێت. لەهەمان کاتیشدا ئەو ئیشەی کە رۆژانە ئەنجامی دەدات بەشدارییەکی سودبەخشی دەبێت لەو تێڕوانینەی کە هەیەتی دەربارەی ژیانی خۆی بە شێوەیەکی گشتی.

سەرەتا ئەم خووە مانای ئەوە دەبەخشێت کە تۆ کاتێك دەست پێدەکەیت دەبێ بزانیت پاشەڕۆژت چی دەبێت. پەیڕەوکردنی ئەم خووە وات لێ دەکات کە بزانیت بۆ کوێ دەچیت و ئەمەش یارمەتیت دەدات باشتر لە دۆخی ئێستات تێبگەیت.

ئەم مەسەلەیە توانات پێدەبەخشێت هەمیشە هەنگاوەکانت لەسەر رێگە راستەکە بن.

زۆر ئاساییە سەرقاڵیی ژیان وات لێ بکات بە هەمو هێز و توانایەکتەوە خۆت ماندو بکەیت و زەحمەت بکێشت بەو هیوایەی کە لەسەر پەیژەی سەرکەوتندا پلەپلە بەرزببیتەوە کەچی کاتێك بەخۆت دەزانیت پەیژەکەت بە دیوارێکەوەیە، ئەو دایوارە نییە کە دەتگەیەنێتە مەبەستەکە. زۆر ئاساییە مرۆڤ زۆر سەرقاڵ بێت، زۆر زۆر، بێ ئەوەی هیچ بەرهەمێکی هەبێت.

مرۆڤ هەندێکجار سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت، بەڵام سەرکەوتنێکی بەتاڵ. سەرکەوتنێك کە لەسەر حسابی شتگەلێکی وا کە زۆر زۆر لە خودی سەرکەوتنەکە بەنرختربون بۆی. خەڵك لە بوارە جیاجیاکانی پزیشکی و سیاسەت و هونەر و وەرزش و بازرگانی و پیشەسازی و ئەکادیمیدا زۆرجار دەبینن، کە لەپێناوی داهات و پلەو پۆستی باڵاتردا رەنج و ماندوبونی وایان بینیوە کە دواتر بۆیان دەرکەوتووە ئەو مەبەست و داواکارییانە گەلێك ئامانج و مەبەستی گرنگتریان لێ شاردونەتەوە کە ئێستا لەدەست چوون.

مرۆڤ ئەگەر بەراستی بزانێت کام مەسەلەیە زۆر بایەخدارە و ئەگەر وێنەی ئەو مەسەلەیەی هەمیشە لەبەرچاودا بێت، بە ئاسانی دەتوانێت رۆژ لەدوای رۆژ ئەرك و فەرمانەکانی دیاری بکات. بەڵام ئەگەر پەیژەکە نەنرابێت بە دیوارە راستەکەوە، ئەوا هەمو هەنگاوێك کە دەینێین نزیکترمان دەکاتەوە لە شوێنە هەڵەکە. بە تەنیا هەر سەرقاڵبون و بەتوانابون بەس نین، بەڵکو کاریگەریی و توانای راستەقینە ئەوەیە کە کاتێك دەست دەدەینە کارێك کۆتاییەکەمان لەبەرچاوبێت و بزانین ئامانجەکەمان چییە.

تۆ ئەگەر راستگۆیانە مەبەستت بێت لە رێورەسمی بەخاك سپاردنتدا چی دەربارەت بڵێن، مانای وایە پێناسەی خۆتت بۆ سەرکەوتن دۆزیوەتەوە. پێناسەکە رەنگە جیاوازبێت لەو پێناسەیەی کە هەستت دەکرد لە مێشکی خۆتدایە. رەنگە ناوبانگ و پارەو دەستکەوت و هەندێ شتی دیکەی کە هەوڵیان بۆ دەدەین بەشێك نەبن لە ئامانجە راستەکە.

مرۆڤ کە لەکاتی دەستبەکاربونیدا سەرەنجامەکەی لە خەیاڵدا بێت ئەوا بە جۆرێکی دیکە لە مەسەلەکان دەڕوانێت. دەربارەی مردنی برادەرێکی هاوبەشیان، یەکێك لە هاوڕێکەی دیکەی پرسی: فلانەکەس چەندی لەپاش خۆی بەجێهێشت؟ هاوڕێکەی وەڵامی دایەوە، وتی: هەموی.

## هەمو شتێك دووجار دەخولقێنرێت

"دەستپێکردن بە جۆرێك کە کۆتاییەکەت لەخەیاڵدا" خوویەکە لەسەر پرنسیپێك پەیوەستە کە دەڵێت هەمو شتێك دووجار دەخولقێنرێت، بەشی یەکەم خولقاندێتی لە مێشکی خۆتدا و بەشی دووەمیش دروستکردنە ماددییەکەیەتی.

بۆ نمونە تۆ دەتەوێت خانویەك دروست بکەیت. یەکەمجار و تەنانەت پێش ئەوەی بزمارێکیش دابکوتیت، تۆ لە خەیاڵی خۆتدا خانووەکەت دروست کردووە .. هەروەها هەوڵ دەدەیت بگەیتە هەستێکی روون و ئاشکرا کە ئەو خانووەی دەتەوێت چۆن خانوویەکە. نەخشەی ژووری میوان و ژووری دانیشتن و شوێنی یاریکردنی منداڵان لە خەیاڵی خۆتدا دادەڕێژیت. مێشکت زۆر چالاکانە دەکەوێتە کار تا دەگەیتە ئەو مەبەستەی دەتەوێت.

پاش ئەمە دەچیتە قۆناغی وێنەی دیزاینە تەلارسازییەکە و نەخشەکەی. ئەمانە هەموی پێش ئەوەی دەستت بەر زەوییەکە بکەوێت. خۆ ئەگەر ئەم قۆناغی یەکەمە فەرامۆش بکەیت و تێی بپەرێنیت و یەکسەر دەست بدەیتە بەشی دووەم، ئەوا ئەم بەشە مادییە هەڵەو کەموکوڕی وای لێ روودەدات کە چاککردنەوەیان رەنگە دووهێندەی نرخی راستەقینەی خانووەکەی تێبچێت.

لێرەدا ئەو یاسایەی دارتاشەکان دێتە دی کە دەڵێت "ئەگەر دەتەوێت تەختەکە یەك جار ببڕیتەوە، دووجار پێوانەکارییەکانت ئەنجام بدە". پێویستە دڵنیابیت لەوەی کە هێڵکارییە تەلاسارسازییەکە یاخود بەشی یەکەمی دروستکردنەکە ئەوەیە کە دەتەوێت و هەمو لایەنەکانیش بەتەواوی لێك دەداتەوە. پاشان ئەم نەخشەیە لەسەر زەوییەکە جێبەجێ بکەو ئینجا دەتوانیت رۆژانە بڕۆیتە سەر خانووەکەت و بەپێی نەخشەکە رێنمایی و فەرمانیان بدەیتێ. ئەمەیە دەستپێکردن بە جۆرێك کە کۆتاییەکەت لەبەرچاوبێت.

نمونەیەکی دیکە لە چالاکییە بازرگانییەکاندایە. ئەگەر ویستت پرۆژەیەکی سەرکەوتوو بەدەست بهێنیت، پێویستە بەروونی دیاری بکەیت بزانیت دەتەوێت بگەیتە چی؟ بەدیهێنانی ئامانجەکەش وا پێویست دەکات کە بە وردی بیر لە بەرهەمەکە یاخود لەو خزمەتگوزاریە بکەیتەوە کە دەتەوێت لە چوارچێوەی بازاڕ و ئامانجەکانی بازاڕدا پێشکەشی بکەیت. ئینجا هەمو لایەنەکانی دارایی و لێکۆڵینەوە و هێزی کار و خستنە بازاڕەوە .. تاد رێك دەخەیت. سەرکەوتن و شکستهێنان لە دامەزراندنی پرۆژەی بازرگانی سەرکەوتودا پەیوەستە بەوەوە کە تا چەند توانیوتە بەشێوازێك دەست پێبکەیت کۆتاییەکەت لەبەرچاوبێت. زۆربەی شکستهێنانەکان لە قۆناغی یەکەمدا دەست پێدەکەن، بەتایبەت لە کێشەکانی وەکو کەمی سەرمایە و باشتێنەگەیشتن لە بازاڕەکەو نەبونی پلانی کار.

هەمان مەسەلەش لە بواری پەروەردەکردنی مناڵدا راستە. ئەگەر ئامانجت پەروەردەکردنی مناڵی بەرپرسیار و خاوەن دیسپلینە، پێویستە ئەو ئامانجەت بە رونی لە خەیاڵدا بێت لەکاتی هەڵسوکەوتی رۆژانەتدا لەگەڵیاندا. نابێت بە جۆرێکی وا رەفتاریان لەگەڵدا بکەیت دیسپلین و رێزلەخۆگرتنیان کەم بکاتەوە.

دیارە مرۆڤ بە ئاستی جۆراوجۆر ئەم پرنسیپە بەکاردەهێنن لە زۆری بواری

ژیانیاندا. بۆ نمونە تۆ پێش ئەوەی گەشتەکەت دەست پێبکەیت ئەو شوێنە دیاری دەکەیت کە بۆی دەچیت و هەروەها باشترین ڕێگاش هەڵدەبژێریت. پێش ئەوەی باخچەیەك دروست بکەیت، نەخشەکەی لەسەر پارچە کاغەزێك دادەڕێژیت. بەر لەوەی وتارەکەت پێشکەش بکەیت لەسەر کاغەزێك دەینویست. بەرلەوەی باخچەکەی ناو ماڵی خۆتان دروست بکەیت نەخشەی ڕاڕەوەکانی دیاری دەکەیت. بەرلەوەی تەقەڵ لە جلەکانت بدەیت دیزاینەکەی دەستنیشان دەکەیت.

بە تێگەیشتن لەم پرنسیپی دووجار خولڵقاندنەو بە زانینی بایەخ و ڕۆڵی هەر قۆناغێکیان مرۆڤ سنوری بازنەی کاریگەرییەکانی خۆی فراوانتر دەکات. بەڵام فەرامۆشکردنی ئەم پرنسیپە و هاوئاهەنگنەبون لەگەڵیداو گوێنەدان بە قۆناغی یەکەمی خولڵقاندن وا دەکات بازنەکە بچوك و بچوکتر ببێتەوە.

## کارکردن بە پێی دیزاین یان هەروا

ئەمە پرنسیپێکی نەگۆڕە کە هەمو شتێك دووجار دەخولڵقێنرێت، بەڵام مەرج نییە هەمو خولڵقاندنێکی قۆناغی یەکەم هەمیشە ئێمە هۆشیارانە دیزانمان کردبێت و نەخشەمان بۆ دارشتبێت. ئێمە لە ژیانی تایبەتی خۆماندا ئەگەر برەو بە خۆ — ئاگاییمان نەدەین و بەرپرسیارێتی خولڵقاندنی یەکەم نەگرینە ئەستۆ، ئەوا ڕێگە بە خەڵکی دیکەو بە بارودۆخی دەرەکی دەدەین بێنە ناو بازنەی کاریگەرێتیمانەوەو وەك (دی فاکتۆ) بەشێکی ژیانمان دیاری بکەن. بەم شێوەیە دەبینە کەسێکی کارتێکراو و ڕێگە بە خێزان و دامودەزگاو ئەجێندای خەڵکانی دیکەو گوشاری بارودۆخ دەدەین، بەهۆی ئەم کەمتەرخەمییەی خۆمانەوە، ئەوان ژیانمان دیاری بکەن.

سەرچاوی ئەم دەق و ئاراستەکردنانە خەڵکانی دیکەن نەك پرنسیپەکان. بەمەش وامان لێ دێت زیاتر و زیاتر ڕەخنە بگرین و زیاتر و زیاتر پشت بە خەڵکی ببەستین، زیاتر و زیاتر پێویستمان بەوەبێت خۆشیان بوێین و بایەخمان پێبدەن و قبوڵمان بکەن و هەست بەوە بکەین کە گرنگین.

ئێمە پێبزانین یان نا، شتەکە لە کۆنترۆڵی خۆماندا بێت یان نا، هەمو بەشێکی ژیانمان قۆناغی یەکەمی خولڵقاندنی هەیە. مرۆڤ یان ئەوەتا خولڵقاندنی دووەمی دیزانە داهێنەرو دەستپێشخەرەکەی خۆیەتی یاخود خولڵقاندنی دووەمی بارودۆخ و

خووەکانی جاران و ئەنجێندای خەڵکی دیکەیە.

توانا بۆ هاوتاکەی مرۆڤ لە خۆئاگایی و هەست و خەیاڵ و هۆشدا هێزی ئەوەی دەداتێ خولقاندنی یەکەم تاقی بکاتەوە و بەشداری تێدا بکات و دەقە تایبەتەکەی خۆی بنوسێتەوە. با بە شێوەیەکی دیکە مەسەلەکە روون بکەینەوەو بڵێین: خووی یەکەم دەڵێت: "تۆ خولقێنەریت" خووی دووەمیش خولقاندنی یەکەمە.

## سەرکردایەتیکردن و بەڕێوەبردن - دووبەشەکەی خولقاندن

خووی دووەم لەسەر پرنسیپەکانی خۆرابەرایەتیکردن دامەزراوە کە دەڵێت سەرکردایەتیکردن خولقاندنی یەکەمە. سەرکردایەتیکردن بەڕێوەبردن نییە. بەڕێوەبردن خولقاندنی دووەمە کە ئێمە لە بەشی خووی سێیەمدا باسی دەکەین. بەڵام پێویستە سەرکردایەتی پێشتر باس بکرێت.

بەڕێوەبردن جەخت لەسەر هێڵی بنەوە دەکات: چۆن بتوانم فلانە مەسەلە بە باشترین شێوە ئەنجام بدەم؟ سەرکردایەتیکردن جەخت لەسەر هێڵی سەرەوە دەکات: ئەو شتانە چین کە دەمەوێت ئەنجامیان بدەم؟ (پیتەر دروکەر) و (وارن بینیس) دەڵێن: "بەڕێوەبردن ئەوەیە کارەکان بە چاکی بکەیت، سەرکردایەتکردن ئەوەیە کارە چاکەکان بکەیت" بەڕێوەبردن ئەوەیە بە باشی بەسەر پەیژەکەدا سەربکەوێت، بەڵام سەرکردایەتیکردن دەزانێت کە ئایا پەیژەکە نراوە بە دیوارە راستەکەوە یان نا.

بۆ ئەوەی بە خێرایی جیاوازییە گرنگەکەی نێوان سەرکردایەتیکردن و بەڕێوەبردنت بۆ دەربکەوێت کۆمەڵێك جوتیار بهێنەرە بەرچاوی خۆت کە بەدەم دروێنەوە بەناو دەغڵێکدا دەڕۆن. ئەمانە بەرهەمهێنن، چارەسەرکەری کێشەکانن. ئەمانە دەڕۆن و رێگەکە پاك دەکەنەوە. بەڕێوەبەرەکان لەپشت ئەمانەوەن، داسەکان تیژدەکەنەوە و نەخشەی کارکردن و سیاسەتەکە دادەڕێژن، بەرنامەی بەهێزکردن دەگرن بەدەستەوە و تەکنیکی پێشخستنی کارەکەو قەرەبوکردنی کرێکارەکان ئامادە دەکەن.

سەرکردەکە ئەوکەسەیە کە دەچێتە سەر درێژترین درەخت و هاوار دەکات: (خەڵکینە ئەمە ئەو دەغڵە نییە کە بۆی هاتوین. بەڵام بەرهەمهێنە سەرقاڵەکان و بەڕێوەبەرەکان گوێی پێنادەن و دەڵێن چەنەبازی مەکە.. تازە وا خەریکین دەگەین. ئێمە چ وەك تاك و چ وەك گروپ و چ وەك بازرگانەکانیش زۆرجار هێندە سەرقاڵی

بڕینی گژوگیاکانین کە تەنانەت نازانین دەغڵەکە ئەو دەغڵە نیـیە کە پێویستە لێی بین. لەم بارودۆخەی ئەمڕۆشدا کە ژینگە گۆڕانی خێرای بەسەردا دێت مانای وایە سـەرکردایەتی لـە هـەمو کاتێـك زیـاتر گـرنگ و چارەنوسسـازە لـە هـەمو بـوارە سەربەخۆو ناسەربەخۆکانی ژیانماندا.

ئێمـە زیـاتر لـە جاران پێویستمان بـە تێڕوانین و ئامـانج و قیبلەنمایـە. (تـاقمی پرنسیپ و ئاڕاستەکان) و کـەمتر پێویستمان بـە نەخشە ڕێگا هەیـە. ئێمـە تەنانـەت ناشزانین زەویەکەی کە ڕێمان تـێ‌ی دەکـەوێت چۆنەو بـۆ لێتێپەڕبونیشی پێویستمان بە چیـیە. ئەمـە زیـاتر پەیوەستە بـەوەوە کـە لـەکاتی گونجـاودا چ بڕیـارێك دەدەیـن. بەڵام قیبلەنماکەی ناخ هەمیشە پێویستە بۆ ڕێنمایی و ئاراستەکردنمان.

چالاکی مـرۆڤ و تەنانـەت مانەوەشی زۆرجار پەیوەسـت نـین بـەوەی کـە هـەوڵ و ڕەنجی زۆربدات. بـەڵکو گـرنگ ئەوەیـە کـە ئاراسـتەکە، ئاراسـتەیەکی ڕاسـت و دروسـت بێـت. هـەروەها گۆڕانکـاریـیـە گرنگـەکانیش لـە زۆربـەی زۆری بوارەکـانی کـارو پیشەسـازیدا لـە پلـەی یەکەمـدا پێویسـتی بـە سـەرکردایەتیە. بـەڕێوەبردن پلـەی دوهەمە. لـە بـواری بازرگانیشـدا بـازاڕ هێنـدە بـە خێرایـی ئـاڵوگۆڕی بەسـەردادێت کـە ئەو بەرهەم و خزمەتگوزارییانەی چەند سـاڵێك لەمەوبـەر بازاڕیـان گـەرم بـوو ئێسـتا کـەس ناچێت بەلایانـدا. سـەرکردایەتی دەستپێشـخەری بـەهێزی پێویسـتە بـەردەوام چـاودێری گۆڕانکارییـەکانی ژینگـە بکـات، بەتایبـەت ئارەزووەکـان و پاڵنـەرەکانی بـەکارهێن و نەریتـەکانی و دەشـبێت ئـەو هێـزەی پێببەخشـێت کـە پێویسـتە بـۆ ڕێکخستنی سەرچاوەکان لە ئاڕاستە گونجاوەکەدا.

دیــارە هەنــدێك جــار گــۆڕانی بــەردەوام ڕوودەدات، وەك ئــەوەی ڕوودان لــە ڕێکخســتنەوەی پیشەســازی فڕۆکــەو بەرزبونــەوەی نرخــی خزمەتگوزارییــە تەندروستییەکان و کاریگـەری زیـادو بـە لێشاوی ژمـارە و جـۆری ئوتومبیـل کـە بـە شێوازی جۆراو جۆر لەسـەر ژینگـە دروستی دەکـەن. لەبـەر ئـەوە ئەگـەر پیشەسازی حساب بـۆ بـارودۆخی ژینگـە نـەکات، بـەو کرێکارانەشەوە کـە کـاری تێـدا دەکـەن و ئەگـەر سـەرکردایەتیکردێنی خوڵقێنـەر نـەنوێنێت بـۆ پاراسـتنی پێشـەنگییەکەی خۆی لەسەر ڕێبازێکی ڕاست، ئەوا هیچ تواناو شارەزاییەکی کارگێڕی ناتوانێت ڕێ لە داڕوخانی بگرێت.

بەڕێوەبردن بەبێ سەرکردایەتییەکی کاریگەر وەك ئەو رەفتارە بێهودە و بێ ئەنجامە کە کەشتییەك خەریك بێت نوغرۆ ببێت کەچی تۆ بچیت کورسی و مێزەکانی رێك بخەیت. بەڕێوەبردن چەندە بەتواناو لێهاتوش بێت ناتوانێت قەرەبوی سەرکردایەتییەکی شکستخواردو بکاتەوە. سەرکردایەتیکردن کارێکی زەحمەتە چونکە بە باشی لێی تێنەگەیشتوین و لە پارادیمی بەڕێوەبردنەوە تەماشای دەکەین.

جارێکیان لە کۆتایی خولێکی یەکسالەدا کە بۆ پێشخستنی لایەنە جێبەجێکارییەکان رێك خرابو، بەڕێوەبەری یەکێك لە کۆمپانیاکانی نەوت هاتە لام و وتی: "ستیڤن، کە تۆ لە دووەم مانگدا باسی جیاوازییەکانی سەرکردایەتیکردن و بەڕێوەبردنت کرد، من بە خۆمدا چوومەوە و بۆم دەرکەوت لە کۆمپانیاکەی خۆمدا هەرگیز رۆڵی سەرکردەو رابەرم نەبینیوە. بەڵکو رۆچوبومە ناو بەڕێوەبردنەوە. خۆم نوقم کردبو لە ملاملانێکان و وردەکارییەکانی ئیشی رۆژانەداو دابینکردنی پێویستییە لۆجستیکەکان. لەبەرئەوە بڕیارم دا خۆم لە کاروباری بەڕێوەبردن دووربخەمەوە. دەتوانم خەڵکی دیکە بدۆزمەوە ئەو کارە بکەن، چونکە دەمەوێت بەڕاستی رابەرایەتی کۆمپانیاکەم بکەم.

لەسەرەتادا ئەمە کارێکی زەحمەت بو. خۆ کشانەوە لەو ئەرك‌و فەرمانە کتوپڕو گرنگانەی کە هەستم دەکرد راستن و مایەی خۆشحاڵیم بون، مەسەلەیەکی ئاسان نەبو. بەوەش دڵم ئاوی نەدەخواردەوە کە تەنیا هەر خەریکی شیتەڵکردنەوەی کێشەکان ببم و بیر لە هەلی تازە بکەمەوەو لەهەمان کاتیشدا ئەم خۆکشانەوەیەی من هەندێکی دیکەشی ناڕەحەت کرد بەوەی کە ئەرکی وای خستە ئەستۆیان پێشتر لێیان بێخەم بون و من خۆم دەمکردن. دەیانویست هەر وەکو جاران من کێشەکانی رۆژانەیان بۆ چارەسەربکەم. بەڵام من سوربوم لەسەر ئەم بڕیار و هەڵوێستەم. باوەڕی رەهام بەوە هەبو کە پێویستە کاری سەرکردایەتی بکەم. کردیشم. ئەمڕۆ ئیش و کارەکەمان تەواو جیاوازە. زیاتر لەگەڵ دەوروبەردا گونجاوین. داهاتمان دووقات و قازانجیشمان چوارقات زیادیان کردووە. خۆیشم بە کردەوە رابەرم؟"

من تەواو دڵنیام کە زۆربەی دایکان و باوکان لە گێژاوی پارادیمی بەڕێوەبردن و فەرمان دەرکردندا گیریان خواردووە، لەبری ئەوەی ئاڕاستەکاربن بۆ دیاریکردنی

ئامـانج و هەسـت و سـۆزەکانی خێـزان. لـە ژیـانی رۆژانەشـدا. پـێش ئـەوەی بـەهاو بنـەماکان روون بکەینـەوە خۆمـان بـە جێبـەکێکردن و بـەدیهێنانی ئامانجەکانـەوە سەرقاڵ دەکەین.

## سەرلەنوێ دارشتنەوە

پێویستە خولقێنـەری یەکـەمی خـۆت بیـت. وەك پێشتر تێبینیمـان کـرد، گیـانی دەستپێشـخەریی پابەنـدی بـەهرە بێهاوتاکـەی مرۆڤـە سـەبارەت بـە خۆئاگـایی. لەراستیدا ویژدان و توانـای خـەیاڵ لـە بـەهرە بێ هاوتاکانی مـرۆڤن، کە یارمـەتیمان دەدەن گیانی دەستپێشخەریمان زیاد بکەین و رۆڵی خۆسەرکردایەتیکردن ببینین.

ئێمـە لـەرێی خەیاڵـەوە دەتـوانین بـەهرە گـەلێك لـە توانـا نـەزانراوەکان بهێنینـە بەرچاوی خۆمـان. لـەرێی ویژدانیشـەوە دەتـوانین لـە یاسـاو پرنسیپە سەرەتاییەکانی بـەهرە تایبەتـەکانمان و بوارەکـانی بەشـداریکردنمان و هێڵـە رێنماییـەکان نزیـك ببینـەوە کـە بەهۆیانـەوە دەتـوانین بـەهرەکانی خـەیاڵ و ویـژدان برەوپێبـدەین. وە ئەگـەر ئـەو دوو بەهرەیـە تێکـەڵ بـە هەسـتی خۆئاگایی بکـەین دەتـوانین بـە تـەواوی ویست و بڕیاری خۆمانەوە رەفتار بکەین. ئێمەی مـرۆڤ چونکە بەشێکی زۆری دەق و تایبەتمەندییەکانمان لە رابردووەوە پێگەیشتووە، کەواتە پرۆسـەی نوسینی دەقـەکانی خۆمان زیاتر لە پرۆسەی وەرگێڕانی پـارادیم و دووبـارە نوسینەوەی دەق دەچێت. لـە گۆڕینی هەندێك لە پارادیمە بنەڕەتییەکانمان دەچێت.

بە ناسینەوەی دەقە ناکاراکان و پارادیمـە ناتـەواو و ناڕاستەکانی خۆمـان دەتـوانین بە شێوەیەکی دەستپێشخەرانە و داهێنەرانە سەرلەنوێ خۆمان بنویسنەوە. بـە بـڕوای مـن یـەکێك لـە سەرچـاوە هـەرە ئیلهامبەخشـەکان لـە پرۆسـەی نوسـینەوەی دەقـدا بڕیتییە لە ژیاننامەی ئەنوەر سادات سـەرۆکی پێشوتری میسر. سادات لـە رابـردوودا رقێکی قوڵ و بێسنوری لە دڵدا بوو دژ بە ئیسرائیل. لـە وتـارێکی تەلەفزیۆنیـدا وتـی هەتا ئیسرائیل یەك سانتیمتری خاکی عەرەبی داگیرکردبێت ئامادەنیم دەست بخەمـە ناو دەستیەوە. هەرگیز، هەرگیز هەرگیز. جەماوەرەکـەش لەگـەڵیا هاواریـان دەکـردەوە هـەرگیز هـەرگیز. سـادات بـەو هەڵوێسـتەی گوزارشـتی لـە ویسـت و ئامـانج و توانـای هەمو وڵات دەکرد.

ئەو دەقە دەقێکی سەربەخۆ و ناسیۆنالیستی بوو، هەستە قوڵەکانی ناخی خەڵکی بێدار دەکردەوە. بەڵام لەهەمان کاتیشدا شتێکی بێ ئەقڵانە بوو. سادات ئەوەی دەزانی بەڵام فەرامۆشی دەکرد و چاوی لێ دەنوقاند.

خۆ نوسینەوەی سادات پرۆسەیەك بوو لەو سەردەمەوە دەستی پێکرد کە ئەو زیندانیەك بوو لەناو زیندانی ناوەندی قاهیرەدا کە بە تۆمەتی بەشداری کردن لە کودەتادا دژی شا فاروق دەستگیر کرابوو. ئەو لەو قۆناغەدا فێربو کە خۆی لە بیرو بۆچونەکانی خۆی دوربخاتەوەو سەرنج بدات بزانێت ئایا بیروڕاکانی راست و حەکیمانەن، لەوەوە فێربو کە چۆن مێشکی خۆی بەتاڵ بکاتەوە و دەقی تازە وەربگرێت و سەرلەنوێ خۆی بنوسێتەوە.

ئەو لە بیرەوەریەکاندا نوسیویەتی کە ئازادبونی لە زیندان زۆر پێخۆش نەبووە، چونکە لە زینداندا بوو کە فێری ئەو راستیە بوو کە سەرکەوتنی راستەقینە بریتییە لەوەی بەسەر خۆتدا زاڵ ببێت. سەرکەوتن ئەوە نییە خاوەنی چی و چی بیت. بەڵکو سەرکەوتن لە سەروەریدایە، لەوەدایە بەسەر ناخی خۆتدا سەرکەویت. ئەنوەر سادات ماوەیەك لەسەردەمی دەسەڵاتی عەبدولناصردا لە پۆستێکی بێبایەخ دا پەراوێز خرابوو. هەمو کەس وای دەزانی سادات بێهیواو دڵ شکاو و وەروخاوە. بەڵام لەراستیدا وانەبو. لێی تێنەگەیشتن و نەیاندەزانی سەرمایە گوزاری لە زەمەندا دەکات.

کە کاتێکیش هات و بووە سەرۆکی میسر و رووبەڕووی واقیعە سیاسیەکان بووەوە ئەم بە گیانێکی نوێوە تەماشای ئیسرائیلی کرد. سەردانی کەنیسەی ئیسرائیلی کرد لە (قودس) و گرنگترین قۆناغی ئاشتی دەستپێکرد لە ناوچەکەدا کە دواجار رێکەوتنی کامپ دیڤیدی لێ کەوتەوە.

سادات توانی خەیاڵو هۆش و هێزی لە خۆتێگەیشتن بخاتە خزمەت سەرکردایەتیکردنەوە بە مەبەستی گۆڕینی پارادیمە سەرەکیەکە و بەدەستهێنانی وەرچەرخانێکی گرنگ لە هەڵسەنگاندنی بارودۆخەکەدا. سادات لەناو چەقی بازنەی کاریگەرییەتیەکانیدا کاری دەکرد. وە لەرێی ئەو دووبارە نوسینەوەو (گۆڕینی پارادیمەکە) وەرچەرخانی گرنگ لە هەڵوێست و رەفتارەدا بە جۆرێك بەدی هاتن کە لە بازنە گەورەکەی بایەخداندا کاریان کردە سەر ژیانی ملیۆنەها مرۆڤ.

ئێمە زۆربەمان کە بەرەو بە تواناکانی خۆئاگاییمان دەدەین گەلێك دەقی ناکارا دەبینین کە وەکو خۆی قوڵ لە ناخماندا چەسپیون بێ ئەوەی هیچ سودو بایەخێکی هەبێت بۆمان. خووی دوهەم دەڵێت: "پێویست ناکات لەگەڵ ئەو خووانەدا بژین. ئێمە دەتوانین خەیاڵ و هێزی داهێنانمان تەرخان بکەین بۆ نوسینی دەقی نوێتر و کاریگەرتر و گونجاوتر لەگەڵ بنەما قوڵەکان و پرنسیپە راستەکانماندا کە (واتایمانا) دەبەخشن بەو بنەمایانە.

گریمان، بۆ نمونە، من زۆر هەستیارم بەرامبەر منداڵەکانم. گریمان ئەوان هەرچییەك بکەن من بە گونجاوی نازانم. دەستبەجێ هەست بە ناڕەحەتییەك دەکەم لە گەدەمدا. هەست دەکەم دیوارەکانی بەرگریکردن بەرزدەبنەوە، خۆم بۆ شەڕ ئامادە دەکەم. مەراقی من لەم حاڵەتەدا لەسەر مەودایەکی درێژخایەن نییە و بۆ لێك تێگەیشتن نییە بەڵکو لەسەر بناغەی رەفتاری کورت خایەنە. من دەمەوێت شەڕەکە ببمەوە نەك لە جەنگە گەورەکەدا سەرکەوتو بم.

هەمو چەکەکانم دەخەمە کار – پێگەکەم و دەسەڵاتەکانم و هێزو توانا جەستەییەکانم – و دەست دەکەم بە هەڕەشەو گوڕەشە. شەڕەکە دەبەمەوە. سەرکەوتوم. بەڵام سەرکەوتنێك کە پەیوەندییەکانی تێدا تێكوپێك دراوەو کە منداڵەکان بەسەر زارەکی گوێڕایەڵن بەڵام لە ناخەوە یاخیین و رقو داخەکانیان دەشارنەوە کە رۆژێك لە رۆژان هەر دەتەقنەوە.

ئێستا ئەگەر ئێمە لەو ڕێورەسمی بەخاکسپاردنەدا بین کە پێشتر هێنابومانە بەرچاوی خۆمان و یەکێك لە منداڵەکانم بیەوێت وتارێك دەربارەی من پێشکەش بکات. حەزدەکەم بڵێت ژیانی ئەو باوکەی ئێمە چیرۆکی سەرکەوتنی مامۆستاو راهێنەرێکە. تێکەڵەیەك لە دیسپلین و خۆشەویستی نەك لە دەمەقاڵێ و شەڕو ناکۆکی. حەزدەکەم ئەقڵ و دڵی لێوانلێو بن لە بیرەوەری جوان دەربارەی پەیوەندی قوڵی خۆشەویستی کە هەمومانی پێکەوە دەبەستەوە. حەزدەکەم بڵێ باوکێکی میهرەبان بو، لە هەمو چرکەساتە خۆشو ناخۆشەکاندا لەگەڵماندا بوە. حەزدەکەم ئەو چرکەساتانە باس بکات کە دەهات و باسی گیروگرفت و نیگەرانییەکانی خۆیی بۆ دەکردم و منیش گوێم لێ دەگرت و هەوڵم دەدا یارمەتی بدەم. حەزدەکەم بزانێت

کە منیش مرۆڤێکی کامڵ نیم بەڵام هەمیشە هەوڵدەدەم بێ کەموکوڕی بم. حەزم دەکرد بیزانیبایە کە هیچ کەسێك لە دنیادا هێندەی من ئەوی خۆش ناوێت.

دیارە ئارەزوی من لەسەر ئەو شتانە سەرچاوەکەی ئەوەیە کە منداڵەکانم خۆش دەوێن و ئامادەم یارمەتییان بدەم و رۆڵی خۆمم لەلا گرنگە. بەڵام مەسەلە ساکارەکان کاریگەریان کرد ئەو بەهاو بنەمایانەم بیرنەمێنن. لایەنە گرنگ و سەرەکییەکە بزر دەبێت لەژێر باری گیروگرفتە سەختەکان و نیگەرانی و ئامۆژگاری راستەوخۆدا. ئەمە دەمکاتە مرۆڤێکی کارتێکراو. هەڵسوکەوتی رۆژانەم لەگەڵ منداڵەکانمدا هیچ شتێکی لەو هەستە قوڵە ناچێت کە بەرامبەریان هەمە.

من چونکە خۆئاگاییم هەیە و چونکە خاوەنی هۆش و خەیاڵم دەتوانم بنەما هەرە قوڵەکانی ناخی خۆم بناسمەوە و تاقی بکەمەوە. دەتوانم بزانم کە ئەو دەقەی پێی دەژیم هاوئاهەنگ نییە لەگەڵ ئەو بەهایانەدا. دەتوانم بزانم کە ژیانم بەرهەمی دەستپێشخەری و دیزانەکانی خۆم نییە، بەڵکو بەرهەمی ئەو یەکەم خوڵقاندنەیە کە لە بارودۆخەکان و لە خەڵکانی دیکەوە وەرم گرتووە. بەڵام من دەتوانم گۆڕانکاری بهێنمە ئاراوە. دەتوانم لەجیاتی ئەوەی لەسەر بیرەوەرییەکانم بژیم، شتەگەلی دیکە بهێنمە بەرچاوی خۆم. لەبری ئەوەی خۆم بە رابردووە سنوردارەکەوە شەکەت بدەم، دەتوانم خۆم ببەستمەوە بە توانا بێسنورەکانمەوە. دەتوانم ببمە خوڵقێنەری یەکەمی خۆم.

دەستپێکردن بەو شێوازەی کە کۆتاییەکەم لەبەرچاوبێت بریتییە لەوەی کە رۆڵی خۆم وەکو باوکێك و وەکو شتەکانی دیکەش بە جۆرێکی وابیینم کە ئاڕاستەکەم و بنەماکانم روون و ئاشکرابن لەلام. بریتییە لەوەی خۆم بەرپرسیاری ئەوەبم کە ببمە خوڵقاندنی یەکەمی خۆم. بریتییە لەوەی بە جۆرێکی وا خۆم بنوسمەوە کە پارادیمەکانی سەرچاوەی رەفتارو هەڵوێستەکانم هاوئاهەنگ بن لەگەڵ بنەما قوڵەکان و پرنسیپە راستەکاندا.

هەروەها بریتیشە لەوەی لە دەستپێکی هەمو رۆژێکدا ئەو بەهایانەم لەبیر بێت. پاشان ئەگەر کێشەم هاتەڕێ و بارودۆخەکانیش هەڵگەڕانەوە بتوانم لەسەر بنەمای ئەو بەهایانە بڕیاربدەم. بتوانم دەستپاکانە رەفتار بکەم. نابێت رەفتارەکانم کاردانەوە

بـن بەرامبـەر بـارودۆخ و هەڵچـونەکان. مـرۆڤ ئەگـەر بـەهاکانی روون و ئاشـکرابن دەتوانێت کەسێکی داهێنەر و دەستپێشخەر بێت و بنەماکان سەنتەری ژیانی بن.

## پەیامی ژیانی خۆت

بە بڕوای من کاریگەرترین ڕێگا بۆ ئەم خووە (کە دەستت پـێکرد کۆتاییەکـەت لـە خەیاڵدا بێـت) بریتییـە لـە نوسینەوەی پـەیامی ژیـان لـەژێر رۆشـنایی فەلسـەفەیەك یاخود باوەڕێکدا. پەیامەکە پێویستە ئـەم شـتانە لـەخۆ بگرێـت: دەتـەوێت ببیـت بـە چـی (کەسـایەتی) و چـی دەکـەیت (کـارو دەسـتکەوتەکان) و ئـەو پرنسـیپ و بەهایانـە چین کە لە کارو کەسایەتیتدا پشتیان پێدەبەستیت.

مادام هیچ تاکێك لە تاکێکی دیکە ناچێت و بونـەوەرێکی بـێ وێنەیـە کەواتـە ئـەم تایبەتمەنـدی و بـێ وێنەیـەی لـە شـێوەو نـاوەڕۆکی پەیامەکەیشـدا رەنـگ دەداتـەوە. هاوڕێیەکم (رۆڵفی کەیر) بیروباوەڕی خۆی بەم شێوەیە دەربڕیوە:

- یەکەم جار سەرکەوتن لە ماڵەوە بەدەست بهێنە
- پشت بە خوا ببەستەو سوپاسی بکە.
- هەرگیز لەسەر دەستپاکی سازش مەکە
- ئەو کەسانەت بیرنەچێتەوە کە بەشداربون لەگەڵتدا
- پێش ئەوەی هیچ حوکمێك بدەیت گوێ لە هەردوولایەنەکە بگرە
- داوای ئامۆژگاری بکە
- راستگۆ بەو مەسەلەکانیش یەکلایی بکەرەوە
- هەمو ساڵێك شتێکی نوێ فێرببە
- لەمڕۆوە نەخشەکەی سبەینێ دابنێ
- بە جۆش‌و خرۆشەوە بڕۆ بەلای کارە تازەکەتەوە
- هەمیشە ئەرێنی بە
- رووخۆش بە
- لە کارو لە مەسەلە تایبەتەکاندا خاوەنی دیسپلین بە
- لـە هەڵـەکردن مەترسـە. تـەنیا ئـەوە نیگـەرانت بکـات کـە توانـای دروسـتکردن و داهێنان و راستکردنەوەی هەڵەکانت نەبێت

- پارمەتی سەرکەوتنی یاریدەدەرەکانت بدە
- چەند قسە دەکەیت دوو هێندە گوێ بگرە
- هەمو هێزو توانایەکت بۆ ئەم کارەی ئێستات چڕبکەرەوە و نیگەرانی کاری داهاتوت مەبە

## خاتونێکی کەیبانوی ماڵیش پەیامەکەی ئاوایە

- بە هەمو توانایەکمەوە هەوڵی بەدەستهێنانی هاوسەنگی دەدەم لەنێوان ئایندەو خێزانەکەمدا، چونکە هەردوکیان بەلامەوە گرنگن.
- ماڵەوە شوێنی ئیسراحەت و حەوانەو بەحتەوەریی خێزان و هاوڕێ و میوانەکانمە. هەوڵدەدەم ژینگەیەکی پاك و ڕێكوپێك دروست بکەم شایستەی ئەوەبێت تیا بژین. هەمو کارو کردەوەیەکیشمان حەکیمانە بەڕێوە دەبەم.
- بەتایبەتیش منداڵەکانم لەسەر خۆشەویستی و پێکەنین و خوێندن رابهێنم و فێری ئەوەیان دەکەم کاربکەن و برەو بدەن بە بەهرەکانیان. هەروەها بە ڕێزێکی زۆرەوە دەڕوانمە ئەرك و ماف و ئازادییەکان لە کۆمەڵگا دیموکراسییەکەماندا و هەوڵدەدەم هاوڵاتیەك بم خاوەنی زانیاری زۆر دەربارەی دەوروبەر و بەشدارییش دەکەم لە پرۆسە سیاسییەکەدا بۆ ئەوەی دڵنیابم لەوەی کە دەنگی من دەبینرێت و کاریگەری هەیە لەسەر هەڵبژاردنەکان. هەروەها کەسێك بم دەستپێشخەر بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانم لە ژیاندا نەك چاوەڕوانی بڕیارەکانی ئەموئەو بم.
- لەئاست هەڵوێست و هەلە ڕەخساوەکاندا دەستپێشخەریی دەنوێنم.
- خۆم دووردەخەمەوە لە مادده هۆشبەرەکان و خووە وێرانکەرەکان و هەوڵدەدەم ئەو خووانە برەو پێبدەم کە رزگارم دەکەن لە کۆت و پێوەندەکان و لە دروشمە کۆنەکان. هەروەها هەوڵی فراوانکردنی بازنەی تواناو هەڵبژاردنەکانم دەدەم.
- ئەو پارەیەی کە هەمە دەیکەمە خزمەتکاری خۆم نەك من ببمە نۆکەری ئەو. هەروەها هەوڵیش دەدەم بۆ دابینکردنی سەربەخۆیی دارایی خۆم بە شێوەیەکی هەمیشەیی و کارێك دەکەم ئەو شتانە داوا بکەم کە بەڕاستی پێویستم پێیانە، بێجگە لە قەرزی درێژخایەن بۆ ئوتومبیل و خانو، هەوڵدەدەم هیچ جۆرە قەرزێکی دیکە نەکەم. هەروەها پێویستە خەرجییەکانم لە داهاتەم کەمتر بن، بەردەوام پاشەکەوتم هەبێت و بەشێك لە داهاتەکەم بخەمە سەرمایەگوزارییەوە.

- لەمەش زیاتر هەوڵدەدەم باشتر سود لە سەروەت و بەهرەکانم وەربگرم بۆ ئەوەی بەشداری بکەم لە پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری و کاری خێرخوازیی بۆ خەڵکانی موحتاج و ژیانیان خۆشتر بکەم.

لەراستیدا پەیامی ژیان دەستوری ئەو کەسەیە و بەهەمان شێوە دەستوری ئەمریکی، بناغەکەی ناگۆڕێت. سەرەڕای تێپەڕبونی زیاتر لە دووسەد ساڵ بەسەر دەرچونی ئەو دەستورەدا تەنیا بیستوشەش هەموارکردنەوەی بەسەردا هاتووە کە (١٠) دانەیان سەبارەت بە خاڵە سەرەکیەکانی (ماف) بون.

دەستوری ئەمریکی پێوەرێکە کە هەمو یاساکانی دیکەی ویلایەتە یەکگرتووەکان لەسەر بناغەی ئەم هەڵدەسەنگێنرێن. هەروەها ئەو بەڵگەنامەیەیە کە سەرۆك سوێندی پێدەخوات و پابەندی دەبێت و ئەو پێوەرەیە کە هاوڵاتی لەرێی ئەوەوە رەگەزنامەکەی وەردەگرێت. ئەو بناغە و بابەتە گرنگەیە کە یارمەتی هاووڵاتیان دەدات قەیرانەکانی وەکو جەنگی ناوخۆ و جەنگی ڤێتنام و رسوایی رۆتەرگێت تێپەڕێنێت. دەستور لەراستیدا تەرازوییەکی نوسراوەو ئەو پێوەرە بنەڕەتییەیە کە ئاراستەکردن و هەڵسەنگاندنی هەمو مەسەلەکانی پێدەکرێت.

دەستور هەمو تاقیکردنەوەکانی بڕیوەو تاکو ئەمڕۆش رۆڵی یەکلاکەرەوەی خۆی بینیوە، چونکە لەسەر پرنسیپی راست و هەقیقەتی روون و ئاشکرا دامەزراوە کە هەمویان لە راگەیاندنی سەربەخۆییدا دەرخران. لە قۆناغە هەستیارەکانی گۆڕان و تەمومژە کۆمەڵایەتییەکاندا ئەم پرنسیپانە هێزو تینێکی بێسنوریان بەخشییە دەستور. تۆماس جیفرسۆن دەڵێت: دەستورێکی نوسراو زامنی ئاسایشە هەڵکەوتوەکەمانە.

لەراستیدا بونی پەیامێکی تایبەتی ژیان کە بنەماکانی راست و دروست بن بۆتە پێوەری یەك بەیەکی ئێمە. ئەو پەیامە دەستوری کەسێتی و بەردی بناغەی هەمو بڕیارێکی گرنگ و سەرەکیی ژیانە، هەروەها مەرجێکی بنەڕەتیە بۆ دارشتنی ئەو بڕیارانەی کە لە بارودۆخە هەستیارەکاندا کاریگەریی لەسەر ژیانمان جێدەهێڵن. هەر ئەم پەیامەشە کە لە گەرمەی گۆڕانکارییە بەردەوامەکاندا هێزمان پێدەبەخشێت.

مـرۆڤ ئەگـەر لەناخیـدا پاڵنـەرێکی نـەگۆڕی نـەبێت ناتوانێـت لەگـەڵ گۆڕنەکانـدا بژی. توانای گۆڕین کلیلێکی هەیە، ئەو کلیله بریتییـه لـه هەسـتێکی نـەگۆڕ بەرامبـەر بە خۆت: تۆ کێیت و خەریکی چیت و چ نرخ و بەهایەکت هەیە.

پەیامی ژیان وامان لێ دەکات لەگەڵ گۆڕانکارییەکانـدا هەڵبکـەین. ئـیتر پێویستمان بە حوکمی پێشوەخت و بە لایەنبازیی نامێنێت. مرۆڤ کە خـاوەنی پـەیامێکی راسـت و دروسـتی ژیـان بـو ئـیتر پێویسـتی بـەوە نابێـت لـە پێنـاوی گەیشـتنە راسـتیدا هـەمو شتەکانی ژیان دەربخات و هەمو کەسێك لە قاڵب بدات.

دیارە ژینگەش بەردەوام لە گۆڕاندایە. گۆڕانێکی لـەجاران خێراتـر و ئـەم گۆڕانکاریـە خێرایانـە زۆرکـەس مانـدو دەکات و دەیانباتـە سـەر ئـەو بـاوەڕەی کـە نـاتوانن بـەردەوام ببن و خۆیان لەگەڵ ئەو ژیانەدا رابهێنن. لەبەرئەوە تەسلیم دەبـن و تـەنیا هەڵوێستێك کە بینوێنن (کاردانەوەیە) بەو هیوایەی مەسەلەکە لە بەرژەوەندی ئەمان بگۆڕێت.

بەڵام ئایا پێویستە مەسـەلە ئـاوا بـڕوات بـەڕێوە؟ نـەخێر. لـە ئۆردوگاکـانی نازیـدا کـە خـەڵکی تیـادا قـەتڵوعام دەکـرا، ڤیکتـۆر فـرانکڵ فێـری پرنسـیپەکانی گیـانی دەستپێشـخەریی بـو. هـەروەها بـۆی دەرکـەوت دیـاریکردنی ئامـانج و واتـای ژیـان مەسـەلەیەکی زۆر گرنگـە. گەوهـەری فەلسـەفەکەی فـرانکڵ لـە چارەسـەرکردنی نەخۆشدا کە بـەم دواییـە دەسـتکاری کـردو بریتییـە لـەوەی بـە شـێوەیەکی ئـەقڵانی بگەڕێنەوە بۆ خودا، جەخت لەوە دەکاتـەوە کـە بەشـێکی زۆری نـەخۆشـییـە ئـەقڵی و دەرونیـەکان لەراسـتیدا سەرچـاوەکەیان ئەوەیـە کـە هەسـت بـە بۆشـی (پووچـی) دەکەین. هەست بە بێهودەیی دەکـەین و هەسـت دەکـەین ژیـان هـیچ واتایـەکی نـییـە. فەلسەفەی ئەم گەڕانەوە ئەقڵانیـیە بـۆ ویسـتی خـودا مـرۆڤ رزگاردەکات لـەم هەسـتە پوچە، بەوەی کە یارمەتی دەدات پەیام و واتای ژیانی خۆی بدۆزێتەوە.

تۆ ئەگـەر بگەیتـە ئاسـتی ئـەوەی درك بـە پەیامەکـەی ژیانـت بکـەیت مانـای وایـە دەسـتت گەیشـتۆتە سـەنتەری گیـانی دەستپێشـخەریی خـۆت و خـاوەنی ئـەو خـەون و بنەمایانەشیت کـە ژیانـت ئاڕاسـتە دەکـەن. هـەر ئەمـەش دەبێتـە هـەوێنی داڕشـتنی ئامانجـە کورتخایـەن و دوورەمـەوداکانت. هـەروەها هێـزی دەسـتورە نوسـراوەکەت کـە لەسەر بناغە راستەکان داڕێژراوە. دەبێتـە سـەنگی مەحـەك بـۆ تاقیکردنـەوەی بڕیـارە گرنگەکان و ناسینی وزە و بەهرەکانت.

## لە چەقی بازنەکەدا

ئێمە بۆ ئەوەی پەیامی ژیانمان بنوسینەوە پێویستە رێك لە چەقی بازنەی کاریگەرێتییەکەمانەوە دەست پێبکەین، لەو سەنتەرەوە کە بریتییە لە بەشێکی زۆری پارادیمە بنەڕەتیەکانمان و ئەو هاوێنەیەیە کە ئێمە دنیای لێوە دەبینین. لێرەدایە کە ئێمە هەڵسوکەوت لەگەڵ تێڕوانین و بنەماکانماندا دەکەین. هەر لێرەشدایە کە دەتوانین سود لە توانای خۆئاگاییمان ببینین بۆ تاقیکردنەوەی نەخشەکانمان و بزانین ئاخۆ پرنسیپەکانمان راست و دروستن و دڵنیابین لەوەی نەخشەکە نەخشەی ناوچەکەی خۆمانەو پارادیمەکانمان لەسەر حەقیقەت و پرنسیپ داڕێژراون. هەر لێرەدایە کە هەستو هۆشمان دەکەینە قیبلەنمایەك بۆ دۆزینەوەی بەهرە بێ هاوتاکانمان و ئەو شوێنانەی کە دەتوانین رۆڵی تێدا ببینین. هەر لێرەدایە کە دەتوانین بەهرەی خەیاڵمان بخەینە گەڕ بۆ ئەوەی لە مێشکی خۆماندا ئەو کۆتاییە بخولقێنین کە مەبەستمانە. ئاراستەو مەبەستێك ببەخشین بە یەکەمین هەنگاومان و کەرەستەی تەواو دابین بکەین بۆ نوسینی دەستورە تایبەتەکەی خۆمان.

هەر لێرەشدایە کە هەوڵە چڕکراوەکانمان گەورەترین ئامانجیان لێ دەکەوێتەوە. مرۆڤ کە لە چەقی بازنەی کاریگەرێتی خۆیدا کاری کرد بێئەوەی مەبەستیشی بێت بازنەکە فراوانتر دەکات. ئەمەش گەورەترین پاڵنەرە بۆ بەرەوپێش بردنی هێزی بەرهەمهێنان کە رۆڵێکی گەورەی هەیە لەوەی کە هەمو بوارێك لە بوارەکانی ژیانمان گرنگ و کاریگەربن.

سەنتەری ژیانمان هەرچییەکی تێدابێت راستەوخۆ دەبێتە سەرچاوەی ئاسایش و ئاڕاستەکردن و حیکمەت و دەسەڵاتمان.

<u>ئاسایش</u>: وا لە مرۆڤ دەکات هەست بە نرخ و کەسایەتی خۆی بکات و رێز لە خودی خۆی بگرێت و پێکهاتە بنەڕەتیەکانی کەسایەتی خۆی بزانێت.

<u>ئاڕاستەکردن</u>: ئەو سەرچاوەیەیە کە رێبازی ژیانت دیاری دەکات و ئەگەر نەخشەکەی خۆتی تیا بەکارهاتبێت ئەوا هەمو پێوەرە ناوخۆییەکان و یاساو پرنسیپەکانی کە چرکە بە چرکە کردارو بڕیارەکانت دیاری دەکەن هەمویان لەو پەیڕەوە ناوخۆیەوە سەرچاوە وەردەگرن کە لە روداوەکان تێدەگات و هەمویان لێکدەداتەوە.

**حیکمەت**: بریتییە لە تێڕوانینت بۆ ژیان. برتییە لە هەستکردن بە هاوسەنگی و لەوەی کە تێبگەیت چۆن هەمو پرنسیپ و پێکهاتەکان پەیوەندییان بەیەکتریەوە هەیە و بەبێ یەکتری ناژین.

حیکمەت بریتییە لە حوکمدانی راست و بیروبۆچونی چاکەو تێگەیشتن. حیکمەت بە کورتییەکەی بریتییە لەوەی هەڵوێستی بێ هاوتا هەڵبژێریت و وەکو تاکێك لەگەڵ ئەو کۆیەدا یەکبگریت کە لە ناخی خۆتەوە هەڵدەقوڵێت.

**دەسەڵات**: بریتییە لە هێزو توانای جێبەجێکردن. بریتییە لە توانای بەئەنجام گەیاندنی مەسەلەیەك. ئەو وزە بنەڕەتیەیە کە بڕیارو هەڵبژاردنەکان دیاری دەکات. دەسەڵات بریتییە لە توانای زاڵبون بەسەر خووە رەگ هاویشتووەکانداو هەڵکەندنیان و چاندنی خووی باشتر و کاریگەرتر.



ئاسایش و ئاڕاستە و حیکمەت و دەسەڵات چوار هۆکارن کە زۆر پەیوەستن بە یەکەوە. ئاسایش و ئاڕاستەکردن حیکمەتی راستەقینە دەستەبەر دەکەن، حیکمەتیش دەبێتە ئەو پریشك و هۆکارە یاریدەدەرەی کە دەسەڵات دەخولقێنێت و ئاڕاستەی دەکات.

کاتێکیش ئەم چوار هۆکارە پێکەوە بە شێوەیەکی چالاك و هاوئاهەنگ کۆدەبنەوە هێزە گەورەکە دروست دەبێت کە دەستنیشانکەری کەسایەتی جوامێرو هاوسەنگ و کامڵە.

هیچکام لەم چوار هۆکارەی رەهەندەکانی ژیان ناتوانێت ببێتە ئەڵتەرناتیڤی ئەوی دیکە. هیچ کامیشیان ئەوە نی‌یە کە یان دەبێت بە تەواوەتی هەبێت یان هەر نەبێت، بەڵکو دەکرێت لە ئاستی جیاجیادا بن و وەك گەلێك بابەتی دیکە بە پرۆسەی پێگەیشتندا بڕۆن. دەکرێت لە خاڵی دەستپێکدا هەمویان لاواز بن چونکە لە بنەڕەتدا تۆ سەرەتا پشت بە خەڵکی دیکەو بە بارودۆخەکە دەبەستیت، بەڵام لە کۆتاییدا وات لێ دێت خۆت کۆنترۆڵی پرۆسەکە بکەیت. چونکە بویتە خاوەنی دەسەڵاتێکی سەربەخۆ و کۆمەڵێك پەیوەندی گرنگ و بەهێز. ئاسایشی هەمو کەسێك دەکەوێتە شوێنێك لەنێوان ئەوپەڕی ئاسایش لەسەرێکەوەو ئەوپەڕی هەستکردن بە ئارامی و ئاسایش لەسەرەکەی دیکەوە. لە جەمسەری بێ ئاسایشیدا ژیانت دەکەوێتە بەر رەحمەتی زەبری هێزە دەرەکیەکان. ئاڕاستەی مرۆڤیش بەهەمان شێوە لە شوێنێکدایە لەنێوان پشتبەستنی تەواو بە ئاوێنە کۆمەڵایەتیەکە (کە ناجێگیرەو) جەمسەری ئەوسەریشی بریتییە لەوەی مرۆڤ لەناوەوە خۆی ئاڕاستەی خۆی بکات. حیکمەتیش لە شوێنێکدایە لەنێوان ئەوەی کە نەخشەکە هەڵەو ئاڵۆز بێت و هیچ رەهەندێکی تێدا دیاری نەکرابێت و جەمسەری ئەوسەریشی نەخشەیەکی وردی رێکوپێکی ژیان بێت کە هەموو بەش و پرنسیپەکانی بە چاکی پەیوەست کرابن بەیەکتریەوە. دەسەڵاتیش لە شوێنێکدایە لەنێوان ئەوەی هیچ جوڵەیەك نەکەیت و وەك توتکە سەگێك وابێت و زنجیرەکەی ملت کەسێکی دیکە رایکێشابێت. وە ئەوەی کە هەمو دەسەڵات و دەستپێشخەریەکە لای خۆت بێت و لە روانگەی بنەماکانی خۆتەوە رەفتار بکەیت نەك بارودۆخ و خەڵکەکە کارت تێبکەن.

پێگەی ئەم چوار هۆکارە لەسەر شەبەنگەکە و دەرەنجامی کۆتایی پەیوەندی و هاوسەنگی و هاوئاهەنگی نێوانیان و کاریگەری ئەرێنیان لەسەر هەمو بوارەکانی ژیانت کاری ئەم سەنتەرەیە کە باسمان کرد. واتە ئەرکی پارادیمە بنەڕەتیەکانی ناخی خۆتن.

## سەنتەرە ئەڵتەرناتیڤەکان

ئێمە بێ ئەوەی پێبزانین هەریەکەمان سەنتەرێکین، مرۆڤ نەك هەر ئاگاداری بونی ئەو سەنتەرە نییە، بەڵکو نکوڵی لەوەش دەکات کە کاریگەری هەبێت لەسەر هەمو بوارەکانی ژیانی.

با بە کورتی لە چەند سەنتەرێك ورد ببینەوە (لەو پارادیمە گەوهەریانە) کە زۆربەمان هەمانن تا بزانین چۆن کار دەکەنە سەر چوار ڕەهەندە بنەڕەتیەکانمان و لە ئەنجامیشدا چ کاریگەرییەك لەسەر ژیانمان جێدەهێڵن.

## سەنتەربونی هاوسەرگیریی

ڕەنگە هاوسەرگیریی گرنگترین خاڵی هاوبەشی هەستو سۆزی مرۆڤ بێت و مەسەلەیەك بێت لە هەمو مەسەلەکانی دیکە زیاتر مرۆڤ وا لێبکات بەرگەی قەیرانەکان بگرێت و لە ناخەوە هەست بە حەسانەوە بکات. هەروەها ڕێگەیەکی گرنگی دروستکردنی پەیوەندیە مرۆڤایەتیەکانیشە. لەبەرئەوە زۆر ئاسایی و گونجاویشە مرۆڤ هاوسەرەکەی خۆی بە هەند وەربگرێت.

بەڵام لەڕێی ئەزمون و تێبینی کردنی چەند ساڵەی خۆمەوە چەندین نمونەی هاوسەرگیری نائارامم بینیوە. هەروەها تێبینیشم کردووە کە تاڵە دەزوویەکی دیاریکراو هەیە لەناو ئەو هەمو پەیوەندیانەدا کە هاوسەرگیری کردۆتە سەرنتەر. تاڵە دەزووەکە ئەوەیە کە یەکێکیان لەڕووی سۆزداریەوە زۆر زۆر پەیوەستە بەوی دیکەوە. ئەگەر تۆ وا هەست بکەیت کە هەمو بەها سۆزداریەکەی تۆ سەرچاوەکەی ئەو هاوسەرگیرییەیە ئەوا وات لێ دێت زۆر زۆر پەیوەست ببیت بەو پەیوەندیەوە، بەمەش دەکەویتە بەر ڕەحمەتی ڕەفتار و ڕەوشت و مەزاجی هاوسەرەکەتەوە و زۆر هۆکاری دەرەکیش زەبر بەو پەیوەندیە دەگەیەنێت، وەك منداڵ و کەسوکار و کێشە

دارایی‌یەکان و مەسەلە کۆمەڵایەتیەکانی لایەنی بەرامبەر.

کاتێـك کـە بەرپرسـیارێتییەکان و گوشـارەکان زیـاد دەبـن ئێمـە هەوڵـدەدەین بگەڕێینەوە بۆ ئەو دەق و سکریپتانەی کە پێشتر پێمان بەخشرابون. بەڵام کێشەکە لەوەدایـە هاوسەرەکەیشـت هـەمان رەفتـار دەکـات. دەقـەکانیش جیـاوازن. ڕێگـای جیاوازن بۆ رووبەڕووبونـەوەی مەسـەلە داراییـەکان و پـەروەردەکردنی منـاڵ و .. تـاد. ئـەم جیاوازیانـە لەلایـەك و خۆبەسـتنەوەی تـەواو بـە هاوسـەرگیرییەکەوە لەلایـەکی دیکەوە وا دەکەن خاڵە لاوازەکانی ئەمجۆرە سـەنەتەربونە دەرکەون. تۆ ئەگـەر هـەمو شـتێکت بەدەسـت کەسـێك بێـت کـە لـە زۆر مەسـەلەدا لەگەڵیـدا ناکۆکیـت، ئـەوا پێویستییەکان تێکـەڵی ناکۆکیـەکان دەبـن. رق و خۆشەویسـتی تێکـەڵی یـەك دەبـن و شـەڕو راکـردن و پاشەکشـە و دوژمنایـەتی و تورەبـون سـەرهەڵدەدەن و لەئەنجامـدا ململانێیەکی ساردوسڕ پەیدا دەبێت.

لەکاتی رووداني ئەم بابەتانەدا ئێمە لەپێناوی پاساو هێنانـەوەدا بـۆ رەفتارەکـەمان و بـەرگریلێکردنی و هێرشکردنەسـەر لایەنەکـەی دیکـە هەوڵـدەدەین بگەڕێینـەوە بـۆ نـەریت و خووەکـانی جارانمـان. ناچـار دەبـین بـۆ خۆپاراسـتن لـە برینـی زیـاتر پـەنا بەرینـە بـەر سـوعبەتی بریندارکـەر و گاڵتـەپێکردن و رەخنـەگرتن و هـەمو ئـەو شـتانەی کـە پێچـەوانەی گەرموگوڕیەکـەی جارانمانـە. هـەر لایـەنێك چـاوەڕێیە لایەنەکـەی دیکـە دەسـت پێشـخەری بکـات لـە نیشـاندانی خۆشەویسـتیدا و توشـی نائومێدی دەبێت و بەڵام هەمیشەش خۆی بە خاوەنی حـەق دەزانێـت لـەو تۆمەتانـەی کە ئاڕاستەی بەرامبەرەکەی کردووە.

لەکاتێکیشدا کە مەسـەلەکان بـە رێکوپێکی بـەڕێوە دەڕۆن، ئاسایش و ئارامیەکە تەنیا سێبەرێکەو هیچی دیکە. ئاڕاستەکەش ئاڕاستەیەکی کاتـیـە و هەسـتو سۆزی ئـەو چرکەسـاتە دروسـتی کـردووە. پەیوەندیـە پێچـەوانە نەرێنیەکـەی نێوانیشـیان هەمو دەسەڵات و حیکمەتێك لەناودەبەن.

## سەنتەربونی خێزان

یەکێك لە سەنتەرە باوەکانی دیکە خێزانە. ئەمیش رەنگە بـە رواڵـەت سروشـتی و گونجـاو بێـت. خێـزان وەك شـوێنێك بـۆ بایەخپێـدان و سـەرمایەگوزاریکردنی قـوڵ

دەتوانێت بواری چاك بڕەخسێنێت بۆ پەیوەندی قوڵ و خۆشەویستی و بەشداری بۆ زۆربەی ئەو شتانەی کە مانایەك بە ژیان دەبەخشن. بەلام لەهەمان کاتیشدا، خێزان ئەگەر بکرێتە سەنتەر و چەقی هەمو شتێك ئەوا بە شێوەیەکی گاڵتەئامێز هەمو ئەو هۆکارانە لەناودەبات کە بۆ سەرکەوتنی خێزان پێویستن.

ئەو کەسانەی کە خێزان سەنتەری ژیانیانە هەمو نرخ و بەهاو ئاسایشێکی خۆیان لە نەریت و کەلتور و ناوبانگی خێزانەکانیاندا دەبینن. لەبەرئەوە هەر گۆڕانکارییەك لەو نەریت و کەلتور و ناوبانگەی خێزان راستەوخۆ کار دەکاتە سەر ئەمانیش.

ئەو باوك و دایکەی کە خێزانیان کردووە بە سەنتەری ژیانیان، لەڕووی سۆزدارییەوە ئازادی لەدەست دەدەن و دەسەڵاتی ئەوەشیان نابێت کە لە پەروەردەکردنی منالەکانیاندا بەرژەوەندیان لەبەرچاو بگرن. تۆ ئەگەر خێزان سەنتەری ژیانت بێت، خۆشەویستی ئێستای منالەکەت وات لێ دەکات رێوشوێنی وای لەگەڵدا نەگریتەبەر کە لە ئایندەدا سود بە منالەکەت بگەیەنێت. نازی دەدەیتێ و ئەو نازە وای لێ دەکات زۆر پشت بە خۆی نەبەستێت و بیر لەوە نەکاتەوە ئایندەیەکی باش بۆ خۆی دابین بکات. ئەو باوك و دایکەی کە خێزانیان کردۆتە سەنتەر تەنیا بیر لەوە دەکەنەوە کە لەم چرکەساتەدا چی راستە: هەر هەڵوێستێك بە هەڵەی بزانن ئاسایشیان دەخاتە مەترسییەوە و تووشی نیگەرانییان دەکات. لەبری ئەوەی لەسەر مەودایەکی دوور بیر لە پەروەردەکردن و پێگەیاندنی منالەکەی بکاتەوە، هەمو رەفتار و هەڵوێستێکی رەنگدانەوەی چرکەساتەکەی ئێستا دەبێت. باوك و دایکی لەوجۆرە ئەفیزێنێ و هاوار دەکات، رەنگە کاردانەوەکەشیان زیاد لە پێویست توندوتیژ بێت و داخی دڵی خۆیان بە خەڵکی دیکە برێژن. ئەم جۆرە دایك و باوکە منالەکانیان بە مەرج خۆش دەوێت و ئەمەش وا دەکات ئەو منالانە یان زۆر پەیوەست ببن بە دایك و باوکیانەوەو بەبێ ئەوان هیچیان بۆ نەکرێت، یاخود بە تەواوی دژیان بوەستنەوە و تەنانەت لێشیان یاخی ببن.

## سەنتەربونی پارە

یەکێکی دیکە لە سەنتەرە هەرە لۆجیکی و باوەکانی ژیانی مرۆڤ پارە پەیداکردنە. ئاسایشی ئابوری مەسەلەیەکی بنەڕەتییە بۆ بوارەکانی دیکەی ژیان. لەسەردەمی ئەمڕۆدا کە پێویستیەکان بەردەوامن، دابینکردنی ژیان و سەربەخۆیی

دارایی لە پلەی یەکەمدایە. هیچکام لە پێویستیەکانی دیکە دەستەبەر نابن ئەگەر لانی کەمی ئەم پێویستییە بنەڕەتیە مەیسەر نەبێت.

ئێمە زۆربەمان مەترسیمان لە بارودۆخی دارایی خۆمان هەیە. گەلێك هێزی دەرەکیش هەن کە دەتوانن کار بکەنە سەر بارودۆخی ئابوریمان و ببنە مایەی نیگەرانیمان کە ڕەنگە زۆرجار ئەو هەست و نیگەرانیە هەر لە ناخماندا بمێننەوەو دەریان نەبڕین.

چەند هۆکارێکیش هەن کە بە ڕواڵەت هۆکاری جوامێرانەن بۆ پارە پەیداکردن. بۆ نمونە بەخێوکردنی خێزان و دابینکردنی ژیانێکی ئاسودە. ئەمانە مەسەلەگەلێکی گرنگن. بەڵام ئەگەر هەمو هەوڵ و تێکۆشانێکت هەر بۆ کۆکردنەوەی پارەبێت و پارە بکەیتە سەنتەری ژیانت ئەوا بە کردەوە تۆ پێچەوانەکەیت چنگ دەکەوێت.

جارێکی دیکە هەرچوار هۆکارەکە بهێنەرەوە بەرچاوی خۆت کە باسمان کردن و بریتین لە ئاسایش و ئاڕاستەکردن و حیکمەت و دەسەڵات. گریمان من هەمو سەرچاوەی ئاسایشی خۆم لە کارەکەمدا ببینم یاخود لەو داهاتەی کە دەستم دەکەوێت. یان لە تواناو لێهاتویی خۆم. بەڵام ئەمانە هیچیان بابەتی نەگۆڕ نین و زۆر هۆکار هەن کاردەکەنە سەر ئەو دەزگا داراییانە. لەبەرئەوە نیگەرانی و بێ ئارامی زاڵ دەبن بەسەرماو دەکەومە هەڵوێستێکەوە کە هەر خەریکی خۆپاراستن و بەرگریلەخۆکردن بم دژی ئەو شتانەی کە ڕەنگە کاربکەنە سەر پۆستەکەم و داهاتەکەم و لێهاتوییەکەم. کاتێك من هەمو نرخ و بەهایەکی خۆم لەو بڕە پارەیەدا ببینم کە دەستم دەکەوێت، مانای وایە هەر شتێك کار بکاتە سەر داهات و پلەو پۆستەکەم کاریش دەکاتە سەر نرخ و بەهاکانی من. بەڵام نە کارو نە پارە هیچیان حیکمەت و ئاڕاستەی چاك بە مرۆڤ نابەخشن و تا ئەندازەیەکی دیاریکراویش دەتوانن دەسەڵات و ئاسایشت بۆ دابین بکەن. ئەگەر دەتەوێت بزانیت سەنتەربونی پارە چەند سنوردارە لە ژیانی مرۆڤدا، سەرنج لەو کاتانە بدە کە خۆت یان کەسێکی نزیکت توشی قەیرانێکی دارایی دەبن.

ئەوکەسانەی کە پارە دەکەنە سەنتەری ژیانیان زۆرجار خێزانو مەسەلە گرنگەکانی دیکە دەنێنە لاوەو وا دەزانن هەمو کەس تێدەگات کە پێویستیە

ئابورییەکان لە پلەی یەکەمدان. من باوکێك دەناسم کە لەگەڵ منداڵەکانیدا دەچوو بۆ تەماشاکردنی سێرك، بە تەلەفۆن داوایان لێکرد بچێتەوە بۆ سەرکارەکەی. بەڵام ئەو ڕەتی کردەوە. کە ژنەکەشی لێی پرسی بۆچی ناڕۆیت بۆ سەرکارەکەت؟ وتی: کار هەر پەیدا دەبێتەوە، بەڵام سەردەمی منداڵی ناگەڕێتەوە. منداڵەکان بە درێژایی ژیانیان ئەم هەڵویستەی باوکەکەیان بیرنەچووەوە و زۆر بەلایانەوە گرنگ بو نەك هەر وەکو وانەیەك بەڵکو وەکو بیرەوەریەکی خۆش لە دڵیاندا مابووەوە.

## سەنتەربونی کار

وەك چۆن خەڵك هەیە گیرۆدەی مادە هۆشبەرەکان دەبن، ئەوەش کە "کار" دەکاتە سەنتەری ژیانی وای لێ دێت هەمو شتێك دەکاتە قوربانی کارەکەی: پەیوەندییەکان و تەندروستی و هەمو مەسەلە گرنگەکانی دیکەی ژیان. مرۆڤی لەو جۆرە ناسنامەکەی خۆی تەنیا لە ئیشەکەیدا دەبینێت: "من پزیشکم" "من نوسەرم" "من ئەکتەرم".

تۆ ئەگەر هەمو نرخ و بەهایەکی خۆت تەنیا هەر لە کارو پیشەکەتدا ببینیت و ئیشەکەت ببێتە پێکهێنەری ناسنامەکەت، مانای وایە هەر کاتێك توانای بەردەوامبونت لەو کارەدا نەما ئەوا دەستبەجێ ئارامی و ئاسایشت نامێنێت. مرۆڤی لەوجۆرە ئەگەر ئاڕاستەیەکی هەبێت، ئەو ئاڕاستەیە پێویستییەکانی کارو پیشەکەی دیاری دەکەن. حیکمەت و دەسەڵاتیشی پانتایەکی سنورداری کارەکەی داگیر دەکەن و لە بوارەکانی دیکەی ژیاندا نە حیکمەتێکی دەبێت نە هیچ تواناو دەسەڵاتێکیش.

## سەنتەربونی خاوەندارێتی ( ملك و ماڵ و شتی دیکە )

بەلای زۆرکەسەوە پاڵنەرە سەرەکییەکە ئەوەیە خاوەنی (شت) بیت. شتەکان هەم کەلوپەلە هەستپێکراوەکانی وەك ئوتومبیل و جلوبەرگی گرانبەهاو کەسەرەو خانوو .... تاد دەگرێتەوە، هەم شتە هەستپێنەکراوەکانی وەك پێگەی کۆمەلایەتی و ناوبانگ و شکۆش لەخۆ دەگرێت. دیارە زۆربەشمان بە ئەزمونی ژیان بۆمان دەرکەوتووە کە ئەمانە هەموویان تۆخمی لاوازن و بە ئاسانی کاریان تێدەکرێت و لەناودەچن.

من ئەگەر هەستکردنم بە ئاسایش و ئارامی تەنیا لەوەوە سەرچاوە بگرێت کە ناوبانگم هەیە و خاوەنی فلان و فیسارە بابەتم، ئەوا هەمیشە لەژێر هەڕەشەی بەردەوامی ئەوەدا دەبم کە ڕەنگە ئەم شتانەم بدزرێنن یاخود بزربن یاخود نرخەکانیان کەم ببنەوە. ئەگەر ڕووبەڕووی کەسێکیش ببمەوە لە خۆم دەوڵەمەندتر و بەناوبانگتر و بەدەسەڵاتتر، ئەوا هەست بە کەمیی دەکەم. کە ڕووبەڕووی کەسێکیش دەبمەوە من لەو دەسەڵاتدارتر و بەناوبانگتر و دەوڵەمەندترم ئەوا هەست بە لوتبەرزی دەکەم. دیارە ئەم هەردوحاڵەتەش نیشانەی ئەوەن کە هەستکردنم بە نرخ و بەهای خۆم هەستێکی جێگیر نییە. لەم دۆخەدا هیچ هەستێك بە ئاسایش و بەردەوامی و سەقامگیری کەسایەتیی خۆم ناکەم. هەروەها هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدا دەبم بەرگری لەخۆم بکەم و پێگەو دارایی و ناوبانگ و ملك وماڵەکانم بپارێزم و زیادیان بکەم. ئێمە هەمومان لێرەو لەوێ هەواڵی ئەوکەسانەمان گوێ لێ بووە کە کاتێك لە مامەڵەیەکی بازرگانیدا توشی زیانی قورس بون خۆیان کوشتووە، یان لە ئاکامی ئاڵوگۆڕە سیاسییەکاندا کەوتونەتە پەراوێزەوە و دەسەڵاتیان لێ سەندراوەتەوە.

## سەنتەربونی ڕابواردن

سەنتەرێکی ناسراوی دیکە کە پەیوەندی بەهێزی هەیە بە خاوەندارێتییەکانەوە بریتییە لە سەنتەربونی چێژ و ڕابواردن. جیهانی ئەمڕۆمان جیهانێکە هانی تێرکردنی پێویستییەکان دەدات. سینەماو تەلەفزیۆن و هۆکارەکانی دیکەی پەیوەندی و ڕاگەیاندن لەو کەرەسە سەرەکییانەن کە داواکانی مرۆڤ زیاد دەکەن و دیمەنی ئەو نەتەوەو وڵاتانەمان نیشان دەدەن کە ژیانیان خۆش و کامەران و پڕ لە ڕابواردنە. ئەم جۆرە ژیانە هەرچەندە کاریگەرییەکی خراپ و نەرێنی هەیە لەسەرمان بەڵام زۆرجار هەست بە دەرەنجامە خراپەکانی ناکەین لەسەر خۆمان و بەرهەم و پەیوەندییەکانمان.

دیارە گەلێك سەرچاوەی باش و بێ زیان هەن کە دەتوانن ببنە مایەی بەختەوەرکردنی مرۆڤ و حەسانەوەی ئەقڵ و جەستەی و پتەوکردنی پەیوەندییەکانی خێزان و پەیوەندییەکانی دیکە. بەڵام ڕابواردن خۆی لەخۆیدا

هەرگیز مایەی حەسانەوە و ئیسراحەتێکی قوڵ و بەردەوام نییە. ئەوکەسەی کە رابواردن دەکاتە سەرنتەری ژیانی خۆی، زۆر بە خێرایی هەست بە بێزاری دەکات لەو رابواردنەو داوای زیاتر و زیاتر دەکات و هەوڵدەدات رابواردنەکانی داهاتو چێژ و خۆشیی زیاتری پێببەخشن. بەمەش وردە وردە کەسەکە دەبێتە مرۆڤێکی خۆپەرست و وا دەزانێت ژیان تەنیا هەر رابواردن و چێژی دەستبەجێیە.

ئێمە ئەگەر رابواردن بکەینە سەنتەری ژیانمان، وامان لێ دێت بەشێکی زۆری ژیانمان لە پشووەکان و تەماشاکردنی فیلم و دانیشتن بەدیار تەلەفزیۆن و یارییە ڤیدیۆییەکانەوە بەسەرببەین و تەمەنمان بەفیڕۆبدەین. ژیان لەو سەنتەرەدا تواناکان سست دەکات و بەهرەکان دەپوکێنێتەوەو و رۆح و ئەقڵ خامۆش دەکات و دڵ ناکام دەکات. دەسەڵات و حیکمەت و ئاڕاستە و ئاسایش لەوپەڕی لاوازیدا دەمێنێتەوە: مانەوەی کورتخایەن لە ناوچەی چێژدا.

لە کتێبی (شایەتییەکی سەدەی بیستەم)دا مالکۆڵم مۆگیریدج دەڵێت:

" هەمو جارێك كە سەرنج لە رۆژانی رابردوو دەدەم، شتێك کە زۆر سەرنجم رادەکێشێت ئەوەیە کە هەر شتێك کە جاران بەلامەوە زۆر گرنگ و بەنرخ بووە ئێستا دەیبینم بێبایەخترین و بێ ئەقڵانەترین مەسەلەیە، بۆ نمونە: سەرکەوتن لە مەسەلە ناسراو و خۆشەکانی وەکو پارەو سێکس و گەشتوگوزار و خۆنواندن و تاقیکردنەوەی ئەو شتانەی دەبنە مایەی لەخۆبایبون و هەمو هەوڵەکان بۆ تێرکردنی داواکارییەکان و بۆ رازیکردنی خودی خۆمان، هەمویان لەراستیدا وەهمن، یان بە دەردی پاسکاڵ دەڵێت وەك ئەوە وایە زەوی بلێسیتەوە".

## سەنتەری بونی هاوڕێ / دوژمن

گەنجان بەتایبەتی، مەرج نییە هەمویان، لە خەڵکانی دیکە زیاتر ئەگەری ئەوە هەیە هاوڕێیەتی بکەنە سەنتەری ژیانیان. پەیوەندیکردن بە گروپێکی تایبەتەوە و قبوڵکردنیان لەلایان دەبێتە مەسەلەیەکی زۆر گرنگ. سەرچاوەی هەرچوار هۆکارە گرنگەکەی ژیانیان بریتیی دەبێت لەو ئاوێنە کۆمەڵایەتییە تەڵخەی کە هەمیشە لە گۆڕاندایە و بەمەش وایان لێ دێت تا ئەندازەیەکی زۆر پابەندی هەست و رەفتار و هەڵوێست و مەزاجە هەڵبەزو دابەزکەرەکەی خەڵکانی دیکە بن.

ئەم سەنتەربونە جاری وا هەیە تاقە (یەك) کەس دەکاتە سەنتەر و دەبێتە ئاڕاستەیەك کە بە هاوسەرگیری کۆتایی دێت .. سەنتەربونی هاوڕێیەتی وات لێ دەکات لەڕووی سۆزدارییەوە سەرومڕ پابەندی (یەك) کەس ببیت و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر پەیوەست ببیت پێیەوە و پێویستت پێی بێت و بەمەش ململانێکانت لەگەڵیدا زیاتر دەبن و لەئەنجامدا کارلێکی نەرێنی لێ دەکەوێتەوە.

ئەی سەنتەربونی دوژمن چییە؟ ئایا ڕێی تێدەچێت مرۆڤ دوژمنێك بکاتە سەنتەری ژیان و بایەخەکانی؟ بەڵێ ڕێی تێدەچێت بەڵام زۆربەمان پێی نازانین و دانی پێدا نانێین. هەندێکجار ئەو پرۆسەیە لە نەستدا ئەنجام دەدرێن، واتە بە شێوەیەکی لاشعوری ئەو دوژمنە دەکەیتە سەنتەری ژیان و هەمو بایەخەکانت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم مەسەلەیە شتێکی دەگمەن نییە، بەتایبەت ئەگەر ئەو دووکەسەی کە ناکۆکییەکی جددییان لەنێواندایە زوو زوو بەریەك بکەون و کاریان بکەوێتە یەکتری. ئەگەر من هەست بکەم بەرامبەرەکەم خراپ ڕەفتاری لەگەڵدا کردوم و ئەو کەسەش لەڕووی کۆمەڵایەتی و سۆزدارییەوە حسابێکی تایبەتی هەیە لەلام ئەوا ئیتر شەو و ڕۆژ بیر لەو زوڵم و ناهەقییەی دەکەمەوەو کابراکە دەکەمە سەنتەری ژیانم. لەمەشەوە ئیتر لەبری ئەوەی بەشێوەیەکی ئەرێنی خەریکی ژیانی خۆم ببم، هەمو ئەقڵ و توانایەکم لەو دوژمایەتییەدا چڕدەکەمەوە و هەڵوێستێکی ناحەز و دوژمندارانە بەرامبەر ڕەفتار و هەڵوێستی ئەو کەسە وەردەگرم.

یەکێك لە هاوڕێکانم کە مامۆستای زانکۆیەك بو زۆر ناڕەحەتی و سەرسوڕمانی دەربڕی لەوەی کە یەکێك لە بەرپرسە کارگێڕییەکانی ئەو زانکۆیە کەسێکی لاوازەو پەیوەندییەکی خراپی لەگەڵ ئەمدا هەیە. هاوڕێکەم کارێکی وای کرد ئەم کابرایە بووە تەوەری هەمیشەیی بیرکردنەوەکانی و لەئاکامدا لە خۆی کردە مەراقێکی زۆر گەورە. ئەم مەسەلەیە بە جۆرێك مێشکی داگیرکردبو کە کاری کردە سەر هەمو پەیوەندییەکانی لەناو خێزان و کەنیسەو ئیش و کاردا. لەئەنجامدا بڕیاری دا ئەو زانکۆیە جێبهێڵێت و بڕوات لە شوێنێکی دیکە بەدوای کاردا بگەڕێت.

لێم پرسی وتم "ئەگەر ئەو کابرایە لەوێ نەبوایە ئامادەبویت کە زانکۆ جێ نەهێڵیت؟"

وەڵامی دامەوە "بەڵێ، بەڵام هەتا ئەوی لێ بێت مانەوەم لەو زانکۆیەدا ژیانم لێ

تێك دەدات، لەبەرئەوە پێویستە لەو زانکۆیە نەمێنم".

لێم پرسی: بۆچی ئەم کابرایەت کردۆتە سەنتەری خۆت؟".

پرسیارەکەم تووشی شۆکی کرد. نکۆڵی لەوەکرد. بەڵام من بۆم سەلماند کە بواری داوە زەلامێك و لاوازییەکانی ئەو زەلامە هەمو نەخشەکەی ژیانی ئەم تێك بدەن و متمانەی بە خۆی لەق بکەن و پەیوەندییەکانی تێك بدەن لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە ئەم خۆشی دەوێن".

لە کۆتایی گفتوگۆکەماندا هاوڕێکەم ددانی بەوەدا نا کە کابرا ئەو هەمو کاریگەرییەی هەبووە لەسەری، بەڵام نکۆڵی لەوەکرد ئەم بڕیارانە هیچ خەتای ئەمی تێدابێت و هەمو بەرپرسیارێتییەکی خستە ئەستۆی کابرا.

زۆرێکیش لەو ژن و مێردانەی لەیەکتری جیادەبنەوە دەکەونە هەمان هەڵەوە. هێشتا هەر پڕن لە رق و کینەو تووڕەیی بەرامبەر هاوسەرەکەی پێشویان و هەوڵدەدەن هەمو خەتاکە بخەنە ئەستۆی ئەو. ئەم هەستە نەرێنییە وا دەکات هەست بکەن لەڕووی دەروونییەوە هێشتا هاوسەری یەکترین و بەدوای خاڵی لاوازی یەکتریدا دەگەڕێن و پاساوی هەڵەکانی خۆیانی پێدەنەوە.

زۆر منداڵیش کە گەورە دەبێت لە ڕێڕەوی ژیانیدا بە قۆناغی ئەوەدا رەت دەبێت کە بە دزییەوە رقی لە باوك و دایکی بێت. ئۆباڵی فەرامۆشکردن و خراپە و فەزڵدانی منداڵەکانی دیکە بەسەر ئەمدا دەدەنە پاڵیان و کە گەورەبون و پێگەیشتن ئەم رقە دەکەنە سەنتەری ژیانیان و بە جۆرێك دەژین کە هەر چاوەڕێ بن شتێك رووبدات و کلیلی ژیانی خۆیان تەسلیمی بارودۆخەکان بکەن.

ئەو کەسەی کە هاوڕێ یاخود دوژمن دەکاتە سەنتەری ژیانی خۆی هەرگیز هەست بە ئاسایش و ئارامییەکی راستەقینە ناکات. لەهەمان کاتیشدا مەسەلەی هەستکردن بە نرخ و بەهای خۆشەویستی مەسەلەیەکی نەگۆڕ نابێت بەڵکو هەمیشە لە هەڵبەزو دابەزدا دەبێت و پابەندی هەڵوێستی خەڵکانی دیکە و هی بارودۆخەکەی دەوروبەرە. ئاڕاستەکەشی لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە ئاخۆ خەڵك چۆن کاردانەوەیەکیان دەبێت. حیکمەتەکە لەلایەن ئاوێنە کۆمەڵایەتییەکەوە دیاری دەکرێت و ئەگەر سەنتەرەکەشی دوژمنێك بێت ئەوا حیکمەتەکەی هەر بریتی دەبێت لەوەی هەست بە زوڵمێکی گەورە بکات.

## سەنتەربونی دامەزراوە ئاینییەکان

من لەو باوەڕەدام کە زۆربەی ئەوانەی بە جددی قوڵ بونەتەوە لە کاروباری دامودەزگا ئاینیەکان دەزانن کە سەردانی شوێنەکانی خواپەرستی یەکسان نیە بە باوەڕی قوڵ. ئەوانەی زۆر هاتوچۆی کەنیسە و شوێنەکانی خواپەرستی دەکەن مەرج نیە زۆر باوەڕیان بە مەسەلە رۆحییەکان هەبێت. هەندێك کەس هێندە سەرقاڵی بەرنامەو پرۆژەکانی ئەو دامودەزگایانە دەبن کە گوێ نادەنە پێویستییەکانی مرۆییەکانی خەڵکانی دەوروبەریان. ئەمە پێچەوانەی ئەرکە ئاینییەکانە کە گوایە ئەمان زۆر خۆیان بە پابەندی دەزانن. بە پێچەوانەشەوە خەڵك هەیە زۆرکەم هامشۆی شوێنەکانی خواپەرستی دەکات یان هەر سەردانی ناکات کەچی رەفتار و هەڵوێست و هەڵسوکەوتەکانی تەواو هاوجوتن لەگەڵ ئەرك و فەرمایشتەکانی ئاینەوە.

من بەهۆی ئەو ئەزمونەی لە چالاکیە کۆمەڵایەتیەکاندا بەدەستم هێناوە بۆم ساغ بۆتەوە کە هامشۆکردنی زۆری شوێنی خودا پەرستی مەرج نییە مانای جێبەجێکردنی ئەرکە ئاینییەکان بێت. مرۆڤ هەیە لە چالاکیەکانی شوێنەکانی خواپەرستیدا گورج و گۆڵە، بەڵام لە جێبەجێکردنی ئەرکە ئاینیەکاندا بەوجۆرە نیە.

ئەوکەسەی کە هاتوچۆکردنی کەنیسەو شوێنەکانی دیکەی خوداپەرستی دەکاتە سەنتەری ژیانی رەنگە وای لێ بێت هەر بایەخ بە شتە روکەشەکان بدات و لەکۆتاییدا بکەوێتە داوی ریاکاری و دووڕوویییەوە. ئەمەش زەبرێکی گەورە بە ویژدان و ئاسایشی کەسەکە دەگەیەنێت. هیدایەت و ئاڕاستەکاری لە هوشیاری کۆمەڵایەتیەوە دێن و بەرهەمی ویژدانی کۆمەڵایەتین. کەسێکیش کە دەزگا ئاینیەکانی کردبێت بە سەنتەری ژیانی خۆی، هەوڵدەدات ناتۆرە و نازناوی جۆراوجۆر بۆ دەوروبەرەکەی بدۆزێتەوە و بەم بڵێت گورجوگۆڵ و بەو بڵێ تەمبەڵ و بڵێ گومڕاو و بڵێ سەلەفی و .. تاد.

ئایین دەزگایەکە بەرنامەو رێورەسمی تایبەتی خۆی هەیە. بەڵام دین بە تەنیا خۆی ناتوانێت ئاسایشێکی قوڵ و هەمیشەیی بە مرۆڤ ببەخشێت و پایەی بەرز بکاتەوە، بەڵکو ئەمانە دەرەنجامی جێبەجێ کردنی ئەرکەکانی ئاینن نەك هەر تەنیا بایەخ دان بە مەسەلە رواڵەتیەکانی ئایین.

هاتوچۆکردنی زۆری کەنیسەو شوێنەکانی دیکەی خواپەرستی دەستەبەری ئەوە

ناکەن کەسەکە هەمیشە هەست بە هیدایەت و هەبونی ئاڕاستە بکات. ئەوکەسەی دەزگا ئاینییەکانی کردبێتە سەنتەری ژیانی خۆی هەمیشە لە گۆشەگیریدا دەژی و شەو و ڕۆژ بیری لای پشووەکان و بۆنە ئاینییەکانە. بە چاوێکی جیاواز لە باقی ڕۆژەکانی دیکە دەڕوانێت. مرۆڤ کە نەگاتە ئاستی کامڵبون و گومان لە ئاستی دەست پاکی و بێهاوتاییەکەی هەبێت وای لێ دێت هەست بە ئاسایش نەکات و ناچار دەبێت پاساو بۆ کردەوەکانی بهێنێتەوە و ناوو ناتۆرەی جۆراوجۆر لە دەوروبەرەکەی بدۆزێتەوە. مرۆڤ نابێت هاتوچۆکردنی شوێنەکانی خواپەرستی لێ ببێتە ئامانج بەڵکو ئامرازێکە بەرەو ئامانجێکی گەورەتر. هەر تێڕوانینێکی دیکەی مرۆڤ بۆ شوێنەکانی خواپەرستی لە گۆشەنیگای جیاوازەوە ئەنجامەکەی بەوە دەشکێتەوە کە ئەوکەسە هاوسەنگی خۆی لەدەست بدات و حیکمەتی نەمێنێت. ئەو قسەیە ڕاستە کە دەڵێت: شوێنەکانی خواپەرستی دەتوانن مرۆڤ ئاشنابکەن بە سەرچاوەکانی هێز، بەڵام ئەمە مانای وانیە کە خۆیان سەرچاوەی هێز بن. شوێنەکانی خواپەرستی ئامرازێکن هێزی ئیمان لە کەسایەتی مرۆڤدا دەچێنن.

### سەنتەربونی خود

ڕەنگە لەم سەردەمەی ئەمڕۆدا بەناوبانگترین و بەربڵاوترین سەنتەر، ئەوە بێت مرۆڤ بایەخ بە خۆی بدات. ئاشکراترین شوێنەکانی ئەم سەنتەربونەشی بریتییە لە خۆپەرستی کە پێچەوانەی بەهاکانی زۆربەی زۆری خەڵکیە. تۆ ئەگەر لە نزیکەوە سەرنج لەو هەمو ئاڕاستانە بدەیت کە بۆ نەشونما کردن پێویستن، دەبینیت زۆربەی زۆریان لە ناوەڕۆکدا بریتین لە سەنتەربونی خودی کەسەکە.

کێشەی ئەم جۆرە سەنتەربونە ئەوەیە کە برێکی زۆرکەم ئاسایش و دەسەڵات و ئاراستەو حیکمەتی تیایە. وەکو دەریای مردوو وایە. لق و جۆگەی زۆری دەچێتە سەر، بەڵام هیچی لەبەر ناڕوات و مەنگ دەبێت.

لەلایەکی ترەوە بایەخ دان بە پێشخستنی خودی خۆت لە چوارچێوەی پارادیمە گەورەکەدا بە مەبەستی چاککردنی تواناکان و بەرزکردنەوەی ئاستی خزمەتگوزاری و بەرهەم و بەشداری کردنی سودمەندانە دەبنە مایەی گەشەسەندنی دراماتیکی لەهەرچوار هۆکارەکەی کە پێشتر باسمان کرد.

ئەوانەی کە تا ئێستا ئاماژەمان پێداون، سەنتەرە هەرە ناسراو و بەربڵاوەکانن و لەو سەنتەرانەوە ئێمە ئاراستەی ژیان دەبین. زۆرجار بەلامانەوە زۆر ئاسانترە سەنتەری کەسێکی دیکە دەستنیشان بکەین لەوەی کە سەنتەرەکەی خۆمان بناسینەوە. ڕەنگە کەسێك بناسیت کە پەیداکردنی پارە بەلایەوە لە هەمو شتێکی دیکە گرنگترە، یاخود کەسێکی دیکە بناسیت کە هەمو هەوڵ و تەقەلایەکی بۆ ئەوەیە بڕوبیانو بۆ هەڵوێستی خۆی لە پەیوەندیە خراپەکاندا بدۆزێتەوە، بەڵام ئەگەر قوڵتر تەماشا بکەیت دەتوانیت بزانیت چ هۆکارێك وای کردووە ئەم مەسەلەیە ببێتە سەنتەری ژیانی کەسەکە.

## دیاری کردنی سەنتەری خۆت

هەڵوێستی تۆ چیە؟ سەنتەری ژیانت چی تێدایە؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە زۆرجار ئاسان نین. ڕەنگە باشترین ڕێگا بۆ ناسینی سەنتەرەکەی خۆت ئەوەبێت لە نزیکەوە سەرنج بدەیتە چوار هۆکارە پشتگیریکەرەکەی ژیانت. تۆ ئەگەر توانیت یەك دوانێك لەم خەسڵەتانەی خوارەوە بدۆزیتەوە دەتوانیت شوێن پێیان هەڵبگیرت و بزانیت لە چ سەنتەرێکەوە هەڵقوڵاویت، سەنتەرێك کە ڕەنگە تواناکانت سنوردار بکات.

| سەنتەر | ئاسایش | ئاڕاستەکردن | حیکمەت | دەسەلات |
|---|---|---|---|---|
| ئەگەر سەنتەری ژیانت ژیانی هاوسەرگیری بێت | - سەرچاوەی هەستکردنت بە ئاسایش ئەوەیە هاوسەرەکەت چۆن رەفتارت لەگەڵ دەکات.<br>- لەژێر بەزەیی مەزاج و هەستی لایەنی بەرامبەردا دەبیت.<br>- ئەگەر هاوسەرەکەت لەگەڵ بیروبۆچوونەکانتدا نەگونجێت یاخود لەئاستی چاوەڕوانیەکانتدا نەبێت توشی نائومێدییەکی هێندە گەورە دەبیت کە پاشەکشە یاخود ململانێی لێ دەوێتەوە.<br>- هەرشتێک بەر پەیوەندییەکانت بکەوێت دەبێتە مایەی هەڕەشەی راستەوخۆ | - داواکاری و پێویستییەکانی خۆت و هاوسەرەکەت ئاڕاستەکەت دیاری دەکەن.<br>- سنوری بڕیارەکانت ئەوە دیاری دەکات کە چی باشترین شتە بۆ هاوسەرگیرییەکەت یاخود بۆ هاوسەرەکەت و بیروبۆچوونی هاوسەرەکەت زۆر گرنگن. | - گۆشەنیگای ژیانت ئەو شتانە دیاری دەکەن کە باش یان خراپ کاردەکەنەسەر هاوسەرەکەت و پەیوەندییەکانت | - هەر لاوازییەکی خۆت یان هاوسەرەکەت کاردەکاتە سەردەسەلاتەکە. |
| ئەگەر سەنتەری ژیانت بریتی بێت لە خێزان | - ئاسایشەکەت پەیوەستە بەوەی خێزان چەند قبوڵت دەکات و داواکانت دەهێنێتە دی<br>- هەستکردنت بە ئاسایشی تایبەتی خۆت وەکو خێزان قابیلی هەڵگەڕانەوەیە.<br>- هەستکردنت بە شانازی و رێز پەیوەستە بە ناوبانگی خێزانەکەتەوە | - تۆماری خێزان ئەو سەرچاوەیە کە ئاڕاستەی چاکسازییەکانت دەکات<br>- بڕیارەکانت لەو روانگەیەوە دەدەیت کە تا چەند لەگەڵ بەرژەوەندی خێزان و ئەندامەکانیدا دەگونجێت. | - ژیان لەژێر رۆشنایی بیروبۆچوونەکانی خێزانەوە لێک دەدەیتەوە ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی بە ناتەواوی و نەرجسیانە لە خێزان تێبگەیت. | - نەریت و نمونەکانی خێزان کۆنترۆڵی هەڵسوکەوتت دەکەن. |

| سەنتەر | ئاسایش | ئاراستەکردن | حیکمەت | دەسەڵات |
|---|---|---|---|---|
| ئەگەر سەنتەری ژیانت بریتی بێت لە پارە | - نرخی خۆت بەوە دیاری دەکەیت کە چەندت پارە هەیە<br>- بەئاسانی دەچیتە ژێر رەحمەتی ئەو شتانەی کە ئاسایشی ئابوریت دەشێوێنن | - بڕیارەکانت لەو روانگەیەوە دەدەیت کە چەندت قازانجە | - پارە کۆکردنەوە دەبێتە ئەو ئاوێنەیەی کە ژیانی لێوە دەبینیت و تێی دەگەیت و بەمەش هەمو بڕیارەکانت ناهاوسەنگ دەبن. | - دەسەڵاتەکانت سنوردار کراو دەبن چونکە هەم ئەو شتانەی کە بە پارە دەکرێن سنوردارن و هەم تێڕوانینەکانیشت سنوردارن. |
| ئەگەر کارکردن سەنتەری ژیانت بێت | - هەمو کەسایەتی خۆت لە پلەو پۆست و کارەکەتدا دەبینیت.<br>- تەنیا کارو پیشەکەت مایەی حەسانەوەتن | - بڕیارەکانت لەسەر بناغەی ئەوە دادەڕێژیت کە کارەکەت پێویستی بە چییەو چاوەڕێی چیت لێ دەکات | - تەنیا هەر لەڕێی کارەکەتەوە پێناسە دەکرێیت.<br>- وا تەماشای کاردەکەیت کە هەمو شتێکی ژیانە | - کردارەکانت سنوردارکراون بە شێوازی کارکردنت و بەو هەل و فرسەتانەی لە بواری نیشدا بۆت هەڵدەکەون و بە یاساکانی کارو بە بیروبۆچونەکانی سەرۆکەکەت و بەوەی کە ئەتوانیت کارێکی دیکە ئەنجام بدەیت. |
| ئەگەر سەنتەری ژیانت خاوەنداریتی بێت | - هەستکردنت بە ئاسایش پەیوەستە بە ناوبانگت و پێگەی کۆمەڵایەتیت و ئەو شتە مادییانەی کە خاوەنیانیت.<br>- هەمیشە خەریکی بەراوردکردنی ئەوەیت کە تۆ چیت هەیە و خەڵکی چییان هەیە | - بڕیارەکانت لەسەر ئەو بناغەیە دادەڕێژیت کە دەتپارێزن و ملك و ماڵەکەت زیاتر و چاکتر دەکەن. | - جیهان لە روانگەی بەراوردکاریی کۆمەڵایەتی و ئابورییەوە دەبینیت. | - لە چوارچێوەی ئەوەدا هەڵدەسورێیت کە دەتوانیت چی بکڕیت و چۆن لەرووی کۆمەڵایەتییەوە لە خەڵك جیاواز بیت. |

| سەنتەر | ئاسایش | ئاڕاستەکردن | حیکمەت | دەسەڵات |
|---|---|---|---|---|
| ئەگەر سەنتەری ژیانت بریتی بێت لە ڕابواردن | - تەنیا ئەو کاتە هەست بە ئاسایش دەکەیت کە بگەیتە ئەوپەڕی دڵخۆشی | - بڕیارەکانت لەسەر ئەو بناغەیە دەدەیت کە ئایا ئەو شتە ئەوپەڕی چێژت دەداتێ | - دنیا لەو ڕوانگەیەوە دەبینیت کە چی تیایە بۆ تۆ | - زۆرجار دەسەڵاتی هیچ شتێکت نییە |
| ئەگەر سەنتەری ژیانت هاوڕێیەتی بێت | - ئاسایشی تۆ ڕەنگدانەوەی ئاوێنە کۆمەڵایەتییەکەیە<br>- تا ئەندازەیەکی زۆر لەژێر کاریگەری بیرو بۆچوونی خەڵکی و هەڵسەنگاندنەکانیاندایت | - ئەوان چییان پێباش بێت تۆ ئەو بڕیارە دەدەیت.<br>- زۆر بە ئاسانی لەڕوودا دادەمێنیت | - هەموو شتێک لە ئاوێنە کۆمەڵایەتییەکەوە دەبینیت | - بازنەی ناوچەی حەسانەوە کۆمەڵایەتییەکەت سنووردارت دەکات.<br>- کردەوە و بیرو بۆچوونەکانت زوو زوو هەڵدەگەڕێنەوە. |
| ئەگەر دوژمن ببێتە سەنتەری ژیانت | - ئاسایشت جێگیر نییە و پەیوەستە بە هەڵسوکەوتی دوژمنەکەتەوە.<br>- هەمیشە مێشکت لای ئەوەیە ئاخۆ دوژمنەکەت بەتەمای چییە.<br>- بەدوای ئەوەدا دەگەڕێیت بەهانە بۆ خۆت بدۆزیتەوە و شەرعیەت بدەیت بە ئەقڵ و کردەوەکانت | - هەڵسوکەوتی خەڵکی و هی دوژمنەکانت دەبنە بناغەی بڕیارەکانت.<br>- بڕیارەکانت لەسەر ئەو بناغەیە دادەڕێژیت کە دوژمنەکەت چ هەنگاوێک دەنێت. | - هەڵسەنگاندنت بۆ مەسەلەکان تەمومژاوی و ناحەکیمانەن<br>- بەرگریکاریت، زیاد لە پێویست هەستیار و توندڕەوی دەنوێنیت و زۆرجاریش دوژمنکارانە ڕەفتار دەکەیت. | - سەرچاوەکانی ئەو دەسەڵاتە کەمەی هەتن بریتییە لە تووڕەیی و حەسوودی و تۆڵەکردنەوە و ئەو وزە نەرێنییەی کە وێرانکەرە هەموو وزەکانی دیکە لەناودەبات. |

| سەنتەر | ئاسایش | ئاراستەکردن | حیکمەت | دەسەڵات |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| ئەگەر دەزگا ئاینییەکان سەنتەری ژیانت بن | - ئاسایشی خۆت لەوەدا دەبینیت کە شوێنەکانی خواپەرستی چالاکییەکانیان چۆنن و چ کاریگەرییەکیان لەسەر تۆ هەیە و چەند ڕێزت دەگرن.<br>- ئاسایش و ناسنامەی خۆت لە ڕێنماییە ئاینییەکان و بەراوردکارییدا دەبینیت. | - ئاراستەکەت ئەوە دیاری دەکات کە خەڵکەکە چۆن تەماشات دەکەن لە ڕوانگەی پێوەرەکانی ئایین و سەرکردە ئاینییەکانەوە. | - هەمو دنیا دابەش دەکەیت بەسەر دوو گروپدا.<br>- ئیمانداران و بێ ئیمانەکان بەسەر لایەنگران و نەیارانەوە. | - دەسەڵاتت لەوەدایە کە لەو شوێنی خواپەرستییەدا چ پۆست و پێگەیەکت هەیە. |
| ئەگەر خودی خۆت سەنتەری ژیانی خۆت بێت | - هەستکردنت بە ئاسایش هەمیشە لە هەڵبەزو دابەزدا دەبێت | - ڕوانگەی هەمو حوکم و بڕیارەکانت بریتییە لە:<br>١. ئەگەر بزانم باشترە ..<br>٢. بۆ من وا خۆشترە ..<br>٣. من پێویستم بە ..<br>٤. بەرژەوەندی من لەوەدایە کە<br>.... | - دنیا لەوەدا دەبینیت کە بڕیار و بارودۆخ و ڕووداوەکان چۆن کاریگەریت لەسەر دروست دەکەن | - توانای دەسەڵاتەکانت تەنیا لە سەرچاوەکانی خۆتەوەن چونکە هاوکارییت لەگەڵ کەسدا نییە. |

زۆرجار سەنتەرەکە بریتی دەبێت لە تێکەڵەیەك لەم هۆکارانە و لە سەنتەری خەڵکانی دیکەش. زۆربەمان تێکەڵەیەکین لەو کاریگەریانەی کە رۆڵی گرنگیان هەیە لە ژیانماندا. هۆکارە دەرەکی و ناوخۆییییەکان وا دەکەن تا ماوەیەکی دیاریکراو فلانە سەنتەر بکەوێتە چالاکی و بەردەوام بێت لە چالاکیکردندا تا ئەوکاتەی داواکارییەکان تێردەکرێن. ئینجا پاش ئەوە سەنتەرێکی دیکە دێتە پێشەوەو دەبێتە هێزێکی کاریگەر. مرۆڤ چونکە هەمیشە لە سەنتەرێکەوە دەچێت بۆ سەنتەرێکی دیکە، لەبەر ئەوە مەسەلەکان هێندە رێژەیین لە ژیانی مرۆڤدا کە وەکو ئەو خولخولۆکە وایە کە لە چرکەساتێکدا گەیشتۆتە لوتکە و یەکسەر لە چرکەساتی داهاتودا دادەبەزێتە خوارەوە و هەوڵدەدات لاوازییەکەی خۆی بەوە قەرەبوو بکاتەوە کە هێز لە شتێکی دیکەی لاواز قەرز بکات. لەم حاڵەتەشدا نە هەست بە هیدایەت و ئاراستەکردن دەکەیت و نە حیکمەتێکی بەردەوام و نە دەسەڵاتێکی نەگۆڕ و نە لە ناخی خۆشتدا هەست بە نرخ و بێ هاوتایی خۆت دەکەیت. ئامانجە نمونەییەکە ئەوەیە هەوڵ بدەیت سەنتەرێکی روون و ئاشکرای وا بخولقێنیت کە ئاستێکی بەرزی ئاسایش و ئاڕاستەکردن و حیکمەت و دەسەڵاتیان تیا هەڵبهێنجرێت بە شێوەیەکی وا کە یارمەتیت بدات لە دەست پێشخەرییداو بوارە جیاجیاکانی ژیانت هاوئاهەنگ بکەن لەگەڵ یەکتریدا.

## سەنتەری پرنسیپەکان

مرۆڤ ئەگەر ژیانی بکاتە سەنتەری پرنسیپە راست و دروستەکان ئەوە دەتوانێت دەزگایەکی بەهێزی وا دابمەزرێنێت کە هەرچوار هۆکارە پشتگیریکەرەکەی ژیان گەشەی تیابکەن. بە پێچەوانەی خەڵك و شتە بگۆڕەکانی دیکەوە ئاسایش و ئارامی مرۆڤ پەیوەستن بە کۆمەڵێك پرنسیپی راستەوە کە ناگۆڕێن. دەتوانین پشتیان پێ ببەستین.

پرنسیپ، کاردانەوە بەرامبەر هیچ شتێك نانوێنێت. نە لێمان تورە دەبێت و نە بە شێوەیەکی جیاوازیش رەفتارمان لەگەڵ دەکات. لێمان جیا نابێتەوەو لەگەڵ هاوڕێ هەرە دڵسۆزەکەماندا دەست تێکەڵ ناکات و ناڕوات. داومان بۆ نانێتەوە، قەد بڕیی ناکات و پابەندی زینگەو هەڵسوکەوتی خەڵکی و ناتەواویەکان نییە. پرنسیپ

نامرێت، ئەوەنیە رۆژێك هەبێت و رۆژێك نەبێت. نە ئاگر لە ناوی دەبات و نە بومەلەرزە و نە دزیش دەستی پێ‌دەگات.

پرنسیپ بریتییە لە کۆمەڵێك حەقیقەتی قوڵ و بنەڕەتی و کۆڵەکەی زۆر شتی دیکەیە. خەصڵەتەکانی پرنسیپ بریتین لە جوانی و بەردەوامی و وردی و تێکەڵاوی رێڕەوی ژیان دەبێت.

تەنانەت لەو کەسانەشدا کە بە رواڵەت پرنسیپەکان فەرامۆش دەکەن دەتوانین لێبڕاوانە بڵێین: پرنسیپ زۆر لە خەڵك و لە بارودۆخەکان گەورەترە. ئەمەش دەرەنجامی ژیان و گەشەکردنی هەزاران هەزار ساڵە. لەمەش زیاتر دەتوانین لە سێبەری زانستدا باوەڕ بەوە بهێنین کە پرنسیپ لە دەرەنجامی ئەزمونی تایبەتی خۆمانەوە شەرعیەتی هەیە لەسەر ژیانمان.

پێویستە لەهەمان کاتیشدا ددان بەوەدا بنێین کە زانیاری تەواومان دەربارەی هەمو زانستەکان نییە. ئەوەی دەربارەی پرنسیپە راست و دروستەکان دەیانزانین شتێکی سنوردارە، چونکە کەسمان بە تەواوەتی ئەم سروشت و جیهانەی دەوری خۆمان تێنەگەیشتوین و هێشتا بەردەوام فەلسەفە و تیۆری وا هەڵدەقوڵێن کە لەگەڵ پرنسیپە راست و دروستەکاندا ناگونجێن. هەمو بیروباوەڕێکیش لەکاتی خۆیدا قبوڵ دەکرێت و ئەگەر بناغەی چەوتی هەبێت ئەوا وەکو زۆر شتی دیکەی پێش خۆی رەت دەکرێتەوە.

هەرچەندە ئێمەی مرۆڤ سنوردارین بەڵام دەتوانین چوارچێوەی ئەو سنورانە فراوانتر بکەین. تێگەیشتنی پرنسیپەکانی گەشەکردنمان دەتوانن وامان لێ بکەن بە دڵنیاییەوە بەدوای پرنسیپە راست و دروستەکانماندا بگەڕێین، بە جۆرێکی وا کە هەتا زۆرتر شت فێر ببین چاکتر دەتوانین سەرنج بدەینە ئەو هاوێنانەی کە جیهانیان لێوە دەبینین. پرنسیپەکان ناگۆڕێن، بەڵام تێگەیشتنی ئێمە لەو پرنسیپانە قابیلی گۆڕانە.

ئەو حیکمەت و ئاڕاستەیەی کە لەگەڵ ژیانێك رادێن پرنسیپەکانی کردبێتە سەنتەری خۆی هەڵقوڵاوی نەخشە راست و دروستەکانن. بەرهەمی ئەوەن کە شتەکان لە بنەڕەتدا بریتین لە چی و لە رابوردودا چی بون و لە ئایندەدا دەبن بە چی. نەخشەی چاك یارمەتیمان دەدات بە ئاشکرا تێبگەین کە دەمانەوێت بگەینە

کوێ و چۆن بیگەینێ. مرۆڤ لەرێی بەکارهێنانی زانیاریە راستەقینەکانەوە دەتوانێت بڕیاری وا بدات کە هەم گونجاو بێت و هەم جێبەجێ کردنیشی ئاسان.

دەسەڵاتی تاکە کەس لەوجۆرە مرۆڤەدا کە پرنسیپەکان سەنتەری ژیانێتی بریتییە لە دەسەڵاتی مرۆڤێك کە دەست پێشخەر بێت و خۆی بناسێت و خەڵك تێی بگات. کەسێك کە نە لەژێر کاریگەری هەڵوێست و رەفتاری کەسی دیکەدایە و نە ژینگە و بارودۆخەکانیش دەتوانن سنوری بۆ دابنێن.

لەم جۆرە مرۆڤانەدا هیچ شتێك ناتوانێت سنورێکی راستەقینە بۆ دەسەڵاتەکەیان دابنێ. بێجگە لە دەرەنجامە سروشتیەکانی پرنسیپەکان خۆیان. ئێمەی مرۆڤ ئازادین لەوەی چی دەکەین بە رەچاوکردنی تێگەیشتنمان لە پرنسیپە راست و دروستەکان، بەڵام ئازاد نین لە هەڵبژاردنی دەرەنجامی کارەکانمان. واتە کارەکانمان بە دەست خۆمانە بەڵام ئەنجامەکانیان بەدەست ئێمە نین. بیرت نەچێت تۆ کاتێك ئەمسەری تێلاکە هەڵدەگریت ئەوا سەرەکەی ئەوسەریشت هەڵگرتووە.

پرنسیپەکان هەمیشە ئەنجامە سروشتیەکانیان بەخۆیانەوەیە. تۆ ئەگەر بە شێوەیەکی هارمۆنی لەگەڵ پرنسیپەکاندا بژیت ئەوا بە دڵنیاییەوە ئەنجامی ئەرێنیت دەست دەکەوێت. بەڵام ئەگەر فەرامۆشیان بکەیت ئەنجامەکان نەرێنی دەبن. بەڵام چونکە پێ بزانین یان نەزانین پرنسیپەکان هەمومان وەکو یەك دەگرێتەوە کەواتە سنورداربونەکە مەسەلەیەکی جیهانییە. دیارە هەتاکو زیاتریش دەربارەی پرنسیپە راست و دروستەکان بزانین سنوری ئازادیمان فراوانتر دەبێت لەوەی حەکیمانە هەڵسوکەوت بکەین.

ئێمە ئەگەر سەنتەری ژیانی خۆمان بکەینە پرنسیپە نەگۆڕە هەمیشەییەکان، ئەوا دەتوانین پارادیمێکی بنەڕەتی بخولقێنن بۆ ژیانێکی کاریگەر. ئەمە سەنتەرێکە کە هەمو سەنتەرەکانی دیکە دەخاتە یەك گۆشەنیگاوە.

| سەنتەر | ئاسایش | ئاڕاستەکردن | حیکمەت | دەسەڵات |
|---|---|---|---|---|
| ئەگەر سەنتەری ژیانت بریتی بێت لە پرنسیپەکان | - ئاسایشت لەسەر ئەو پرنسیپە راست و دروستانە دادەڕێژیت کە بارودۆخە دەرەکییەکان کاری تێ ناکەن.<br>- دڵنیایت لەوەی کە راست و دروستی پرنسیپەکان لەڕێی ئەزموونکردنیان لە ژیانی تایبەتی خۆتدا شەرعییەت وەردەگرن.<br>- سەرچاوەی ئاسایشەکەت گەوهەرێکی جێگیر و نەگۆڕت پێدەبەخشێت کە شکست ناهێنێت و وات لێ دەکات سەرکێشییەکان بقۆزیتەوە و بیکاتکەیتە هەلێك بۆ دەستکەوتی بەنرختر.<br>- وەك پێوەرێك بۆ پێشکەوتنی کەسێتی، ئەم پرنسیپانە دەست دەگەن بە پرۆسەی دیسپلین و بەردەوامی و هێز و جوانی<br>- پرنسیپە راستەکان پارمەتیت دەدەن لە پێشکەوتنی خۆت تێبگەیت و متمانەی زیاتر بە فێربون پەیدا بکەیت و مەسەلەکان تێبگەیت | - قیبلەنمایەکی دیاریکراو رێنمایت دەکات ئامانجەکە ببینیت و رێگەکەشیت نیشان دەدات.<br>- بەکارهێنانی زانیارییە وردەکان یارمەتیت دەدات بە شێوازێك ئەنجامی بدەیت شیاوی جێبەجێکردن بن و واتایەکیان هەبێت<br>- خۆت بەدووردەگریت لە بارودۆخ و هەستوسۆز و هەڵوێستەکانیشیان و تەماشای کۆ گشتییە هاوسەنگەکە دەکەیت و کردەوەکانت رەنگدانەوەی لەبەرچاوگرتنە کورت مەوداکان و درێژ مەوداکان دەبێت.<br>- لە هەمو هەڵوێستێکدا دەتوانێت بە ئەقڵێکی هۆشیار و دەستپێشخەرییەوە ئەڵتەرناتیڤە گونجاوەکان دیاری بکەیت و لەروانگەی ویژدانەوە بڕیارەکە هەڵبسەنگێنیت. | - حیکمەتەکەت پێك دێت لە پانۆرامایەکی ئەنجامە دوورمەوداکان کە رەنگدانەوەی هاوسەنگیەکی حەکیمانەو جەختکردنەوەیەکی هێمنە.<br>- مەسەلەکان جیاواز دەبینیت. بەمەش جیاواز بیردەکەیتەوە و جیاوازیش کاردانەوە دەنوێنیت بەرامبەر کردەوەکانی جیهانی دەوروبەرت.<br>- تێڕوانینی تۆ لە ژیان پارادیمێکی بنەڕەتییە. لە پێناوی ژیانێکی چاکتر و کاراتر و خێرخوازانەتر.<br>- وا تەماشای جیهان دەکەیت کە ئاخۆ دەتوانێت چی پێشکەشی خۆی و مرۆڤەکانی بکەیت.<br>- ژیانێك دەگریتەبەر کە دەستپێشخەری بناغەکەی بێت بۆ خزمەتکردن و دروستکردنی خەڵکی.<br>- وا تەماشای شارەزایی ئەزموونەکانی ژیان دەکەیت کە خزمەتێکن بۆ فێربون و بەشداریکردن لە خزمەتی خەڵکیدا. | - تێگەیشتن و تێبینیەکانت لەسەر یاسا سروشتییەکە و لەسەر پرسە راست و دروستەکان و ئەنجامە سروشتییەکانیان سنوری دەسەڵاتت دیاری دەکەن.<br>- بویتە کەسایەتییەکی هۆشیار و عاشقی زانیاری و دەستپێشخەری رەفتار و بۆچوون و کردەوەی خەڵك هیچ کارێکت تێناکەن.<br>- هێزی کارکردنت بەردەوام زیاترە لە تواناکانت و یارمەتیت دەدات بۆ گەیشتن بە ئاستە پێشکەوتووەکانی کارکردن کە بەرهەمی هاوکارین.<br>- کردەوەو بڕیارەکانت پەیوەندییان بە توانا داراییەکان و بە بارودۆخەکەتەوە نییە.<br>- تۆ ئازادییەك پەیڕەو دەکەیت لەسەر بنەمای هاوکاری خولقێنەر (یەکتر ك تەواوکردن). |




بیرت نەچێت كە پارادیمەكەت ئەو سەرچاوەیەیە كە هەڵوێست و ڕەفتارەكانتی لێوە هەڵدەقوڵێن. پارادیم وەكو چاویلكە وایە: كار دەكاتە سەر ئەو شێوازەی هەمو شتەكانی دیكەی پێدەبینیت. ئەگەر لە پارادیمی پرنسیپە ڕاست و دروستەكانەوە تەماشای دنیا بكەین، ئەوەی دەیبینین بە شێوەیەكی دراماتیكی جیاوازە لەوەی كە لە پارادیمەكانی دیكەوە دەیانبینین.

من لە پاشكۆی ئەم كتێبەدا نەخشەیەكم بە وردەكاری تەواوە پێشكەش كردووە بۆ ڕوونكردنەوەی چۆنێتی كاركردنی سەنتەرەكانی كە باسمان كرد لەسەر شێوازی بینینی هەمو شتەكان. بەڵام بۆ ئەوەی بە خێرایی لە دەورو تەئسیری جیاوازی سەنتەرە جیاوازەكان تێبگەین با پێكەوە تەنیا تەماشای یەك كێشەی تایبەت بكەین لە پارادیمی جیاجیاوە. لەكاتی خوێندنەوەدا بۆ هەر حاڵەتێك چاویلكەی تایبەتی خۆی بكەرە چاوت. هەوڵبدە هەست بە كاردانەوە جیاجیاكان بكەیت.

گریمان تۆ ئەم ئێوارەیە هاوسەرەكەتت دەعوەت كردووە پێكەوە بچن بۆ تەماشاكردنی كۆنسێرتێك. بیتاقەتان بڕیوە و ئەو زۆر دڵخۆشە بەم بانگهێشتەی تۆ.

ئێستا سەعات چواری پاش نیوەڕۆیە، لەپڕ بەڕێوەبەرەکەت تەلەفۆنت بۆ دەکات دەڵێت ئەم ئێوارە زۆر پێویستمان پێتە لەبەر ئەوە مەچۆرەوە ماڵێ لێرە بمێنەرەوە بۆ ئامادەکردنی کۆبونەوەیەکی گرنگ کە سبەینێ سەعات نۆی سەرلەبەیانی دەکرێت.

تۆ ئەگەر لە هاوێنەی سەنتەربونی هاوسەر و سەنتەربونی خێزانەوە تەماشای مەسەلەکە بکەیت، ئەوا گرنگترین کەس بەلاتەوە هاوسەرەکەت دەبێت. لەبەر ئەوە بە بەڕێوەبەرەکەت دەڵێیت کە ناتوانیت بمێنێتەوە و ژنەکەت دەبەیت بۆ کۆنسێرتەکە بۆ دڵخۆشکردنی. ڕەنگە لەهەمان کاتیشدا نیگەرانی ئەوەبیت کە بۆچی بە قسەی بەڕێوەبەرەکەت نەکردو دڵیت زویر کرد. کە ڕەنگە بۆ چارەنوسی پۆستەکەت خراپ بێت. لەبەر ئەوە بە نابەدڵی دەچیت و رقت هێندەی دیکە لە بەڕێوەبەرەکەت هەڵدەستێت.

ئەگەر لە چاویلکەی پارەوە تەماشای مەسەلەکە بکەیت، مێشکت هەر لای ئەو پاداشتە دەبێت کە لە ئەنجامی کارکردنی زیادەدا وەری دەگریت، یاخود بیر لەوە دەکەیتەوە ئاخۆ بەڕێوەبەرەکە پلەکەت بەرزدەکاتەوە یان نا. لەبەرئەوە تەلەفۆن بۆ هاوسەرەکەت دەکەیت و زۆر ئاسایی پێی دەڵێیت ناتوانم بگەڕێمەوە بۆ ماڵێ و لە دڵی خۆتدا وای دادەنێیت کە هاوسەرەکەت مەسەلەکە تێدەگات و دەزانێت پارەو بابەتە ئابورییەکان لە هەمو شتەکانی دیکە گرنگترن.

ئەگەر لەو کەسانە بیت کە ئیشکردن بەلایانەوە سەنتەری ژیانە، ئەوا زۆر بە خۆشحاڵییەوە دەمێنیتەوە و وای دادەنێیت کە ئەمە هەلێکە و بۆت هەڵکەوتووە. شتی نوێ لەبارەی کارەکەتەوە فێردەبیت و دەتوانیت هەندێك بابەت و مەسەلە بۆ بەڕێوەبەرەکەت روون بکەیتەوە و پێگەکەی خۆت بەهێزتر بکەیت، لەهەمان کاتیشدا خۆشحاڵیت بەوەی کە هاوسەرەکەت و خەڵکانی دیکە بە کەسێکی ئیشکەرو جددیت لەقەڵەم دەدەن. بەڵام ئەگەر سەنتەری ژیانت خاوەنداریێتی مڵك و ماڵ و شتی دیکە بێت ئەوا بیر لەو پارەو دەستکەوت و لەو ناوبانگە باشە دەکەیتەوە کە هەقی مانەوەت لە فەرمانگەکەتدا دەستت دەکەون. بە تایبەت ئەگەر خەڵکەکە هەمو ستایشی دڵسۆزی و فیداکارییەکانیان کردیت لە کارەکەتدا.

بەڵام ئەگەر سەنتەری ژیانت بریتی بێت لە چێژ و رابواردن، ئەوا ئیشەکە

دەخەیتە لاوە لە پێناوی کۆنسێرتەکەدا، تەنانەت ئەگەر هاوسەرەکەشت هانی دایت لە فەرمانگەکەت بمێنیتەوە. دەیبەیت بۆ کۆنسێرتەکە و دەڵێیت هەزار فەرمانگە بە قوربانی سەعاتێك دڵخۆشکردنی تۆ بێت.

خۆ ئەگەر سەنتەرەکەی ژیانت هاوڕێیەتی بێت ئەوا بڕیارەکەت پەیوەست دەبێت بەوەوە کە ئایا هیچ هاوڕێیەکت بانگهێشتی کۆنسێرت کردووە لەگەڵتا بێتە ئاهەنگەکە، یاخود ئەگەر تا درەنگ لە فەرمانگە بمێنێتەوە هیچکام لە برادەرەکانیشت لەوێ دەبن؟!

ئەگەر لەوکەسانەش بیت کە دوژمن دەکاتە سەنتەری ژیانی خۆی، ئەوا تا درەنگ لە فەرمانگەکە دەمێنیتەوە بۆ ئەوەی خۆت بە ئیشکەرو دڵسۆزتر نیشان بدەیت لەو فلانە کەسەی هاوکارت کە پێی وایە گرنگترین کارمەندی فەرمانگەکەیە. لەبەرئەوە خۆت هیلاك دەکەیت و ئیشەکەی ئەویش و خۆیشت دەکەیت (کە ئەو خەریکی رابواردنی خۆیەتی) و قوربانیی بە ئیسراحەت و ئارەزوووە تایبەتەکانت دەدەیت لە پێناوی بەرژەوەندی کۆمپانیا (فەرمانگە)کەدا کە ئەو پشتگوێی خستووە.

ئەگەر دامودەزگا ئاینییەکانیشت کردبێتە سەنتەری ژیان، ئەوا پێوەر و دیدو بۆچوونی ئەندامانی ئەو دەزگایانە کاردەکەنە سەر بڕیارەکەت. بەڵام ئەگەر خودی خۆت سەنتەری ژیانت پێك بهێنیت، ئەوا بیر لەوە دەکەیتەوە کامیان زۆرترین سودت پێدەگەیەنێت. باشترین بڕیار ئەوەیە بچیت بۆ ئێوارە کۆنسێرتەکە یاخود ئەگەر چەند مەسەلەیەك بۆ بەڕێوەبەرەکەت روون بکەیتەوە زۆرترین قازانج دەکەیت.

ئێمە کە ئەم تێڕوانینە جیاوازانە سەبارەت بە یەك مەسەلە لەبەرچاو دەگرین، مانای وایە کاتی خۆی لە بینینی وێنەی کچە جوانەکە/ ژنە پیرەکە چۆن کێشەی لێکدانەوەو تێگەیشتنمان هەبو، لەم مەسەلەیەشدا هەمان کێشەمان هەیە و چونیەك نین لە تێگەیشتن و بینین و لێکدانەوەی مەسەلەکانداو ئەمەش کاردەکاتە سەر پاڵنەرەکان و رەفتارو بڕیارەکانی رۆژانەمان. (یان زۆرجار کاردەکاتە سەر کاردانەوەکانمان) و سەر چۆنێتیی لێکدانەوەی رووداوەکان. لەبەرئەوە زۆرگرنگە مرۆڤ سەنتەرەکەی خۆی بە چاکی تێبگات. خۆ ئەگەر ئەو سەنتەرە نەیتوانی بیکاتە مرۆڤێکی دەستپێشخەر ئەوا پێویستە هێندە چالاك بێت بتوانێت وەرچەرخان لە پارادیمەکەتدا دروست بکات بۆ خوڵقاندنی سەنتەرێکی وا کە بیکاتە مرۆڤێکی دەستپێشخەر.

تۆ ئەگەر پرنسیپەکان سەنتەری ژیانت بن مانای وایە خۆت دووردەگریت لە هەستوسۆزی هەڵوێستەکەو لەو فاکتەرانەی دیکە کە رەنگە کارت تێبکەن و هەوڵدەدەیت ئەگەرە جۆراوجۆرەکان هەڵبسەنگێنیت. لە روانگەی ئەوەوە بڕیار دەدەیت کە کۆی گشتی پێویستییەکانی کارو خێزان و پێویستییەکانی دیکە تا چەند هاوسەنگن و ئەگەری جێبەجێکردنی بڕیارە ئەڵتەرناتیڤەکان تا چەندە. ئینجا دەگەیتە باشترین بڕیار بەوەی کە هەمو هۆکارەکان بەهەند وەربگریت. مەسەلەکە لە ناوەڕۆکدا ئەوەنییە بچیت بۆ کۆنسێرتەکە یان نەچیت و لە کۆمپانیاکە بمێنیتەوە. ئەمە بەشێکی بچوکی بڕیارێکی کاریگەرە. رەنگە بە لەبەرچاوگرتنی ژمارەیەك سەنتەری دیکە بگەیتە هەمان بڕیار. بەڵام مەسەلەکە ئەوەیە کە سەنتەربونی پرنسیپەکان لە ژیاندا کۆمەڵێك جیاوازیی گرنگی هەیە.

**یەکەم:** ناکەویتە ژێر کاریگەریی هیچ کەسێك و هیچ بارودۆخێکەوە. زۆر دەستپێشخەرانە بڕیار لە باشترین هەڵبژاردن دەدەیت. بڕیارەکەت هۆشیارانە و بەپێی زانیاری قوڵ دەدەیت.

**دووەم:** دڵنیایت لەوەی کە بڕیارەکەت کاریگەرترین بڕیارە چونکە پشتی بە پرنسیپە راست و دروستەکان بەستووەو لە دوورمەودادا ئەنجامی چاکی دەبێت.

**سێیەم:** بڕیارەکەت دەبێتە مایەی بەرزبونەوەی زیاتری بەهاکانت لە ژیاندا. مانەوەی ئەو شەوەت لە فەرمانگەکە (کۆمپانیاکە) شەوێکی زۆر جیاواز دەبێت لە ژیانتدا چونکە رێز بۆ تواناو کاریگەرییەکانی بەڕێوەبەرەکەت دادەنێیت و هەروەها بەشدارییەکی راستەقینەش دەکەیت لە خزمەتکردنی شوێنی کارەکەتدا. هەر ئەو زانیارییە نوێیانەش کە دەستت دەکەون لەم بڕیارەتدا زۆر سودت پێدەگەیەنن لە بوارە جیاجیاکانی ژیانتدا.

**چوارەم:** دەتوانیت بە شێوازی جۆراوجۆر ئەوە بە هاوسەرەکەت و بە سەرۆکەکەت بگەیەنیت کە تۆ دەتەوێت پەیوەندی پتەویان لەگەڵدا دروست بکەیت کە بەرژەوەندی هەمولایەکی تیا پارێزراو بێت. مرۆڤ ئەگەر سەربەخۆ بێت دەتوانێت رۆڵی ئەرێنی هەبێت لەسەر دەوروبەرەکەی. هەروەها دەتوانێت کەسی گونجاو رابسپێرێت و سبەی بەیانی زوو سەرلەنوێ تێهەڵبچێتەوە.

دوا خاڵیش ئەوەیە کە بڕیارەکەت مایەی خۆشحاڵیت دەبێت و لێی پەشیمان نابیتەوە بەڵکو هەرچییەك بێت تۆ ئەوپەڕی هەوڵی بۆ دەدەیت و چێژیشی لێ دەبینیت.

ئەوکەسەی کە پرنسیپەکان سەنتەری ژیانی دروست دەکەن مەسەلەکان بە جۆرێکی جیاواز دەبینێت. لەبەرئەوە بیرکردنەوەو هەڵسوکەوتیشی جیاوازن. ئارامی و ئاسایش و ئاراستەو حیکمەت و دەسەڵاتەکانی لە ئاستێکی زۆر بەرزدا دەبن و ژیانێکی کاریگەر و پڕ لە دەستپێشخەری دەباتە سەر.

- نوسین و بەکارهێنانی پەیامە تایبەتەکەی ژیان

- ئێمە هەتا قوڵتر رۆبچینە ناخی خۆمانەوە و هەتا زیاتر لە پارادیمە بنەڕەتیەکانمان تێبگەین و هاوسەنگیان بکەین لەگەڵ پرنسیپە راست و دروستەکاندا زیاتر دەتوانین سەنتەری بەهێز و کاریگەر دروست بکەین و هاوێنەی رون و گرنگیش دروست بکەین کە خۆمان و جیهانی پێ ببینین و پەیوەندی نێوانمان تێبگەین.

- فرانکڵ دەڵێت مرۆڤ پەیامی ژیانەکەی دروست ناکات بەڵکو دەیدۆزێتەوە. من ئەم قسەیەم زۆر بەدڵە. من باوەڕم وایە هەریەکێك لە ئێمە چاودێرێکی ناوخۆیی هەیە، هەستێك و ویژدانێکی هەیە لە ناخەوە کە سەرچاوەی لەخۆتێگەیشتن و بەشدارییکردنە بێهاوتاکانیشی دیاری دەکات. فرانکڵ دەڵێت: هەر یەکێك لە ئێمە لە ژیاندا ئەرکێکی دیاریکراو و پەیامێکی تایبەتی هەیە. هیچ کەسێك ناتوانێت جێی کەسێکی دیکە بگرێتەوە. ناشتوانێت ژیانی ئەو دوبارە بکاتەوە. لەبەر ئەوە ئەرکی هەر مرۆڤێك ئەرکێکی بێهاوتایە و هەلی جێبەجێکردنەکەشی هەر بە هەمان شێوە شتێکی بێ هاوتایە. ئێمە ئەگەر بمانەوێت بە قسە بۆ ئەم تایبەتمەندێتیەی مرۆڤ بگەڕێین پێویستە بایەخە بنەڕەتییەکەی گیانی دەستپێشخەرییمان بیرنەچێت و بزانین کە کارکردنمان لە چوارچێوەی بازنەی دەوروتەئسیرماندا مەسەلەیەکی زۆرگرنگە. ئەگەر ئێمە لەدەرەوەی بازنەی مەراق و نیگەرانیەکانماندا بەدوای واتاکانی ژیانماندا بگەڕێین مانای وایە دەستبەرداری ئەرکەکانی خۆمان دەبین وەکو مرۆڤی دەستپێشخەر و خولقانی یەکەمی خۆمان تەسلیمی خەڵك و بارودۆخەکان دەکەین. مەبەست و ماناکان لە ناخی خۆمانەوە هەڵدەقوڵێن و بەدەردی فرانکلین دەڵێت (نابێت مرۆڤ بپرسێت بلێ ژیانم چ مانایەکی هەیە بەڵکو پێویستە درك بەوە

بکات کە ئەو خۆی خاوەنی پرسیارەکەیە. بە کورتی‌یەکەی ژیان هەمو کەسێك تاقی دەکاتەوە و هەر بەوە وەڵام دەدرێتەوە کە مرۆڤ وەڵامدەرەوە و بەرپرسیارە.)

- بەردی بناغەی خوڵقاندنی یەکەم بریتی‌یە لە بەرپرسیارێتی تایبەت واتە لە ژیانی دەستپێشخەری. ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ زمانی کۆمپیوتەر ئەوا خووی یەکەم دەڵێت تۆ دانەری پرۆگرامەکەی، خووی دووەمیش دەڵێت پرۆگرامەکە بنوسە. مرۆڤ هەتا ئەم قسەیە قبوڵ نەکات کە خۆی بەرپرسیارە و خۆی دانەری پرۆگرامەکەیە ناتوانێت دەست بکات بە نوسینی بەرنامەکە.

- پەیامی ژیان شتێك نی‌یە مرۆڤ لە شەو و رۆژێکدا بینوسێت بەڵکو رامانی قوڵی پێویستە و لێکدانەوەی وردی دەوێت و پێویستە بە وردی و بە چاکی گوزارشتیان لێ بکات. زۆرجاریش وا پێویست دەکات چەندین جار دەستکاری بکات تا بەوشێوەیە دەردەچێت کە مەبەستێتی. رەنگە چەندین هەفتەو چەندین مانگ بخایەنێت ئینجا بەوشێوەیە دەربچێت کە لێی رازییت و هەست دەکەیت تەواوەو بە وردی گوزارشت لە بەهاکان و پاڵنەرەکانی ناخت دەکات. بەڵام سەرباری ئەمانەش دیسان پێویستە بەردەوام چاوی پێدا بخشێنیتەوە و لەبەر رۆشنایی گۆڕانکارییەکان و تێپەڕبونی زەمانەدا دەستکاری کەم کەمی بکەیت و شتی نوێی بخەیتە سەرو شتی زیادەی لێ لاببەیت بە گوێرەی گۆڕینی بارودۆخەکان و هاتنەکایەی تێڕوانینی نوێوە.

- بەڵام بە شێوەیەکی بنەڕەتی پەیامی ژیان دەبێتە دەستوری تۆ. دەبێتە گوزارشتێکی بەهێز لە بیروبۆچون و بەهاکانت. دەبێتە ئەو تەرازووەی کە هەمو شتەکانی دیکەی ژیانتی پێ‌دەپێویت. من خۆم بەم دواییە چاوم خشاندەوە بە پەیامی ژیانمدا کە زۆرجار ئەو کارە دەکەم و هەمو جارێك چەند سەعاتێك دەخایەنێت. پاش ئەو چاوخشاندنەوەیە هەستم بە خۆشی و بەختەوەری و دیسپلین و بەرچاوڕونی کرد.

- من پێم وایە پرۆسەی نوسینەکە هێندەی بەرهەمەکە گرنگە. نوسین و چاوخشاندنەوە بە پەیامی ژیاندا گۆڕانکارییت تیا دروست دەکات چونکە ناچارت دەکات بە قوڵی بیربکەیتەوە لە مەسەلە گرنگەکانی ژیانت و وات لێ دەکات رەفتارت بگونجێنیت لەگەڵ بیروبۆچونەکانتدا. تۆ بەم کارەت وا لە خەڵکی دەکەیت وردە

وردە هەست بکەن تۆ کەسێك نیت ئەو شتانەی لێت رودەدەن کۆنترۆڵی تۆیان کردبێت چونکە مرۆڤێکیت هەست بە ئەرکەکان دەکەیت و هەر ئەو کارو چالاکیيانە ئەنجام دەدەیت کە لە ناخەوە دەتجولێنن.

## هەمو مێشکت بخەرە کار

خۆ ئاگاییمان توانای ئەوەمان دەداتێ بزانین هزرو بیرکردنەوەمان چۆنن، ئەمەش رۆڵی زۆر گرنگی هەیە، بەتایبەت لە خولقاندنی پەیامە تایبەتەکەی ژیاندا چونکە ئەو دوو بەخششە بێهاوتایەی کە بریتین لە خەیاڵ و ویژدان توانای پەیڕەوکردنی خووی دووەممان دەدەنێ کە بە شێوەیەکی سەرەکی کاری بەشی راستی مێشکن. کەواتە هەتا چاکتر رەفتار لەگەڵ تواناکانی بەشی راستی مێشکماندا بکەین زیاتر بە توانا دەبین لە پرۆسەی خولقاندنی‌یەکەمدا.

لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی دەیان ساڵ ئەوەی لێ کەوتەوە کە پێی دەوترێت تیۆری باڵادەستبونی مێشك. ئەنجامەکان بە شێوەیەکی سەرەکی ئەوە دەردەخەن کە هەرکام لە نیوەی لای چەپ و نیوەی لای راستی مێشك مەیلی ئەوەیان هەیە پسپۆڕی و دەسەڵات لە ئەرکی جیاوازدا پەیدا بکەن و سەروکاریان لەگەڵ زانیاری جیاوازدا هەبێت و گیروگرفتی جیاواز چارەسەر بکەن.

نیوەی لای چەپی مێشك، بە شێوەیەکی بنچینەیی زیاتر لۆجیکی‌یە و تواناکانیشی زیاتر زارەکین. بەڵام تواناکانی نیوەی لای راست زیاتر لە مەسەلەکانی لێکدانەوە و داهێناندایە، لەکاتێکدا نیوەی لای چەپ مامەڵە لەگەڵ وشەدا دەکات، نیوەی لای راست مامەڵە لەگەڵ وێنەدا دەکات. چەپ خەریکی وردەکاری و مەسەلە دیاریکراوەکانە بەڵام نیوەکەی لای راست تایبەتە بە کۆی گشتی و بە پەیوەندی نێوان بەشەکان و پێکهێنەرەکان. چەپ هەڵسوکەوت لەگەڵ لێکدانەوە و شیتەڵکردندا دەکات کە بریتییە لە وردوخاشکردنی کۆ گشتی‌یەکان، بەڵام نیوەی لای راست سەرگەرمی پێکهێنان دەبێت کە بریتییە لە کۆکردنەوەی شتەکان پێکەوە. نیوەی لای چەپ سەروکاری لەگەڵ بیرکردنەوەی زنجیرەییدا هەیە، بەڵام نیوەکەی لای راست مامەڵە لەگەڵ بیرکردنەوەی کاتیدا دەکات. نیوەی لای چەپ پابەندە بە کاتەوە بەڵام ئەوەی لای راست پابەند نابێت بە کاتەوە.

هەرچەندە مرۆڤ هەردوو نیوەکەی مێشکی بەکاردەهێنێت، بەڵام هەمیشە نیوەیەکیان هەوڵ دەدات رەفتاری خاوەنەکەی کۆنترۆڵ بکات. دیارە نمونەییترین دۆخیش ئەوەیە کە هەردوو نیوەکە پەیوەندییەکی پێشکەوتویان هەبێت پێکەوە بۆ ئەوەی کەسەکە بتوانێت هەست بەوە بکات کە هەڵوێستەکە چی دەخوازێت ئینجا کەرەسەی پێویست بەکاربهێنیت بۆ هەڵسوکەوتکردن لەگەڵیدا. بەڵام بە شێوەیەکی گشتی مرۆڤ ئارەزووی ئەوەی هەیە بێ‌قرە لە ناوچەی ئیسراحەتدا بمێنێتەوە لە نیوە باڵادەستەکەیدا و لەگەڵ هەر هەڵوێستێکدا بەوشێوەیە رەفتار بکات کە نیوەکەی لای چەپ یاخود نیوەکەی لای راست پێی خۆشە.

بە دەردی (ئەبراهام ماسلۆ) دەڵێت: "ئەو کەسەی کە لە چەکوشکاریدا باشە هەمو شتێکی لێ دەبێت بە بزمار" ئەمەش هۆکارێکی دیکەیە کە وامان لێ دەکات هەندێکمان خانمە گەنجەکە ببینین و هەندێکیشمان ژنە پیرەکە. لەراستیدا ئەوکەسەی کە نیوەی راستی مێشکی باڵادەستە، شتەکان وەك ئەوکەسە نابێت کە نیوەی چەپی مێشکی باڵادەستە.

ئێمە بە شێوەیەکی بنەڕەتی لە جیهانێکدا دەژین کە نیوەی چەپی مێشك باڵادەستە تیایدا. واتە وشەو لۆجیك و پێوەرەکان کۆنترۆڵیان بەدەستەوەیە و پێشبینیکردنی خولقێنەر و هەست و لایەنە هونەرییەکانی سروشت زۆرجار پاشەکشەیان کردووە. زۆربەمان بەلامانەوە زەحمەتە نیوەکەی لای راست بخەینە کار.

پێویستە بزانین کە ئەم جۆرە وەسفکردنە بۆ ئەوەیە شتەکە لەلاتان زۆر ئاسان بکرێت ئەگینا ئێجگار بەو شێوەیە نییە و تێگەیشتنی تەواوی ئەرکەکانی مێشك پێویستیان بە لێکۆڵینەوەی زیاتر هەیە. گرنگ ئەوەیە کە ئێمەی مرۆڤ توانای ئەنجامدانی جۆرەها پرۆسەی بیرکردنەوەمان هەیە ئەگەرچی لە هەمو دەرگاکانی توانا جۆراوجۆرەکانیشمان نادەین (بەڵام خۆمان لێیان نادەین). ئەگەر ئاگاداری ئەو توانا جیاوازانەی خۆمان بین و بزانین خاوەنی توانای ئاواین دەتوانین هۆشیارانە ئەقڵمان بخەینە کار بۆ بەدیهێنانی پێویستی‌یە دیاریکراوەکانمان بە شێوازی کاریگەرتر.

## دوو رێگا بۆ نزیکبونەوە لە مێشکە راستەکە

ئەگەر تیۆرییەکەی باڵادەستبونی مێشك بەکاربهێنین وەکو نمونەیەك ئەوا بە ئاشکرا بۆمان دەردەکەوێت کە چۆنێتی خولقاندنی یەکەممان تا ئەندازەیەکی زۆر

پەیوەستە بەو توانایەی کە هەمانە لە بەکارهێنانی مێشکە خولقێنەرەکەی دەستە راستمان. مرۆڤ هەتا زیاتر سود لەو بەشەی مێشک ببینێت زیاتر توانای بەرجەستەکردن و پێکهێنان و تێڕوانینی دەبێت و زیاتر دەتوانێت بەسەر بارودۆخەکەی ئێستاو داهاتودا بەرزببێتەوە و وێنە رۆحییەکەی ئەو کارو چالاکییانە بهێنێتە بەرچاو کە گەرەکێتی لە ئایندەدا ئەنجامیان بدات.

## گۆشەنیگای فراوان

هەندێک جار ئێمە بەبێ هیچ ئامادەکارییەک و هیچ بەرنامەیەکی پێشوەخت بێبەریی دەکرێین لە ژینگەو شێوەبیرکردنەوەکانی بەشی چەپی مێشک و راپێچی نیوە راستەکە دەکرێین. مردنی کەسێکی خۆشەویست، یاخود نەخۆشییەکی سەخت، یان قەیرانێکی دارایی، یاخود دوژمنایەتییەکی قورس رەنگە وامان لێ بکەن بوەستین و چاوێک بگێڕیەوە بە ژیانماندا بۆ ئەوەی هەندێک پرسیاری قورس لە خۆمان بکەین "چی زۆر گرنگە؟ من بۆچی وا دەکەم؟"

بەڵام مرۆڤی دەستپێشخەر و ئەرێنی هەرگیز چاوەڕێ ناکات بارودۆخەکە یاخود خەڵکی دیکە رەهەندی شارەزاییەکان و ئەزمونەکانی فراوان بکەن. مرۆڤی لەوجۆرە دەتوانێت خۆی هۆشیارانە ئەزمون بۆ خۆی دروست بکات.

دیارە بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە چەند رێگایەک لەبەردەمدان. تۆ لەرێی دەسەڵاتەکانی خەیاڵەوە دەتوانیت رێورەسمی ناشتنی خۆت بهێنیتە بەرچاو، وەک چۆن لەسەرەتای ئەم بەشەی کتێبەکەدا کردمان. وەسێتنامەی خۆت بنوسە. بەراستیمە بینوسە. بە وردی بینوسە.

تۆ دەتوانیت بیستوپێنجەمین ساڵرۆژی هاوسەرگیریت و پاشان پەنجاهەمین ساڵرۆژەکە بهێنیتە بەرچاو. با هاوسەرکەشت لەو کارەدا بەشداربیت لەگەڵدا بکات. هەوڵبدە پابەندی بناغەکانی ئەو پەیوەندییە خێزانییە ببیت کە پێت خۆشە لە هەڵسوکەوتی رۆژانەدا ماوەیەکی دوورودرێژ پەیڕەوی بکەیت.

هەروەها ئەوەش بهێنەرە بەرچاو کە واز لەم کارەی ئێستات بهێنیت. پێت خۆشە بەرلەوەی لەم بوارەدا چ دەستکەوت و بەشدارییەکت هەبوبێت؟ پلانەکانی پاش خانەنشینبونت چین؟ ئایا دەست دەدەیتە کارێکی دیکە؟

مێشکت بکەرەوە و فراوانی بکە. وردەکارییەکان بهێنەرە بەرچاوی خۆت. چەندت پێدەکرێت هەست و خەیاڵ بخەرەگەڕ. هەتا دەتوانیت هەستەوەرەکانت بەکاربهێنە.

من خۆم لە زانکۆدا ئەزمونێکی لەوجۆرەم لەگەڵ هەندێك لە خوێندکارەکاندا هەیە. "وابزانە کە هەر ئەم وەرزەی خوێندن لە ژیاندا دەمێنیت. و ئەو ماوەیەش پێویستە لێرە بمێنیتەوە. ئایا چۆن ماوەکە بەسەر دەبەیت؟"

کتوپڕ مەسەلەکان خزانە گۆشەنیگایەکی جیاوازەوە و بنەماو بەهای وا دەرکەوتن کە پێشتر کەس ددانی پێدا نەدەنا.

پاشان داوام لە خوێندکارەکانم کرد ماوەی یەك حەفتە لەگەڵ ئەو ئەزمونەدا بەراستی بژین و ئینجا بیرەوەرییەکانیان لەسەر ئەزمونەکانی خۆیان بنوسنەوە.

ئەنجامەکان گەلێ مەسەلەیان روون کردەوە. خوێندکارەکان دەستیان کرد بە نوسینی نامەی تایبەت بۆ دایك و باوکیان و باسی رێزو خۆشەویستی خۆیانیان بۆ کردن. هەروەها لەگەڵ ئەو خوشك و برایانەشدا ئاشت بونەوە کە پێشتر لێیان زویر بوبون.

توخمە سەرەکییە باڵادەستەکەی چالاکییەکەی ئەم خوێندکارانە بریتی بو لە خۆشەویستی و بێهودەیی رق و خراپەکاری و تۆمەتبارکردن. ئەمە هەموی پاش ئەوە هات کە بیریان کردەوە. ماوەیەکی کەمیان لە ژیاندا ماوە و لە ئەنجامدا پرنسیپ و بەهاکان لای هەمویان ئاشکرابو.

دیارە زۆر رێگا هەیە بۆ بەکارهێنانی خەیاڵ و نزیکبونەوە لە بەهاکان. من ئەگەر بزانم دەمەوێت ببمە چی و لە ئایندەدا چی دەکەم ئەوا دەبمە کەسێکی پاك و بێ خەوش: هزرم قوڵ دەبێت و بیر لەو ئاسۆیانە دەکەمەوە کە لەمڕۆو لە سبەینێ فراوانترن.

## هێنانە بەرچاو و جەختکردنەوە

خۆ رابەرایەتیکردن تەنیا هەر ئەزموێنکی تایبەت نییە. شتێك نییە بە نوسینی پەیامی ژیان دەست پێبکات و کۆتایی بێت. بەڵکو پرۆسەیەکی بەردەوامی پاراستن تێڕوانین و بەهاکانە و هاوسەنگبونی ژیانە بە جۆرێك کە لەگەڵ مەسەلە گرنگەکاندا بگونجێت. لەم رووەشەوە بەشە باڵادەستەکەی لای راستی مێشك دەتوانێت بەشێوەیەکی رۆژانەو تا ئەندازەیەکی زۆر تێکەڵبونی پەیامە تایبەتەکەت

لەگەڵ ژیانی رۆژانەتدا دەستەبەر بکات. ئەمەش خۆی لەخۆیدا جێبەجێکردنێکی دیکەی ئەو ئامۆژگارییەیە کە دەڵێت کە دەستت پێکرد کۆتاییەکەت لەبەرچاو بێت.

با ئێستەش بگەڕێینەوە بۆ نمونەکەی پێشوتر و گریمان من باوکێکم مناڵەکانم زۆر زۆر خۆش دەوێت و ئەم خۆشویستنە لەلام یەکێکە لە بەها بنەڕەتی‌یەکانم، بەڵام گریمان لەهەمان کاتیشدا توندڕەوم لە کاردانەوەکانمدا.

لێرەدا دەتوانم بەشەکەی دەستەڕاستی مێشکم بخەمە کار کە تایبەتە بە هێنانە بەرچاو و جەختنامەیەك بنوسم کە یارمەتیم بدات لە ژیانی رۆژانەمدا چاکتر بتوانم لەگەڵ بەهاکانمدا هەڵ بکەم.

هەمو جەختنامەیەکی چاك پێنج پێکهێنەری بنەڕەتی هەیە: تایبەت و ئەرێنی‌یە و هی کاتی ئێستایە و بینراوە و سەروکاریشی لەگەڵ سۆزدا هەیە. کەواتە دەتوانم شتێکی لەم جۆرە بنوسم: کارێکی زۆرچاکە (سەروکاری لەگەڵ سۆزدا هەیە) من (کەسێتی) حەکیمانەو راشکاوانە و بە خۆشەویستی و متمانەوە (ئەرێنی) کاردانەوە دەنوێنم (کاتی ئێستا) کاتێك کە مناڵەکانم بەدڕەفتاری دەکەن.

ئینجا من دەتوانم مەسەلەکە بهێنمە بەرچاوی خۆم و هەمو رۆژێك چەند خولەکێك بەوپەڕی ئارامییەکانی ئەقڵ و جەستەوە بیر لەو هەڵوێستانە بکەمەوە کە رەنگە مناڵەکانم هەڵەی تیا بکەن. بۆ ئەوەی جلەکانی بەریان ببینم یاخود بزانم چی دەکەن و گوزارشت لەچی دەکەن. دیارە هەتا ئەو هێنانە بەرچاوە رونتر و دیاریکراوتر بێت ئەزمونەکەم بەهێزتر و قوڵتر دەبێت لەچاو ئەوەی کە دوراودور تەماشای بکەم.

دەتوانم کچەکەم بهێنمە بەرچاوی خۆم خەریکی کارێکی دیاریکراوە کە هەمیشە نیگەرانم دەکات و بەڵام لەبری چاودێریکردنی کاردانەوە ئاساییەکەم دەتوانم وا خۆم بهێنمە بەرچاو کە بە هێز و خۆشەویستی و ئارامی‌یەوە مامەڵە لەگەڵ هەڵوێستەکەدا دەکەم و دەتوانم بەرنامەیەکی وا بنوسم کە بگونجێت لەگەڵ پەیامە تایبەتەکەی ژیانم و لەگەڵ بەهاکانمدا.

ئەنجامدانی رۆژانەی ئەوکارە هەڵسوکەوتم دەگۆڕێت و لەو چوارچێوەی هەڵسوکەوتە رزگارم دەبێت کە لە باوك و دایکم و کۆمەڵگا و دەوروبەر و کرۆمۆسۆمەکانەوە بۆم ماوەتەوە.

من هەر لەم بووارەدا یارمەتی کوڕەکەمم دا کە بەکارهێنانی ڕێبازی جەختکردنەوە بخاتە خزمەت ئایندەی خۆیەوە وەك یاریزانێکی تۆپی پێ. من لە قۆناغی دوا ناوەندییەوە ئەمەم لەگەڵدا دەست پێکردووە و فێرم کردووە چۆن خۆی بیکات. هەوڵماندا هەناسەی قوڵ هەڵمژێت بۆ خاوکردنەوەی ماسولکەکان و حەساندنەوەی مێشکی تا لە ناخەوە ئارام ببێت و هانم دا خۆی وا بهێنێتە بەرچاو کە لە ناخۆشترین و زەحمەترین هەڵوێستدایە.

هێنایە بەرچاوی خۆی کە هێرشی ناکاوی دەکرێتە سەرو پێویستە ئاگاداربێت. هەروەها پێویستیشە ئەو هەمو شێوازی بەرگرییانە بەکاربهێنێت کە ئەو لەکاتی ئاساییدا بەکاریان ناهێنێت.

لە قۆناغێکی ژیانیدا کوڕەکەم پێی ڕاگەیاندم کە هەست بە تورەیی و بێ ئارامی زیاتر دەکات. کاتێکیش کە کەوتینە گفتوگۆ بۆم دەرکەوت کە کوڕەکەم ئەو ڕەفتارە تورەیەی هێناوەتە پێش چاوی خۆی لەبەر ئەوە پێکەوە کارمان کرد بۆ ئەوەی لە گەرمەی دۆخە هەرە ناڕەحەتەکەماندا خاوبونەوە بهێنێتە پێش چاوی خۆی. بۆمان دەرکەوت کە مەسەلەی هێنانەپێش چاو بایەخێکی گەورەی هەیە. مرۆڤ ئەگەر شتی هەڵەو خراپ بهێنێتە پێش چاوی خۆی ئەوا ئەو هەڵەو خراپەیە دەکات.

د. چارڵس جارفیلد لێکۆڵینەوەیەکی چڕوپڕی ئەنجام داوە لەسەر مرۆڤە هەڵکەوتووەکانی بواری وەرزش و بواری یارییە جەستەییەکان. ئەو کاتێك لەگەڵ ناسادا کاری دەکرد گەیشتە لوتکەی چالاکییەکانی خۆی، بەتایبەت کاتێك پیاوەکانی بۆشایی ئاسمانی بینی لە ژینگەیەکی وا ڕاهێنان دەکەن کە کتومت وەکو ژینگەکەی بۆشایی ئاسمان وایە. د. چارڵس هەرچەندە خاوەنی بڕوانامەی دکتۆرا بو لە بیرکاریدا بەڵام بڕیاری دا لە دەروونناسیشدا بڕوانامەی دکتۆرا بەدەست بهێنێت بۆ ئەوەی تایبەتمەندییەکانی وەرزشکارە هەڵکەوتووەکان تێبگات.

- لێکۆڵینەوەکەی ئەم دەریخست کە زۆربەی پاڵەوانە هەڵکەوتووەکان کاتێك کە ڕووداوەکان دێننە بەرچاوی خۆیان، دەشیان بینن و هەستیان پێدەکەن و پێش ئەوەی بە کردەوە ئەنجامی بدەن لە مێشکی خۆیاندا کردویانن. بەمەش لەگەڵ دەستپێکردنی کارەکەدا ئەنجامەکەیان لە مێشکدا بووە. تۆش دەتوانیت لە هەمو

بوارەکانی ژیانی خۆتدا ئەمە بکەیت و هەمو فرۆشتن و کڕین و کێشەکانی ژیانی ڕۆژانە و ڕووبەڕووبونەوە قورسەکان بخەیتە پێش چاوی خۆت و جار لەدوای جار ڕوونتر بیانبینیت و نەوەستیت. هەوڵبدە لە ناخی خۆتدا ناوچەیەکی ئیسراحەت بخولقێنیت بۆ ئەوەی کە بە کردەوە چویتە ئەو هەلۆیستەوە بەلاتەوە نامۆ نەبێت و لێی نەترسیت.

- بەشە خولقێنەرە سۆماییەکەی لای ڕاستی مێشك یەکێکە لە سەرچاوە هەرە گرنگەکانی هێزی مرۆڤ چ لە مەسەلەی دروستکردنی پەیامە تایبەتەکەی ژیاندا و چ لە پتەوکردنی ژیان.

- دیارە زۆر کتێب و کاسێتی بیستراو و بینراو هەیە سەبارەت بە پڕۆسەی هێنان بەرچاوە و جەختکردنەوە. گومانیشی تێدانییە کە یەکێك لە دەستکەوتە گرنگەکانی سەردەم لەم بوارەدا کە پڕۆگرامە سەختەکان و شێوە تازەکانی خاوبونەوە و ئەو پڕۆگرامانەیان لەخۆ گرتووەکە پەیوەستن بە توانا زمانەوانییە دەماریەکانەوە. ئەم مەسەلانە هەمویان پێویستییان بە رونکردنەوە و باسکردن و کۆکردنەوەی سەرەتا بنەڕەتییەکانی پڕۆسەی خولقاندنی یەکەم (سەرەکی) هەیە. من بە حوکمی پیشەکەم سەروکارم لەگەڵ سەدان نوسراوی دیکەدا هەبووە لەسەر هەمان بابەت کە ئەگەرچی هەندێکیان زیادەڕۆییان تیایە و بێ پشتیوانی زانستیین بەڵام زۆربەیان بەرهەمی ماقوڵن.

لە مەسەلەی خۆڕابەرایەتیکردنی چالاکدا هێنانە پێش چاو و جەختکردنەوە بەرهەمی ئەو بیرۆکە ڕاست و دروستەن کە سەرچاوەکانیان کۆمەڵە ئامانج و پرنسیپێکن بونەتە سەنتەری ژیانی مرۆڤ. زۆر بەهێزیشن لە داڕشتنەوە و پڕۆگرامکردنی ئامانجە قوڵەکانی ناخی دڵ و مێشك. من پێم وایە چەقی کاریگەرییەکەی ئایینە ئاسمانییەکان لەسەر مرۆڤ لەو ئەزمون و پرنسیپانەوە دێن کە بە زمانی جۆراوجۆر دەیانخوێنین وەکو نوێژ و رامان و بڕوابون بە ناوچەوان و هاوکاری و توێژینەوەی رابردو، هەروەها سۆز و شێوازەکانی دیکەی پەیوەست بە ویژدان و بەرجەستەکردن. پێویستە ئەم مەسەلانە بە شێوەیەك بەکارنەهێنین کە لە ئامانجە سەرەکییەکانیان دەربچن و گەندەڵیان بکات.

جەختکردنەوە و هێنانە بەرچاو دوو شێوەن لە شێوەکانی پڕۆگرام دانان. لەبەرئەوە پێویستە ئێمە دڵنیابین لەوەی نەچینە سیستمی پڕۆگرامێکەوە لەگەڵ ئەو سەنتەرە سەرەکییەدا نەگونجێت یاخود لە سەنتەرەکانی پارە پەیداکردن و خۆپەرستی و ئەو مەسەلانەی دیکەوە بئاڵێت کە لەگەڵ پرنسیپە راست و دروستەکاندا هاوئاهەنگ نین.

دەتوانرێت خەیاڵ بۆ بەدەستهێنانی ئەو هەستی سەرکەوتنە بەکاربهێنرێت کە مرۆڤ لە بەدەستهێنانی قازانجە مادیەیە تایبەتەکانی خۆیدا پێی دەگات. بەڵام من باوەڕم وایە کە بەکارهێنانی بالآتری خەیاڵ ئەوەیە هاوئاهەنگی بکەیت لەگەڵ بەکارهێنانی ویژداندا بۆ بەرزبونەوە بەسەر خۆپەرستی و خوڵقاندنی ژیانێك سەراپای ئامانجی بێ هاوتا و ئەو پرنسیپانە بێت کە هەقیقەتە (کامڵەکە) کۆنترۆڵ دەکات.

## دیاریکردنی رۆڵ و ئامانجەکان

بێگومان چالاکییە لۆجیکییە/ گوتارییەکەی نیوەی چەپی مێشك یارمەتیدەریش دەبێت لە هەوڵەکانتدا بۆ داڕشتنی وێنەو هەست و شێوەکانی نیوەی راستی مێشك بەو وشانەی کە پەیامەکەی ژیانی پێ دەنوسینەوە. وەك چۆن مەشقکردن لەسەر هەناسەدان یارمەتی کامڵبونی جەستە و ئەقڵ دەدات، بەهەمان شێوەش نوسین چالاکییەکی دەورنی -دەماری- ماسولکەییە کە یارمەتی بەرجەستەبون و کامڵبۆنی هەردوو ئەقڵی هوشیار و ناهوشیار دەدات (هەست ونەست). نوسین پاکژکەرەوە و روونکەرەوە و خەمڵێنەری بیرۆکەکانە و یارمەتی دەدات لەوەی کۆگشتییەکان وردبکاتەوە بۆ پارچەی بچوك بچوك کە هەریەکێکیان لە ژیاندا چەندین رۆڵی هەیە. ئێمەی مرۆڤ لە بواری جیاجیادا بەرپرسیارێتی و شارەزاییمان هەیە. بۆ نمونە من هەم تاکێکی کۆمەڵگام، هەم هاوسەرم، هەم باوکم، هەم مامۆستام، هەم بزنسمانم، هەم ئەندامی دەزگایەکی ئایینیم و دیارە هەر کام لەو رۆڵانەش بایەخی تایبەتی خۆی هەیە.

مرۆڤ کاتێك کە هەوڵدەدات رۆڵی کاریگەرتری هەبێت لە ژیاندا، کۆمەڵێك گیروگرفتی دێتە رێ. گیروگرفتێکیان کە زۆر گرنگە ئەوەیە وەك پێویست ئاسۆی

بیرکردنـەوەی خـۆی فـراوان ناکـات. بەمـەش ئـیتر هـیچ نـە رێـژە و درێژەکارییـەك مانایەکی دەمێنێت لەلای و نە هاوسەنگی و نە ئەو پێشبینیکردنە سروشتییـەی کە بۆ ژیـانێکی کاریگـەر پێویسـتن. بـۆ نمونـە کەسـەکە رەنگـە هێنـدە سـەرگەرمی کـارو پیشـەکەی ببێـت کـە نەیپەرژێتـە سـەر ئـەوەی بـیر لـە تەندروسـتی خـۆی بکاتـەوە و لـەپێناوی سـەرکەوتن لـە پیشـەکەیدا رەنگـە گـرنگترین پەیوەندییـەکانی ژیـانی فەرامۆش بکات.

بەڵام ئەگەر پەیامەکەی ژیانت دابەش بکەیت بەسەر بوارە جیاجیاکانی رۆڵ و ئامانجـەکانی ژیانتـدا کـە لـە هـەر بوارێکدا دەتـەوێت بیگـەیتێ ئـەوا بـە دڵنیاییـەوە پەیامەکـە زۆر هاوسـەنگتر دەبێـت و ئاسـانتریش دەتوانیـت جێبـەجێی بکـەیت. بـۆ نمونە تەماشای پیشەکەی خۆت بکە. تـۆ رەنگـە بەرێوەبـەر بیـت یـاخود لێپرسـراوی بەرهـەمهێنان بیـت یـان کارمەنـدی بەشـی فرۆشـتن بیـت. ئایـا چـۆن هەڵسوکەوت دەکەیت؟ ئەو بنەمایانە کامانەن کە دەیانکەیتـە رێنمـای خـۆت؟ تـۆ وەکو هاوسـەرێك، باوکێك/ دایکێك، هاوسێیەك، برایەك، هاورێیەك چ رۆڵێکت هەیـە و لەئاست هـەرکام لـەو رۆڵ و بەرپرسـیارییانەدا چـۆن رەفتـار دەکـەیت؟ چـی زۆر بەلاتـەوە گرنگـە؟ هـەروەها بـیر لـە رۆڵـی سیاسـی و کۆمەڵایـەتی خـۆت بکـەرەوە .. بزانـە لـە رێکخـراوە خۆبەخشەکان و لە بوارەکانی خزمەتگوزاریی گشتیدا رۆڵت چییە؟

یـەکێك لـە بەرێوەبـەرە جێبـەجێکارەکان بـە سـود وەرگـرتن لـە بیرۆکـەی رۆڵ و ئامانجەکان ئـەم پەیامـە تایبەتـەی خـوارەوەی نوسـیوە: پـەیامم لـە ژیانـدا ئەوەیـە بە دەستپاکی و سەربەرزی بژیم و گۆڕانکاریی لە ژیانی خەڵکیشدا دروست بکەم.

بۆ بەدیهێنانی ئەم ئەرکە:

خێرخواز دەبم: هەوڵ دەدەم هەمو کەسێك بە چاکی - هەرکەسێك - بناسم هـەمو کەسێکم خۆش بوێت بێ گوێدانە بارودۆخەکەی

قوربـانی دەدەم: هـەمو توانـا و بـەهرەو سەرچـاوەکانم دەخەمـە خزمـەت پەیامەکەمەوە.

ئیلهامبـەخش دەبم: دەبمـە نمونەیـەکی مـەزن بـۆ ئـەوەی خـەڵکی تێبگـات کـە هەمومان بەندەی خوداین و دەتوانین ترس و بەربەستەکان تێك بشکێنین

کاریگـەر دەبم: هەرچییەك دەیکـەم بـۆ ئەوەیـە گۆڕانکـاری لـە ژیـانی خەڵکیـدا دروست بکەم.

بۆ بەدیهێنانی ئەرکەکەم ئەم ڕۆڵانەی خوارەوە زۆر گرنگن بەلامەوە

هاوسەر: گرنگترین کەس لە ژیانمدا هاوسەرەکەمە. پێکەوە بەشداریی دەکـەین لـە چنینەوەی بەرهەمەکانی فێرخوازی و گونجان و سەرڕاستی و کارکردندا.

باوك: هەوڵ دەدەم منداڵەکانم زیاتر و زیاتر چێژ لە ژیانیان وەربگرن.

کوڕ/ برا: هەمیشە دەستی خۆشەویستی و یارمەتیدانیان بۆ درێژ دەکەم.

خواپەرســـت: بەندەیـــەکی جێبـــەجێکاری فەرمانـــەکانی خـــودا دەبم و خزمـــەتی بەندەکانی دەکەم

هاوســێ: ئیمانداریێتییەکــەم لــەو هەڵســوکەوتانەدا دەردەکــەون کــە بەرامبــەر خەڵکانی دیکە دەیاننوێنم.

## بەرپرسیاری پێشکەوتن

دەبمە هۆکارێك بۆ پێشخستنی شێوازی کارکردنی دامودەزگاکان

فێرخواز: هەمو ڕۆژێك بابەتی نوێ فێردەبم

نوسـینی پـەیامی ژیـان لەسـەر بناغـەی ڕۆڵـە گرنگـەکان لـە ژیانـدا هاوسـەنگی و هاوئاهەنگی دەبەخشێت بە مرۆڤ. کارێـك دەکـات ڕۆڵـەکانت یـەك بەیـەك لـەلا ڕوون و ئاشکرابن. هەروەها پێویستیشە چاو بـە ڕۆڵەکانـدا بگێڕیـت بـۆ ئـەوەی وات لێ نەیـەت ڕۆڵێکـی دیـاریکراو تـەواو سـەرقاڵت بکـات و ڕۆڵـەکانی دیکـەت بیربباتـەوە کـە ڕەنگـە هێندەی ئەو و بگرە زیاتریش گرنگ بن لە ژیانتدا.

پاش دیاریکردنی ڕۆڵە جۆراوجۆرەکان ئیـتر نـۆرەی ئـەوە دێـت بیـر لـەو ئامانجـە درێژخایەنانـە بکەیتـەوە کـە دەتـەوێت لـەو ڕۆڵانـەدا بـەدییان بهێنیـت. بـەمجۆرە جـارێکی دیکــە دەگەڕێینــەوە بــۆ نیــوەی لای ڕاســتی مێشـك. چـۆن؟ لــەڕێی بـەکارهێنانی خـەیاڵ و داهێنـان و خولقانـدن و ویـژدان و ئیلهامـەوە. ئەگـەر ئـەم ئامانجانە درێژکراوەی پەیامە تایبەتەکـەی ژیـان بێـت کـە لەسـەر بناغـەی پرنسیپە ڕاست و دروستەکان داڕێـژراون، ئـەوا جیـاوازیی بنـەڕەتییان دەبێـت لەگـەڵ ئامانجە ئاسـاییەکانی مرۆڤـدا. هاوئاهـەنگ دەبـن لەگـەڵ بنـەما ڕاسـتەکان و یاسـا

سروشتییەکاندا کە هێزی زیاترت پێ دەبەخشن بۆ بەدیهێنانیان. ئامانجەکان ئامانجی خودی خۆتن نەك لە کەسێکی دیکەوە پێت گەیشتبن. ڕەنگدانەوەی بنەما قوڵەکانت و بەهرە بێ هاوتاکەتن. ڕەنگدانەوەی هەستکردنتن بە ڕێز و بایەخی خۆت و لەناوجەرگەی ئەو ڕۆڵە گرنگانەوە هەڵدەقوڵێن کە لە ژیاندا هەڵتبژاردون.

ئامانج ئەگەر گرنگ و کاریگەر بێت ئەوا لە بنەڕەتەوە زیاتر جەخت دەکاتە سەر ئەنجامەکان نەك سەر چالاکییەکان. ئەو پێگەیە دیاری دەکات کە ئارەزومەندیت تیایدا بیت و لە هەمان کاتیشدا یارمەتیت دەدات پێگەکەی ئێستات بناسیت و دیاری بکەیت. ئامانجی کاریگەر زانیاری گرنگت پێدەبەخشێت بۆ گەیشتن بەو پێگەیەی کە ئارەزوی دەکەیت و کاتێکیش کە پێی گەیشتیت یەکسەر ئاگادارت دەکات. وزەو هەوڵەکانت یەك دەخات. واتاو مەبەست دەبەخشێت بە هەمو چالاکییەکانت. لە کۆتاییشدا خۆی وەردەگێڕێتە سەر ئەو چالاکییانەی کە ڕۆژانە ئەنجامیان دەدەیت بۆ ئەوەی بتوانیت ببیتە مرۆڤێکی ئەرێنی و بەرپرسیاری ژیانی خۆت و بەدیهێنانی ڕۆژ بەڕۆژی ئەو شتانەی کە هاوکاریت دەکەن لە بەدیهێنانی پەیامەکەی ژیانتدا.

ڕۆڵ و ئامانجەکان پەیکەر و ئاڕاستە ڕێکخراوەکەی پەیامی ژیانن. تۆ ئەگەر تا ئێستا پەیامی ژیانی خۆتت دیاری نەکردووە، ئێستا باشترین کاتە بۆ ئەو کارە. بوارە جیاجیاکانی ژیانت لە ڕەهەندە جۆراوجۆرەکاندا پێویستن بۆ بەرەو پێشچونت. ئەم بوار و ئامانجانە گۆشەنیگایەکی گشتی بە ژیانت دەبەخشن و ئاڕاستەکەشیت لەلا بەرجەستە دەکەن.

ئێمە هەتا زیاتر بەرەو خووی سێیەم بچین قوڵتر ڕۆدەچینە ناو ئامانجە کورتمەوداکانەوە. گرنگترین مەسەلە، کە جێبەجێکردنی لەم خاڵەدا زۆر پێویست بێت، بریتییە لە دیاریکردنی ڕۆڵ و ئامانجە دوورمەوداکان، چونکە پەیوەندی پتەویان هەیە بە پەیامە تایبەتەکەی ژیانەوە. ئەم ڕۆڵ و ئامانجانە بەردی بناغەی دیاریکردن و جێبەجێکردنی کاریگەرانەی ئامانجەکانن کاتێك دەگەینە جێبەجێکردنی ڕۆژانەی خووی سێیەم کە پەیوەستە بە بەڕێوەبردنی کات و ژیانەوە.

## پەیامی ژیانی خێزان

چونکه خووی ژماره (٢) پابەندی پرنسیپەکانە، لەبەرئەوە مەوداکانی جێبەجێکردنی زۆر فراوانن. خووی ژماره (٢) نەك هەر تاکەکانی کۆمەڵگا، بەڵکو ئەگەر خێزان و دامودەزگا جیاوازەکان و کۆمەڵە خزمەتگوزارییەکان لەسەرتاوە ئامانجەکانیان بە روونی بخەنە پێش چاوی خۆیان، دەتوانن کاریگەرانەتر ئەرکەکانیان رابپەڕێنن.

ئەوەی تێبینی کراوە زوربەی خێزانەکان ژیانیان لەسەر بناغەی پرنسیپە راستەکان بەڕێوەنابەن، بەڵکو بە چەمکی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ قەیران و چارەسەری خێرا و مەزاج و پاداشت و سزای دەستبەجێدا. کاتێکیش کە لە ئەنجامی زیادبونی گوشارەکان و ماندبون و بەهیلاکچوندا نیشانەکان دەردەکەون، ئەوکاتە ئیتر خەڵکەکە یان زیاتر رەشبین دەبن و دەست دەدەنە گلەیی و رەخنەگرتن، یاخود بێدەنگ دەبن یان دەست دەکەنە هاوار و گریان و سکاڵا دەربڕین و زیادەڕەویکردن لە کاردانەوەکاندا. ئینجا ئەو منداڵانەی کە لە ژینگەی وادا گەورە دەبن دەگەنە ئەو باوەڕەی کە تاقە رێگاچارە بۆ یەکلایکردنەوەی کێشەکان یان ئەوەیە شەڕ بکەن یاخود لە شەڕ هەڵ بێن.

کرۆکی هەمو خێزانێك شتە نەگۆڕەکەیە، ئەو شتەیە کە هەمو کاتێك هەیە، واتا تێڕوانین و بەها هاوبەشەکان. خێزان کە پەیامە تایبەتەکەی ژیانی خۆی نوسی مانای وایە دەیەوێت گوزارش لە بنەما راستەقینە پتەوەکەی خۆی بکات.

ئەم پەیامە دەبێتە دەستوری خێزان، دەبێتە پێوەر و ئەو پارادیمەی کە بڕیارەکانی پێدەدات و مەسەلەکانی پێ هەڵدەسەنگێنێت. پەیام بەردەوامی و یەکپارچەیی بە خێزان دەبەخشێت و ئاڕاستەکەی بۆ دیاری دەکات. کاتێك کە بەهای ئەندامانی خێزانەکە هاوئاهەنگ دەبن لەگەڵ بەهاکانی خێزاندا، ئەوا ئەندامانی ئەو خێزانە ئاسانتر دەتوانن پێکەوە کار بکەن بۆ ئەو ئامانجە هاوبەشانەی کە لە ناخەوە هەستی پێدەکەن.

لێرەشدا دیسانەوە خودی پرۆسەکە هێندەی ئەنجامەکە گرنگە. هەر ئەم پرۆسەی نوسین و راگەیاندنەی پەیامی ژیانە کە دەبێتە رێبازێکی گەورە بۆ چاککردنی خێزانەکە. کارکردن پێکەوە بۆ خولقاندنی پەیامی تایبەتی خێزان توانای بەرهەمهێنان بە شێوەیەکی وا بنیات دەنێت کە قابیلی ژیان بێت.

بەشداریكردنی یەك بەیەكی ئەندامانی خێزان لە رەشنوسی پەیامەكە و پێداچونەوە و پاكنوسكردن و بەخشینی زانیاری و بەكارهێنانی ئەو وشەو دەستەواژانەی كە پێشنیاری دەكەن وا لە خێزانەكە دەكات قسەو باسیان لەسەر ئەو شتانە بێت كە بەلایانەوە بایەخدارە. باشترین پەیامی ژیان، پەیامێكە كە لە دەرئەنجامی كۆبونەوەی ئەندامانی خێزانەكە دێتە بەرهەم، كاتێك بەوپەڕی رێز و خۆشەویستییەوە پێكەوە دادەنیشن و بیروبۆچونە جیاوازەكانیان دەردەبڕن و پێكەوە كاردەكەن بۆ دۆزینەوەی شتێك چاكترو مەزنتر لەو شتەی كە هەركەسێك بە تەنیا خۆی بەدی دەهێنێت. هەروەها چاوخشاندنەوەی ناوبەناویش بە پەیامەكەدا بۆ فراوانكردنی مەودای تێڕوانین و گۆڕینی ئاڕاستەو جەختكردنەوە و هەمواركردنەوە و بەخشینی واتای تازە بە زاراوە كۆنەكان، ئەمانە هەمو لە باریاندا هەیە لە چوارچێوەی كۆمەڵێك بەهاو ئامانجی هاوبەشدا یەكێتی خێزانەكە بپارێزن.

بەم شێوەیە پەیامی ژیانی خێزانەكە دەبێتە چوارچێوەیەك بۆ بیركردنەوە و بۆ بەڕێكردنی كاروبارەكانی خێزان. چونكە كاتێك كێشەو قەیرانەكان دەردەكەون دەستورەكە ئامادەیە ئەو شتانە بیری ئەندامانی خێزانەكە بخاتەوە كە لە مەسەلەكانی دیكە گرنگترن و هەروەها ئاڕاستەشیان بكات بۆ دۆزینەوەی چارەسەر و جێبەجێكردنی بڕیاری گونجاوی پشت بەستوو بە پرنسیپە راست و دروستەكان.

ئێمە لە ماڵی خۆمان پەیامی ژیانی خێزانەكەمان بە دیواری ژووری دانیشتندا هەڵواسیوە بۆ ئەوەی هەمیشە لەبەرچاوماندا بێت و رۆژ بەرۆژ چاودێری خۆمانی پێبكەین.

ئێمە كە لە ماڵەوە زاراوەكانی تایبەت بە خۆشەویستی و سیستم و رێكوپێكی و سەربەخۆیی و بەرپرسیارێتی و هاوكاری و یارمەتی و بەهاناوە هاتن و گەشە بە خۆدان و بایەخدان بە بەهرەی یەكتری دەخوێنینەوە و خزمەتی یەكتری دەكەین لەم رێگایەوە هەندێك پێوەرمان دەست دەكەوێت بۆ ناسین و دەستنیشانكردنی هەڵسوكەوتمان بەرامبەر بە مەسەلە گرنگەكانی دیكە.

ئێمە كاتێك نەخشە بۆ ئامانج و چالاكیەكانی خێزان دادەڕێژین. لە خۆمان دەپرسین و دەڵێین: لەبەر رۆشنایی ئەم پرنسیپانەدا ئایا ئەو ئامانجانە چین كە هەوڵیان بۆ دەدەین؟ چ هەنگاوێك دەنێین بۆ بەدیهێنانی ئامانجەكان و بەرجەستەكردنی ئەو پرنسیپانە؟

ئێمە زۆرجار چاو بە پەیامەکەدا دەخشێنینەوە و ساڵی دوجاریش ئامانج و ئەرکەکان دادەڕێژینەوە، جارێکیان لە مانگی ئەیلول و جارەگەی دیکەش لە مانگی حوزەیراندا کە وادەی دەستپێکردن و کۆتایی هاتنی ساڵی خوێندنن. چاوخشاندنەوە و دارشتنەوەکە یان بۆ راگرتنی بارو دۆخەکەیە وەکو خۆی یاخود بۆ چاککردن و پتەوکردنێتی. ئەنجامێکی دیکەی ئەم چالاکیە ئەوەیە کە دەبێتە مایەی نوێبونەوەمان و تازەکردنەوەی پابەندبونمان بەو شتانەی کە بڕوامان پێیان هەیە و خۆمان تەرخانکردووە بۆ بەدیهێنانیان.

## پەیامی ژیانی دەزگاکان

بەهان شێوەی خێزانیش، پەیامی تایبەتی ژیان بۆ دامودەزگا، مەسەلەیەکی چارەنوسیە. من خۆم یەکێك لە پاڵنەرە گرنگەکانم بۆ کارکردن لە دامودەزگاکاندا ئەوەبو کە هاوکارییان بکەم بۆ داڕشتنی پەیامی ژیانی کاریگەر. پەیامەکە بۆ ئەوەی کاریگەر بێت پێویستە لە ناخی دەزگاکە خۆیەوە هەڵقوڵابێت، کە پێویستە هەمو کەسێکی ناو دەزگاکە بە شێوەیەکی ئەرێنی بەشداری تێدا بکات، نەك تەنیا هەر هەڵبژاردەیەك لە نەخشە دارێژە ستراتیجییەکان. دووپاتی دەکەمەوە و دەڵێم سەرقاڵبون لە پرۆسەکەدا و بەشداریکردن تیایدا هێندەی ئەنجامە نوسراوەکە گرنگە و کلیلی بەکارهێنانیشێتی.

من هەمو جارێك کە سەردانی کۆمپانیای IBM دەکەم و چاوم بە پرۆگرامەکانی راهێنانیان دەکەوێت هەست بە سەرسامی و دڵبەستەیی دەکەم. کاربەدەستانی کۆمپانیاکە لە هەمو کۆبونەوەیەکیاندا لەگەڵ بەشدارانی خولی راهێنانەکەدا ئەوەیان بۆ دووپات دەکەنەوە کە سێ مەسەلە لە دەزگای IBMادا باڵادەستن: رێزی تاکە کەس، نایابی و خزمەتگوزاریی چاك.

ئەم شتانە سیستمی بیروباوەڕی IBM پێك دەهێنن. هەمو شتەکانی دیکە قابیلی گۆڕانن، بەڵام ئەم سێ شتە ناگۆڕێن. ئەم تیۆرییە بەهەمان یاسای (گوشاری ئۆسمۆزی) لەسەرتاسەری دەزگاکەدا بڵاوبۆتەوە و بەمەش بنکەیەکی پتەو لە بەهای هاوبەش دروست بووە و هەمو کەسێکیش لە ناخەوە هەست بە ئاسایش و ئارامی دەکات.

من جارێکیان لە بارەگایەکی دەزگای IBM لە نیویۆرك مەشقم بە گروپێکی

بیست کەسی دەکرد. کتوپڕ یەکێکیان نەخۆش کەوت و دەستبەجێ تەلەفۆنی کرد بۆ ژنەکەی لە کالیفۆرنیا، ئەویش زۆر نیگەرانیی دەربڕی چونکە نەخۆشییەکە پێویستی بە چارەسەری تایبەت هەبو. بەرپرسیارانی کۆمپانیاکە، ئەوانەی کە سەرپەرشتی مەشقەکەیان دەکرد، مەسەلەی گواستنەوەی نەخۆشەکەیان ڕێك خست بۆ نەخۆشخانەیەکی تایبەت کە پزیشکی پسپۆڕی ئەو نەخۆشییەی تێدابێت. لەهەمان کاتیشدا ئاگاداری ئەوەبون کە هاوسەرەکەی چەندێك نیگەرانە و حەزی کرد بیبەنەوە مالی خۆی کە پزیشکی تایبەتی خۆی ئەرکی چاودێریکردنی نەخۆشەکە دەگرێتە ئەستۆ.

بەم شێوەیە هەمو گەیشتنە ئەو بڕیارەی کە بیگوێزینەوە بۆ مالی خۆی. جا بۆ ئەوەی بە زووترین کات بگاتە فڕۆکەخانە، کۆپتەرێکییان بۆ گرت بەکرێ و لەوێشەوە بە فڕۆکەیەکی تایبەت گواستیانەوە بۆ کالیفۆرنیا.

من نازانم ڕێك ئەو مەسەلەیە چەندی تێچووە، بەلام دلنیام بڕەکەی لە چەندین هەزار دۆلار کەمتر نەیە. بەلام چونکە دەزگاکە ڕێزی کارمەندەکانی خۆیی لەلابو، وە ئەو پرنسیپەی جێبەجێ دەکرد و ئەو ئەزمونەشی گوزارشتێك بو لە سیستمەکانی بیروباوەڕی دەزگاکە، لەبەرئەوە بەلایانەوە ئاسایی بو ئەو هەمو خەرجیەی بۆ بکێشن و ئەو هەمو بایەخەی پێبدەن. بەلام من خۆم ئەم هەلوێستە زۆر سەرسامی کردم.

لە ڕووداوێکی دیکەدا، وا ڕێك کەوت من لە ئوتێلێکدا مەشق بکەم بە ١٧٥ بەڕێوەبەری سەنتەرێکی بازرگانی. ئاستی خزمەتگوزاری ئوتێلەکە زۆر سەرسامی کردم، کە تەنیا هەر شتێکی رووکەش و بۆ خۆدەرخستن نەبو، بەلکو مەسەلەیەك بو لە هەمو ئاستەکاندا هەستی پێدەکراو خەلکەکە خۆیان دەیان کرد بێ ئەوەی چاوی کەسیان لەسەربێت.

من زۆر درەنگ گەیشتبومە ئوتێلەکە و بەلام دوای ئەوەی کە ژوورەکەم گرت پرسیارم کرد ئایا لەم درەنگوەختەدا چێشتخانەکە کراوەیە، کارمەندەکەی پرسگە وەلامی دامەوە وتی: "نەخێر بەڕێز کۆڤی، بەلام ئەگەر بتەوێت دەتوانم بچم لە چێشتخانەکە سەندویچێك یاخود کەمێك زەلاتەت بۆ دەهێنم" بە هەلسوکەوتیدا دیاربوو کە زۆر مەبەستێتی خزمەتم بکات و نەهێلێت لە هیچم کەم بێت و هەست

بە نارەحەتی بکەم. ئینجا لێی پرسیم: "پێت خۆشە هۆڵی دەرسوتنەوەکە ببینیت؟ ئایا لە هیچت کەم نییە؟ من دەتوانم چیت بۆ بکەم؟ ئێمە لێرەین بۆ خزمەتکردنی بەڕێزت".

دیارە هیچ چاودێرێکی لێ نەبو تا بڵێم ئەم کابرایە لەترسی ئاوا رەفتار دەکات. کەسێك بو لە کارەکەیدا دڵسۆزبو.

رۆژی دواتر و لەکاتی رونکردنەوەی بابەتێکدا، بۆم دەرکەوت هەندێك ماجیکم نوقسانە کە پێویستە لە روونکردنەوەکاندا بەکاریان بهێنم. چەند رەنگێکم بیرچووبوو لەگەڵ خۆمدا بیانهێنم. بۆیە لەکاتی پشووە کورتخایەنەکەدا چومە دەرەوەی هۆڵەکە و خزمەتگوزارێکم بینی بە راکردن بەرەو ژوورێکی دیکە دەڕۆیشت. پێم وت: "من وانە بە کۆمەڵێك بەڕێوەبەر دەڵێمەوە و هەر ئەم ماوە کەمەی پشووەکەم بەدەستەوەیە پێویستم بە قەڵەم رەنگی دیکەیە"

کابرا ئاوڕی لێ دامەوە، ئینجا گەڕایەوە و وەکو سەرباز لە حاڵەتی ئامادەباشیدا وەستاو کە ناوی منی بینی لەسەر باجەکەی سەرسنگم نوسرابو، وتی: "بەڕێز کۆڤی، من کێشەکەت چارەسەردەکەم."

ئەم کابرایە نەی وت "نازانم قەڵەم بۆیە لەکوێ پەیدا دەبێت"، هەروەها نەشی وت "بڕۆ لە کارمەندی پرسگە بپرسە" بەڵکو زۆر بایەخی دا بە کێشەکەو وای لێ کردم هەست بکەم کە ئەو بەڕاستی چێژ لەم کارەی دەبینێت.

جارێکی دیکەش، بەرێکەوت لە هۆڵە بچکۆلەکەدا تەماشای هەندێك تابلۆی هونەرییم دەکرد، کاتێکم زانی یەکێك لە کارمەندانی ئوتێلەکە هات و وتی: "بەڕێز کوفی، ئایا پێت خۆشە نامیلکەیەك ببینیت تابلۆ نمایشکراوەکانی ئێرە باس بکات؟ ئای لەو زەوقە!! ئای لەو خزمەتگوزارییە مەزنە و لەو دڵسۆزییە گەورەیە.

پاشان کرێکارێکم بینی بەسەر پەیژەکەوە خەریکی پاککرنەوەی پەنجەرەی هۆڵەکە بو. لەوێوە چاوی لێ بو لە ڕاڕەوی ئوتێلەکە ژنێك بە زەحمەت دەڕوات بەرێدا. ژنەکە خەڵکی دیکەی لەگەڵدابو، بەڵام ئەم کرێکارە خێرا لە پەیژەکە هاتە خوارەوە و بە هەڵەداوان چووە دەرەوە بەلای ژنەکەوە و دەستی گرت هێنایە ناوەو هەتا دڵنیا نەبو لەوەی کە ئیتر هیچی دیکەی پێویست نییە نەچووەوە سەر پەیژەکە. حەزم کرد بزانم ئەم دەزگایە لەکوێوە ئەم کەلتورەی هێناوە کە کارمەند و

کرێکارەکانی هەمو تێکرا لە ناخی دڵەوە حەزدەکەن خزمەتی نەفەرەکان بکەن. لەبەر ئەوە کەوتمە گفتوگۆ لەگەڵ خزمەتگوزار و کارمەند و پێشخزمەتە جۆراوجۆرەکاندا و بۆم دەرکەوت ئەم بایەخ و ئاڕاستەیە رۆچۆتە ناو ئەقڵ و دڵ و رەفتاری هەمو کارمەندەکانی ئەوێ.

چاوگێڕان و گوێ هەڵخستنەکەم درێژە پێدا بەرەو دەرگاکەی پشتەوەی چێشتخانەکەو لەوێ بەها ناوەندییەکەم دۆزییەوە کە خۆی لە "خزمەتگوزارییەکی تایبەتی بێ هاوتا"دا دەبینییەوە .. دواجار چوومە لای بەڕێوەبەرەکە و پێم وت: "کاری من هاوکاری دامودەزگاکانە بۆ ئەوەی گیانی هەرەوەز و کاری بەکۆمەڵیان تێدا بڵاوبکەمەوە. بەڵام ئەوەی کە لە ئێوەی دەبینم تەواو سەرسامی کردوم".

لێی پرسیم: "حەزدەکەیت بزانیت کلیلە راستەقینەکە چییە؟ ئینجا پەیامی ژیانی هەمو ئوتێل و میوانخانەکانی کۆمپانیاکەی خۆیانی نیشان دام.

پەیامەکەم خوێندەوە و وتم پەیامێکی زۆرجوانە، بەڵام زۆربەی دەزگاکان پەیامی ئاوا جوانیان هەیە.

پێی وتم: "حەز دەکەیت پەیامە تایبەتەکەی ئەم ئوتێلە ببینیت؟"

وتم: "یەعنی ئەم ئوتێلە پەیامی تایبەت بە خۆیی نوسیوە؟"

وتی: بەڵێ، پەیامێکی جیاواز لەوەی کە هەمو ئوتێلەکانی دیکەمان هەیانە پەیامێکە لەگەڵ پەیامە گشتیەکەدا دەگونجێت، بەڵام تایبەتە بە بارودۆخی خۆمان، بە دەوروبەری خۆمان و بە کاتی خۆمان.

ئینجا کاغەزێکی دیکەی نیشان دام

- ئەم نامەیە کێ نوسیوێتی؟

★ هەمویان

- هەویان؟ بەراستیتە؟

★ بەڵێ

- خزمەتگوزارەکان ؟

★ بەڵێ

- بارمەن و مەیگێڕەکانیش؟

★ بەڵێ

- کارمەندەکانی پرسگەش

* بەڵێ. بەڕاست حەزدەکەیت پەیامی ژیانی یەك بەیەکی ئەوکەسانەت نیشان بدەم کە دوێنێ شەو بەخێرهاتنیان کردیت؟

ئینجا پەیامە تایبەتەکەی نیشان دام کە خەڵکەکە خۆیان نوسیبویان و پاشان لەگەڵ هەمو پەیامەکانی دیکەدا تێکەڵ کرابو. هەمو کەسێك، لە هەمو ئاستەکاندا، بەشداری کردبو لە پرۆسەکەدا.

پەیامی ژیانی ئەم ئوتێلە وەکو ناوکی منداڵ وابو لە سکی دایکیدا. وەکو سەنتەری تایەیەکی زەبەلاح وابو کە ئەرکەکەی بریتی بێت لە رستنی زانیارییە هەرە وردەکان و هەرە پسپۆڕییەکانی کۆمەڵە دیاریکراوەکانی فەرمانبەران. ئەم زانیاری و وردەکارییانە وەك پێوەرێك بەکاردەهێنران بۆ هەڵسەنگاندنی هەمو بڕیارەکان. هەروەها ئەو ئامانج و بابەتانەشی دەردەخست کە کارمەندەکان خۆیان بۆ تەرخان کردبو – چۆنێتی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ یەکتری و لەگەڵ میوان و نەفەرەکاندا. ئەمە کاری کردبووە سەر رەفتاری بەڕێوەبەر و سەرکردەکان و سەر سیستمی پاداشتەکان. هەروەها کاری کردبووە سەر چۆنێتی هەڵبژاردنی ستافی ئوتێلەکە و سەر چۆنێتی مەشق پێکردنیان. بە کورتییەکەی دەڵێم هەمو بوارێك لە بوارەکانی ئەو دەزگایەدا بە شێوەیەکی بنەڕەتی بەرهەمی تایە گەورەکە بو، واتە بەرهەمی ئەو پەیامی ژیانەبو.

جارێکی دیکە سەردانی ئوتوێلێکی دیکەم کرد سەر بەهەمان کۆمپانیا و زنجیرە ئوتێل. یەکەم هەنگاو پاش پێشکەشکردنی ناسنامەو بەڵگەنامەکانم، پرسیاری پەیامە تایبەتەکەیانم کرد، ئەوانیش یەکسەر دایانە دەستم. لەم ئوتێلەدا من باشتر تێگەیشتم (خزمەتگوزاری تایبەت و بێ هاوتا) یەعنی چی.

ماوەی سێ رۆژی رەبەق، لە هەمو هەلۆیستێکدا چاوم دەگێڕا بزانم خزمەتکردن لای هەڵسوڕاوانی ئەم ئوتێلە چی دەگەیەنێت. بۆم دەرکەوت خزمەتکردن لێرە بە جوانترین و سەرنجڕاکێشترین شێوەیە. لەهەمان کاتیشدا شتێکی زۆر تایبەت بو. هەرکەسەو بەشێوازی تایبەتی خۆی خزمەتی دەکرد. بۆ نمونە من کە لەلای مەلەوانگەکەوە بوم پرسیارم لە شاگردەکە کرد، وتم ئاوی خواردنەوە لەکوێیە؟ شاگردەکە پێشم کەوت و شوێنەکەی نیشان دام.

بەڵام ئەوەی کە کاریگەریی زۆری لەلا دروست کردم، لە هەمو شتێك زیاتر، ئەوەبو کە بینیم کارمەندێك بەپێی خۆی هاتە لای سەرۆکەکەی و ددانی نا بە هەڵەیەکدا کە کردبوی. ئێمە پێشتر داوای شتێکمان کردبو کە فلانە سەعات بیهێنن بۆ ژوورەکەمان. خزمەتگوزارەکە کاتێك شتەکەی هێنا تۆزێك لە شوکۆلاتە گەرمەکەی رشت بە پەڕۆی سەرسینیەکەدا؛ ئەمەش ناچاری کرد بڕوات و سینی‌یەکە و شوکۆلاتەکە بگۆڕێت، بەو هۆیەوە داواکەی ئێمە چارەکە سەعاتێك دواکەوت، کە مەسەلەیەك نەبو بەلامانەوە زۆر گرنگ بێت.

کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، بەڕێوەبەری خزمەتگوزارییەکان بە تەلەفۆن داوای لێبوردنی لێ کردین و بانگهێشتی کردین بۆ نانی بەیانی دەعوەتی ئەوبین چ لە ژوورەکەی خۆماندا چ لە بۆفیە. ئەمەش وەك هەوڵێکی ئوتێلەکە بۆ قەرەبوکردنەوەمان لەو بێزارییەی کە توشمان بوبو.

ئایا چی لەو کەلتورە جوانتر هەیە کە کارمەند ددان بنێ بە هەڵەیەکدا بۆ بەڕێوەبەرەکەی، بەمەرجێك لە خۆی زیاتر کەس ئاگای لەو هەڵەیە نەبوبێت و مەبەستەکەشی خزمەتکردن و چاودێریکردنی زیاتری میوانەکان بێت.

من، وەك پێشتریش بە بەڕێوەبەری ئوتێلی یەکەمم وتبو، ئاگادارم زۆربەی زۆری کۆمپانیاکان پەیامی چاك و کاریگەریان هەیە. بەڵام جیاوازییەکی گەورە هەیە نێوان ئەو پەیامەی کە هەمو ئەندامانی دەزگاکە بەشداری تێدا دەکەن، لەگەڵ ئەو پەیامەدا کە ژمارەیەکی دیاریکراوی بەڕێوەبەری هەڵبژاردە لەودیو دیوارە بەرزەکانەوە دەینوسن.

* * *

ڕەنگە یەکێك لە کێشە هەرە سەرەکیەکانی دامودەزگا جیاوازەکان، بە خێزانیشەوە، ئەوەبێت کە خەڵك پابەندی بڕیارێك نەبێت کەسێکی دیکە لە بارەی ژیانی ئەمەوە دەیاندات و ئەم قبوڵی ناکات.

من لە ماوەی کارکردنمدا لەگەڵ دەزگا جۆراوجۆرەکاندا زۆرجار ڕێکەوتی خەڵکی دەکەم، کە ئامانجەکانیان جیاوازە لە ئامانجی دەزگاکانیان. هەمیشە تێبینی ئەوە دەکەم کە سیستمی پاداشتەکان بە تەواوی پێچەوانەی سیستمە بڕیارلێدراوەکەی بەهاکانە.

هەمو جارێکیش کە دەستم بە کارەکەم دەکرد لەگەڵ دەزگایەکدا خاوەنی پەیامی ژیان بوبێت، لێم دەپرسین "چەند کەس لێرە ئاگاداری ئەوەیە کە کۆمپانیاکەتان پەیامی تایبەتی ژیانی هەیە؟"

چەند کەستان ئاگاداری ناوەڕۆکەکەیەتی؟ چەند کەستان بەشداری کردووە لە دانانیدا؟ چەند کەستان بە کردەوە قبوڵێتی و وەك پارادیمێك و پێوەر و سەرچاوەیەك بەکاری دەهێنێت لە کاتی بڕیاردانداِ؟

بەبێ بەشداریکردن، پابەندبون دروست نابێت. ئەمە رستەیەکی زۆر گرنگە. نیشانەی بکە، ئەستێرەیەکی لەسەر دابنێ. هێڵێك بهێنە بەژێریدا. بیخەرە ناو بازنەیەکەوە: بەشداری نەبێت پابەندبون دروست نابێت.

لە قۆناغی یەکەم و سەرەتاییدا، کاتێك کە ئەو کەسە تازە پەیوەندی دەکات بە دەزگاکەوە، یاخود کە منداڵەکە هێشتا بچوکە، دەتوانیت بە ئاسانی ئامانجەکەیان بۆ دیاری بکەیت و ئەوانیش قبوڵیان دەبێت بە تایبەتی ئەگەر پەیوەندییەکە و ئاڕاستەکردنەوەکەو راهێنانەکە باش بێت.

بەڵام کاتێك کە مرۆڤ کامڵتر دەبێت و ژیانیشی مانایەکی سەربەخۆتر پەیدا دەکات، زیاتر حەزی لە بەشداریکردن دەبێت، بەشدارییەکی کاریگەرانە. ئەگەر رێگریان لێ بکرێت قبوڵی ناکەن. بەمەش گیروگرفتێك سەرهەڵدەدات کە زۆر پەیوەستە بە پاڵنەرەکانەوە و هەرگیز بەو ئاستی بیرکردنەوەیە چارەسەر ناگرێت کە کێشەکەی دروست کرد.

لەبەر ئەوە خولقاندنی پەیامی تایبەتی ژیان هەم پێویستی بە کاتە، هەم بە سەبرو هەم بە شارەزایی و هەم بە هاوسۆزیی و هەم بە بەشداریکردن. دووپاتی دەکەمەوە و دەڵێم ئەمە مەسەلەیەك نیە بە نوکە قەڵەمێك یەکلایی بکرێتەوە. پێویستی بە کات و بە دڵسۆزی و پرنسیپی چاك و ئازایەتی و دەستپاکی هەیە بۆ ئەوەی هەمو سیستەم و پەیکەر و شێوازەکانی بەڕێوەبردن هاوئاهەنگ بن لەگەڵ تێڕوانین و بنەما هاوبەشەکاندا. پەیامی ژیانی دامودەزگاکان — مەبەستم لەو پەیامەیە کە راستگۆیانە ئەو تێڕوانین و بەهایانەی تێدا رەنگ دەدەنەوە کە هەمو ستافی دەزگاکە بە قوڵی و بە جددی بەشداریی تێدا دەکەن — خولقێنەری دۆخێکی دڵڕفێنی یەکپارچەیی و بیرێکی زۆری پابەندبونە.

پەیامی لەو جۆرە دەبێتە مایەی دروستکردنی پێوەر لە دڵ و مێشکی خەڵکەکەدا و ئەمیش لە کۆتاییدا وا دەکات کەسەکە خۆی حوکمی خۆی بکات. ئەوە نییە کەسی دیکە ئاڕاستەی بکات و رەخنەی لێ بگرێت و کۆنترۆڵی بکات و چاودێری بکات. مرۆڤی لەوجۆرە گەیشتۆتە دۆخێك ناوەڕۆکە نەگۆڕەکەی ئامانجەکانی قبوڵ بێت. ئەو ئامانجانەی کە دەزگاکە هەوڵیان بۆ دەدات.

## چەند پێشنیارێك بۆ جێبەجێ کردن

١. کاتی گونجاو تەرخان بکە بۆ تۆمارکردنی تێڕوانینەکانت دەربارەی ئەو بەخاکسپاردنەی کە لەسەرەتای ئەم بەشەدا باسمان کرد. بۆ رێکخستنی بیرۆکەکانت رەنگە پێویستت بەم نەخشەیەی خوارەوە هەبێت

| بواری چالاکی | کەسایەتی | بەشداریکردن | دەستکەوت |
|---|---|---|---|
| خێزان | | | |
| هاوڕێکان | | | |
| کار | | | |
| دەزگا ئاینییەکان/ خزمەتکردنی کۆمەڵگا .. تاد | | | |

٢. لە ماوەك چەند چرکەیەکدا لە روانگەی ئێستاوە رۆڵەکانت تۆمار بکە. ئایا لەو وێنەیە رازیت کە ئاوێنەی ژیانت نیشانی دەدات.

٣. ماوەیەك خۆت لە هەموو چالاکییەکی رۆژانە بدزەرەوە و دەست بکە بە تۆمارکردنی پەیامی تایبەتی ژیانت

٤. تەماشای نەخشەکەی پاشکۆی (أ) بکە کە سەنتەرە جیاوازەکان نیشان دەدات و بازنەیەك بکێشە بە دەوری هەر سەنتەرێکدا کە بەلاتەوە ئاشنایە. ئایا ئەمانە نمونەی شێوازی ژیانی تۆن؟ ئایا خۆشحاڵیت لە جۆری لێکدانەوەکان؟

٥. دەست بکە بە کۆکردنەوەی ئەو لێدوان و بیرۆکەو وتە بەنرخانەی کە پێت خۆشە لە کاتی نوسینی پەیامەکەتدا بەکاریان بهێنیت.

٦. پرۆژەیەك دیاری بکە کە پێشبینی دەکرێت لە ئایندەیەکی نزیکدا رووبەڕووی ببیتەوە. لە مێشکی خۆتدا بیخوڵقێنە. ئەو ئامانجانە تۆماربکە کە ئارەزومەندیانیت و هەروەها ئەو هەنگاوانەش کە دەبنە هۆی دەستبەرکردنی ئامانجەکان.

٧. پرنسیپەکانی خووی دووەم لەگەڵ خێزانەکەت و هاوکارەکانتدا ئاڵوگۆڕ بکە. پێکەوە دەست بکەن بە هەنگاوەکانی نوسینی پەیامی خێزان و گروپەکە.

## خووى سىٚيەم

# گرنگتر لەپێش گرنگەوە دابنێ



## پرنسیپەکانی خۆبەڕێوەبردن

**پێویستە مەسەلە گرنگەکان نەخینە ژێر رەحمەتی مەسەلە کەمبایەخەکان.**

**گۆتە**

تکایە خولەکێك کاتی خۆتم بدەرێ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم دوو پرسیارەی خوارەوە. وەڵامەکانت زۆر گرنگ دەبن بۆ خۆت لەکاتێکدا کە خووی سێیەم پەیڕەو دەکەیت.

پرسیاری یەکەم: تاقە یەك بابەتمان پێ بڵێ کە دەتوانیت ئەنجامی بدەیت (جگە لەم کارەی کە ئێستا دەیکەیت) و ئەگەر بە رێکوپێکی ئەنجامی بدەیت رەنگە کارێکی ئەرێنی زۆر گەورە بکاتە سەر ژیانی تایبەتی خۆت.

پرسیاری دووەم: لە ژیانی پیشەیی و رۆژانەی تۆدا ئەو تاقە بابەتە چییە کە رەنگە هەمان دەرەنجامی لێ بکەوێتەوە.

زۆرچاکە، ئێمە دوایی دەگەڕێینەوە سەر وەڵامەکان. بەڵام با ئێستا باسی خووی سێیەم بکەین.

خووی یەکەم دەڵێت: "داهێنەرەکە خۆتیت، تۆ بەرپرسیاریت" ئەم خووە لەسەر چوار بەخششە بێهاوتاکەی مرۆڤ دامەزراوە کە بریتین لە: خەیاڵ و ویژدان و ویستی سەربەخۆ و (بەتایبەتیش) خۆناسین. ئەم چوار خەسڵەتە هێزی ئەوەت پێدەبەخشن بڵێیت: "ئەم بەرنامەیە ساخڵەم نییە کە لەسەردەمی منالیمدا فێرکرام و لە ئاوێنەی کۆمەڵگاوە وەرم گرت. من ئەم دەقە مردووەم حەز لێ نییە. دەتوانم بیگۆڕم).

خووی دووەم بریتییە لە داهێنانی یەکەم یاخود لە داهێنانی ئەقڵی. ئەم خووە، بناغەکەی خەیاڵە – واتە توانای هێنانە بەرچاو و توانای بینینی وزە شاردراوەکان. واتە بتوانین بە ئەقڵمان ئەو شتانە بخولقێنین کە ناتوانین بە چاو بیانبینین. پێکهاتەی دیکەی ئەم خووە بریتییە لە ویژدان – واتە توانای

دەستنیشانکردنی بێ هاوتایی خۆمان و توانای دیاریکردنی ئەو ڕێنماییە ڕەوشتی و کەسێتی و مەعنەوییانەی کە لە ڕێیانەوە دەتوانین ویژدانی خۆمان ئاسودە بکەین. ویژدان پەیوەندییەکی قوڵە بە پارادیمە بنەڕەتییەکانمانەوەو بەو ئایندەیەی کە دەتوانین بیگەینێ.

خووی سێیەمیش کەواتە بریتییە لە خوڵقاندنی دووەم، لە خوڵقاندنە مادییەکە. بریتیە لە ئەنجامدان و بەرجەستەکردن و سەرهەڵدانی سروشتییانەی خووەکانی یەکەم و دووەم. خووی سێیەم راهێنانی ویستی سەربەخۆی مرۆڤە بۆ ئەوەی پرنسیپەکان بکاتە سەنتەری خۆی. ئەو رۆژە تاڵ و شیرینانەیە کە چرکە بە چرکە دروستیان دەکەیت.

کەواتە خووەکانی یەکەم و دووەم دوو مەرجی پێش وەخت و سەرەکیین بۆ خووی سێیەم. مرۆڤ ناتوانێت پابەندی پرنسیپەکانی ببێت ئەگەر پێشتر ئاگاداری سروشتە دەستپێشخەرەکەی خۆی نەبێت و گەشەی پێنەدات. ناتوانیت پرنسیپەکان بکەیتە چەقی کەسایەتی خۆت ئەگەر پارادیمەکانت نەناسیت و نەزانیت چۆن وەریانبچەرخێنیت بۆ ئەوەی لەگەڵ پرنسیپەکاندا بگونجێن. تۆ ئەگەر توانای بەشداریکردنی خۆت نەبینیت و جەختی تەواو نەکەیتە سەر ئەو توانا تایبەتە بێ هاوتایەی خۆت، ناتوانیت پرنسیپەکان بکەیتە سەنتەری کەسایەتیت

بەڵام ئەو بناغانە دەتوانن وات لێ بکەن پرنسیپەکان سەنتەرت بن و چرکە بە چرکە ئەو ژیانە تاڵ و شیرینەی خۆت دروست بکەی لەڕێی خووی سێیەمەوە. کە کاریگەرانە خۆبەڕێوەبردن پەیڕەو بکەیت.

بیرت نەچێت، بەڕێوەبردن زۆر جیاوازە لە سەرکردایەتیکردن. سەرکردایەتیکردن چالاکیەکی بەهێزی بەشی راستی مێشکە. تەنیا هەر هونەر نیە، بەڵکو شتێکە لە هونەریش گەورەترە. سەرکردایەتیکردن پەیوەستە بە فەلسەفەوە.

تۆ کە هەڵسوکەوت دەکەیت لەگەڵ ئەو مەسەلانەی کە پەیوەستن بە خۆڕابەرایەتیکردنەوە پێویستە پرسیارە بێ کۆتاییەکانی ژیان لەخۆت بکەیت.

**بەڵام هەرکاتێك ئەو مەسەلانەت یەکلایی کردەوە ئیتر کاتی ئەوە دێت بە شێوەیەك خۆت بەڕێوە ببەیت کە لەگەڵ وەڵامەکانتدا هاوئاهەنگ بێت. خۆبەڕێوەبردن مەسەلەیەك نییە زۆر پەیوەست بێت بە شوێنەکەوە.**

**لەراستیدا ئەوە توانای باش خۆبەڕێوەبردنە کە چۆنێتی و تەنانەت بونی خولقاندنی دووەم دیاری دەکات. بەڕێوەبردن، بریتییە لە تێکوپێك شکاندن و شیتاڵ کردنەوەو رێکخستنەوە و پراکتیزە کردنی نیوەی چەپی مێشك کە پێویستە لە کاتێکی دیاریکراودا کۆنترۆڵی خود بکاتەوە. لێرەدا هەمیشە من ئەو حیکمەتە دوبارە دەکەمەوە کە دەڵێت: بەڕێوەیەرایەتیکردن لە چەپەوەیەو سەرکردایەتیکردنیش لەراستەوە.**

## هێزی ویستی سەربەخۆ

**بێجگە لە بەخششەکانی خۆناسین و خەیاڵ و ویژدان، بەخشیشێکی دیکە ویستی سەربەخۆیە هەر ئەمەیە وادەکات خۆبەڕێوەبردنی کاریگەرانە کارێکی کردەنی بێت. ویستی سەربەخۆ بریتییە لە توانای بڕیاردان و هەڵبژاردنی هەڵوێستی گونجاو و رەفتارکردن بەپێی ئەو هەڵوێست و بڕیارانە. واتا، توانای کاریگەربوونە، نەك ئەوەی بکەویتە ژێر کاریگەریەکانەوە. بریتییە لەوەی بە هاوکاری سێ توخمەکەی دیکە ئەو بەرنامەیە بە رێکوپێکی جێبەجێ بکەین کە خۆمان دامانڕشتووە. لەراستیدا ویستی مرۆڤ شتێکی سەرسوڕهێنە. هەمیشە دەیسەلمێنێت کە دەتوانێت بەسەر بارودۆخە هەرە سەختەکانیشدا زاڵ ببێت. خێزانی هیلین کیلەر، کە خێزانێکی ئەم دنیایەی خۆمانە بە شێوەیەکی بەلگەنەویست هێزی ویستی سەربەخۆی روونکردەوە.**

**ئێمە ئەگەر بە وردی ئەم بەخششە شرۆڤە بکەین دەبینین کە هەمیشە هەر هەوڵێکی نائاسایی و هەست پێکردن نییە کە لە تەمەندا یەکجار بە شێوەیەکی دراماتیکی رووبدات و سەرکەوتنی هەمیشەیی بەدەستبهێنێت. بەڵکو هێزەکە لەوەوە دێت کە فێر ببین چۆن ئەم نیعمەتە گەورەیە لە بڕیارەکانی ژیانی رۆژانەماندا بەکاربهێنین.**

**پێوەری راستەقینەی ئاستی ویستی سەربەخۆمان لە ژیانی رۆژانەماندا ئەوەیە**

کە تا چەند سەرڕاست و دەست پاکین. سەرڕاستییش لە بنەڕەتدا ئەو نرخەیە کە لەسەر خۆمانی دادەنێین، واتە بریتییە لەوەی کە چۆن بەڵێن دەدەین و بەجیّ دەهێنین، بریتییە لەوەی قسەو کردارمان یەکێك بن، بریتییە لەوەی کە لەگەڵ خۆماندا شەرافەتمەند بین. ئەمەش بەشێکی بنەڕەتی ڕەوشتی کەسایەتی و گەوهەری نەشونماکردنی ئەرێنییە.

بەڕێوەبردنی کاریگەر، ئەوەیە گرنگتر بخەیتە پێش گرنگەوە. لەکاتێکدا کە (سەرکردایەتی) شتە هەرە گرنگەکان دیاری دەکات، (بەڕێوەبەرایەتی) دەیانخاتە پێشەوە. ڕۆژ بەڕۆژ و چرکە بەچرکە. بەڕێوەبردن، بریتییە لە دیسپلین و جێبەجیّکردنی.

دیسپلین، وشەیەکی ئینگلیزییە لە (دیسپڵ Diseple)ەوە هاتووە. واتا لایەنگر و موریدو شوێنکەوتو- شوێنکەوتوی فەلسەفەیەك، یاخود کۆمەڵە پرنسیپێك، یان کۆمەڵە بەهایەك بۆ مەبەستێکی گەورە یاخود ئامانجێکی ئاسایی یاخود بۆ کەسێك کە نوێنەری ئامانجەکە بێت.

بە گوزارشتێکی دیکە، تۆ ئەگەر بەڕێوەبەرێکی کاریگەری خودی خۆت بیت، ئەوا دیسپلینەکەت هەڵقوڵاوی ناخی تۆتە. کردارێکە لە ویستی سەربەخۆی خۆتەوە هەڵقوڵاوە، چونکە تۆ موریدو شوێنکەوتوی بەها سەقامیگرەکانی قوڵایی ناخی خۆت و سەرچاوە بەرهەمهێنەرەکانی ئەو بەهاو بنەمایانەیت. هەروەها بایی هێندەش ویست و سەرڕاستیت تێدایە مەزاج و هەست و پاڵنەرەکانت بخەیتە ژێر کۆنترۆڵی ئەو بەهاو بنەمایانەوە.

یەکێك لە وتارە هەرە پەسەندکراوەکان بەلای منەوە وتارەکەی (ئی. ئێم. گرەی)یە بە ناونیشانی (کۆڵکە هاوبەشە باوەکەی سەرکەوتن). (گرەی) ژیانی خۆی تەرخان کرد بۆ دۆزینەوەی ئەو کۆڵکە هاوبەشە تاقانەیەی کە هەمو مرۆڤە سەرکەوتووەکان تیایدا هاوبەشن و بۆی دەرکەوت کە نە ڕەنجکێشانە و نە پەیوەندی هەلپەرستانەیە و نە شانس و ناوچەوانە. ئەمانە هەمویان گرنگن لە سەرکەوتندا، بەڵام ئەوەی کە لە هەموان گرنگتر و کاریگەرترە لە گەوهەری خووی سێیەمدا ئەمەیە: گرنگتر بخەرە پێش گرنگەوە.

(گرەی) بۆی دەرکەوت "خەڵکە سەرکەوتووەکان ئەو کارانە ئەنجام دەدەن کە مرۆڤی شکستخواردو حەزی لێ ناکەن". سەرکەوتووەکان کارەکە هەر لەبەر ئەوە ئەنجام نادەن کە پێویستە، بەڵکو لەبەر ئەوەی لای ئەوان ئامانج و مەبەست لە رق و حەزپێنەکردن بەهێزترن.

زاڵکردنی مەسەلەیەك بەسەر مەسەلەیەکی دیکەدا وا پێویست دەکات مەبەستێك و ئەرکێك و هەستێکی روون و ئاشکرای وەکو خووی دووەم هەبێت. پێویستە (بەڵێ)یەکی هێندە کڵپەسەندوو لە ناختدا هەبێت کە توانات بداتێ بە مەسەلەکانی دیکە بڵێیت "نەخێر". ئەم زاڵکردنە هەروەها پێویستیشی بە ویستێکی سەربەخۆ هەیە، هێزی ئەوەی کە کارێك حەزیشت لێی نەبێت، بەڵام ئەنجامی بدەیت، هێزی ئەوەی کە جێبەجێکاری بەهاکانت بیت لەبری ئەوەی جێبەجێکاری پاڵنەر و ئارەزووە کاتییەکانی چرکەساتێکی دیاریکراو بیت. هێزی کارکردنە لە کاتێکدا کە پابەندی راهێنانە ئەرێنی‌یە یەکەمەکەی خۆت بیت.

## چوار شێوازەکەی بەڕێوەبردنی کات

سێیەمین خوو فێرمان دەکات چۆن هەڵسوکەوت بکەین لەگەڵ پرسیارە گرنگەکانی ژیان و مەسەلەی بەڕێوەبردنی کاتدا. جا من لەبەرئەوەی توێژەرێکی دێرینی ئەم بوارە خۆش و دڵڕفێنەم، ئەو باوەڕەم لا دروست بووە کە دەتوانرێت چاکترین رێگا بۆ بەڕێوەبردنی کات لەم رستەیەدا کورت بکرێتەوە: "لە چوارچێوەی ریزبەندبونی مەسەلەکاندا کاتی خۆت رێك بخەو ئەرکەکان جێبەجێ بکە". ئەم رستەیە گوزارشتە لە چۆنێتی گەشەکردنی چوار تیۆری (چوارنەوەی) بەڕێوەبردنی کات. پێویستە ئەوەش بزانین کە گرنگیدان بە زانینی باشترین رێگا بۆ بەڕێوەبردنی کات کۆمەڵێك رێکارو کەسەرەو شێوازی لێ کەوتۆتەوە.

خۆ بەڕێوەبردنیش، وەك زۆرێك لە چالاکیە مرۆڤایەتییەکانی دیکە گەلێك بازدانی گەشەسازیی گەورەی لەخۆ گرتووە کە نوسەرێکی وەکو (ئالڤین تۆفلەر) ناوی لێ ناوە (شەپۆلەکان). ئەم شەپۆلانەش شوێن یەکتری دەکەون و هەریەکەیشیان رەهەندێکی نوێ و گرنگی دەخاتە سەر. بۆ نمونە، لە بواری گەشەکردنی کۆمەڵایەتیدا، شۆڕشی پیشەسازی بەدوای شۆڕشی کشتوکاڵیدا هات و بەدوای ئەویشدا

**شۆڕشـی زانیارییـەکان هـات. هـەر شـەپۆلێکیش کـە دێـت مەودایـەکی فـراوان دەخولقێنێت بۆ گەشەکردن لەسەر ئاستی کۆمەڵ و تاکەکاندا.**

**بەهەمان شێوەیەش لـە بـواری بـەڕێوەبردنی کاتـدا، هـەمو نەوەیـەك ریـزە خشتی زیاتر دەخاتە سەر ئەو بینایەی کە نەوەکەی پێش خۆی دروستی کردووە و دەرەنجامی هەموشیان ئەوەیە ئێمە زیاتر و زیاتر کۆنترۆڵی ژیانی خۆمان بکەین. دەتوانین بڵێین کە شەپۆلی یەکەم یاخود نـەوەی یەکەم خەسڵەتەکانی بریتی بون لە یادداشتەکان و فۆڕمەکانی پێداچوونەوە. مەبەستەکەش لەم هەوڵە ئەوەبو شێوازێك لە تێگەیشتن و تایبەتمەندێتی ببەخشرێت بە زۆربەی داواکارییەکانی سەرشانی کات و توانای ئێمە.**

**خەسڵەتەکانی نەوەی دووەم، بریتین لە ساڵنامەکان و خشتەی چاوپێکەوتنەکان. ئـەم شـەپۆلە ڕەنگدانـەوەی چـیـیە؟ ڕەنگدانـەوەی هـەوڵی تەماشاکردنی ئاینـدە و ریزبەندکردنی چالاکی و ڕووداوەکانی داهاتووە.**

**نەوەی سێیەم ڕەنگدانـەوەی بـواری ئێستایە بـۆ بـەڕێوەبردنی کات. بیرۆکەیـەکی دیکـە دەخاتـە سـەر نـەوەکانی پـێش خـۆی. ئـەم بیرۆکـە گرنگـە مەسـەلەی ریزبەنـدکردنی مەسـەلە بایەخـدارەکان و ڕوونکردنـەوەی بـەهاکان و بـەراوردکردنی بایەخی چالاکییەکانە لەسەر بناغەی پەیوەندییان بەو بنەماو بەهایانەوە. سەرباری ئەمانـەش نـەوەی سـێیەم بایـەخی تایبـەت دەدات بـە دیـاریکردنی ئامانجـەکان — ئامـانجی دیـاریکراوی کـورت و مامناوەنـد و درێژخایـەن کـە دیـارە لـەپێناو بەدیهێنانیانـدا وزەو کـات تـەرخان دەکـرێ بـە هاوئاهـەنگی لەگـەڵ بەهاکانـدا. جگە لـەوەش ئـەم نەوەیـە بیرۆکـەی نەخشەکێشـانی ڕۆژانـە لـەخۆ دەگرێـت و پلانـی دیاریکراویش دادەنێـت بـۆ بـەدیهێنانی ئـەو چـالاکی و ئامانجانـەی کـە بڕیـار وایـە بایەخی گەورەیان هەبێت.**

**هەرچەندە ئەم نەوەی سێیەمە بەشداری بەرچاوی کرد لـە مەسـەلەی پێشخستنی بـەڕێوەبردنی کاتـدا، بـەڵام خـەڵك وردە وردە درکیـان بـەوەکرد کـە (کاریگـەرێتی) خشتەدانان و کۆنترۆڵکردنی کات زۆرجار ئەنجامە خوازراوەکان دوادەخات. چونکە بایەخـدانی زۆر بـە (شـارەزایی) هـەڵی ئـەوە لـەناو دەبـات کـە بـرەو بـە پەیوەندییـە سودمەندەکان بدرێت و پێویستییە مرۆییەکان بەدی بهێنرێت و چێژ لە چرکەساتە خۆڕسکەکانی ڕۆژانە وەربگیرێت.**

لەئەنجامدا زۆرکەس کەوتنە نارەزایی دەربڕین لە بەرنامەکانی بەڕێوەبردنی کات و لەوکەسانەش کە نەخشەکانیان ئەمانی وا لێ کردووە زیاد لە پێویست لەناو خشتەکاندا شەتەك بدرێن. لەبەرئەوە هەمو شتێکیان خستە پشت گوێ و گەڕانەوە بۆ تەکنیکەکانی نەوەی یەکەم و نەوەی دووەم لەپێناوی پاراستنی پەیوەندییەکان و جۆرە خۆڕسکییەکەی ژیان.

لەمەوە ئیتر نەوەی چوارەم سەری هەڵدا کە لەروی چۆنێتیەوە بایەخێکی زۆری هەیە. نەوەی چوارەم دەزانێت کە زاراوەی (بەڕێوەبردنی کات) قسەیەکی هەڵەیە — چونکە کێشەکە لە بەڕێوەبردنی کاتدا نییە، بەڵکو لە بەڕێوەبردنی خودی خۆماندایە.

رازیبون لە شتێك دەرەنجامی دوو مەسەلەیە: پێشبینی کردن و بەدیهێنان. ئەم پێشبینیکردنەش (رازیبونە)ش لەناو بازنەی دەوروتەئسیری خۆماندایە.

پێشبینییەکانی نەوەی چوارەم لەبری جەختکردنەسەر (شتەکان) و (کات) جەخت دەکاتە سەر پاراستن و بەرجەستەکردنی (پەیوەندییەکان) و بەدیهێنانی (ئامانجەکان). واتە بە کورتییەکەی جەخت دەکاتە سەر پاراستنی هاوسەنگی لەنێوان بەرهەم و توانای بەرهەمهێناندا.

## چوارگۆشەی ژمارە (٢)

ئەو بایەخە سەرەکییەی کە خەسڵەتی نەوەی چوارەمی بەڕێوەبردنی کاتە دەتوانرێت لە خشتەی (خانەکانی بەڕێوەبردنی کات)دا روون بکرێتەوە (لاپەڕەی داهاتو). بە شێوەیەکی بنەڕەتی ئێمە کات لە یەکێك لەم چوار رێگەیەی خوارەوەدا بەسەر دەبەین.

وەك دەبینیت ئەو دوو فاکتەرەی کە سروشتی هەر چالاکییەك دیاری دەکەن بریتین لە (پەلە) و (گرنگ). (پەلە) مانای وایە کارەکە گرنگیپێدانی دەستبەجێی پێویستە. ئێستا دەبێت وەڵامی بدەینەوە، چونکە کارەکە پەلەیەو یەکسەر کارمان تێدەکات. زەنگی تەلەفۆن مەسەلەیەکی پەلەیە. هەندێك کەس تەنانەت ناتوانن بیر لەوەش بکەنەوە کە گوێ نەدەنە زەنگی تەلەفۆن و وەڵامی نەدەنەوە.

زۆر ئاساییە چەندین سەعات خەریکی ئامادەکردنی پێویستیەکانی بابەتێك بیت، یان خۆت بگۆڕیت و بەڕێ بکەویت بەرەو نوسینگەی کەسێك بۆ تاوتوێکردنی مەسەلەیەك، بەلام هەر کە زەنگی تەلەفۆنەکەی لێی دا، دەستبەجێ وەلامی ئەو دەداتەوە و پێش سەردانەکەی تۆ دەخرێت.

## خانەکانی بەڕێوەبردنی کات

| پەلەیە | پەلە نییە |
|---|---|
| (١) چالاکییەکان<br>قەیرانی کتوپڕ، گیروگرفتی کاریگەر، وادەی رادەستکردنی پرۆژەکان | (٢) چالاکییەکان<br>پلان، ئامادەکاری، خۆپاراستن، دروستکردنی پەیوەندییەکان، خولقاندن، دیاریکردنی هەلی نوێ. |
| (٣) چالاکییەکان<br>قسە پێبڕین، هەندێ تەلەفۆن و نامە، هەندێك راپۆرت، هەندێك کۆبونەوەی بێسود، بابەتی هەنوکەیی، چالاکییە کۆمەلایەتیەکان. | (٤) چالاکییەکان<br>تەلەفۆنی ناو بەناو. هەندێك نوسراو و نامەی فەرمی. بەسەربردنی کات. چالاکیی خۆش |

تۆ ئەگەر تەلەفۆن بۆ کەسێك بکەیت، کەم جار رێك دەکەوێت کەسەکە بلێت: "خۆم لە ماوەی پانزە خولەکەدا پەیوەندییت پێوە دەکەمەوە. تکایە چاوەڕوان بە" بەلام زۆر ئاساییە ماوەیەکی دوورودرێژ لە نوسینگەکەیدا ناچارت بکات چاوەڕوان بیت تا ئەو بە تەلەفۆن قسەکانی لەگەڵ کەسێکی دیکەدا تەواو دەکات.

مەسەلە "پەلە"کان هەمیشە ئاشکران. گوشارمان دەخەنە سەرو ناچارمان دەکەن رێوشوێنێك بگرینەبەر. ئەم جۆرە بابەت و کارانە بە شێوەیەکی گشتی مایەی بایەخ و گرنگیپێدانی خەلکن. هەمیشە لەبەرچاومانن و ئەنجامدانیان دەبێتە مایەی خۆشحالی و رازیبونمان. بەلام لە زۆربەی زۆری حالەتەکاندا شتی گرنگ نین.

لەلایەکی دیکەوە، بایەخ دەبێت پەیوەست بێت بە ئەنجامەوە. ئەو مەسەلەیە گرنگە کە شتێك دەخاتە سەر ئەرك و بەهاکانت و سەر ئامانجە هەرە گرنگەکانت.

ئێمە لەبەرامبەر کارە بەپەلەکاندا کاردانەوە دەنوێنین. بەڵام بابەتە گرنگەکانی کە پەلەنین پێویستیان بە ئەرێنی و دەستپێشخەریی زیاتر هەیە و دەبێت کارێکی وا بکەین فرسەتەکانمان لەکیس نەچن، (بەوەی مەسەلەکان رووبدەن). ئەگەر خووی ژمارە (٢) پەیرەو نەکەین و بە روونی و ئاشکرا نەزانین کام مەسەلەیە گرنگە و ئێمە لە ژیاندا ئارەزومەندیی کام ئەنجامەین، ئەوا بە ئاسانی وامان لێ دێت کە هەر وەڵامی شتی پەلە بدەینەوە.

تکایە چەند چرکەیەك تەماشای هەرچوار چوارگۆشەکەی خشتەی خانەکانی بەڕێوەبردن بکە. دەبینیت چوارگۆشەی یەکەم ئەو مەسەلانە لەخۆدەگرێت کە هەم گرنگیشن و هەم (پەلە)شن. هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەو ئەنجامە گرنگانەدا دەکات کە پێویستیان بە بایەخدانی دەستبەجێیە. ئێمە چالاکییەکانی ناو ئەم چوارگۆشەیە (چوارگۆشەی یەکەم) ناودەنێین (قەیرانەکان) یاخود (کێشەکان). دیارە هەریەکێکیش لە ئێمە لە ژیانیدا هەندێك لەم بابەت و چالاکییانەی دێنە رێ. بەڵام ئەم چوارگۆشەیە زۆر کەس دەخوات، بەتایبەت ئەوانەی کە ئەرکیان چارەسەری قەیرانە، یاخود بەرهەمەکەیان بە جۆرێکە (وادە) تیایدا زۆر گرنگە، یاخود ئەوانەی کە ئەقڵیان هەر لەلای کێشەو گیروگرفتە.

سروشتی ئەم چوارگۆشەیە وایە، هەتا بایەخی زیاتری پێ بدەیت ئەو گەورەتر و گەورەتر دەبێت و دەگاتە ئاستێك کە کۆنترڵت بکات. وەك شەپۆل و زریان وایە. گیروگرفتێکی گەورەیە، دێت و دەتدا بە زەویدا و هێزت لەبەر دەبڕێت. خۆ ئەگەر بەرەنگاریشی ببیتەوە، ئەوا کاتێك کە گیروگرفتێکی دیکەت هاتەڕێ، ئەمیش لەگەڵیدا پەلامارت دەداتەوە و جارێکی دیکە تەختی زەویەکەت دەکات.

هەندێك کەس رۆژانە زەبری راستەقینەیان بەردەکەوێت لەلایەن گیروگرفتەکانەوە. لەبەر ئەوە تاقە دەرفەتێك لەبەردەمیاندا ئەوەیە رابکەن بۆ ئەو چالاکییانەی کە نە گرنگن و نە پەلەشن، واتە بۆ چالاکییەکانی چوارگۆشەی ژمارە (٤). بۆیە کە تەماشای خشتەی خانەکانیان دەکەیت، دەبینیت (٩٠٪)ی کاتەکەیان لە

چوارگۆشەی یەکەمدایە و بەشێکی زۆری ڕێژەکەی کە ماوەتەوە لەناو چوارگۆشەی چوارەمدا بەسەری دەبەن و تەنیا بایەخێکی زۆر زۆرکەم دەدەن بە چوارگۆشەکانی دووەم و سێیەم. ئەمە بەسەرهاتی ئەو کەسانەیە کە ژیانیان لە قەیراندا بەسەردەبەن.

| ٢ | ١- ئەنجامەکان<br>* خۆماندوکردن<br>* سوتان<br>* بەڕێوەبردنی قەیرانەکان<br>* هەمیشە سەرقاڵی کوژاندنەوەی ئاگرەکانە. |
| --- | --- |
| ٤ | |
| ٣ | |

جۆرێکی دیکەی خەڵك ئەوانەن کە بەشێکی زۆری کاتەکەیان خەریکی ئەو بابەتانەن کە پەلەن بەڵام گرنگ نین، واتە لە چوارگۆشەی سێیەمدا، بەڵام وا دەزانن کە لە چوارگۆشەی یەکەمدان. هەڵسوکەوت لەگەڵ شتی پەلەدا دەکەن، وا دەزانن کە گرنگیشن. بەڵام لەراستیدا ئیشەکان بۆیە ئەم بەپەلەیان دەزانێت چونکە بەرامبەرەکە ئەو ریزبەندی و پێشبینییەی بۆ داناوە.

| ٢ | ١ |
| --- | --- |
| ٤ | ٣- ئەنجامەکان:<br>* بایەخدانی کەمخایەن<br>* بەڕێوەبردنی قەیران<br>* خاوەنی ناوبانگ و کەسایەتییەکی مەزاجی<br>* ئامانج و پلانەکانی لا بێهودەیە<br>* خۆی بە قوربانییەکی بێ دەسەلات دەزانێت<br>* پەیوەندییەکی روکەش و شکستخواردو |

ئەو کەسەی کە زۆربەی زۆری کاتی خۆی لە چوارگۆشەکانی سێیەم و چوارەمدا بەسەر دەبات ناتوانێت بەرپرسیارێتی بگرێتە ئەستۆ

| ١ | ٢ |
| --- | --- |
| ٣ ئەنجامەکان:<br>* نابەرپرسیارێتی تەواو<br>* زوو زوو لەسەرکار لادەبرێت<br>* پشت بە خەڵکی و لایەنی دیکە دەبەستێت لە مەسەلە بنەڕەتییەکاندا | ٤ |

مرۆڤی کاریگەر دووردەکەوێتەوە لە چوارگۆشەکانی سێیەم و چوارەم. چونکە بابەتەکانیان، پەلەبن یان پەلە نەبن، گرنگ نین. هەروەها قەبارەی چوارگۆشەی یەکەمیش تا ئەوپەڕی توانا کەم دەکاتەوە بەوەی کە زۆرترین کات لە چوارگۆشەی دووەمدا بمێنێتەوە.

چوارگۆشەی دووەم کرۆکی خۆبەڕێوەبردنی کاریگەرە. هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەو مەسەلانەدا دەکات کە پەلە نین بەڵام گرنگن، بۆ نمونە دروستکردنی پەیوەندییەکان، تۆمارکردنی پەیامە تایبەتەکەی ژیانیان، نەخشەکێشان بۆ مەودایەکی دوور، ئەنجامدانی راهێنانی وەرزشی، پاراستن چاکڕاگرتنی، ئامادەکردن و هەمو ئەو شتانەی کە ئێمە دەزانین گرنگن، بەڵام کاتیان بۆ تەرخان ناکەین چونکە پەلەنین.

٢

**ئەنجامەکان:**

- **بینینی گۆشەنیگا (مەبەست)**
- **هاوسەنگی**
- **دیسپلین**
- **کۆنترۆڵکردن**
- **قەیرانی کەمتر**

**ئێمە ئەگەر لە گۆشەنیگای (پیتەر دراکەر)ەوە تەماشا بکەین دەڵێین کەسانی کاریگەر مێشکی خۆیان بە گیروگرفتەکانەوە خەریك ناکەن، بەڵکو سەرقاڵی ئەوە دەبن چۆن فرسەتەکان بقۆزنەوە. کاروکردەوەیان بۆ گونجاندنی فرسەت و لەناوبردنی گیروگرفتەکانە. بیرکردنەوەیان بیرکردنەوەیەکی خۆپارێزییە. خەڵکی کاریگەر قەیران و مەسەلە هەنوکەییە گرنگەکانی چوارگۆشەی یەکەم فەرامۆش ناکەن کە بایەخی دەستبەجێیان دەوێت، بەڵام ژمارەی ئەو قەیران و مەسەلە هەنوکەییانە بە بەراورد بە مەسەلەکانی دیکە کەمە. مرۆڤی کاریگەر هەوڵ دەدات هاوتەریبی بەرهەم و توانای بەرهەمهێنان بپارێزێت، ئەویش لەڕێی بایەخدان بەوەی کە گرنگە، بەڵام پەلە نییە. هەروەها بەو چالاکییانەش کە دەکەونە چوارگۆشەی دووەمەوە و تواناکانی مرۆڤ زیاد دەکەن بەوەی کە ورەو ویستێکی بەرزیان تێدایە.**

**بە ڕەچاوکردنی خشتەی خانەکانی بەڕێوەبردنی کات، بۆ چرکەساتێك بحەسێرەوە و بیر لە وەڵامەکانت بکەرەوە. کە بۆ پرسیارەکانی سەرەتای ئەم بەشەی کتێبەکەت داناون. کام چوارگۆشەیەیان بۆ دەبێت؟ ئایا گرنگن یاخود پەلەن؟**

**من چوارگۆشەی ژمارە (٢) بەگونجاو دەزانم بۆیان. لە گرنگ دەچن، بەڵام پەلە نین. مادام پەلە نین، ئەنجامیان نادەیت.**

**ئێستاش سەرلەنوێ بیر لە سروشتی ئەو پرسیارانە بکەرەوە: ئەو تاقە شتە**

چیە کە لە ژیانی پیشەیی و تایبەتی خۆتدا دەتوانیت ئەنجامی بدەیت و ئەگەر لەسەر بناغەیەکی ڕێك‌وپێك ئەنجامی بدەیت، جیاوازییەکی ئەرێنی مەزن لە ژیانتدا دروست دەکات؟ چالاکییەکانی چوارگۆشەی دووەم ئەم کاریگەرییەیان هەیە. مرۆڤ بە ئەنجامدانی ئەم چالاکییانە دەتوانێت لەڕووی چۆنایەتییەوە قەڵەمبازی گەورە بدات.

* * *

پێشتریش هەمان پرسیارم ئاراستەی کۆمەڵێك بەڕێوەبەری سەنتەرێکی کاڵافرۆشتن کرد: ئەو تاقە ئیشە چیە کە دەزانن ئەگەر ئەنجامی بدەن کاریگەری زۆر ئەرێنی گەورە لەسەر ئەنجامەکانتان بەجێ دەهێڵێت؟ "وەڵامی هەمویان لە چوارچێوەی دروستکردنی پەیوەندی کاریگەر و دۆستانەدا بوو لەگەڵ کرێچی و خاوەن موڵکەکاندا. ئەمەش چالاکییەکە دەکەوێتە ناو چوارگۆشەی دووەمەوە.

دوایی شرۆڤەی ئەو ماوەیەمان کرد کە ئەمان تاکو ئێستا بۆ ئەو چالاکییە تەرخانیان کردووە. دەرکەوت ماوەکە کەمترە لە ڕێژەی ٥٪. هەریەکەش هۆکار و گیروگرفتی خۆی هەبو کە بۆچی ماوەیەکی هێندە کەمی بۆ ئەم مەسەلەیە داناوە. دەبو ڕاپۆرت ئامادە بکەن و ئامادەی کۆبونەوەکان ببن و وەڵامی نوسراوەکان بدەنەوە و تەلەفۆن بکەن و چەندین جار لەکاتی ئیشدا ئیشەکەیان پێ‌بڕدراوە. بە کورتییەکەی، چوارگۆشەی یەکەم زۆربەی کاتی ئەوانی داگیرکردبوو.

ماوەیەکی زۆر کەمیان لەگەڵ بەڕێوەبەرانی فرۆشگاکاندا بەسەردەبرد. ماوەکەش بە بابەتی نەرێنییەوە دەکوژرا. تاقە هۆکارێك کە ناچاری دەکردن سەردانی بەڕێوەبەرەکان بکەن جێبەجێکردنی گرێبەستەکان و وەرگرتنی کرێ خانووەکان و گفتوگۆکردن بو دەربارەی ڕیکلام و مەسەلەکانی دیکەی لە دەرەوەی ڕێنماییەکانی فرۆشگاکەدا بون.

کرێچییەکانی فرۆشگاکان بە زەحمەت دەیانتوانی پارێزگاری لە مانەوەی خۆیان بکەن. ئەوە هیچ کە گەشەیان نەدەکرد، کێشەی کرێکار و خەرجی و ئەنبارکردن و دەیان کێشەی دیکەیان هەبو. زۆربەشیان هیچ شارەزاییەکی وایان نەبو لە مەسەلە کارگێڕییەکاندا. هەندێکیان هەرچەندە بازرگانی باش بون، بەڵام پێویستیان بە

هاوکاریکردن هەبو. کرێچی‌یەکان زۆر رقیان لە خاوەن فرۆشگاکان بو، حەزیان نەدەکرد چارەیان ببینن، چونکە بە سەرچاوەی یەکێك لە کێشەکانیان دەزانین.

خاوەن فرۆشگاکان بڕیاریان دا ئەرێنی بن لەگەڵیاندا. ئامانج و بەهاو مەسەلە گرنگەکانی خۆیان دەستنیشان کردو لە روانگەی ئەمەوە بڕیاریان دا سێ‌یەکی (⅓ی) کاتی خۆیان بۆ چاککردنی پەیوەندییەکانیان تەرخان بکەن لەگەڵ کرێچییەکاندا.

لە ماوەی ئەو ساڵ‌ونیوەی من کارم لەگەڵ ئەو دەزگایەدا کرد، سەرنجم دا ماوەکەیان بەرزکردەوە بۆ ٢٠٪ کاتی خۆیان، ئەمەش چوارقاتی جاران بو. سەرباری ئەمەش رۆڵی خۆیان گۆڕی. بوونە گوێگر و راهێنەر و راوێژکاری کرێچییەکانیان و وزەیەکی ئەرێنی گەورە باڵی کێشا بەسەر مامەڵە هاوبەشەکانیاندا.

دەرەنجامەکە شتێکی زۆر قوڵ و کاریگەر بو. لەڕێی بایەخدان بە پەیوەندی و ئەنجامەکانەوە (نەك بە رێکار و کات) ژمارەکان بەرزبونەوە: کرێچییەکان سەرسام بون بە ئەنجامەکان کە ئەم شارەزایی و بیرۆکە تازانە خولقاندیان. بەڕێوەبەری فرۆشگاکانیش لە جاران چالاکتر و رازیتر بون. دۆخەکە وای لێ هات خەڵکێکی زۆر داوا بکات ببنە کرێچی بە کرێی زیاتر، چونکە فرۆشگاکان جوڵەی باشیان تێکەوتبو. ئیتر بەڕێوەبەرەکان وازیان لەوە هێنا رۆڵی پۆلیس و چاودێری رووبەروو بگێڕن. لەجیاتی ئەمە، بوونە هاوکار و چارەساز.

تۆ ئەگەر خوێندکاری زانکۆ بیت، یاخود کرێکاری کارخانەیەك بیت، یاخود بەڕێوەبەری کۆمپانیایەك بیت، یان ژنی ماڵەوە بیت، یاخود پسپۆڕێکی جلوبەرگ بیت، بە باوەڕی من مەسەلەکە هیچ جیاوازییەك دروست ناکات و ئەگەر بتەوێت بەدوای ئەو شتانەدا بگەڕێیت کە لەناو چوارگۆشەی دووەمدان، هەمیشە هەر هەمان ئەنجامت دەستگیر دەبێت. ئەم چوارگۆشەیە توانا و وزەی مرۆڤ زیاد دەکات و کێشە و قەیرانەکانیش تا ئەو ئاستە کەم دەکاتەوە کە بتوانرێن کۆنترۆڵ بکرێن. چونکە تەنیا بایەخ بە رەگ‌وریشەکان دەدەیت و ئەو هەنگاوە خۆپارێزییانە دەگریتە بەر کە لە پەلەی یەکەمدا ناهێڵن دۆخەکە بگاتە سنوری قەیران. ئەمەش لە زانستی کارگێڕی و بەڕێوەبردنی کاتدا پێی دەوترێت (پرنسیپی باریتۆ) کە دەڵێت:

٨٠٪ی ئەنجامەکان بەرهەمی ٢٠٪ی چالاکییەکانن.

## چی تێدەچێت بڵێی (نە ء) ؟

لە سەرەتادا مرۆڤ دەتوانێت تەنیا لە چوارگۆشەکانی (سێیەم) و (چوارەم) کات بۆ چوارگۆشەی (دووەم) دابین بکات، چونکە بابەتە هەنوکەیی و پەلەکانی چوارگۆشەی یەکەم قابیلی پشتگوێخستن نین، هەرچەندە وردە وردە بە گەورەبونی چوارگۆشەی دووەم، ئەو چوارگۆشەیە بچوك دەبێتەوە، بەڵام سەرەتا (ماوە)ی مانەوە لە چوارگۆشەی دووەمدا سەرچاوەکەی لە هەردوو چوارگۆشەی سێیەم و چوارەمەوەیە.

سروشتی چوارگۆشەکانی (سێیەم) و (یەکەم) ئەوەیە ئەوان کاردەکەنە سەر تۆ، لەبەرئەوە مرۆڤی ئەرێنی لە چوارگۆشەی دووەمدا کاردەکات. تۆ ئەگەر بتەوێت بە مەسەلە گرنگەکانی ناو چوارگۆشەی دووەم بڵێیت (بەڵێ)، پێویستە فێری ئەوە ببیت بە چالاکییەکانی دیکە بڵێیت (نەخێر)، کە هەندێکیان بە ئاشکرا شتی پەلەن.

ماوەیەك لەمەوبەر داوا لە هاوسەرەکەم کرا سەرۆکایەتی لیژنەیەك بکات کە ئەرکێکی کۆمەڵایەتی پێ سپێردرابو .. لەراستیدا هاوسەرەکەم خۆی ئەوکاتە هەندێك کاری گرنگی هەبو کە خەریکیان بو. لەبەر ئەوە حەزی لێ نەبو سەرۆکایەتی لیژنەکە بکات، بەڵام هەستی کرد کەوتۆتە ژێر گوشارێکی بەهێزەوە، بۆیە لە کۆتاییدا قبوڵی کرد.

پاشان داوای لە هاوڕێیەکی زۆر نزیکی خۆی کرد لە لیژنەکەدا هاوکاری بکات .. هاوڕێیەکە چاك چاك گوێی لە هاوسەرەکەم گرت و ئینجا پێی وت: "ساندرا، لەراستیدا، ئەم کارە لە پڕۆژەیەکی سەرنجڕاکێش دەچێت و ئەوە دەهێنێت مرۆڤ بەشداری تێدا بکات. من زۆر رێزو پێزانینم هەیە بۆ بانگهێشتەکەت کە داوام لێ دەکەیت ببمە بەشێك لەو پڕۆژەیە. ئەمە شکۆیەکی گەورەیە بۆ من. بەڵام لەبەر کۆمەڵێك هۆکار بەشداری تێدا ناکەم، بەس پێم خۆشە بزانیت کە من سوپاسی بانگهێشتنەکردنەکەت دەکەم.

کەچی ساندرا بە پێچەوانەوە، هەرگیز نەیدەتوانی بڵێت (نە). کە ئەم بەسەرهاتەی بۆ گێڕامەوە، بەدەم هەناسەیەکی قوڵەوە وتی "حەزم دەکرد ئەو (نە) من بموتایە".

مەبەستی من ئەوە نییە کە نابێت مرۆڤ لە پڕۆژەی خزمەتگوزاری گرنگدا

بەشداری بکات. ئەمانە بابەتی گرنگن. بەڵام پێویستە خۆت بڕیار بدەیت لەسەر مەسەلە هەرە گرنگەکانی ژیانت. پێویستە ئازایەتی ئەوەت تێدابێت، بە ڕوویەکی خۆش و بێ هیچ تەریقییەك بە شتەکانی دیکە بڵێیت (نەخێر). ئەمەش کاتێك مەیسەر دەبێت کە (بەڵێ)یەکی گەورە لەناو ناختدا وەکو مەشخەڵ داگیرسابێت. هەمیشە شتی (باش) شتی (باشتر)مان لێ دەشارێتەوە. مرۆڤ لە ژیانیدا هەمیشە بە شتێك دەڵێت (نەخێر). جا ئەگەر ئەو (نەخێر)ە بۆ بابەتە ئاشکراو پەلەکانی ژیانت نەبن، ئەوا ئەگەری زۆر هەیە، بۆ مەسەلە هەرە گرنگتر و بنەڕەتییەکانی ژیانت بن. هەرچەندە کارە پەلەکە کارێکی باشیش بێت، بەڵام ڕێی تێدەچێت ئەوکارە باشە کارێکی هەرە باشت لێ بشارێتەوە و نەهێڵێت ڕۆڵی بێ هاوتای خۆتی تێدا بگێڕیت.

من ئەو ماوەیەی کە بەڕێوەبەری پەیوەندییە زانکۆییەکان بوم لە یەکێك لە زانکۆ گەورەکان، نوسەرێکم دامەزراند کە زۆر داهێنەر و ئەرێنی و بەهرەدار بو. چەند مانگێك بەسەر دامەزراندەکەیدا تێپەڕیبو کە ڕۆژێکیان چومە نوسینگەکەی و داوام لێ کرد هەندێك ئیشم بۆ ئەنجام بدات کە پەلەبون و گوشاری زۆریان خستبووە سەرم.

وتی: "ستیڤن، تۆ هەرچییەکم داوا لێ بکەیت بۆت دەکەم، بەڵام با هەندێك شتت بۆ باس بکەم"

پاشان ئەو بۆردەی نیشان دام کە ناونیشانی دوو دەرزەن پرۆژەی لەسەر نوسرابو کە ئەم بە وردی کاری لەسەردەکردن. کابرا بەڕاستی خاوەنی ئەوپەڕی دیسپیلین بو، هەر ئەمەش بو وای لێ کرد بچم ئەو داوایەی لێ بکەم. پێی وتم: "ئەگەر دەتەوێت کارێك ئەنجام بدرێت، بیسپێرە بە کەسێکی سەرقاڵ".

دیارە من بە قسەیم نەکرد چونکە حەزم نەدەکرد ئەو بەرپرسیارێتییە بگرمە ئەستۆ و گیروگرفت بۆ یەکێك لە کارمەندە هەرە چالاك و پڕ بەرهەمەکانمان دروست بکەم تەنیا لەبەر ئەوەی من لەوکاتەدا بەرپرسیاری چارەسەرکردنی قەیرانەکان بوم. کارەکانی کە دەمویست ئەنجام بدرێت پەلە بون بەڵام گرنگ نەبون. لەبەر ئەوەی کەسێکی دیکەم دۆزییەوە و ئەرکەکەم بەو سپارد.

ئێمە ڕۆژانە چەندین جار بە (بەڵێ) و (نەخێر) وەڵامی شتەکان دەدەینەوە. بونی سەنتەرێکی تایبەت بە پرنسیپە ڕاستەکان و جەختکردنە سەر ئەرکەکانی

خۆمان حیکمەتی ئەوەمان پێ دەبەخشن بتوانین ئەو بڕیارانە بە چاکی جێبەجێ بکەین.

من لەگەڵ هەرکەسێکدا کاربکەم هەمیشە ئەو ڕاستییەی بیردەخەمەوە کە کرۆکی کاتی کاریگەر و ڕێکخستنی ژیان ئەوەیە بە هاوسەنگییەکی تەواوە ئەرکە گرنگەکان ڕیزبەندی بکەیت و ئەنجامیان بدەیت. ئینجا ئەم پرسیارە دەکەم: ئەگەر پێت بڵێن پێویستە هەڵەیەك بکەیت، ئەو هەڵەیە لە چ بوارێکدا دەکەیت؟

١. نەتوانیت ڕیزبەندی بابەتەکان بکەیت بەپێی گرنگییان؟

٢. نەتوانیت بەپێی ئەو ڕیزبەندییە خۆت ڕێك بخەیت؟

٣. بۆ جێبەجێکردنیان هیچ دیسپلینێکت نەبێت؟

زۆرکەس وادەزانن کێشەی هەرە گەورەیان نەبونی دیسپلینە، بەڵام ئەگەر بە قوڵی بیری لێ بکەینەوە دەبینین مەسەلەکە وا نییە. کێشە بنەڕەتییەکە لەوەدایە کە ئەو ڕیزبەندییە بە قوڵیی نەچەسپیوەتە دڵ و مێشکییانەوە. واتە لە ناخەوە خووی ژمارە (٢) تێنەگەیشتون.

خەڵکێکی زۆر، پێ بزانن یان نەزانن، ددان بەوەدا دەنێن کە چالاکییەکانی چوارگۆشەی دووەم لە ژیانیاندا گرنگن و هەوڵ دەدەن بایەخی سەرەکی بەو چالاکییانە بدەن، بەڵام تەنیا لەڕێی دیسپلینەوە. دیارە ئەمەش بەس نییە، چونکە مرۆڤ ئەگەر خاوەنی سەنتەرێك نەبێت تایبەت بە پرنسیپەکان و ئەگەر لە ناخی خۆیدا گرنگی ئەرکەکە نەزانێت، ناتوانێت ببێتە خاوەنی ئەو بناغە پتەوەی کە بەرگەی هەوڵ و ماندوبوونەکان بگرێت. ئەمەش وەکو ئەوە وایە هەر تەماشای گەڵاکان بکەیت، تەماشای هەڵوێست و ڕێچکەکان، بێ ئەوەی تەنانەت بیر لەوە بکەیتەوە کە تەماشایەکی ڕەگەکان بکەیت، تەماشای ئەو پارادیمانەی کە سەرچاوەی ڕەفتار و ڕێچکەکانن.

جەختکردنە سەر چوارگۆشەی دووەم، پارادیمێکە لە سەنتەری پرنسیپەکانەوە هەڵدەقوڵێت.. ئەگەر هۆکارە دەرەکییەکانی وەکو هاوسەرو پارەو هاوڕێو خۆشگوزەرانی سەنتەرەکەت بن، ئەوا بە دڵنیاییەوە بەردەوام فڕێ دەدرێیتەوە ناو چوارگۆشەکانی یەکەم و سێیەم، واتە ژیانت تەنیا بریتیی دەبێت لە کاردانەوە

بەرامبەر هێزە دەرەکییەکانی کە بونەتە سەنتەری ژیانت. تەنانەت ئەگەر خودی خۆیشت کردبێتە سەنتەر، لە کۆتاییدا هەر دەگەڕێیتەوە سەر چوارگۆشەکانی یەکەم و سێیەم و دەکەویتە ژێر کاریگەرییەکانی ئەو چرکەساتە. کەواتە سەربەخۆیی بە تەنیا بەس نییە بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێت خۆی رێك بخات دژی سەنتەرەکەی خۆی.

لە ئەندازەی بیناسازیدا حیکمەتێك هەیە دەڵێت شێوە حوکم بەسەر ناوەڕۆکدا دەدات. بەهەمان حیکمەتیش دەتوانیت بڵێیت رابەرایەتی حوکم بەسەر کارگێڕیدا دەدات. واتە رابەرایەتیکردن دیاری دەکات. شێوازی کارگێڕییەکە چۆن بێت. شێوازی بەڕێوەبردنی کات پەیوەستە بەوەوە چۆن دەڕوانیتە کات و چۆن دەڕوانیتە ریزبەندییەکانت. ئەگەر مەسەلە هەرە گرنگەکانی بەلای تۆوە ئەوانە بن کە هەڵقوڵاوی سەنتەری پرنسیپەکان و پەیامە تایبەتەکەی خۆتن و لە قوڵایی مێشك و دڵتدان، ئەوا چوارگۆشەی دووەم دەبێتە شوێنە سروشتییەکە و جێگای سەرمایەگوزاریکردنی کاتەکانت.

مرۆڤ ئەگەر تیشکی (بەڵێ)یەکی گەورە لە ناخیدا نەدرەوشیتەوە مەحاڵە بتوانێت بە چوارگۆشەی سێیەم و چوارەم بڵێت نەخێر .. سێیەم لەبەرئەوەی چوارگۆشەیەکی زۆر باوەو چوارەمیش لەبەرئەوەی زۆر بەتامو چێژە. درەوشانەوەی ئەو (بەڵێ) بەهێزە لە ناخی مرۆڤدا زۆر زۆر گرنگە بۆ ئەوەی بتوانێت ببێتە خاوەنی ئەو ویستە سەربەخۆیەی کە بتوانێت بەدەم زەردەخەنەیەکی راستگۆوە بە مەسەلە ناگرنگەکان بڵێت نەخێر.

## چۆن بچینە چوارگۆشەی دووەمەوە؟

ئەگەر چالاکییەکانی چوارگۆشەی دووەم بە ئاشکرا کرۆکی ئەو شێوە خۆبەڕێوەبردنە کاریگەرە بن کە (شتە گرنگەکان) بخەمە پێشی پێشەوە، کەواتە رێوشوێنی رێکخستن و جێبەجێکردنی ئەو شتانە چین؟

دیارە شێوازی یەکەمی (نەوەی یەکەمی) داڕێژەرانی بەڕێوەبردنی کات تەنانەت نەشیاندەزانی ریزبەندیکردن یەعنی چی. کاری ئەوان تەنیا بریتی بو لە ئامادەکردن و پێشکەشکردنی لیست و فۆڕمی ئەو کارانەی کە دەیانکەین و دەتوانین رەتیان بکەینەوە، هەروەها هەمو کاتێکیش کە مەسەلەیەکمان رەت دەکردەوە، ئەم

شێوازی کات بەڕێوەبردنە هەستی سەرکەوتنی پێ دەبەخشین. بەڵام لەم شێوازەدا لیستی بابەتەکان هیچ پەیوەندییەکی بە گرنگییانەوە نەبو .. جگە لەوەش هیچ پەیوەندییەك نەبو لەنێوان ناوەڕۆکی لیستەکەو بنەما سەرەکییەکانمان و ئامانجی کۆتاییمان لە ژیاندا. مەسەلەکە بە سادەیی ئەمەبو: هەرشتێك هەستی پێ بکەین و بەڕواڵەت وا پێویستە کە ئەنجام بدرێت، کاردانەوە لەلامان دروست دەکات.

زۆرکەس لە پارادیمی نەوەی یەکەمەوە تەماشای کارگێڕیی دەکەن چونکە ڕێبازەکە کەمترین بەرهەڵستیی تێدایە. نە ئازاری هەیە و نە نیگەرانی، بەڵکو ڕێبازێکی بەتامە و دەڵێت (لەگەڵ ڕەوتەکەدا بڕۆ) و سیستم و پرۆگرامە سەپێنراوەکانی دەرەوە دەهێنێت تا ئەو هەستەت بداتێ کە ئەنجامەکان تۆ لێیان بەرپرسیارنیت.

بەڵام بەڕێوەبەرانی نەوەی یەکەم، بەپێی پێناسەکە، کەسانی کاریگەر نین و بەرهەمێکی زۆر کەمیان هەیە و شێوازی ژیانیان هیچ شتێکیان پێ نابەخشێت توانای بەرهەمهێنانیان بەرزبکەنەوە. لەبەرابەرمبەر هێزە دەرەکییەکانیش، هەمیشە وا تەماشایان دەکرێت کە ئەمانە بەکەڵکی بەرپرسیارێتی نایەن و پشتیان پێ نابەسترێت و هێزی خۆکۆنترۆڵکردنیان لاوازەو زۆر بە چاکیش نرخی خۆیان نازانن.

بەڵام نەوەی دووەمی بەڕێوەبەرەکان، لەڕێی نەخشەو خشتەی پێشوەختەوە زیاتر کۆنترۆڵیان بەدەستەوەیە و بە رواڵەتیش وا دەردەکەون کە زیاتر بەرپرسیارێتی دەگرنە ئەستۆ، چونکە کاتێك کە پێویستت پێیان دەبێت، دەیانبینیت.

بەڵام کێشەی ئەمانیش، دیسانەوە ئەوەیە کە ڕیزبەندیکردنی تیا نییە بەپێی بایەخی ئیشەکان و پیەوەندییش نابینیت لەنێوان ئەو ئیشارەتەو بەهاو ئامانجە قوڵەکاندا. دەستکەوتەکان هەمیشە بچوکن و بەپێی خشتەکەن.

نەوەی سێیەمی بەڕێوەبەران هەنگاوێك پێشترکەوتون. بنەماو ئامانجەکانیان دیاریکراوە و نەخشەکانیان بەپێی خشتەیەکی ڕۆژانە دادەنێت و چالاکییە هەرە گرنگەکانیشیان دەستنیشان دەکەن.

وەك پێشتر روونم کردەوە، حاڵی حازر، ئەم شێوازە لە زۆربەی بوارەکانی کارگێڕیدا پەیڕەو دەکرێت. ئەم نەوەی سێیەمە هەندێ کۆسپ و تەگەرەشی لە

ڕێدایە. یەکێك لەوانە سنورداربونی ئاسۆیە، چونکە نەخشەکێشانی ڕۆژانە زۆرجار وا دەکات مەسەلە گرنگەکان نەبینین کە پێویستە لە ڕوانگەی ئاسۆیەکی فراوانترەوە تەماشایان بکەیت. تەنانەت خودی زاراوەکەش (پلانـدانانی ڕۆژانە) جەخت لەسەر مەسەلە پەلەکان دەکاتەوە، لەسەر ئێستا. ڕاستە ئەم شێوازی کارگێڕییە کە پشت بە پرنسیپی ڕیزبەندکردنی بابەتەکان دەدات، چالاکییەکان دەخاتە چوارچێوەی سیستمەوە، بەڵام کارێك ناکات لە پلەی یەکەمدا بایەخ بە گرنگیی چالاکییەکان بدرێت — واتە بابەتەکان لەسەر بنەمای پرنسیپ و پەیامی کەسەکەو ڕۆڵ و ئامانجەکان ڕیزبەندی ناکەن. بەم شێوەیە میتۆدی نەوەی سێیەم لە پلانی ڕۆژانەدا، لە بنەڕەتدا بایەخی سەرەکی بە کێشەو قەیرانی ڕۆژانەی چوارگۆشەکانی (یەکەم) و (سێیەم) دەدات.

بێجگە لەم خاڵەش، نەوەی سێیەم نەیتوانیوە بایەخ بە هاوسەنگی بدات لەنێوان ڕۆڵە کارگێڕییەکاندا. ئەم ناواقیعیبونە وای کردووە کە زیاد لە پێویست بایەخ بە پلانی ڕۆژانە بدرێت، ئەمەش دۆخێك لە نائومێدی و بێ باوەڕی دروست دەکات و هانی کەسەکە دەدات تا دەتوانێت لە پلانەکە دووربکەوێتەوە و ڕابکاتە چوارگۆشەی چوارەم. هەروەها ئەم جەختکردنە زۆرەی سەر چالاکییەکان وا دەکات پەیوەندییەکان ناسەقامگیربن.

هەرچەندە ئەم سێ شێوازی کارگێڕییە هەرسێکیان بە شێوەیەك لە شێوەکان دەزانن کە پێویستە میکانیزمێك هەبێت بۆ بەڕێوەبردن، بەڵام هیچکامیان نەیتوانیوە ئەو ئامرازە پێشکەش بکات کە شێوازی چوارگۆشەی دووەمە و هێزێکی وا بە کەسەکە دەبەخشێت بتوانێت مێتۆدێك پەیڕەو بکات پەیوەست ببێت بە پرنسیپەکانەوە. فۆڕم و یاداشتەکانی (ئەرکەکان)ی نەوەی یەکەم تەنیا فێری ئەوەمان دەکات دەست بگرین بەو ئەرکانەوە و لەبیریان نەکەین. ساڵنامە و دەفتەری وادەکانیش کە خەسڵەتێکی سەرەکی نەوەی دووەمە تەنیا فێری ئەوەمان دەکات لە شوێن و کاتی دیاریکراودا ئامادەبین.

سەبارەت بە نەوەی سێیەمیش، کە هەرچەندە سیستمێکی فراوانی هەیە لە بابەت و لە خەڵکی نەخشەکێش و بە شێوەیەکی سەرەکیش پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت خەڵکەکە هاوکاری یەکتریی بکەن لە داڕشتنی بابەت و

چالاکییەکانی هەردوو چوارگۆشەی یەکەم و سێیەمدا و هەروەها سەرباری ئەوەش کە زۆربەی راهێنەر و راوێژکارەکان گرنگیی چالاکییەکانی چوارگۆشەی دووەم دەزانن، بەڵام ئامرازەکانی نەخشەکێشانی ئەم شێوازی سێیەمە ناتوانێت پرۆسەی رێکخستن و جێبەجێکردنەکە بەوشێوەیە دەستەبەر بکات کە ئاوازەکان لە خزمەتیاندا بن.

هەمو نەوەیەك لەو شێوە کارگێڕیانە شتێك دەخاتە سەر دەستکەوتی نەوەکەی پێش خۆی و لە ئاکامدا هێزەکان و هەندێك لە کەرەسەکانی ئەم سێ نەوەیە بونەتە کەرەسەی خاو بۆ نەوەی چوارەم. بەڵام هێشتا پێویستییەکی زیاتر هەیە بۆ رەهەندێکی نوێ، بۆ ئەو پارادیم و شێوازە پراکتیکییەی کە توانامان پێ دەبەخشێت بەرەو چوارگۆشەی دووەم بەڕێ بکەوین و جەخت بخەینە سەر پرنسیپەکان و لەپێناوی ئەنجامی باشتر و گرنگتردا خۆمان بەڕێوەببەین.

## کەرەسەکانی چوارگۆشەی دووەم

مەبەست لە بەڕێوەبردنی چوارگۆشەی دووەم ئەوەیە چالاکییەکانی ژیانمان کاریگەرانە بەڕێوەببەین. چۆن؟ لەڕێی سەنتەری پرنسیپەکان و ناسینی ئەرکە بنەڕەتییەکان و بایەخدانی تەواو بەو مەسەلانەی کە هەم گرنگن و هەم پەلەشن و هەروەها بە پاراستنی هاوسەنگی نێوان زیادکردنی بەرهەم و زیادکردنی توانای بەرهەمهێنان.

ئەمە لەراستیدا ئامانجێکی بەرزە بۆ ئەو کەسانەی بونەتە دیلی ناودیوارە ئەستورەکانی مەسەلە وردەکانی هەردو چوارگۆشەی سێیەم و چوارەم. بەڵام خەباتکردنی راستەقینە بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجە کاریگەرییەکی مەزن لەسەر تواناکانی ئەوکەسە جێ دەهێڵێت. بۆ رێکخستنی چوارگۆشەی دووەم لەراستیدا پێویستە پابەندی شەش پێوەری گرنگ ببین.

**خۆڕاگری:** خۆڕاگری نیشانەی ئەوەیە کە هاوئاهەنگی و یەکپارچەیی و کامڵبون هەیە لەنێوان تێڕوانین و پەیامەکەتدا، لەنێوان رۆڵ و ئامانجەکانتدا، لەنێوان ریزبەندبونی مەسەلە گرنگەکان و پلانەکانت، لەنێوان ئارەزووەکانت و دیسپلینەکانتدا. هەروەها پێویستە پلانەکەشت شوێنێکی تێدابێت بۆ پەیامە

کەسێتییەکەی ژیانت بە جۆرێکی وا کە هەمو کاتێك بتوانیت بگەڕێیتەوە بۆی. هەروەها مەسەلەکە پێویستی بە شوێنێکیشە بۆ رۆڵ و ئامانجە هەنوکەیی و دوورمەوداکانت پێکەوە.

**هاوسەنگی:** پێویستە ئامرازەکە یارمەتیدەرت بێت بۆ راگرتنی هاوسەنگی لە ژیانتدا. یارمەتیدەرت بێت بۆ دیاریکردنی رۆڵە جۆراوجۆرەکانت و هەمیشە لەبەرچاوت بن، بۆ ئەوەی بوارە گرنگەکانی وەکو تەندروستیت و خێزانەکەت و پیشەکەت و پێشکەوتنە تایبەتەکانت فەرامۆش نەکەیت.

زۆرکەس وا هەست دەکەن سەرکەوتن لە بوارێکدا دەتوانێت قەرەبوی شکست لە بوارەکانی دیکەدا بکاتەوە. بەلام ئایا ئەمە وایە؟ رەنگە بۆ هەندێك بوار ئەمە تا کاتێکی دیاریکراو راست بێت. بەلام ئایا سەرکەوتنی مرۆڤ لە کارەکەیدا دەتوانێت قەرەبوی هاوسەرگیرییەکی خراپ بکاتەوە؟ دەتوانێت قەرەبوی ئەوە بکاتەوە تەندروستیت باش نەبێت یاخود قەرەبوی ئەوەی کەسایەتییەکی لاوازت هەیە؟ کاریگەرێتی راستەقینە پێویستی بە هاوسەنگی هەیە و ئەم ئامرازەش دەتوانێت یارمەتیت بدات لە خولقاندن و پاراستنی ئەو کاریگەرێتیەدا.

## فۆکەسکردنە سەر چوارگۆشەی دووەم

مرۆڤ پێویستی بە کەرەسەیەك هەیە ئازایەتی تێدا بچێنێت و هانی بدات و بە کردەوە هاوکاری بکات بۆ ئەوەی چەند پێویست بکات لە چوارگۆشەی دووەمدا بمێنێتەوە، تاکو بتوانێت رێ لە سەرهەڵدانی قەیرانەکان بگرێت نەك دواتر لە ناچاریدا ریزبەندییان بۆ بکات. بەرای من، باشترین رێگە بۆ بەدیهێنانی ئەم مەبەستە ئەوەیە "هەفتانە" ژیانت رێك بخەیت، لە هەمان کاتیشدا دەتوانیت خۆت بگونجێنیت و مەسەلەکانت رۆژانە دابنێیت، بەلام هێزە پاڵنەرە سەرەکییەکە هەر بریتیی بێت لە رێکخستنی هەفتانە.

ئەو هاوسەنگی و پێکەوە گونجانەی کە لە رێکخستنی هەفتانەوە بەدەست دێن زۆر زۆر لەوەی رێکخستنی رۆژانە زیاترن. وا دیارە هەموان تێگەیشتنێکی هاوبەشمان بۆ هەفتە هەیە وەك یەکەیەکی کامڵ و بێهاوتای کات، چونکە کۆمپانیاکان و پەروەردە و چالاکییەکانی دیکەی کۆمەڵگا لەسەر بناغەی هەفتە کاردەکەن و چەند

ڕۆژێک تەرخان دەکەن بۆ کارو سەرمایەگوزاریکردن و ڕۆژی دیکەش بۆ ڕامان و حەسانەوە. (لە ئایینە جیاجیاکانیشدا کە مەسەلەکانی لەسەر بناغەی هەفتە ڕێک خستووە، ڕۆژێک دیاریکراوە بۆ ئیسراحەت و حەوانەوە).

وەک وتمان زۆربەی زۆری خەڵکەکە لەسەر بناغەی ڕێکخستنی هەفتانە بیردەکەنەوە، بەڵام زۆربەی کەرەسە بەرنامەداڕێژراوەکانی نەوەی سێیەمیش جەخت لەسەر پلانەکانی ڕۆژانە دەکاتەوە. لەکاتێکدا ئەم نەخشانە ڕەنگە یارمەتیت بدەن بۆ ڕیزبەندیکردنی چالاکییەکانت، بەڵام بە شێوەیەکی بنەڕەتی تەنیا لە ڕێکخستنی قەیرانەکان و ئیشە کەڵەکەبووەکاندا دەتوانن یارمەتیت بدەن. کلیلی مەسەلەکە ئەوە نییە بابەتەکانی ناو خشتەکەت ڕیزبەندی بکەیت بەڵکو خشتەبەندکردنی مەسەلە گرنگەکانە. باشترین شێوازیش بۆ جێبەجێکردنی ئەمە ڕێکخستنی هەفتانەیە.

**ڕەهەندی خەڵک:** ئێمە تەنیا پێویستمان بە ئامرازێک نییە بۆ خشتەکانمان، بەڵکو کەرەسەیەکیشمان دەوێت بۆ ڕەفتارکردن لەگەڵ خەڵکیدا. ئەگەرچی بایەخدان بە کات و چۆنێتی ڕەفتارکردن لەگەڵیدا تواناکان بەرزدەکاتەوە، بەڵام ئەوانەی کە پابەندی بنەماکانن، خەڵکیان لەلا گرنگترە. بەم پێیە هەندێک جار ژیان لەناو چوارگۆشەی دووەمدا کە پابەندی بنەماکانە وا پێویست دەکات خشتەکەیان بکەین بە قوربانی خەڵک. کەرەسەکەش پێویستە ئەم بنەمایەی تیادا ڕەنگ بداتەوە و جێبەجێکردنەکە ئاسان بکات، نەک ئەوەی ئەگەر جارێک نەتوانرا خشتەکە بە وردی جێبەجێ بکرێت، تۆمەتیان بخەیتە پاڵ.

**نەرمی:** کەرەسەی نەخشەکێشانەکەت پێویستە نۆکەرت بێت نەک ئاغات. کەرەسەکە مادام کار بۆ تۆ دەکات کەواتە پێویستە بەپێی پێویستییەکانی تۆ و شێواز و ستایڵی تۆ داڕێژرابێت.

**توانای گواستنەوە:** مەرجێکی دیکەی کەرەسەکەت ئەوەیە کە بتوانیت زۆربەی کات لەگەڵ خۆتدا بیگێڕیت. ڕەنگە ئەوکاتە بوارت هەبێت چاو بە پەیامە تایبەتەکەتدا بخشێنیتەوە کاتێک کە لەناو پاصدایت. ڕەنگە پێویستت بەوە هەبێت دۆخێکی تازە بەراورد بکەیت بەوەی کە پێشتر پلانت بۆ داناوە. لەبەر ئەوە ئەگەر کەرەسەکەت قابیلی ئەوەبو بیگێڕیت ئەوە دەتوانیت هەمیشە و لە هەمو شوێنێک

سودی لێ ببینیت.

مادام چوارگۆشەی دووەم بە هەناوو کرۆکی خۆبەڕێوەبردن حساب دەکرێت، کەواتە مرۆڤ پێویستی بە ئامرازێکە بیخاتە ناو ئەو چوارگۆشەیەوە .. ئەزمونی کارکردنم لەسەر چەمکی نەوەی چوارەم توانای پێبەخشیوم کەرەسەیەك بدۆزمەوە کە بەپێی پێوەرەکانی سەرەوە تایبەتن بۆ ئەم مەسەلەیە. بەڵام دەشتوانرێت بە ئاسانی سود لە هەندێك کەرەسەی نەوەی سێیەمیش وەربگریت و ئەم مەبەستە دەستکاری بکرێت. لەم رووەوە گرنگ پرنسیپەکانە. ئەگەر پرنسیپەکان راست و دروست بن، ئەوا دەکرێت رێو شوێنی جۆراوجۆر بگیرێتە بەر، کە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە جیاوازە.

## چۆن دەبیتە خۆ – بەڕێوەبەرێکی چوارگۆشەی دووەم

هەرچەندە هەوڵی من لەم کتێبەدا باسکردنی پرنسیپەکانی کاریگەربوونە نەك مەسەلە پراکتیکییەکانی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕم وایە مرۆڤ دەتوانێت باشتر لە پرنسیپ و سروشتە رازاوەکەی نەوەی چوارەم تێبگات ئەگەر بەپێی بنەماکانی چوارگۆشەی دووەم رێکخستنی کاروباری هەفتەیەکی خۆی بە شێوەیەکی پراکتیکی تاقی بکاتەوە.

## رێکخستنی چوارگۆشەی ( دووەم ) چوار چالاکیی سەرەکی لەخۆ دەگرێت.

**دیاریکردنی رۆڵ.** یەکەم ئەرك دیاریکردنی رۆڵە جیاجیاکانی خۆتە لە ژیانتدا. یەکسەر کاغەز و قەڵەم بهێنەو دەست پێبکە. تۆ وەکو تاکێکی ناو کۆمەڵگا، رەهەند و رۆڵی جیاجیات هەیە. بۆ نمونە: باوك/ دایك، کوڕ/ کچیت، مام/ خاڵیت، هاوسەریت، ئامۆزا/ خاڵۆزایت، کچەزا/ کوڕەزایت، ....تاد. هەریەکەش لەم رۆڵە جیاوازانە ئەرك و بەرپرسیارێتی جیاوازی خستۆتە ئەستۆت. سەرباری ئەمانەش رەنگە ئەرك و بەرپرسیارێتی دیکەیشت هەبێت بەرامبەر کۆمەڵگاکەت (سیاسی/ ئایینی). مرۆڤ ئەگەر بتوانێت لەسەر بناغەی رێکخستنی هەفتانە ئەرك و بەرپرسیارێتییەکانی دیاری بکات دەتوانێت بەئاسانی و سەرکەوتوانە رۆڵە جیاجیاکانی سەرشانی بگێرێت و ئەو بوارانە بنوسێت کە لە هەفتەی ئایندەدا پێویستە کاتی خۆی بۆ تەرخان بکات.

**لە خوارەوە دوو نموونەت نیشان دەدرێت کە بەشێکی زۆری رۆڵە جیاجیاکانی لەخۆ گرتووە:**

**١. تاك**
**٢. هاوسەر / باوك و دایك**
**٣. بەڕێوەبەری بەرهەمهێنان**
**٤. بەڕێوەبەری لێکۆڵینەوە**
**٥. بەڕێوەبەری خۆیەتی**
**٦. بەڕێوەبەری کارگێڕی**
**٧. سەرۆکی ئەنجومەنی کۆمپانیای گواستنەوە**

**١. گەشەکردنی کەسێتی**
**٢. هاوسەر**
**٣. باوك و دایك**
**٤. دەلالی خانووبەرە**
**٥. خزمەتگوزاریی کۆمەلایەتی**
**٦. ئەندامی بۆردی تیمی کیمفۆنی**

**هەڵبژاردنی ئامانجەکان:** هەنگاوی داهاتوو ئەوەیە بیر لە یەك دوو ئەنجامی گرنگ بکەیتەوە کە بە پێویستی دەزانیت لە هەر رۆڵێك لەو رۆلانەدا لە حەوت رۆژی ئایندەدا ئەنجامیان بدەیت. ئەمانە وەکو ئەنجام تۆمار دەکرێن (تەماشای لاپەڕەی داهاتو بکە) پێویستە لانی کەم، هەندێك لەو ئامانجانە چالاکییەکانی چوارگۆشەی دووەم لەخۆ بگرن. ئەم ئامانجە هەفتانەییانە دەبەسترێن بە ئامانجە دوورمەوداکانتەوە. کە تۆ هاوڕێ لەگەڵ ئەرکەکانی ژیاندا دیاریت کردون. بەلام ئەگەر پەیامە تایبەتەکەی ژیانیشت نەنوسیبێت، هەر دەتوانیت بە هەست و سەلیقە، یەك دوو ئامانجی گرنگ بۆ هەر رۆڵێك دیاری بکەیت.

**خشتە بەندیکردن:** ئێستا کە دەزانیت ئامانجەکانت چین، دەتوانیت بڕوانیتە هەفتەکە و خشتەیەك دابنێیت بۆ جێبەجێکردنیان. بۆ نموونە، ئامانجەکەت ئامادەکردنی رەشنوسی پەیامەکەت بێت، دەتوانیت لە رۆژی هەینیدا یەك دوو سەعاتی بۆ تەرخان بکەیت دابنیشیت. بۆ ئەو مەبەستە: رۆژی هەینی (یان هەر رۆژێکی دیکەی کە بەهۆی هۆکارە ئایینی و ویژدانی‌یەکانەوە بەلاتەوە تایبەتن) زۆرجار رۆژێکی نموونەییە بۆ داڕشتنی بەرنامە هەرە تایبەتەکانت کە بە نیازیت ئەنجامیان بدەیت، لەوانەش رێکخستنی هەفتانە، کاتێکی گونجاوە. بۆ چاوخشاندنەوە و ئیلهام وەرگرتن و نمایشکردنی ژیانت لە چوارچێوەی پرنسیپ و بەهاکاندا.

ئەگەر ئامانجێکیشت ئەوەبێت لەڕێی وەرزشکردنەوە باری جەستەیی خۆت چاکتر بکەیت، رەنگە وا پێویست بکات لە هەفتەکەدا سێ چوار رۆژ، یاخود هەمو

ڕۆژەکان ڕۆژی سەعاتێك تەرخان بکەیت بۆ ئەو مەبەستە. دیارە ئەنجامی دیکەش هەن کە هەر لەکاتی کارکردنی فەرمیدا جێبەجێ دەبێت. ئەنجامی دیکەی وایش هەن کە هەر لە ڕۆژی (هەینی)دا دەتوانیت جێبەجێیان بکەیت، کە منداڵەکانت لە ماڵ بن. ئێستا دەزانیت بۆچی ڕێکخستنی هەفتانە لە ڕێکخستنی ڕۆژانە باشترە؟

پاش دیاریکردنی ڕۆڵە جیاجیاکان و دوای دانانی ئامانجەکان، دەتوانیت (بەپێی بایەخی ئامانجەکە یاخود ڕێی گونجانی کات و شوێنەکە) هەر ئامانجێك بخەیتە ڕۆژێکەوە. هەروەها دەتوانیت تەماشای ساڵنامە و دەفتەری یادداشتی مانگانەی خۆت بکەیت بۆ زانینی وادەکان و بەراوردکرنیان بە ئامانجەکانت. ئەگەر بڕیارت دا لە بابەتێکدا بەردەوام بیت، دەتوانیت خشتەبەندی نوێی بۆ بکەیت یاخود وادەکانی دیکە هەڵبوەشێنێتەوە.

بنواڕە ئەو خشتە هەفتانەیەی بەرامبەر. تێبینی چۆنێتی خشتەبەندیکردنی هەر نۆزدە ئامانجە هەرە گرنگەکان بکە — کە تایبەتن بە چوارگۆشەی دووەم — یاخود کراون بە بەرنامەی دیاریکراوی کار، هەروەها سەرنج لەو بازنەیەش بدە کە پێی دەوترێت (مشارەکەت تیژ بکەرەوە) و شوێنێکە بۆ نەخشەسازیکردنی ئەو چالاکییە گرنگانەی کە مرۆڤ نوێ دەکەنەوە لە بوارە جیاجیاکاندا و ئێمە لە خووی حەوتەمدا) بە وردی باسیان دەکەین.

| | |
|---|---|
| پێشکەوتنی تایبەتی کەسەکە | ڕەشنوسی یەکەمی پەیامی ژیان<br>تۆمارکردنی سیمینارێك<br>سەردانی هاوڕێیەك لە نەخۆشخانە |
| هاوسەر/ دایك و باوك | بلیتی کۆنسێرتەکەت بیرنەچێت<br>وانەی زانستی کوڕەکەت<br>پاسکیلی کچەکەت |
| بەڕێوەبەری نوێی بەرهەمهێنان | تاقیکردنەوەی بازار<br>تاقیکردنەوەی داواکارانی دامەزراندن<br>شرۆڤەکردنی ڕوپێوەکانی تایبەت بە کڕیارەکان |
| بەڕێوەبەری لێکۆڵینەوە | لێکۆڵینەوەی دوا ئەنجامی تاقیگا<br>تاوتوێکردنی کێشەکانی پەیوەندیی<br>پەیوەندیکردن بە فلان و فیسارە کەسەوە |
| بەڕێوەبەری خۆیەتی | چاوخشاندنەوە بە پۆستەکاندا<br>سەردانی بەشێك |
| بەڕێوەبەری کارگێڕی | ڕاپۆرتی کۆتایی مانگ<br>ڕاپۆرتی چاوخشاندنەوە بە موچەکاندا |
| سەرکۆی ئەنجومەنی کارگێڕی کۆمپانیای گواستنەوە | ئامادەکردنی ئەجیندای کار<br>ئامادەکردن بۆ سەردانێك<br>دەستکردن بە داڕشتنی پلانی ساڵی داهاتوو |

تەنانەت لەگەڵ تەرخانکردنی ئەوکاتەی کە لە ماوەی هەفتەیەکدا پێویستە هەر نۆزدە ئامانجە گرنگەکەی تیا جێبەجێ بکرێت، تەماشای ئەو پانتاییەی ناو خشتەکەش بکە کە بەتاڵە. ڕێکخستنی هەفتانەی چوارگۆچەی دووەم وەك چۆن هێزی ئەوەت پێ دەبەخشێت گرنگتر بخەیتە پێش گرنگەوە، لەهەمان کاتیشدا ئازادیی و دەستکراوەییت دەداتێ بۆ ڕووبەڕووبونەوەی ڕووداوە چاوەڕواننەکراوەکان و هەروەها بۆ گۆڕینەوەی وادەکان ئەگەر پێویستی کرد، هەروەها بۆ پتەوکردنی ڕەفتار و پەیوەندی لەگەڵ خەڵکیشدا و بۆ گوێگرتنی قوڵ لە ئەزمونە خۆڕسکەکانیان. ئەمانە هەمویان لەو ڕوانگەیەوەن بزانیت ڕێکخستنی هەفتانە بۆ ئەوەیە خزمەتی ئامانجە سەرەکییەکانی هەمو بوارەکانی ژیانت بکات.

## خۆراهێنانی ڕۆژانە

کە تۆ هەفتانە ئیش‌وکارەکانت ڕێك خست، ئیتر ڕێکخستنی ڕۆژانە زیاتر دەبێتە خۆراهێنانی ڕۆژانە بۆ ڕیزبەندیکردنی چالاکییەکان و وەڵامدانەوەی ڕووداوە پێشبینی نەکراوەکان و هی پەیوەندییەکان و ئەزمونەکان بە شێوەیەکی ماقوڵ.

ئەگەر هەمو بەیانییەك چەند خولەکێك تەرخان بکەیت بۆ چاوخشاندنەوە بە خشتەکەتدا، ئەمە دەتوانێت پەیوەستت بکات بەو بڕیارانەوە کە لە کاتی داڕشتنی خشتەی هەفتانەدا لەسەر بناغەی بەهاکان ڕاتگەیاندوون. بە وردبونەوە لە ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژە، دەبینیت ڕۆڵ و ئامانجەکانی تۆ لە ڕوانگەی هەستکردن بە هاوسەنگی ناوخۆوە مەسەلەکانت بە شێوەیەکی سروشتی بۆ ڕیزبەندی بکەن. ئەمانەش مادام هەڵقوڵاوی پەیامە تایبەتەکەی خۆتن ئاشناترن بە ڕۆحت و ڕاست و ڕەوانترن. ڕەنگە هەندێك کەس هێشتا وابزانن ئەو شێوازی ڕیزبەندیکردنەی کە ئەوەی سێیەم پەیڕەوی دەکات (١، ٢، ٣ یان أ، ب، ج) ڕێنمایی پێویست بۆ چالاکییەکانی ڕۆژانە دابین دەکات.

ئێمە ئەگەر ڕواڵەتییانە بیربکەینەوە و وا بزانین چالاکییەکان دژ بە یەکن خۆمان بە هەڵەدا دەبەین. مەرج نییە چالاکییەکە یان زۆر گرنگ بێت، یاخود بێبایەخ بێت. نەخێر خاڵە گەوهەرییەکە ئەوەیە چالاکییەکان پەیوەندییان پێکەوە هەیە و هەندێکیان لە هەندێکی دیکەیان گرنگترن. لە ڕێکخستنی

هەفتانـەدا، ریزبەندیکردنـەکانی ئـەوەی سـێیەم رێـکوپێکی دەبەخشێت بـە کـارو جەختی رۆژانە. بەڵام ئەگەر هەوڵبدەیت چالاکییەکان ریزبەنـدی بکـەیت تەنانـەت پـێش ئـەوەی بزانیـت چ پەیوەندییـەکیان هەیـە بـە پەیامـە تایبەتەکەتـەوە و چـۆن هاوئاهەنگ دەکرێن لەگەڵ هاوسەنگییەکانی ژیانتدا، هەوڵێکی بێهودە دەردەچێت، چونکە لـە ئـەرك و بابـەتی وادا نـوقم دەبیـت کـە حـەزی پێناکـەیت یـاخود هـیچ پێویستت پێی نییە.

من لـە ژیـانی خۆمـدا هێـزی ئـەو رێکخستنەم ئـەزمون کـردووە کـە پەیوەستە بـە پرنسیپەکانی چوارگۆشەی دووەمەوە. هەروەها بینیویشمە چۆن ژیـانی سـەدان کەسـی گۆڕیـوە. لەبـەر ئـەوە بـاوەڕی تـەواوم هەیـە کـە جیـاوازی زۆر، یـەکجار زۆرە لـەنێوان رێکخستنی هەفتانـە و رێکخسـتنی رۆژانـەدا .. دیـارە هـەتاکو ئامانجـە هەفتانەکـەیش پەیوەسـتترین بـە پەیامـە تایبەتەکـەمان و بـە پرنسـیپە راسـت و دروسـتەکانمانەوە، زیاتر و زیاتر کاریگەریمان لەسەر دروست دەکەن.

| خشتەی هەفتانە |
| --- |
| پێشکەوتنی تایبەتی کەسەکە: (١) ڕەشنوسی یەکەمی پەیامی ژیان (٢) تۆمارکردنی سیمینارێک (٣) سەردانی فرانك لە نەخۆشخانە |
| هاوسەر/ دایک و باوک: (٤) بلیتی کۆنسێرتەکەت بیرنەچێت (٥) وانەی زانستی کوڕەکەت (٦) پاسکیلی سارا (کچەکەت) |
| بەڕێوەبەری نوێی بەرهەمهێنان: (٧) تاقیکردنەوەی بازار (٨) تاقیکردنەوەی داواکارانی دامەزراندن (٩) شرۆڤەکردنی ڕوپێوەکانی تایبەت بە کڕیارەکان |
| بەڕێوەبەری لێکۆڵینەوە: (١٠) لێکۆڵینەوەی دوا ئەنجامی تاقیگا (١١) تاوتوێکردنی کێشەکانی پەیوەندیی (١٢) پەیوەندیکردن بە کین و پیتەر |
| بەڕێوەبەری خۆیەتی: (١٣) چاوخشاندنەوە بە پۆستەکاندا (١٤) سەردانی ساموێل |
| بەڕێوەبەری کارگێڕی: (١٥) ڕاپۆرتی کۆتایی مانگ (١٦) ڕاپۆرتی چاوخشاندنەوە بە موچەکاندا |
| سەرکۆی ئەنجومەنی کارگێڕی کۆمپانیای گواستنەوە: (١٧) ئامادەکردنی ئەجیندای کار (١٨) ئامادەکردن بۆ سەردانێك (١٩) دەستکردن بە داڕشتنی پلانی ساڵی داهاتوو |

**مشارەکە تیژبکەرەوە**

جەستەیی ______

هزری ______

ڕۆحی ______

کۆمەڵایەتی/ سۆزداریی ______

| هەفتە لە | یەکشەممە | دووشەممە |
| --- | --- | --- |
| | | ١٦ چاوخشاندنەوە بە موچەکاندا |
| | | |
| | | |
| | | |
| | | |
| | | |
| | | |
| | ٨ ١ کاتی تایبەت | ٨ |
| | ٩ ڕونکردنەوەی | ٩ |
| | ١٠ پەیامەکە | ١٠ |
| | ١١ | ١١ |
| | ١٢ | ١٢ چاوپێکەوتنەکان |
| | ١ | ١ |
| | ٢ | ٢ |
| | ٣ | ٣ |
| | ٤ | ٤ فرانك – نەخۆشخانە |
| | ٥ | ٥ |
| | ٦ | ٦ پاسکیلەکەی (سارا) |
| | ٧ | ٧ |
| | ٨ | ٨ |
| | ئێوارە | ئێوارە |

| سێ شەممە | چوارشەممە | پێنجشەممە | جومعە | شەممە |
|---|---|---|---|---|
| **گرنگییەکانی ئەو ڕۆژە** | | | | |
| (٢) ناردن | (١٢) کڕین و | | (١٤) سەردانی | |
| تۆمارکردنی کوڕ | پیتەر | | ساموێل | |
| | | | | |
| | | | | |
| | | | | |
| | | | | |
| | | | | |
| **وادەکان** | | | | |
| ٨ | ٨ | ٨ | ٨ کاتی تایبەت | ٨ |
| ٩ | ٩ (٧) تاقیکردنەوەی بازاڕ | ٩ (١١) پەیوەندییەکان | ٩ (١٠) ئەنجامی تاقیگاکان | ٩ |
| ١٠ | ١٠ بارودۆخی بازاڕ | ١٠ کێشەکان | ١٠ خوێندن | ١٠ ڕێکخستنی ماڵ و وانەکانی منداڵەکەت |
| ١١ | ١١ | ١١ | ١١ | ١١ |
| ١٢ | ١٢ (١٨) سەردانێک | ١٢ | ١٢ | ١٢ |
| ١ (٩) شرۆڤەکردنی ڕووپێوەکانی کڕیار | ١ | ١ | ١ | ١ |
| ٢ | ٢ | ٢ | ٢ | ٢ |
| ٣ | ٣ | ٣ | ٣ (١٥) ڕاپۆرتی سەری مانگ | ٣ |
| ٤ | ٤ | ٤ | ٤ | ٤ |
| ٥ | ٥ | ٥ چاوخشاندنەوە بە پۆستەکاندا | ٥ | ٥ |
| ٦ (٥) وانەی زانستی کوڕەکەت | ٦ | ٦ (٧) کۆمپانیای گەیاندن | ٦ | ٦ |
| ٧ | ٧ | ٧ ئەجێندای کار | ٧ | ٧ |
| ٨ | ٨ | ٨ (٩) پلانی ساڵی داهاتوو | ٨ | ٨ |
| | ئێوارە | ئێوارە | ئێوارە | ئێوارە<br>لەگەڵ خێزانی (براون)دا دەچینە شانۆ |




ڕێکخستنی درێژخایەن




ڕێکخستنی هەفتانە

## تێکەڵبونی دۆخەکە

ئەگەر بۆمان هەبێت زاراوەکانی کۆمپیوتەر بەکاربهێنین، دەتوانم بڵێم خووی یەکەم پێت دەڵێت: "داڕێژەری بەرنامەکە خۆتیت". خووی دووەم دەڵێت: "بەرنامەکە بنوسە"، خووی سێیەمیش دەڵێت: "بەرنامەکە بخەرەگەڕ" "تێکەڵی بەرنامەکە ببە" "لە بەرنامەکەدا بژی". ئەم جۆرە تێکەڵبون و تیاژیانەدا، لە بنەڕەتدا ئەرکێکە لەسەر ویستی سەربەخۆی ئێمە، لەسەر دیسپلین و یەکپارچەیی و پابەندبونمان – نەك لە پێناو خشتەو ئامانجە کورت مەوداکاندا، نەك لەبەر گوشارە هەنوکەییەکان، بەڵکو لەپێناو پرنسیپە چاکەکان و ئەو بەهاو بنەمایانەمان کە لە قوڵایی ناخماندا چەسپیون و واتاو پەیکەرێك دەبەخشن بە ئامانج و خشتەکانمان.

بە تێپەڕبونی ڕۆژەکانی هەفتە، دڵنیابە دەکەویتە کاتی واوە کە خۆڕاگری و یەکپارچەییت دەدرێن لە سەنگی مەحەك. دەبینیت ئەو ناوبانگەی کە وەڵامدانەوەی مەسەلە هەنوکەییە کەمبایەخەکانی چوارگۆچەی سێیەم، یاخود چێژ و خۆشحاڵیی مەسەلەکانی چوارگۆشەی چوارەم هەیانە وات لێ بکەن توخنی چالاکییە گرنگەکانی چوارگۆشەی دووەم نەکەویت کە پێشتر بەرنامەت بۆ دانابو. بەڵام ئەگەر هەمیشە

دڵت لای پرنسیپەکانت بێت و ویژدانێکی بێدار هەمیشە ئاڕاستەکارت بێت و بە باشی خۆت بناسیت، ئەوا بایی هێندە داناو ئاڕاستەکەر و سەلامەت دەبیت کە بتوانیت ویستی سەربەخۆی خۆت بکەیتە کارو خۆڕاگر و هەروەها یەکپارچە بیت لەئاست راستیەکاندا.

یەکێك لە کوڕەکانم، لە قۆناغێکدا تەواو سەرقاڵی چالاکی و خشتەبەندیکردن بوبو. رۆژێکیان خشتەیەکی زۆر سەختی هەبو. کە پڕبو لە کۆمەڵە ئەرکێکی زۆر وردو هەستیار، لەوانە کتێب کڕین و شۆردنی ئوتومبیلەکەی و گەیاندنی دەزگیرانەکەی و چەندین ئەرکی دیکە.

هەمو شتێك بەپێی خشتەکە دەڕۆیشت بەڕێوە، هەتا وادەکەی (کارۆل)ی دەزگیرانی هات. کوڕەکەم دەمێك بو ئەم کچەی نیشانە کردبو، بەڵام دواجار گەیشتە ئەو باوەڕەی کە پەیوەندییەکەیان کەڵکی نابێت، لەبەر ئەوە بڕیاری دا ماوەی دە پانزە خولەك بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵدا بکات و مەسەلەکەی پێ رابگەیەنێت.

بەڵام چونکە مەسەلەکە بۆ (کارۆل) زۆر قورس و باوەڕنەکردنی بو، سەعاتونیوێك زیاتر دوای دەستپێکردنی تەلەفۆنەکە، هێشتا بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵدا دەکراو گفتوگۆشیان زۆر توندو پەرێشان. تەنانەت دوای ئەوەش، مەسەلەکە بەیەك دیدار تەواو نەبو، چونکە هەڵوێستەکە بۆ هەردوکیان مایەی ئەوپەڕی نائومێدیی بو.

کەواتە پێویستە جیاوازی نێوان "مرۆڤ" و "کەرەسەی بێگیان" بزانین. مرۆڤ "لێهاتووی" و "کاریگەریی" هەیە، بەڵام کەرەسەکە بێگیانەکان "توانا"یان هەیە. من زۆرجار هەوڵم داوە "بە توانا" بم لەگەڵ کەسەکەی بەرامبەردا کە بیروبۆچونی جیاوازم هەبووە لەگەڵیدا. بەڵام هیچم بە هیچ نەکردووە. هەوڵم داوە بۆ چارەسەرکردنی کێشەیەکی دیاریکراو "کاتی گونجاو" بۆ کەسەکە تەرخان بکەم بەڵام بۆم دەرکەوتووە کە ئەم "توانا"یە کێشەی تازەتر دروست دەکات و کەمجار مەسەلەکە دەگەیەنێتە ئەنجامی قوڵ.

زۆر دایك و باوکم بینیوە، بەتایبەت دایکان، کە هەستیان بە نائومێدی کردووە دەرهەق بە منداڵەکانیان چونکە نەیانتوانیوە ئامانجی گرنگیان بۆ بەدەست بهێنن و ئەوەی کردویانە تەنیا بەدیهێنانی پێویستییە سادەکانی رۆژانە بووە. پێویستە

بزانین کە نائومێدبوون بەرهەمی پێشبینییەکانمانە. پێشبینییەکانیش زیاتر لەوەی ڕەنگدانەوەی بابەت و بەهاکانمان بێت، ڕەنگدانەوەی ئاوێنە کۆمەڵایەتییەکەیە.

بەڵام ئەگەر خووی ژمارە (٢) لە قوڵایی مێشك و دڵتدا ڕەگی داکوتابێت، دەبینیت کە بەها باڵاکانت ڕاپێچت دەکەن و دەتوانیت خشتەبەندیکردنەکەت بخەیتە ژێر ڕکێفی بەهاکانتەوەو یەکپارچەیی و خۆڕاگرییەکەت بپارێزیت. هەروەها دەشتوانیت نەرم بیت، دەتوانیت خۆت ڕابهێنیت. لەبەر ئەوە ئەگەر نەتوانی خشتەکە جێبەجێ بکەیت یاخود ناچار بویت گۆڕانکاریی تێدا ئەنجام بدەیت، هەست بە کەمتەرخەمی و تاوان مەکە.

## پێشکەوتنەکانی نەوەی چوارەم

یەکێك لەو هۆکارانەی وای کردووە خەڵك دووربکەوێتەوە لە بەکارهێنانی ئامرازەکانی نەوەی سێیەم سەبارەت بە بەڕێوەبردنی کات ئەوەیە کە ئەو ئامرازانە خۆڕسك و خۆبەخۆ نین. ئامرازگەلێکی ڕەق وتەقی وان مرۆڤ دەکەنە کۆیلەی خشتەکان، چونکە پارادیمی ئەم شێوازی کات بەڕێوەبردنە هیچ هاوئاهەنگییەکی نی‌یە لەگەڵ ئەو پرنسیپەدا کە دەڵێت مرۆڤ لە شتەکان بایەخدارترە.

بەڵام ئامرازەکانی نەوەی چوارەم درکی بەم پرنسیپە کردووە. هەروەها درکی بەوەش کردووە کە شایستەترین کەس پێویست بێت بایەخی پێ بدەیت خۆتیت. کەرەسەکانی ئەم نەوەیە هانت دەدەن کاتی تەواو لەگەڵ چوارگۆشەی دووەمدا بەسەر ببەیت. هەروەها تێبگەیت و ژیانت بخەیتە چەقی پرنسیپەکانەوە و زۆر بە ئاشکراش گوزارشت لەو مەبەست و بنەمایانە بکەیت کە پێت خۆشە بڕیارەکانی ڕۆژانەت ئاراستە بکەن. ئەم کەرەسەیە یارمەتیت دەدات هاوسەنگی دروست بکەیت لە ژیانتدا چونکە لە کۆت و بەندەکانی پلاندانانی ڕۆژانە ڕزگارت دەکات و هاوکاریت دەکات هەفتانە کاروبارەکانت خشتەبەندی بکەیت. هەر کاتێکیش دژایەتی دروست بو لەنێوان نەخشەکەت و بەهایەکی باڵای تۆدا، ئەم کەرەسەیە توانات پێ دەبەخشێت هەست و ویژدانت بخەیتە گەڕ بۆ پابەندبون بەم مەبەست و بنەمایانەی کە بەلاتەوە گرنگترین بابەتن. واتە لەبری بەکارهێنانی نەخشە ڕێگا، قیبلە نما بەکاردەهێنیت.

بەم شێوەیە دەبینیت کە نەوەی چوارەمی خۆبەڕێوەبردن لە چوار رووەوە پێشی نەوەی سێیەمی داوەتەوە.

یەکەم رووی ئەم پێنج رووە ئەوەیە کە نەوەی چوارەم پرنسیپەکانی کردۆتە سەنتەر و لەبری ئەوەی تەنیا هەر بەدەم ستایشی چوارگۆشەی دووەم بکات، پارادیمێکی ناوەندی وا دەخولقێنێت کە بتوانێت لە روانگەی مەسەلە گرنگ و کاریگەرەکانەوە کات ببینێت.

رووی دووەم ئەوەیە کە ئەم نەوەیە پابەندی ویژدانەو بەمەش بوارت دەداتێ ژیانی خۆت بەگوێرەی ئەوپەڕی تواناکانت رێك بخەیت کە بگونجێت لەگەڵ بەها قوڵەکانی ناختدا. هەروەها هێندەش ئازادیت پێ دەبەخشێت بتوانیت خشتەکە بە نەرمی بخەیتە ژێر رکێفی بەها باڵاکانەوە.

مەسەلەی سێیەمیش ئەوەیە کە نەوەی چوارەم پەیامە تایبەتەکەت و بەهاو ئامانجە دوورەکانت دیاری دەکات. هەر ئەمەشە کە ئاڕاستەو ئامانجی رێگاکەت پێدەبەخشێت. ئەو رێگایەی کە هەر رۆژەی برێك کاتی خۆتی بۆ تەرخان دەکەیت.

رووی چوارەم ئەوەیە کە نەوەی چوارەم یارمەتیت دەدات ژیانت هاوسەنگ بکەیت لەڕێی دیاریکردنی رۆڵەکان و داڕشتنی ئامانجەکان و پرۆگرامکردنی رۆڵە سەرەکییەکان لە ماوەی هەفتەکەدا.

رووی پێنجەمیش تایبەتە بەوەی کە بوارێکی فراوانترت بۆ دەڕەخسێت لەڕێی پەیڕەوکردنی رێکخستنی هەفتەکە و ئەگەر پێویستیشی کرد رۆژانە بیگونجێنیت. ئەم بوارە فراوانە بەرهەمی ئەوەشە کە نەوەی چوارەم لە تێڕوانینە سنووردارە یەك رۆژییەکە رزگارت دەکات و دەتخاتە پێگەیەکەوە بتوانیت پەیوەندی بکەیت بە رەسەنترین بەهاکانتەوە ئەویش لەڕێی چاوخشاندنەوە بە رۆڵە سەرەکییەکانت.

دیارە ئەم پێنج رووە گرنگە پەتێك پێکیانەوە دەبەستێت کە بریتییە لەوەی لە پلەی یەکەمدا جەخت بکەیتە سەر پەیوەندییەکان و ئەنجامەکان، لە پلەی دووەمیشدا بایەخ بدەیت بە کات.

## سەرپشککردن: زیادکرنی بەرهەم و زیادکردنی توانای بەرهەمهێنان

ئێمە هەرکارێك کە تەواوی دەکەین لەڕێی سەرپشککردنەوە تەواوی دەکەین — چ سەرپشککردنی کات و چ سەرپشککردنی خەڵك. سەرپشککردنی کات لە خانەی (توانا)دایە، بەڵام ئەگەر سەرپشککردنەکەمان سەرپشککردنی خەڵکی دیکە بێت مانای وایە ئێمە مەبەستمان کاریگەرێتییە.

زۆرکەس پێیان باش نییە خەڵکی دیکە سەرپشك بکەن و ڕێیان پێبدەن و دەڵێن ئەمە بەفیڕۆدانی کات و خەسارکردنی رەنجە. ئەمانە باوەڕیان وایە کە خۆیان دەتوانن کارەکە باشتر جێبەجێ بکەن. بەڵام رەنگە تاکە چالاکی هەرە کاریگەر و رێپێدراو سەرپشککردن بێت. گواستنەوەی بەرپرسیارێتی بۆ کەسانی دیکەی شارەزاو مەشق پێکراو بوارت بۆ دەڕەخسێنێت تواناکانی خۆت بۆ کارو چالاکی گرنگتر تەرخان بکەیت. سەرپشککردن واتە گەشەکردن. گەشەکردنی تاك و گەشەکردنی دەزگاکان. (جەی. سی. پێنی) کۆچکردو وتویەتی چاکترین و حەکیمانەترین بڕیارێك کە لە ژیانمدا دابێتم ئەمە بو "ڕێی پێبدە بیکات". پاش ئەوەی کە بۆم دەرکەوتووە چیتر خۆم هەمو کارەکەم پێ ناکرێت.

ئەم بڕیارە، کە ماوەیەکی زۆری بەسەردا تێپەڕیووە، رۆڵی هەبووە لە گەورەبون و پێشکەوتنی سەدان کۆگا و هەزاران کەسدا.

سەرپشککردن لەبەرئەوەی پەیوەندی بە خەڵکی دیکەوە هەیە، یەکێکە لە سەرکەوتنە بەکۆمەڵەکان، لەبەرئەوە دەتوانین بیخەینە خووی چوارەمەوە. بەڵام چونکە ئێمە لێرەدا باسی پرنسیپەکانی خۆبەڕێوەبردن دەکەین و هەروەها مادام توانای سەرپشککردنی خەڵکانی دیکە جیاوازییە سەرەکییەکەی نێوان بەڕێوەبەر و بەرهەمهێنی سەربەخۆیە، کەواتە دەتوانیت سەرپشککردن (رێ پێدان) لە روانگەی تواناکانی خۆبەڕێوەبردنەوە باس بکەین.

بەرهەمهێن هەمو کارێك دەکات کە بە پێویستی بزانیت بۆ بەدیهێنانی ئەنجامە خوازراوەکان، لەپێناوی بەدەستهێنانی هێلکە ئاڵتونییەکاندا. لێرەوە دەتوانیت بڵێیت ئەو باوکەی کە حاجەت دەشۆرێت و ئەو ئەندازیارە تەلارسازەی کە نەخشەکان دەکێشێت و ئەو سکرتێرەی کە نوسراوەکان چاپ دەکات هەمویان بەرهەمهێنن.

بەڵام ئەگەر کەسەکە شتێکی وای دامەزراند کە بە کارکردن لەگەڵ یاخود لەڕێی کەسانی دیکەو دامودەزگای دیکەوە هێلکە ئاڵتونییەکان بەرهەم بهێنێت، ئەو کەسە بەپێی چەمکی هاوکاریکردنی خوڵقێنەر بەڕێوەبەرە. کەواتە ئەو باوکەی ڕێ بە منداڵەکەی دەدات قاپەکان بشوات بەڕێوبەرە، ئەو تەلارسازەش کە سەرۆکایەتی کۆمەڵێك ئەندازیاری تەلارساز دەکات بەڕێوەبەرە و ئەو سکرتێرەش کە سەرپەرشتی کۆمەڵێك سکرتێر و کارمەندی نوسینگە دەکات بەڕێوەبەری نوسینگەیە.

بەرهەمهێن دەتوانێت سەعاتێك سەرمایەگوزاری بکات لە هەوڵ و چالاکیدا و بڕێکی دیاریکراو بەرهەمی هەبێت بێ ئەوەی هیچ شتێك لە کاریگەرێتی خۆی کەم ببێتەوە.




لەلایەکی دیکەوە بەڕێوەبەر دەتوانێت هەر بەو سەعاتە سەرمایەگوزارییە، دەقات و پەنجا قات و سەد قاتی جاران بەرهەم بهێنێت لەڕێی سەرپشککردنی راستەقینەوە.




چونکە بەڕێوەبەرایەتی، لە گەوهەردا، بریتییە لە گواستنەوەی چەقی فورساییەکە تا ئەوپەڕی: سەرپشککردنیش کلیلی هەمو بەڕێوەبەرایەتیەکی کاریگەرە.

## دەسەڵاتپێدانی فەرماندە

دوو جۆری سەرەکی ڕێپێدان هەیە، "ڕێپێدانی فەرماندە" و "ڕێپێدان بە بەرپرسیارێتییەوە". ڕێپێدانی فەرماندە واتا: "بچۆ بۆ ئەوێ، ئاگات لەمە بێت، ئەمە بکە، ئەوە بکە، پێم بڵێ بزانم چیت کردووە". دیارە زۆربەی کەسانی بەرهەمهێن "ڕێپێدانی فەرماندە" دەکەنە پارادیمی خۆیان. یەکێك لە نمونە بەرجەستەکانی ئەم شێوازی ڕێپێدانە درووێنەکردنە، کە درۆێنەکارەکان هەمویان قۆڵی لێ هەڵدەکەن و دەست دەکەن بە درووێنەکردن لە کێڵگەکاندا .. خۆ ئەگەر پۆستێکی کارگێڕی و چاودێریشیان بدەیتێ ئەمان هەر لەسەر ئەقڵییەتی بەرهەمهێن بەردەوام بن: ئەمانە نازانن چۆن دەسەڵاتی تەواو بدەنە بەرامبەرەکە بۆ ئەوەی پابەندیان بکەن بە ئەنجامەکانەوە. ئەمانە چونکە هەمو ئەقڵێکیان لای ئامرازەکانە، لەبەر ئەوە دەبنە بەرپرسیاری ئەنجامەکان.

جارێکیان لەگەڵ منداڵەکاندا چووین بۆ خلیسکێنەی سەرئاو. ئەوجارە کەوتمە دوای دەسەڵات پێدانی فەرماندەوە. کوڕەکەم کە شارەزاییەکی زۆری هەیە لەو وەرزشەدا، چووە سەر خلیسکێنەیەك و منیش بەلەمەکەم لێ دەخوڕی. کامێراکەشم دا بە هاوسەرەکەم کە چەند وێنەیەکمان بگرێت. کامێراکە فیلمی زۆری تێدا نەمابو، لەبەر ئەوە هەر لەسەرەتاوە داوام لێ کرد دەست بە فیلمەکانەوە بگرێت و گرتەی باش هەڵببژێرێت. دواتر بۆم دەرکەوت زۆر شارەزا نییە لە ڕەسمگرتندا، بۆیە ئامۆژگارییەکانم وردتر کرد و داوام لێ کرد پشت بکاتە تیشکی خۆرەکەو لەوکاتانەدا وێنەمان بگرێت کە کوڕەکە بازدەدات بەسەر شەپۆلەکاندا.

ئەمەش هەر دادی نەدام و لەوە دەترسام هاوسەرەکەم ئەو چەند فیلمە کەمەش خەسار بکات، لەبەر ئەوە پێم وت "ساندرا، گوێ بگرە. هەتاکو خۆم پێت نەڵێم پەنجەی پێدا مەنێ. باشە؟ ئینجا هاوارم کرد .. بیگرە .. بیگرە .. نا .. نەیگری .. پەنجەی پیانەنێ .." لەوە دەترسام کە ئەگەر لە هەمو جوڵەو چرکەیەکدا ڕێنمایی نەدەمێ، ئەنجامەکە باش دەرناچێت.

ئەمە نمونەیەکی ڕاستەقینەی دەسەڵاتپێدانی فەرماندەبو. واتە سەرپەرشتیکردنی هەمو هەنگاوێك. دیارە زۆرکەس ئەم شێوە دەسەڵاتپێدانە پەیڕەو

دەکەن، بەڵام ئایا ئەنجامەکە چییە؟ مرۆڤ دەتوانێت لەرێی ئەم شێوازەوە سەرپەرشتی چەند کەس بکات و بیانخاتە ژێر ویستی خۆیەوە.

بێگومان شێوازێکی چاکتر هەیە. شێوازێکی کاریگەرتر بۆ دەسەڵات بەخشین بە خەڵکی. ئەم شێوازە بەرهەمی پارادیمێکە کە رێز بۆ توانای بەرامبەرەکەت دادەنێت و دەزانێت ئەویش توانای بیرکردنەوەی هەیە و ویژدانی زیندوو و خاوەنی ویستێکی ئازادە.

## دەسەڵاتپێدان بە بەرپرسیارێتییەوە

ئەم شێوە دەسەڵاتپێدانە گرنگی دەدات بە ئەنجام نەك بە شێوازی کارکردن. هەڵبژاردنی شێوازەکە بۆ کەسەکە بەجێ دەهێڵێت و وای لێ دەکات بەرپرسیاربێت بەرامبەر بە ئەنجامەکە. ئەم جۆرە دەسەڵاتپێدانە هەرچەندە لەسەرەتاوە ماوەیەکی زۆر دەخایەنێت بەڵام زۆرچاك (کات)ی تیا سەرمایەگوزاری دەکرێت .. لەمجۆرە دەسەڵاتبەخشینەدا دەتوانیت چەقی قورساییەکە تا ئەوپەری بجوڵێنیت و هێزی بەرزکردنەوەکە (کاریگەرێتی) چەند بەرامبەر بکەیت.

دەسەڵاتپێدان بە بەرپرسیارێتییەوە لەراستیدا ئاڵوگۆڕکردنی روون و ئاشکرای لێکتێگەیشتن و پابەندبونی پێشبینییەکانە لە پێنج بواردا:

١. ئەنجامە خوازراوەکان: بەوەی کە هەردولایەنە کە بە ئاشکرا دەزانن ئەنجامە خوازراوەکە چییە و گرنگ ئەوە نییە چۆن کارەکە دەکەیت بەڵکو چی بەدەست دەهێنیت .. ئەنجامەکان گرنگن نەك شێوازەکان. کات تەرخان بکە، پشودرێژ بە. ئەنجامە خوازراوەکان پێشنبینی بکە. با کەسە دەسەڵاتپێدراوەکەش بیانبینێت و راپۆرتێك دابنێت سەبارەت بە چۆنێتی ئەنجامەکان و وادەی بەدیهێنانیان.

٢. رێنماییەکان: ئەو چوارچێوەیە دیاری بکە کە پێویستە کەسەکە کاری تێدا بکات. با تاکو دەتوانێت ژمارەی رێنماییەکان کەم بن بۆ ئەوەی دەسەڵاتپێدانەکە نەبێتە بەخشینی میتۆدەکان، بەڵام پێویستە خاڵە گرنگەکان بگرێتەخۆ. گرنگترین مەسەلە بەدیهێنانی ئەنجامە خوازراوەکانە، لەبەرئەوە ئەگەر هەندێك بنەمای کۆن و هەندێك رەفتاری پێشێل کرد تۆ مەیکە بە کێشە. ئەگینا گیانی

دەستپێشخەریکردنی تیا دەمرێت و دەبێتە کەسێکی گوێڕایەڵی وا کە ئەم پرنسیپە پەیڕەو دەکات: "پێم بڵێ دەتەوێ چیت بۆ بکەم، با بیکەم".

هەروەها ئەو ڕێڕەوانەش دیاری بکە کە دەزانیت شکست بە کارەکە دەهێنن. ئاشکراو و سەرراست بە- کەسەکە ئاگادار بکە و پێی بڵێ مەترسییەکان لەکوێدان. مرۆڤ پێویستی بەوە نییە هەمو ڕۆژێك سەرلەنوێ "تایە" دابهێنێتەوە. ڕێگە بدە خەڵکەکە لە هەڵەکانی تۆ و هەڵەکانی خەڵکانی دیکەوە فێر ببن. ئەو ڕێبازانە روون بکەرەوە کە ڕەنگە ببنە مایەی شکست. بۆیان روون بکەرەوە کە پێویستە (چی نەکەن) بەڵام پێیان مەڵێ دەبێ چی بکەن. ئەمە بۆ خۆیان جێبهێڵە. بەرپرسارێتی ئەنجامەکان بۆ خۆیان جێبهێڵە با لە چوارچێوەی ڕێنماییەکاندا هەمو کارێکی پێویست بکەن.

٣. سەرچاوەکان: ئەو سەرچاوە مرۆیی و دارایی و هونەری و ڕێکخراوەییانە دیاری بکە کە بەکارهێنانیان سودبەخشن بۆ بەدیهێنانی ئەنجامە خوازراوەکان.

٤. لێپرسینەوە: پێوەرەکانی هەڵسەنگاندن ئامادە بکەکە ئەنجامەکانی پێ دەنرخێنیت. هەروەها کاتی هەڵسەنگاندنەکە و کاتی پێشکەشکردنی راپۆرتەکانیش دیاری بکە.

٥. پێشهاتەکان: لەڕێی هەڵسەنگاندنەکەوە بە دیاریکراوی بزانە، باش و خراپ، چی ڕوودەدات. ئەمەش ڕەنگە پاداشتی ماددی و خەڵاتی مەعنەوی و پلە بەرزکردنەوە بگرێتەوە وەك ئەنجامی سروشتی پەیوەست بە ئامانجە گشتییەکەی ئەو دەزگایە.

من چەند ساڵێك لەمەوبەر، لە بواری دەسەڵاتپێداندا ئەزمونێکی قورسم بەڕێکرد لەگەڵ یەکێك لە منالەکانمدا. کۆبونەوەی خێزانیمان هەبو، پەیامەکەشمان لەسەر کارتۆنێك نوسیبو کە بە دیوارێکدا هەڵمانواسیبو بۆ ئەوەی هاوئاهەنگبونی پلان و بەهاکانمان مسۆگەر بکەین، هەمو ئەندامانی خێزان ئامادەبون. بۆردێکی گەورەم هێناو ئامانجەکانم لەسەر نوسی – واتە ئەو شتە سەرەکییانەی کە دەمانەوێت بیانکەین – هەروەها ئەو ئەرکانەی کە ئامانجەکان دروستیان دەکات. پاشان پرسیارم کرد بزانم کێ بۆ کام ئەرك ئامادەیە وەکو خۆبەخش کاربکات؟ کێ ڤیستەکان دەداتەوە؟ تەماشام کرد تەنیا هەر من دەستم

بەرزکردۆتەوە. کێ مەسرەفی ماڵ دەگرێتە ئەستۆ؟ دیسانەوە تەنیا هەر خۆم بوم. کێ شیر دەدات بە منالە ساواکە؟ لەمەیاندا هەندێ منجە منج کرا، بەڵام تەنیا ژنەکەم مەرجەکانی تێدابو.

بە تێپەڕبونی کات و ئاشکراکردنی یەک لەدوای یەکی ئەرکەکان، خێرا بۆمان دەرکەوت کە من و ژنەکەم نزیکەی شەست سەعات ئەرکی هەفتانەمان کەوتۆتە سەر. بەم پارادیمە هەندێك لە ئەرکەکان خۆبەخشی دیکەی بۆ پەیدابو.

(ستیڤن)ی کوڕم، کە ئەوکاتە تەمەنی حەوت ساڵان بو، وتی من ئامادەم بە خۆبەخش ئەرکی خزمەتکردنی حەوشەکە بگرمە ئەستۆ. من پێش ئەوەی ئەرکەکەی پێ بسپێرم، دەستم کرد بە پرۆسەی راهێنان و مەشق پێکردن. داوام لێ کرد باش ئەوە بهێنێتە بەرچاوی خۆی کە پێویستە حەوشەکە چۆن بێت. لەبەر ئەوە بردم حەوشەی ماڵی دراوسێکەمانم نیشان دا.

پێم وت: "تەماشاکە کوڕەم، بزانە حەوشەکە چەند سەوز و پاکە. ئێمەش پێویستە حەوشەکەمان ئاوابێت: سەوز و پاك. ئینجا وەرە با تەماشایەکی حەوشەکەی خۆمان بکەین. ئەها لە هەمو رەنگێکی تێدایە.

ئەمە نابێت: سەوز نییە. ئێمە دەمانەوێت سەوز و پاك بێت. چۆن سەوزی دەکەیت؟ خۆت دەیزانیت. ئازادیشت چ رێگەیەك دەگرێتەبەر، ئیللا بۆیاخکردن نەبێت. ئەگەر من بومایە دەمزانی چۆن سەوزی دەکەم؟ "چۆن؟ چیت دەکرد بابە"

"رەشاشی ئاوەکەم بەکاردەهێنا. بەڵام تۆ ئارەزوی خۆتە. دەتوانیت بە سەتڵ ئاوی بدەیت یان بە سۆندە. ئەوە بەلامەوە گرنگ نییە. گرنگ ئەوەیە حەوشەکە سەوز بێت. باشە!"

"ئینجا ئێستا نۆرەی باسکردنی پاکوتەمیزییە. کوڕی خۆم پاکوتەمیزی مانای ئەوەیە هیچ زبڵ و پیسی و خۆڵ و خاشاکێکی لێ نەمێنێت، نە کاغەز، نە پەت، نە ئێسقان، نە بەرد، نە هیچ شتێك کە ببێتە هۆی بێسەروبەری ئێرە: پێت دەڵێم پێویستە چی بکەیت. ئێستا با بەشێکی حەوشەکە پاك بکەینەوەو جیاوازییەکە ببینیت".

ئا لێرەدا دوو زەرفی گەورە کاغەزمان هێنا و دەستمان کرد بە پاککردنەوەی لایەکی حەوشەکە. "ئێستا تەماشای ئەم لایە بکەو تەماشای ئەولاش بکە. جیاوازییەکە دەبینیت؟ پاکوتەمیزی ئەمەیە"

کوڕەکەم هاواری کرد: "راوەستە، لەپشتی ئەو نەمامەوە پارچە رۆژنامەیەکی لێیە"

"ئافەرین. من نەمبینی. تۆ چاوت لە من تیژترە کوڕم".

"ئینجا ئێستا پێش ئەوەی بڕیار بدەیت ئەرکەکە دەگریتە ئەستۆ یان نا، با هەندێك شتت پێ بڵێم. کە تۆ ئەم ئەرکەت گرتەئەستۆ ئیتر من هەقم بەسەر هیچییەوە نابێت. دەبێتە ئەرکی تۆ. ئەمە پێی دەڵێن دەسەڵاتبەخشین بە بەرپرسیارێتییەوە، مانای وایە تۆ متمانەپێکراویت و باوەڕی تەواوم پێت هەیە کە ئیشەکە بە چاکی ئەنجام بدەیت. کەواتە کێ دەبێتە سەرۆکت؟"

"تۆ بابە"

"نەخێر، من نا. تۆ خۆت سەرۆکیت. دەبێت خۆت سەرۆکی خۆت بیت. حەزدەکەیت هەمیشە سەرو دڵت بگرین؟"

"نا، حەزناکەم"

"ئێمەش حەزناکەین .. ئەوە شتێکی ناخۆشە. لەبەرئەوە پێویستە خۆت سەرۆکی خۆت بیت: ئەی باشە کێ یارمەتیت دەدات؟"

"کێ؟"

"من، جەنابی سەرۆك"

"یارمەتیم دەدەیت؟"

"بەڵێ، بەڵام هەمو کات نا، چونکە دەزانیت من زۆرجار لەماڵ نابم و ئەرکم زۆرە. بەڵام ئەگەر لە ماڵ بوم و دەستم بەتاڵ بو، پێویستە داوای یارمەتیم لێ بکەیت و منیش هەرچییەکم لەدەست بێت دەیکەم"

"زۆرچاکە"

"باشە کێ کارەکەت هەڵدەسەنگێنێت؟"

"کێ؟"

"خۆت. خۆت کاری خۆت هەڵدەسەنگێنێت"

"ئەوەش من بیکەم"

"بەڵێ. خۆم و خۆت هەفتەی دوجار بە حەوشەکەدا دەگەڕێین و چیت کردووە تیایدا بۆم باس دەکەیت، پێوەرەکە چیە؟"

"پاکی و سەوزایی"

"ئافەرین"

بە درێژایی دوو هەفتە من لەسەر ئەم دوو وشەیە رامدەهێنا، تا ئەوکاتەی هەستم کرد ئیتر ئامادەیە ئەرکەکە بگرێتە ئەستۆ. دواجار رۆژەکە هات.

"تەواو کورم؟"

"تەواو"

"ئەرکەکە چیە؟"

"سەوزایی و پاکوتەمیزی"

"سەوزایی چیە؟

تەماشای حەوشەکەی کرد خەریك بو دەگەشایەوە، ئینجا ئاماژەی بۆ حەوشەی دراوسێکەمان کرد و وتی .. سەوزایی ئاوایە""پاكو تەمیزی چیە؟"

"ئەوەیە خۆڵ و خاشاکی لێ نەبێت؟

"کێ سەرۆکە؟"

"خۆم"

"کێ یارمەتیت دەدات؟"

"تۆ، لەکاتی دەستبەتاڵیتدا"

"کێ حەکەمە؟

"خۆم حەفتەی دووجار پێکەوە بە حەوشەکەدا دەگەڕێین و نیشانت دەدەم چۆن شتەکان گۆڕاون"

"ئامانجەکەمان چیە؟"

"سەوزایی و پاکی"

من لەوکاتەدا بە هیچ شێوەیەك باسی خەڵاتم نەکرد، بەڵام ئامادەبوم دەرهەق بەم جۆرە دەسەڵاتپێدانە خەڵاتی بکەم.

دوو هەفتەو دوو کەلیمە قسە. دڵنیابوم ئیتر ئامادەیە

شەممە هیچی نەکرد. یەکشەممە هیچی نەکرد. دووشەممە هەروا. رۆژی سێشەممە کاتێك ویستم سواری ئوتومبیلەکە ببم و بڕۆم بۆسەر کارەکەی خۆم تەماشای حەوشەکەم کرد کە ئەوهەتاوە گەرمەی مانگی حوزەیران زەردی کردبو. لە دڵی خۆمدا وتم: حەتمەن ئەمڕۆ پاکی دەکاتەوە" و خۆم لە دڵی خۆمدا بیانوم بۆ دەهێنایەوە: ئێمە شەممە لەسەر مەسەلەکە رێك کەوتین. یەکشەممەش پشووە و ئیش ناکرێت." بەڵام هەرچەندەم کرد نەمتوانی بیانو بۆ رۆژی دووشەممە بهێنمەوە، خۆ ئەمڕۆ نەك دووشەممە، سێشەممەشە، دڵنیام ئەمڕۆ دەست پێدەکات. هاوینە و هیچ ئیشێکی دیکەی نییە.

ئەو رۆژە خواخوام بو خولەکێك زووتر بگەڕێمەوە ماڵێ بزانم چی کردووە. بەڵام کە گەیشتمەوە هەر هەمان دیمەنەکەی سەرلەبەیانیم بینی. کوڕەکەشم لەسەر شەقامەکە یاریی دەکرد.

شتەکە قابیلی قبوڵ نەبو، هەستم بە توڕەییەکی زۆردەکرد لە داخی ئەوەی دوو هەفتە دەستخەڕۆی کردبوم. چەند خۆمم لەگەڵدا ماندو کردو بەتەمای چی بوم؟ کەچی هەموی هیچ دەرچو. ئەوەی زیاتر مەراقی دەدامێ دیمەنی حەوشەی دراوسێکەمان بو کە زۆر جوان و رازاوە بو. بەمە زۆر هەستم بە تەریقی دەکرد.

دەمتوانی بگەڕێمەوە بۆ دەسەڵاتپێدانی فەرماندانەو پێی بڵێم "دەی کوڕم" بڕۆ ئەو خۆڵ وخاشاکە کۆبکەرەوە ئەگینا .. "ئەمە کارێکی ئاسانە و هێلکە ئاڵتونییەکەشت دەست دەکەوێت. بەڵام ئەی قازەکە چی بەسەردێت؟ ئایا بەم شێوەیە دەتوانم وا لە کوڕەکەم بکەم لە ناخی خۆیدا هەست بە بەرپرسیارێتی و پابەندبون بکات؟"

لەبەر ئەوە زەردەخەنەیەکی دەستکردم بۆ کردو لە شەقامەکەوە هاوارم لێ کرد .. کوڕم. دەنگوباس؟

وەڵامی دامەوە: "زۆرباشە"

"حەوشەکە چۆنە؟" کە ئەم پرسیارەم کرد یەکسەر هەستم کرد من بەم پرسیارەم رێکەوتنەکەم پێشێل کردووە. بڕیار نەبو لێپرسینەوەکە ئاوابێت. بۆیە ئەویش بیانویەکی دەست کەوت رێکەوتنەکە پێشێل بکات و بڵێت "باشە"

توڕەییەکەی خۆم شاردەوەو ددانم بەخۆمدا گرت و چاوەڕێم کرد تادوای نانخواردن. ئینجا پێم وت: "دەی کوڕم، با ڕێکەوتنەکە جێبەجێ بکەین. وەرە با بە حەوشەکەدا بگەڕێین و چیت تیاکردووە بەپێی دەسەڵاتت نیشانمی بدە ".

کە خۆمان کردە ئەودیوی دەرگاکەوە هەستم کرد چاوی پڕبووە لە گریان و دەلەرزێت. تا کاتێك گەیشتینە ناوەڕاستی حەوشەکە بە هەنسکێکی شاردراوەوە وتی: "بابە ئەو ئیشە زۆر زەحمەتە"

لە دڵی خۆمدا وتم زەحمەتی چییە، خۆ تۆ هەرهیچت نەکردووە؟ بەڵام زانیم شتە زەحمەتەکە چییە: خۆ بەڕێوەبردن – خۆ چاودێریکردن. لەبەرئەوە پێم وت: دەتوانم هیچ یارمەتییەکت بدەم".

مشەیەکی بۆ کردو وتی: "بەراست بابە؟ یارمەتیم دەدەیت؟".

"ڕێکەوتنەکەمان چی بو؟"

"وتت هەرکاتێك دەست بەتاڵ بویت یارمەتیم دەدەیت"

"ئێستا دەستم بەتاڵە"

یەکسەر رایکردەماڵەوەو دوو عەلاگەی گەورەی بەتاڵی هێنا: دانەیەکی دایە دەست من "ئەم شتە پیسانە کۆدەکەیتەوە؟" ئاماژەی بۆ پاشماوەکانی گۆشتبرژاندنەکەی دوێنی کردو وتی "من ناتوانم" دڵم پێی تێکەڵ دێت.

هەرچییەکی داوا لێ کردم بەجێم هێنا، بەمەش ڕێکەوتنەکە بەڕاستی لە دڵیدا چەسپی. حەوشەکە بو بە حەوشەی خۆی و کەوتە ژێر بەرپرسیارێتی ئەوەوە.

بە درێژایی ئەو هاوینە تەنیا دوو سێ جار داوای یارمەتی لێ کردم. بە جۆرێك کەوتە خزمەت و چاودێریکردنی حەوشەکە، پاکترو سەوزتر دەرچو لەو سەردەمەی کە خۆم خزمەتم دەکرد. ئەگەر یەکێکیش لە خوشك و براکانی شتیان تێ فڕێ بدایە یەکسەر بەتوندی سەرزەنشتی دەکردن.

متمانە پێکردن بەرزترین شێوەی هاندانی مرۆڤە. وا لە کەسەکە دەکات ئەوپەڕی تواناو وزەی خۆی بخاتە گەڕ. بەڵام مەسەلەکە کاتی دەوێت و پێویستی بە پشوو درێژییە. هەروەها مەشقپێکردن و بەرزکردنەوەی تواناکانیشیان گرنگە بۆ ئەوەی شایستەیی خۆیان بەرزبکەنەوە بۆ ئاستی متمانەکە.

من دڵنیام ئەگەر دەسەڵاتپێدان بە بەرپرسیارێتی‌یەوە چاك جێبەجێ بکرێت، هەردوو لایەنەکە سودیان پێدەگات و لە کۆتاییشدا بەرهەمی زیاتر لە ماوەیەکی کەمتردا بەدەست دەهێنرێت. من دڵنیام هەر خێزانێك ئەم شێوازی دەسەڵات پێدانە پەیڕەو بکات دەتوانێت کاروبارەکانی بە جۆرێکی وا رێك بخات کە هەر ئەندامێك ئەرکەکەی لە ماوەی سەعاتێکدا جێبەجێ بکات. بەڵام بۆ ئەمەش پێویستمان بە بەڕێوەبردنە، نەك تەنیا بە بەرهەمهێنان. جەختەکە پێویستە لەسەر کاریگەریی بێت نەك لەسەر تواناو لێهاتوویی.

بێگومان تۆ ئەگەر خۆت ئیشەکە بکەیت، لە مناڵەکەت باشتری دەکەیت، بەڵام مەسەلەکە لێرەدا هێز بەخشینە بە منالکە بۆ ئەنجامدانی کارەکە. بەدیهێنانی ئەم مەبەستە کاتی دەوێت. پێویستی بە مەشق و راهێنانپێکردنە. ئەمیش هەرکاتی دەوێت. بەڵام ئایا ئەنجامەکە ئەوە ناهێنێت؟ بیر لە سوودەکانی بکەرەوە لە مەودایەکی دووردا.

بیرکردنەوە بەم شێوازە بۆ دەسەڵاتبەخشین پێویستی بە پارادیمێکی تەواو نوێ هەیە. لەراستیدا ئەمە سروشتی پەیوەندییەکە دەگۆڕێت:

ئەوەی بەرپرسیارێتییەکە وەردەگرێت، خۆی دەبێتە گەورەی خۆی و هیچ شتێك حوکمی ناکات ویژدانی خۆی نەبێت کە زۆر مەبەستێتی. پابەندی ئەو ئەنجامانە دەبێت لەسەری رێك کەوتون. لەهەمان کاتیشدا بەم پارادیمە نوێیە وزە داهێنەرەکانی خۆی ئاراستەی ئەو بابەت و مەسەلانە دەکات کە پێویستن بە هاوئاهەنگی لەگەڵ پرنسیپەکاندا بۆ بەدەستهێنانی ئامانجە خوازراوەکان.

پرنسیپەکانی ئەم شێوازی دەسەڵاتپێبەخشینە پرسنیپی راست و دروستن و بەسەر هەمو کەسێك و لە هەمو هەڵوێستێکدا جێبەجێ دەکرێن. سەبارەت بەو کەسانەش کە هێشتا کامڵ نەبون، پێویستە ئارەزووە خوازراوەکان کەم بن و رێنماییەکان زۆربن. پێویستە زۆرترین سەرچاوەیان بۆ دابین بکرێن و زیاتریش لێپرسینەوە بکەیت و چاو بە ئەنجامەکاندا بخشێنرێتەوەو زۆرتریش ئەنجامە هەنوکەییەکان بایەخیان پێ بدرێت. بەڵام بۆ مرۆڤی کامڵ دەتوانێت ئەنجامی زەحمەتتر دیاری بکەیت و رێنمایی کەمتری بدەیتێ و کەمتر لێپرسینەوە بکەیت و

پێوەری بچوکترو ئاشکراتر بەکاربهێنیت. دەسەڵاتپێدانی کاریگەر باشترین ئامڕازیە بۆ بەڕێوەبردنی چاك و کاریگەر، چونکە مەرجێکی زۆر بنەڕەتییە بۆ گەشەکردنی کەسەکەش و دەزگاکەش.

## پارادیمی چوارگۆشەی دووەم

کلیلە سەرەکییەکەی ئەم خۆبەڕێوەبردن و خەڵك بەڕێوەبردنە لە هیچ تەکنیکێك و کەرەسەو توخمێکی دەرەکیدا نییە، بەڵکو شتێکە لەناخدایە، لە پارادیمی چوارگۆشەی دووەمدا، ئەو پارادیمەی کە پێت دەڵێت کام مەسەلەیە گرنگە و کامەیان پەلەیە.

لە پاشکۆی ئەم کتێبەدا مەشقێکم داناوە بە ناونیشانی "رۆژێکی نوسینگەکەت بۆ چوارگۆشەی دووەم تەرخان بکە"

راهێنانەکە یارمەتیت دەدات لە شوێنی کارەکەتەوە بیبینیت کە چۆن ئەم پارادیمە هێزی ئەوەی تێدایە کاریگەرییەکانت زیاد بکات.

کارکردنت لەسەر بڕەودان بەم پارادیمەی چوارگۆشەی دووەم توانای رێکخستنی حەفتەکانی ژیانت و ئەنجامدانی ئەرکەکانت زیاد دەکات کە جەخت بکەیتە سەر مەسەلە هەرە گرنگ و هەرە قوڵەکانت و ئەوە بکەیت کە دەیڵێیت. وات لێ دێت ئیتر پشت بە هیچ کەس و هیچ شتێکی دیکە نابەستیت بۆ بەڕێوەبردنی ژیانت بە چالاکی.

مایەی سەرنجیشە کە بزانیت هەر حەوت خووەکە لە چوارگۆشەی دووەمدا دەبینیت. مرۆڤ هەڵسوکەوت لە مەسەلە گرنگە چەسپاوەکاندا دەکات، کە ئەگەر بە شێوەیەکی دەوری جێبەجێ بکرێن دەبنە هۆکاری گۆڕانێکی ئەرێنی گەورە لە ژیانماندا.

## خشتەی هەفتانە

| ڕۆڵ | ئامانج |
|---|---|
| پێشکەوتنی تایبەتی کەسەکە | |
| هاوسەر/ دایک و باوک | |
| بەڕێوەبەری نوێی بەرهەمهێنان | |
| بەڕێوەبەری لێکۆڵینەوە | |
| بەڕێوەبەری خۆیەتی | |
| بەڕێوەبەری کارگێڕی | |
| سەرکۆی ئەنجومەنی کارگێڕی کۆمپانیای گواستنەوە | |

**مشارەکە تیژبکەرەوە**

- جەستەیی ____
- هزری ____
- ڕۆحی ____
- کۆمەڵایەتی/ سۆزداریی ____

**هەفتە لە**

ڕیزبەندییەکانی هەفتە

| یەکشەمە | دووشەممە |
|---|---|
| ڕیزبەندییەکانی ئەمڕۆ | |
| | |
| | |
| | |
| | |
| | |
| | |
| وادەکان | |
| ٨ ١ کاتی تایبەت | ٨ |
| ٩ | ٩ |
| ١٠ | ١٠ |
| ١١ | ١١ |
| ١٢ | ١٢ |
| ١ | ١ |
| ٢ | ٢ |
| ٣ | ٣ |
| ٤ | ٤ |
| ٥ | ٥ |
| ٦ | ٦ |
| ٧ | ٧ |
| ٨ | ٨ |
| ئێوارە | ئێوارە |

| سێ شەممە | چوارشەممە | پێنجشەممە | جومعە | شەممە |
|---|---|---|---|---|
| گرنگییەکانی ئەو رۆژە | | | | |
| | | | | |
| | | | | |
| | | | | |
| | | | | |
| | | | | |
| | | | | |
| | | | | |
| وادەکان | | | | |
| ٨ | ٨ | ٨ | ٨ | ٨ |
| ٩ | ٩ | ٩ | ٩ | ٩ |
| ١٠ | ١٠ | ١٠ | ١٠ | ١٠ |
| ١١ | ١١ | ١١ | ١١ | ١١ |
| ١٢ | ١٢ | ١٢ | ١٢ | ١٢ |
| ١ | ١ | ١ | ١ | ١ |
| ٢ | ٢ | ٢ | ٢ | ٢ |
| ٣ | ٣ | ٣ | ٣ | ٣ |
| ٤ | ٤ | ٤ | ٤ | ٤ |
| ٥ | ٥ | ٥ | ٥ | ٥ |
| ٦ | ٦ | ٦ | ٦ | ٦ |
| ٧ | ٧ | ٧ | ٧ | ٧ |
| ٨ | ٨ | ٨ | ٨ | ٨ |
| | ئێوارە | ئێوارە | ئێوارە | ئێوارە |

## چەند پێشنیارێك بۆ جێبەجێکردن

١. چالاکییەکی ناو چوارگۆشەی دووەم دیاری بکە کە دەزانیت لە ژیانـدا پشت گوێت خستووە. چـالاکییەکی وا کـە ئەگـەر بـە باشـی جێبـەجێ بکرێـت کاریگەرییـەکی هەستپێکراوی دەبێت لەسەر ژیانت چ لەڕووی پیشەییەوە، چ لەڕووی کەسێتییەوە.

لای خۆت تۆماری بکەو پابەندی جێبەجێکردنی ببە.

٢. خانـەکانی بـەڕێوەبردنی کـات وێنـە بکێشـەو هەوڵبـدە بیخـەملێنیت لـە هـەر خانەیەکدا سەدی چەندی کاتەکانت بەسەردەبەیت.

ئەمـە بـۆ مـاوەی سـێ ڕۆژ و هـەر ڕۆژەی چارەکەسەعاتێك دیـاری بکـە ئینجا بزانـە خەملاندنەکەت چەند وردە. ئایا خۆت لەو ماوانە رازیت؟ پێویستە چی بگۆڕیت؟.

٣. لیستێك ئامـادە بکە بـەو ئەرکانـەی کـە دەتوانیـت رووبـەرووی خـەڵکی دیکـەیان بکەیتـەوە. نـاوی ئـەو کەسـانەش دیـاری بکـە کـە دەتوانیـت دەسـەڵاتیان بـدەیتێ و مەشقیان پێبکـەیت، هەریەکـە لـە بـوارێکی دیـاریکراودا. ئـەو شـتانە دیـاری بکـە کـە پێویستت پێیانە بۆ دەستکردن بە پرۆسەی دەسەڵاتپێدان و راهێنانەکە.

٤. سیستمێك دابنێ بۆ هەفتـەی داهـاتوت. ڕۆڵ و ئامانجـەکانت لـەو هەفتەیـەدا چـین بیاننوسە. ئینجا ئامانجەکان بکە بە پلانێکی دیـاریکراوی کـار. لـە کۆتـایی هەفتەکـەدا پلانەکەت هەڵبسەنگێنە بزانە چەند سـەرکەوتو بـووە لـەوەی بـەهاکان و ئامانجـەکانت بکاتە رێڕەوی ژیانی رۆژانەت و بزانە تا چـەند توانیـوێتی خۆڕاگری و یەکپارچـەییت بپارێزێت.

٥. خۆت پابەندی ئەوە بکە دەست بکەیت بە دانـانی سیستمێکی هەفتانـە بـۆ خـۆت. کاتێکی رێکخراو دیاری بکە بۆ دەستپێکی ئەو بەرنامەیە.

٦. یان کەرەسەکەی ئێستات بکە بـە کەرەسـەی نـەوەی چوارەم یـان ئـەو کەرەسـەیە دابین بکە

٧. راهێنانەکەی "رۆژێکی نوسینگە تـەرخان بکـە بـۆ چوارگۆشـەی دووەم" جێبـەجێ بکە بۆ ئەوەی قوڵتر لە پارادیمی راهێنانی دووەم تێبگەیت.

## بەشی سێیەم

# سەرکەوتنی بەکۆمەڵ



# پارادیمەکانی یەکتر تەواوکردن

نە هیچ هاوڕێیەك بەبێ متمانە دروست دەبێت و نە هیچ متمانەیەکیش بەبێ دەستپاکی

- ساموئیل جۆنسن

پێش ئەوەی بچینە بواری سەرکەوتنی بەکۆمەڵەوە پێویستە ئەو ڕاستییەمان بیرنەچێت کە هاوکاریکردنی ڕاستەقینە و یەکتر تەواوکردنی کاریگەر لەگەڵ خەڵکیدا بەبێ سەربەخۆیی ڕاستەقینە نایەتەدی. سەرکەوتنی کەسێتی (تایبەت) لەپێش سەرکەوتنی کۆمەڵەوەیە. جەبر هەمیشە پێش داتاشین دێت.

مرۆڤ ئەگەر ئاوڕ لەدواوە بداتەوە و سەرنج لە ڕێگەکە بدات بۆ ئەوەی بزانێت لەکوێوە دەستی پێکردووە و ئێستا لە کوێدایە و مەبەستێتی بگاتە کوێ، بە وردی بۆی ڕوون دەبێتەوە کە ئەگەر ئەم ڕێگەیەی نەگرتایەتە بەر هەرگیز نەیدەتوانی بگاتە ئەم شوێنەی ئێستای. ئامانجەکە هەر ئەم ڕێگەیەی هەیە. ڕێگەیەکی دیکەو قەدبڕی نییە و هیچ ئامرازێکیش نییە یارمەتیت بدات باز بەسەر ڕێگاکەدا بدەیت. سەرنج لە دەوروبەرەکەت بدە دەبینیت پڕە لە برین و شکاوییەکانی پەیوەندی خراپی ئەو کەسانەی کە ویستویانە بە بازێك بگەنە پەیوەندی کاریگەر بێ ئەوەی گەیشتبنە قۆناغی پێگەیشتن و بێ ئەوەی خاوەنی ئەو کەسایەتییە بەهێزە بن کە بۆ پاراستنی پەیوەندییە کاریگەرەکە پێویستە، چونکە بەدەستهێنانی ئەو ئامانج و مەبەستە کارێکی ئاسان نییە. پێویستە ڕێگەکە بگریتە بەر. مرۆڤ ئەگەر لەگەڵ خودی خۆیدا سەرکەوتو نەبێت و باجی ئەو سەرکەوتنەی نەدابێت ناتوانێت لەگەڵ خەڵکیدا سەرکەوتو بێت.

چەند ساڵێك لەمەوبەر ڕۆژێکیان کە لە کەناری ویلایەتی (ئۆریگۆن) لە خولێکی زانستیدا موحازەرەم دەوتەوە. کابرایەك هەستایە سەرپێ و وتی: "ستیڤن، ئەگەر ڕاستت دەوێت من هیچ چێژێك لەم جۆرە خولانە نابینم". قسەکەی ئەو سەرنجی ڕاکێشام. کابرا بەردەوام بو وتی: "تەماشای ئەم خەڵکە بکە .. تەماشای ئەم کەناری

دەریایە بکە .. ئەم هەمو شتانە روودەدەن بەڵام من ناچارم دابنیشم و بە نیگەرانییەوە چاوەڕێی پرسیار و لێکۆڵینەوەکانی ژنەکەم بم کە ئەمشەو بە تەلەفۆن ئاڕاستەمیان دەکات"

"من هەمو جارێك کە لەسەفەر دەبم، ئەو بە پرسیار دامدەگرێتەوە .. نانی بەیانیت لەکوێ خوارد؟ کێت لەگەڵ بو؟ بەیانییەکەی چویتە کۆبونەوەکەوە؟ کەی نانی نیوەڕۆت خوارد؟ لەکاتی نانخواردندا چیت کرد؟ پاش نیوەڕۆکەی خەریکی چی بویت؟ ئێوارە چۆنت رابوارد؟ کێت لەگەڵ بو؟ باسی چیتان کرد؟

"ئەو لەراستیدا دەیەوێت بزانێت کێم لەگەڵدا بووە تاکو پرسیاری لێ بکات بزانێت راستی لەگەڵ دەکەم. بەڕاستی ئەم رەفتارەی ئەو زۆر وەڕسم دەکات و چێژ لە هیچ شتێکی ژیان نابینم"

پاشان ماوەیەك پێکەوە قسەمان کرد، ئینجا بە شەرمێکەوە وتی: "ژنەکەم چاك دەزانێت پرسیاری چی بکات .. یەکەمجار ئەوم لە خولێکی وەك ئەم خولەی ئێستادا ناسی .. ئەوکاتە من ژنێکی دیکەم هەبو"

نەختێك بیرم لە قسەکەی کردەوە و پێم وت: "تۆ لەوجۆرە کەسانەی کە دەیانەوێت هەمو شتێك بە خێرایی چاك بکەنەوە .."

تەماشایەکی کردم و پرسی: "مەبەستت چییە؟"

وتم: مەبەستم ئەوەیە حەزدەکەیت ئیسپانەیەك بگریت بەدەستەوە و سەری ژنەکەت هەڵبدەیتەوە و بەوجۆرەی کە خۆت دەتەوێت وایەرەکانی سەرلەنوێ ببەستیتەوە. وانییە؟

هاواری کرد: بە دڵنیاییەوە حەزدەکەم بگۆڕێت، چونکە بۆی نییە شەو و رۆژ لێکۆڵینەوەم لەگەڵدا بکات.

پێم وت: "برادەری ئازیز، تۆ بەم شێوەیە ناتوانیت کێشەکان لەگەڵ ژنەکەتدا چارەسەربکەیت."

ئێمە لەم قسەیەدا مەبەستمان گۆڕینی پارادیمە، گۆڕینێکی گەورە و گەوهەریی .. مرۆڤ دەتوانێت بە لێزانین و تەکنیکی تایبەتی خۆی هەڵسوکەوتە کۆمەڵایەتییەکان وا لێ بکات نەرمو لاستیکی بن، بەڵام دوور نییە لەهەمان کاتدا کارێك بکات کە بناغە گرنگەکانی رەوشتبەرزی و جوامێری بروخێن. درەخت ئەگەر رەگی نەبێت

بەرنادات. ئەمە پرینسیپی ریزبەندی و بەدوای یەکتریدا هاتنە. سەرکەوتنی تایبەت هەمیشە دەکەوێتە پێش سەرکەوتنی بەکۆمەڵ. کۆنترۆڵکردنی خود بناغەی هەمو پەیوەندییە باشەکانە لەگەڵ خەڵکیدا.

هەندێك دەڵێن، مرۆڤ پێش ئەوەی کەسێکی دیکەی خۆش بوێت پێویستە خۆی خۆش بوێت. من پێم وایە ئەم قسەیە راستەو ئازایەتییەکی زۆریشی تێدایە، بەڵام تۆ ئەگەر بە چاکی خودی خۆت نەناسی و کۆنترۆڵی نەکەیت، زەحمەتە بە شێوەیەکی راست و دروست خۆتت خۆش بوێت. بەڵکو خۆشویستنێکی روکەشی کاتی دەبێت.

سەرچاوەی هەمو رێزلەخۆگرتنێکی راست و راستگۆ ئەوەیە دەستت بەسەر خودی خۆتدا بڕوات و بتوانیت بەراستی پشتی پێببەستیت. ئەمەش کرۆکی خووەکانی (١) و (٢) و (٣)یە. پشت بەخۆبەستن زامنی دەستکەوت و سەرکەوتنێکی مەزنە. تەنیا ئەو کەسانەش دەتوانن پشت بە یەکتری ببەستن کە توانای پشت بەخۆبەستنیان هەیە. ئەگەر ئێمە خاوەنی ورەو نیازێکی راستەقینە نەبین بۆ پشتبەخۆبەستن، ئەوا هەمو هەوڵێك بۆ پێشخستنی پەیوەندییە مرۆییەکان دەبێتە کارێکی گەمژانە. دەشێت لەو مەسەلەیەدا جۆرە سەرکەوتنێك بەدەست بهێنین بەمەرجێك بارودۆخەکە ئاسان و گونجاو بێت، بەڵام کە بارودۆخەکە تێك دەچێت دەبینین بناغەیەکی هێندە پتەومان نیە بتوانین هاوئاهەنگیی شتەکان بپارێزین.

دیارە گرنگترین مەرجی هەمو پەیوەندییەك ئەوەنییە چی دەڵێین و چی دەکەین، بەڵکو ئەوە گرنگە کە ناخە راستەقینەکەمان چییە. ئەگەر کردار و گفتارمان هەڵقوڵاوی شێوازی پەیوەندییە مرۆڤایەتییە روکەشییەکان بن (خەسڵەتە رەوشتییە بابەتەکان) نەك هەڵقوڵاوی ناخی راستەقینەی خۆمان (خەسڵەتە رەوشتییە ئایدیاییەکان) ئەوا بەرامبەرەکەمان یەکسەر هەست بە دووڕوویمان دەکات. بەمەش ئیتر توانای دامەزراندنی بناغەیەکی کاریگەرمان نابێت بۆ هاوکاریکردن لەگەڵ خەڵکیدا و ناتوانین وابکەین ئەو پەیوەندییە هاوکارییە بژی.

ئەو شێوازو شارەزاییانەی کە گۆڕانی راستەقینە لە کارلێکە مرۆڤایەتییەکاندا دروستی دەکەن ئەوانەن کە بە ئاسایی و سروشتی لە کەسایەتییە سەربەخۆکانەوە هەڵدەقوڵێن. لەبەرئەوە شوێنی دەستپێکردنی هەر پەیوەندییەك بریتییە لە ناخی خۆمان، لە بازنەی کاریگەرێتیمان و لە دەورو تەئسیرمان و لە کەسایەتیمان.

سـەربەخۆیی بریتییـە لـە توانـای کـۆنترۆڵکردن و خولقانـدنی دەستپێشـخەری و جەختکردنە سەر پرنسیپە راست و دروستەکان و گوێڕایـەڵیکردنی پرنسیپەکان و ریزبەندیکردنی مەسەلە گرنگەکانی ژیان و ئەنجامدانیان بەوپەڕی دەستپاکی‌یـەوە. لەبەرئەوە مرۆڤ ئەگەر بەراستی سەربەخۆبێت دەتوانێت هاوکاریی خـەڵکی بکات و یـەکتریيان لەگەڵـدا تـەواو بکـات لـەپێناوی دامەزرانـدنی پەیوەنـدی خوڵقێنـەر و بەسود و هەمیشەییدا.

ئێمە کە تەماشای بەردەمی خۆمان دەکـەین دەبیـنین چوینەتە رەهەنـدێکی تـەواو نوێوە کە دنیای چەندین ئەگەری بەڕووداکراوەتـەوە، ئەگـەری هـەبونی پـەیوەندیگەلی قوڵ و واتادارو بەربڵاو، ئەگـەری بەرهـەمی روو لەهەڵکشان و ئەگـەری بەشداریکردن و خزمـەتگوزاریی، ئەگـەری فێربـون و گەشـەکردن. بـەڵام لەهـەمان کاتیشـدا بەردەمەکەمان ئـەو جێگەیەشە کە تیایدا هەست بەوپـەڕی ئـازارو تێکشان دەکـەین، هەست بە کۆسپە هەرە گەورەکانی رێگەی سەرکەوتن و بەختـەوەری دەکـەین." دیارە بەوپەڕی هۆشیاری‌یەوە ئاگاداری ئازارەکەین، چونکە ئازارێکی گورچکبڕە.

مـرۆڤ زۆرجـار دەتوانێـت چـەندین سـاڵ بـژی لەگـەڵ ئـازارە درێژخایەنـەکانی کورتبینی و نەزانی لە رابەرایەتیکردن یاخود بەڕێوەبردنی ژیـانی تایبـەتی خۆیـدا. ئـەم ئـازارە درێژخایەنـە رەنگـە تـەنیا وامـان لێ بکـات هەسـت بـە نیگەرانیـەکی تەمومژاوی بکـەین و هەنـدێك جاریش هـەوڵ دەدەیـن ئازارەکە بەشـێوەیەکی کـاتی کـەم بکەینـەوە و لەبەرئـەوەی ئازارەکـە درێژخایەنـە لەسـەری رادێـین و دەتـوانین لەگەڵیدا هەڵ بکەین.

بـەڵام هـەرکاتێك پەیوەندییەکـەمان لەگـەڵ خەڵکیـدا کێشـەی هاتـەڕێ یەکسـەر هەست بە ئازارێکی بەهێز دەکەین – کـە زۆرجـار ئـازارێکی کتـوپڕە – و حەزدەکـەین دەستبەجێ نەنێت.

لەبـەر ئـەوە ئێمـە کاتێـك هـەوڵی چارەسـەرکردنی نەخۆشـییەکان دەدەیـن بـە چارەسـەری خێـرا "وەك ئەسـپرین و لـەفاف بـۆ خەسـڵەتە رەوشـتی‌یـە خودییـەکان، نازانین ئەو ئازارە تیژە ئەنجام و بەرهەمی کێشەیەکی کۆنترو قوڵترە. جا ئەگـەر هـەر بـەردەوام بـین لـە چارەسـەری نیشانەکان و دەست نەکـەین بـە چارەسـەری کێشـەکە، ئەوا هـەمو هـەوڵ و تەقەلایـەکمان بـەفیڕۆ دەڕوات و لەوانەیـە ئـەنجامی پێچەوانەشی

لێ بکەوێتەوەو تاقە دەستکەوێت کە بتوانین بەدەستی بهێنین تەنیا شاردنەوەی ئازارە درێژخایەنەکە دەبێت.

ئێستاش پێش ئەوەی بیر لە پەیوەندی کاریگەر بکەیتەوە لەگەڵ خەڵکیدا، وەرە پێکەوە بچینەوە بۆلای پێناسەکەی کاریگەریی. وتمان کاریگەریی بریتییە لە هاوسەنگی نێوان بەرهەم و توانای بەرهەمهێناندا. هەروەها وتمان چەمکێکی بنەڕەتیشە لە چیرۆکی قازەکە و هێلکە ئاڵتونییەکەدا.

لە بواری هاوکاریکردنی خولقێنەردا —یەکتر تەواوکردن- هێلکە ئاڵتونییەکە، بریتییە لە کاریگەرێتی و کارتێکردن و یەکترتەواوکردنە سەرنجڕاکێشەکە .. دەرەنجامەکەش زادەی پەیوەندیی کراوەو کارلێکی ئەرێنییە لەگەڵ خەڵکیدا. ئێمە ئەگەر بمانەوێت هەمیشە و بە شێوەیەکی رێك‌وپێك ئەم هێلکە ئاڵتونییەمان دەست بکەوێت، پێویستە بایەخ بدەین بە مریشکەکە. پێویستمان بەوەیە ئەو پەیوەندییانە دروست بکەین و بیانپارێزین کە ئەو ئەنجامانە مسۆگەر دەکەن.

جا پێش ئەوەی لەم خاڵی روانگەیەوە دابەزینە خوارێ و بچینە لای خووەکان، لەوەوە حەزدەکەم بابەتێکتان پێ بناسێنم کە بە بڕوای من کۆدێکی بەهێزە بۆ باسکردنی پەیوەندییەکان و پێناسەکردنی هاوسەنگی نێوان بەرهەم و توانای بەرهەمهێنان لەم واقیعەی ژیاندا کە واقیعێکە مرۆڤەکان و پەیوەندییەکان تیایدا یەکتر تەواو دەکەن.

## پاشەکەوتی بانقی سۆزداریی

هەمومان دەزانین ژمارەی حسابی بانقی دارایی چییە. پارەی تیا دادەنێنین و پاشەکەوتێك دروست دەکەین کە لەکاتی پێویستدا دەتوانین لێی رابکێشین. ژمارە حسابی بانقی سۆزدارییش خوازراوێکی مەجازییە بۆ گوزارشتکردن لەبڕی ئەو متمانەیەی کە لە پەیوەنییەکدا پاشەکەوت دەکرێت. هەستکردنە بە سەلامەتی لەگەڵ کەسێکی دیکەدا.

من ئەگەر لە پەیوەندییم لەگەڵ تۆدا راستگۆیی و دەستپاکیی و میهرەبانی و جوامێری بنوێنم و بەڵێنەکانم ببەمەسەر، مانای وایە پاشەکەوتێکی چاکم لە بانقی سۆزداریدا لای تۆ هەیە. متمانەی زۆرم پێدەکەیت و دەتوانم لەکاتی پێویستدا سود لەو متمانەیە وەربگرم. تەنانەت دەتوانم هەڵەش بکەم و ئاستی بەرزی متمانەکە

قەرەبوی هەڵەکە بکات. ڕەنگە شێوازی بیروڕا گۆڕینەوەکە لەگەڵ تۆدا زۆر رون نەبێت بەڵام تۆ لە واتا گشتییەکە تێدەگەیت و تەنانەت بە وشەیەکیش هەستم بریندار ناکەیت و کاتێك کە لە پاشەکەوتی متمانە پاشەکەوتێکی زۆر هەبێت، ئەوا پەیوەندی و لێکتێگەیشتن دەبنە کارێکی ئاسان و کاریگەر و ڕاستەخۆ.

بەڵام ئەگەر ڕەوشت بەرزیت لەگەڵدا نەنوێنم و ڕێزت نەگرم و کە قسەت کرد قسەکەت پێ ببڕم و فەرامۆشت بکەم و کاردانەوەی توندت بەرامبەر بنوێنم و سەرکوتکەرانە رەفتار بکەم و ناپاکیت لەگەڵدا بکەم و بۆت ببمە مایەی هەڕەشە و درۆت لەگەڵدا بکەم، ئەوا دواجار پاشەکەوتی ژمارە حسابی بانقی سۆزدارییەکە تەواو دەبێت و هیچ متمانەیەك نامێنێت. لەکاتی وادا من دەتوانم چی بکەم؟ هیچ .. وام لێ دێت وەکو بەناو کێڵگەی میندا بڕۆم وایە. پێویستە بەوپەڕی وریاییەوە قسە بکەم و باش باش بزانم چی دەڵێم. پاشەکەوتی بانقی سۆزداریی قەڵایەکە مرۆڤ لە هەمو کارو چالاکییەکدا پاڵی پێوە دەدات و زوربەی خێزان و هاوسەرەکان ئەم ژمارە حسابەیان هەیە.

پێویستە پاشەکەوتەکە بە گەورەیی بهێڵرێتەوە بەوەی کە بەردەوام بیخەیتە سەری ئەگینا هاوسەرگیرییەکە گەندەڵ دەبێت و تێك دەچێت. لەبری لێکتێگەیشتن و پەیوەندی گەرمو خۆڕسك،ماڵەکە دەبێتە مۆتێل و هەردولا هەوڵ دەدەن سەربەخۆبن و جۆرێك لە ڕێز و لێبوردەیی و قبولکردن لەخۆ بگرێت، یاخود ڕەنگە پەیوەندییەکە زیاتر تێك بچێت و ببێتە جۆرێك لە دوژمنایەتی و کاردانەوەو وەرگرتنی هەڵوێستی بەرگریکاری (شەڕکردن یاخود هەڵاتن) کە ئەمەش شەڕە قسەو شاتەشات و زویربون و قسە لەگەڵ یەکدا نەکردن و کرۆزانەوەی لێ دەکەوێتەوەو ڕەنگە دواجار ببێتە هۆی سەرهەڵدانی جەنگێکی سارد لە ماڵەکەدا، ئەو ماڵەی کە ڕەنگە لەژێر گوشارە کۆمەڵایەتییەکان و لەبەر خاتری مناڵەکان و پەیوەندییەکانی هاوسەرگیرییدا بمێنێتەوە یاخود ڕەنگە کێشەکە بچێتە دادگا و ماوەیەکی زۆر درێژە بکێشێت و ژنو مێردەکە ببنە تەحاتەحای خەڵکەکە.

ئەم ژمارە حسابەی بانقی سۆزداری زادەی پەیوەندییە گەرمو قوڵ و ئومێدبەخشەکانی نێوان دووکەسە. روناکییە ڕێنماییکەرەکەی هاوسەنگی نێوان بەرهەم و توانای بەرهەم لێرەدایە، لەم ژمارە حسابەدایە و مرۆڤ بەدەست

خۆیەتی چۆن رەفتار دەکات. دەتوانێت رێنماییەکە فەرامۆش بکات و دەشتوانێت بیکاتە چاوساغی خۆی.

پەیوەندییە گرنگ و سەقامیگرەکانی وەکو هاوسەرگیری پێویستیان بەوەیە بەردەوام پاشەکەوتی باشیان بخەیتە سەر. دیارە لەگەڵ هاتنە پێشەوەی بارودۆخی تازەو لەگەڵ دەرکەوتنی هیواو داخوازی نوێدا پاشەکەوتە کۆنەکان وردە وردە دەپوکێنەوە. بۆ نمونە تۆ ئەگەر کتوپڕ چاوت کەوت بە هاورێیەکی کۆنی سەردەمی خوێندن کە ساڵانێکی دوورودرێژە نەتیبینیوە. دەتوانیت بیناسیتەوە چونکە پاشەکەوتی کۆن هەن کە هێشتا ماون. بەڵام مەسەلەکە لەگەڵ ئەو کەسانەدا جیاوازە کە بەردەوام هەڵسوکەوتت هەیە لەگەڵیاندا. لەگەڵ ئەمانەدا پێویستت بە سەرمایەگوزاریکردنی نەگۆڕ و بەردەوام هەیە.

زۆر لەوکەسانە، بەتایبەت لەگەڵ هەرزەکارەکانیماڵەوەدا، هەڵسوکەوتی رۆژانەت لەگەڵیاندا یاخود توانای تێگەیشتنیان لێت وا دەکەن بەردەوام لە پاشەکەوتەکە رابکێشرێت.

گریمان تۆ کوڕێکی هەرزەکارت هەیە و هەمیشە گفتوگۆکەت لەگەڵیدا بەم شێوەیەیە: "ژوورەکەت پاك بکەرەوە، قۆپچەی کراسەکەت دابخە، رادیۆکە کزبکە، بچۆ سەرت بتاشە، زبڵەکە فرێ بدە." دیارە پاش ماوەیەك راکێشانەکە دەگاتە ئاستێك کە لە هەمو پاشەکەوتەکان زیاتر دەبێت. ئێستا وای دابنێ ئەم کوڕەت سەرقاڵی بیرکردنەوەیە لە مەسەلەیەك کە بڕیاردان لێی کارێکی گەورە دەکاتە سەر هەمو ژیانی، بەڵام ئاستی متمانەکەی نێوانتان لەوپەڕی نزمیدایە و کەناڵەکانی پەیوەندییش داخراون. لەبەرئەوە گوێ لە ئامۆژگارییەکانت ناگرێت. خۆ رەنگە تۆ بایی ئەوە حیکمەت و زانیاریت هەبێت بتوانیت یارمەتی بدەیت بەڵام لەبەرئەوەی پاشەکەوتی ژمارە حسابەکەت سفرە، هیچت پێ ناکرێ و ئەو بڕیارێکی خراپ لە مەسەلەکە دەدات کە ئاکامێکی خراپ و درێژخایەنی دەبێت. کەواتە پەیوەندیکردن لەبارەی ئەم مەسەلانەوە پێویستی بەوەیە ژمارە حسابەکەت پاشەکەوتێکی باشی تێدا بێت. تەگبیر چییە؟

دەست بکە بە دانانی پاشەکەوت لە پەیوەندییەکەدا. لەکاتی گونجاودا چاکەیەکی سادەی لەگەڵدا بکە. بۆ نمونە گۆڤارێکی بۆ بهێنەرەوە کە خۆی حەزی لێی بێت.

یاخود ئەگەر ببینیت سەرقاڵی شتێکە ئامادەیی خۆتی بۆ دەربڕە کە یارمەتی بدەیت، یاخود پێکەوە بچن بۆ شوێنێك، گەڕانێك. بەڵام لە هەموان گرنگتر ئەوەیە کە تەنیا هەر گوێی لێ بگریت. بێ ئەوەی حوکم بدەی بەسەریدا، یاخود ئامۆژگاری بکەیت، یاخود ئەزمونی رابردوی خۆتی بۆ بخوێنیتەوە. تەنیا هەر گوێی لێ بگرەو هەوڵ بدە تێی بگەیت. وای لێ بکە هەست بکات کە تۆ بایەخی پێ دەدەیت و وەکو مرۆڤێك قبوڵتە.

زۆر رێی تێدەچێت ئەو لەسەرەتادا وەڵامدانەوەی نەبێت، یاخود تەنانەت بکەوێتە گومانەوە و لە دڵی خۆیدا بڵێت "ئاخۆ بەم رەفتارە مەبەستی چی بێت؟ ئەمەیان چ بەزمێکە؟". بەڵام بەردەوامبون لە پاشەکەوتکردنی راستگۆی بێ فێڵ و فەرەجدا، وردە وردە پاشەکەوتەکەت بەرزدەکاتەوەو لەئەنجامدا پرۆسەی راکێشانی زۆر لە ژمارە حسابەکە کەم دەبێتەوە.

بیرت نەچێت چاکسازیی خێرا تراویلکەیە. دامەزراندن و چاککردنی پەیوەندییەکان کاتی دەوێت. لەبەر ئەوە ئەگەر مرۆڤێکی پشودرێژ نەبێت بەرامبەر وەڵامدانەوەی ئاشکرای رەفتارە خراپەکانی بەرامبەرت، رەنگە وات لێ بێت بڕێکی زەبەلاح لە پاشەکەوتەکەت رابکێشیت (رەفتارێکی زۆر توندو خراپی لەگەڵدا بکەیت) و هەرچییەکت کردبو تێکی بدەیتەوە.

(پاش ئەو هەمو رەنج و قوربانییەی کە بۆمان دایت، چۆن ئاوامان دەرهەق دەکەیت؛ ئێمە دەمانەوێت خزمەتت بکەین کەچی تۆ ئاوا چاکەمان دەدەیتەوە؟ ..)

ددان بەخۆداگرتن لە هەڵوێستی وادا کارێکی ئاسان نییە. بەڵام مەسەلەکە تەنیا پێویستی بەوەیە بتوانیت دەستپێشخەریی بنوێنیت و فۆکەس بخەیتە سەربازنەی کاریگەرێتییەکەی خۆت و رێ بە گەشەکردنی شتەکان بدەیت.

بەڵام بزانە چارەسەری خێرا شتێکە مەحاڵ. دروستکردن و چاککردنی پەیوەندییەکان سەرمایەگوزارییەکی درێژخایەنە

## شەش پاشەکەوتی مەزن

رێگەم بدە شەش پاشەکەوتی مەزن پێشنیار بکەم کە دەتوانن پاشەکەوتی بانقی سۆزداریی زیادبکەن

## تێگەیشتن لە کەسەکە

ڕەنگە یەکێك لە پاشەکەوتە هەرە گرنگەکان بریتی بێت لەوەی بەڕاستی هەوڵ بدەیت لە کەسەکەی بەرامبەرت تێبگەیت. ئەمە کلیلی هەمو پاشەکەوتەکانی دیکەیە. تۆ ئەگەر لە کەسەکەی بەرامبەرت تێنەگەیت، نازانیت ئەو کام شتەی بەلاوە گرنگ و پاشەکەوتە. بۆ نمونە ڕەنگە تۆ گەڕان و سەفەرو خواردنێکی تایبەتت بەلاوە گرنگ بێت و حسابی پاشەکەوتی بۆ بکەیت، بەڵام مەرج نییە منیش هەمان تێگەیشتنم لەو شتانە هەبێت و بە پاشەکەوتیان دابنێم بۆسەر بانقی پەیوەندییەکانمان، بەڵکو بە پێچەوانەوە ڕەنگە حەزم لێیان نەبێت و بە ڕاکێشانی حساب بکەم نەك بە پاشەکەوتکردن چونکە پێویستم پێیان نییە و لەگەڵ بەرژەوەندییە قوڵەکانی ناخمدا ناگونجێن.

پەیامی ژیانی کەسێك، بەلای کەسێکی دیکەوە هەر تەنیا وردەکارییە. لەبەرئەوە ئەگەر دەتەوێت پاشەکەوت بکەیت پێویستە ئەوەی بەلای کەسەکەوە گرنگە، تۆش بە گرنگی بزانیت. هێندەی گرنگی کەسەکە داخوازی و ئارەزووەکانشیت پێ گرنگ بن. تۆ ڕەنگە سەرقاڵی مەسەلەیەکی زۆر گرنگ بیت کە منداڵە شەش ساڵەکەت ئیشەکەت پێ دەبڕێت بۆ مەسەلەیەك کە بەلای تۆوە بێبایەخە؛ بەڵام لای ئەو ئەوپەڕی بایەخی هەیە. شرۆڤەکردنی خووی ژمارە (٢) بوارت دەداتێ خۆت کەسەکە بناسیت و بایەخەکەشی تێبگەیت، خووی ژمارە (٣)یش بوارت بۆ دەرەخسێنێت پلانەکانت بخەیتە خزمەت ئەو ڕیزبەندییە مرۆڤایەتییەوە. تۆ ئەگەر نرخ بۆ قسەو ئارەزووەکانی کەسەکەی بەمبەرت دابنێیت دەیسەلمێنیت کە تێی گەیشتیوت، ئەمەش بە پاشەکەوتێکی مەزن حساب دەکرێت.

هاوڕێیەکم هەیە کوڕەکەی زۆر خولیای یاری بەیسبۆڵە، بەڵام هاوڕێکەم هەرگیز بایەخی بەم یارییە نەداوە. کەچی جارێکیان لە ڕۆژێکی هاویندا کوڕەکەی برد بۆسەیری یارییەکی بەیسبۆڵ. گەشتەکە هەم پارەیەکی زۆری تێچو، هەم کاتێکی زۆریشی برد، بەڵام بووە ئەزمونی پێکەوە گرێدانێکی بەهێزی پەیوەندییەکەیان. کوڕەکە لە باوکی پرسی: تۆ ئەوەندە حەزت لە بەیسبۆڵە. هاوڕێکەم وەڵامی دایەوە: نەخێر، بەڵام کوڕەکەمم هێندە خۆش دەوێت.

هاوڕێیەکی دیکەم هەیە مامۆستای زانکۆیە .. ئەم هاوڕێیەم پەیوەندییەکی زۆر

خراپی هەبو لەگەڵ کوڕەکەیدا. ئەم کابرایە هەمو ژیانی خۆی تەرخان کردبو بۆ کارەکەی. هەستیشی دەکرد کوڕەکەی لە جیاتی ئەوەی خەریکی کاری هزری بێت، هەمیشە خەریکی کاری جەستەیی‌یە. باوکەکە ئەمەی پێناخۆش بو .. دەیوت ژیانی خۆی خەسار دەکات. لەبەرئەوە هەمیشە ناکۆکییان هەبو. زۆرجار، لە ساتەوەختی پەشیمانیدا هاوڕێکەم هەوڵی دەدا لە بانقی سۆزداری کوڕەکەیدا پاشەکەوت بکات بەڵام هەوڵەکەی شکستی هێنا. کوڕەکە وا لێک دەدایەوە کە ئەم هەوڵانەی باوکی جۆرێکی تازەی رەتکردنەوەو لێ رازینەبون و بەراوردکاریی و دادگاییکردنە. پەیوەندییەکە هێندەی دیکە خراپ بو، ئەمەش دڵی باوکەکەی زۆر ناڕەحەت دەکرد.

رۆژێکیان من و ئەو هاوڕێیەم پێکەوە گفتوگۆمان لەسەر ئەو پرنسیپە کرد کە دەڵێت: تۆ چەند کەسەکەت لەلا گرنگ بێت هێندەش بایەخ بەو شتانە دەدەیت کە بەلایەوە گرنگن. هاوڕێکەم بەدڵ ئەم پرنسیپەی وەرگرت و لەگەڵ کوڕەکەیدا دەستیان کرد بە پرۆژەی دروستکردنی حەسارێك بە دەوری ماڵەکەیاندا. پرۆژەکە کاتێکی زۆری خایاند و زۆریش ماندوی کردن. ساڵونیوێك زیاتر پێکەوە کاریان کرد.

لەرێی ئەم ئەزمونەوە منداڵەکە ئەو قۆناغەی لە ژیانیدا تێپەڕاند و ئارەزوویەکی قوڵ و راستەقینەی تێدا دروست بو کە شارەزاییە ئەقڵییەکانی برەو پێبدات. بەڵام گرنگترین سود بە پەیوەندییەکەی نێوانیان گەیشت کە لەجیاتی خراپی و ناڕەحەتییەکەی جاران بووە سەرچاوەی هێز و بەختەوەریی، بۆ کوڕەکەش و باوکەکەش.

ئێمە بە شێوەیەکی گشتی لە بیرەوەرییەکانی خۆمانەوە تەماشای جیهان دەکەین و هەوڵ دەدەین وای لێك بدەینەوە کە ئەوەی خۆمان پێمان خۆشە، خەڵکەکەش پێیان خۆشە. ئامانج و مەبەستەکانمان بەسەر رەفتاری خەڵکیدا دەسەپێنین. تەنیا ئەو مەسەلانەش بە پاشەکەوت حساب دەکەین کە لەگەڵ پێویستی و ئارەزووە تایبەتەکانی خۆماندا بگونجێن. ئیتر گرنگ نیيە پێویستی و ئارەزووە تایبەتەکانی ئێستابن یاخود هی ئەوسەردەمەی ژیانمان کە بەقەدەر ئێستای کەسەکە دەبوین. خۆ ئەگەر بەرامبەرەکەمان ئەم هەوڵەمان بە پاشەکەوت حساب نەکات و وەکو ئێمە تەماشای نەکات مانای وایە رەنجەکەمان رەت دەکاتەوە کە بەوپەڕی نیازپاکییەوە

کێشاومانەو لەئەنجامدا ئیتر واز دەهێنین.

یاسایەکی ئالتونی هەیە دەڵێت: "ئەوە پێشکەشی خەڵکی بکە کە حەزدەکەیت پێشکەشتی بکەن" واتا رواڵەتییەکەی قسەکە ئەمەیە: مرۆڤ ئەو شتە دەبەخشێت و پێشکەشی دەکات کە حەزدەکات پێشکەشی بکرێت. حەزت لەچی بێت ئەوە دەدەیت بە خەڵکی. بەڵام واتا قوڵ و گەوهەرییەکە ئەوەیە بە قوڵی لە بەرامبەرەکە تێبگەیت. چۆن پێت خۆشە خەڵك تێت بگات پێویستە خۆیشت ئاوا لە خەڵکەکە بگەیت. کە ئەممەت کرد ئیتر دەتوانیت لە روانگەی ئەو لێکتێگەیشتنەوە هەڵسوکەوت بکەن لەگەڵ یەکتریدا. لەم بارەیەوە باوکێکی سەرکەوتو ئاوا باسی پەروەردەی منداڵ دەکات: هەمویان وەکو یەك پەروەردە بکە بەوەی کە لەگەڵ هەریەکەیاندا بە شێوازێکی جیاواز رەفتار بکەیت

## بایەخدان بە مەسەلە بچوکەکان

زۆر گرنگە هەمیشە کەسێك روخۆشی و نەرمونیانی بۆ بەرامبەرەکەی دەرببرێت. بێڕێزی کردن و گرژی و بێئیسوڵێنواندن چەندە کەمیش بن، بڕێکی زۆر سەرمایە رادەکێشن لە بانقی پەیوەندییەکاندا، چونکە لە دنیای پەیوەندییەکاندا شتە گەورەکان هەمان شتە بچکۆلەکانن.

ئەو ئێوارەیەم چاك لەبیرە کە چەند ساڵێك لەمەوبەر لەگەڵ دوان لە منداڵەکانمدا بوم. سەیرانێکی ئاسایی بو. کەمێك یارییان کردو تۆزێك خواردن و میوەو شەربەت و ئینجا تەماشای فلیمێکمان کرد.

لە ناوەڕاستی فیلمەکەدا، خەو زۆری بۆ (شین) هێنا کە ئەوکاتە تەمەنی چوار ساڵ بو. بەڵام (ستیڤن)ی برای گەورەی کە شەش ساڵان بو بە بێدارییەوە مایەوەو پێکەوە تەماشای فیلمەکەمان کرد هەتا تەواوبو. ئەوسا بە باوەش (شین)م هەڵگرت و بردمە ناو ئوتومبیلەکەوە و لەدواوە پاڵم خست. ئەو ئێوارەیە زۆر ساردبو، لەبەرئەوە پاڵتۆکەم لەبەری خۆم داکەندو بە هێواشی ئەوم پێ داپۆشی کە خەوی لێ کەوتبو.

کە گەیشتینە ماڵەوە، بە خێرایی (شین)م داگرت و خستمە ناو جێگاکەی خۆیەوە و جوان دامپۆشی. (ستیڤن)یش بیجامەی لەبەرکردو ددانەکانی شۆری و لە تەنیشتییەوە پاڵ کەوتم بۆ ئەوەی پێکەوە باسی گەڕانەکە بکەین.

- سەیرانەکە چۆن بو ستیفن؟

وەڵامی دامەوە: خۆش بو

- چێژت لێ بینی

★ بەڵێ؟

- خۆشترین شت کامەیان بو

★ نازانم .. پێم وایە پیاوە هەزەلییەکە بو

- راست ئەکەی .. شتی خۆشی دەکرد. سیحر و قەڵەمبازو ..

ستیفن وەڵامی پێنەبو. هەستم کرد قسە لەگەڵ خۆمدا دەکەم. بەڵام کە بێدەنگییەکەی درێژەی کێشا بە تەواوی واقم ورما. چونکە ئەو بەوە ناسراوە کە لەوجۆرە دۆخانەدا حەزی لە قسەیە. هەستم کرد کێشەیەك هەیە چونکە بە درێژایی رێگاکە و هەتا ئەوکاتەش هەر بێدەنگ بو. لەپڕ روی کردە دیوارەکە. سەیرم پێهات کە لێی وردبومەوە دەبینم چاوی پڕبووە لە فرمێسك.

- چیتە ئازیزەکەم؟ چی رویداوە؟

روی تێکردمەوە. هەستم کرد نارەحەتە لەوەی چاوی پڕە لە فرمێسك و لێوەکانی دەلەرزن "بابە. ئەگەر منیش سەرمام بوایە، بە پاڵتۆکەت منیشت دادەپۆشی؟"

ئەها .. لەناو هەمو رووداوی ئەو ئێوارە تایبەتەدا کە خۆم و دوو مناڵە بچکۆلەکەم پێکەوە بوین تەنیا رەفتارێکی سادە لە دەربڕینی سۆزو بەزەیی بەرامبەر مناڵێکی بچکۆلەی خەوتو گرنگترین رووداوە — دەربڕینی خۆشەویستی بۆ برا بچکۆلەکەی بە شێوەیەکی خۆڕسك و خێرا.

ئای کە دەرسێکی بەهێز لەو ئەزمونە تایبەتەوە فێربوم. هەتا ئێستاش هەر شتی لێوە فێردەبم و هەرگیز بیرم ناچێتەوە. مرۆڤ لەناوەوە ناسکتر و هەستیارترە. نە ئەزمون و نە تەمەن کاریان بەسەر ئەم هەستەوە نییە. تەنانەت ئەوانەش کە بەرواڵەت دڵڕەق دیارن لە ناخدا هەستیارو دڵ ناسکن.

## پەیمان بردنە سەر

پاراستنی گفت و بەڵێنەکان و جێبەجێکردنیان بە پاشەکەوتکردنێکی مەزن حساب دەکرێت لە ژمارە حسابی بانقی سۆزدارییدا. دیارە پێچەوانەکەشی راستە و

ئەگەر تۆ بەڵێنێك بە کەسێك بدەیت و نەیبەیتەسەر ئەوا گەورەترین بڕە سەرمایەت لە ژمارە حسابەکەت راکێشاوە. کەسەکە ئیتر بڕوا بە هیچ بەڵێنێکت ناکات. مرۆڤ بەگشتی هیواکانیان لەسەر بەڵێنە تایبەتەکان هەڵدەچنن، بەتایبەت ئەو بەڵێنانەی کە پەیوەستن بە بژێوی ژیانیان.

من وەکو باوکێك هەوڵم داوە هەرگیز بەڵێنێك نەدەم کە نەتوانم بیبەمە سەر، هەروەها هەوڵیش دەدەم هەتا دەتوانم دەست بگرمەوە لە بەڵێندانی زۆردا و ئەوەم لەبەرچاوبێت کە بارودۆخەکان هەمیشە چاوەڕوانی گۆڕان و هەڵگەڕانەوەیان لێ دەکرێت، بۆ ئەوەی لە خۆمەوە بەڵێن و پەیمان نەدەم.

بەڵام هەندێك جار سەرباری هەموو وریاییەکیش، بابەت و روداوی وا دێنە پێشەوە کە (یان) مەحاڵە بەڵێنەکە جێبەجێ بکرێت یاخود جێبەجێکردنەکەی دەبێتە شتێکی زیان بەخش‌و نیشانەی بێ ئەقڵیی. لە دۆخی وادا من بەڵێنەکە هەڵدەسەنگێنم و ئینجا (یان) ئەوەتا بەهەر نرخێك بێت جێبەجێی دەکەم، یاخود بە دورودرێژی هەڵوێستەکە بۆ ئەوکەسە رون دەکەمەوە و داوای لێ دەکەم ئازادم بکات لەو بەڵێنە.

رێزگرتنی بەڵێنەکان و جێبەجێکردنیان وا دەکات پردی متمانە دروست ببێت. تۆ ئەگەر پەیوەندیت لەگەڵ منداڵەکەتدا باش بێت و لێکتێگەیشتن لەنێوانتاندا لە ئاستێکی بەرزدا بێت، ئەوکاتە ئەگەر ئەو داوای شتێکی لێ کردیت و تۆ بە ئەزمون و بە تەمەنی خۆت توانیت ئەو دەرەنجامە ببینیت کە منداڵەکەت نایبینێت، پێی بڵێ "رۆڵە گیان ئەگەر وا بکەیت دڵنیابە ئەنجامەکەی ئاوا دەبێت". ئەمە باشترین رەفتارە چونکە منداڵەکە بەقسەت دەکات بە مەرجێك تۆ پێشتر توانیبێتت متمانەی لەلا دروست بکەیت و باوەڕی بە قسەو بەڵێنەکانت هەبێت.

## رونکردنەوەو لێکدانەوەی چاوەڕوانییەکان

بیهێنەرە بەرچاوی خۆت بزانە چەند زەحمەتت دێتە رێ ئەگەر خۆت و سەرۆکەکەت بۆچونی جیاوازتان هەبو دەربارەی ئەوەی کێ بۆی هەیە ئەرك و دەسەڵاتەکانی تۆ دیاری بکات.

تۆ دەپرسیت: "کەی ئەرك و دەسەڵاتەکانم بۆ رون دەبێتەوە؟"

سەرۆکەکەت رەنگە وەلامت بداتەوە بلێ: "وام دەزانی فۆرمێك دەهێنیت لەوبارەیەوە و نیشانمی دەدەیت تا پێکەوە گفتوگۆی لەسەر بکەین.

- بەلام وابزانم ئەوە ئیشی تۆیە ئەرك و دەسەلاتەکانم دیاری بکەیت

* نەخێر بە هیچ جۆرێك ئیشی من نییە؛ بیرت نایەت یەکەمجار چیم پێ ویتیت؟ وتم شتەکە بەدەست خۆتە و پەیوەندی بەوەوە هەیە چەند کاردەکەیت"

- من وامزانی مەبەستت لەوەیە ئیشەکە بە باشی بکەم و بەس ئەوانی دیکە لەسەر تۆیە و تۆ بۆم دیاری دەکەیت

تەمومژ لە چاوەڕوانییەکاندا بەتایبەت لە مەسەلەی ئامانجەکاندا زیان بە گفتوگۆ و بە متمانەکانیش دەگەیەنێت.

- هەرچیەکت داوا لێ کردم ئەنجامم داوەو ئەمەش راپۆرتەکەیە

- راپۆرتم بۆ چییە؟ لای من گرنگ ئەوەیە کێشەکە چارەسەرببێت. نەك شی بکەیتەوەو راپۆرتی لەسەر بنوسیت

* وامزانی ئامانجەکە دەستنیشانکردنی کێشەکەیە و دەمانتوانی روبەروی کەسێکی دیکەی بکەینەوە.

"چەند جار ئێمە باسی ئەم کێشەیەمان کردووە؟"

* تۆ وتت ..

* نەخێر تۆ هەڵەیت. هەرگیز تۆ بە منت نەوتوە کە پێویستە .."

"بەلێ وتم .. بە ئاشکرا پێم وتیت ...."

"هەرگیز شتی وات باس نەکردووە .."

"نەخێر ئێمە لەسەر ئەوە رێك کەوتین"

لە مەسەلەی پەیوەندییەکاندا بەشێکی زۆری کێشەکان زادەی تەمومژن لە چاوەڕوانی و لێکدانەوەکاندا دەربارەی رۆڵ و ئامانجەکان. مەسەلەکە هەرچییەك بێت دەبێت بزانیت کە تەمومژ لە داواکاری و چاوەڕوانییەکاندا دەبێتە خراپ لێك حالیبون و نائومێدی و راکێشانی زۆر لە پاشەکەوتی ژمارە حسابی متمانەدا.

بەشێکی زۆری چاوەڕوانیەکان ئاشکرانین، بەلکو لە دلدان، کەچی لە هەلوێستی دیاریکراودا دەبینیت کەسەکە دەری دەبڕێت. بۆ نمونە لە هاوسەرگیریدا، کە ژن و

پیاوەکە پێشبینی و چاوەڕوانی وایان هەیە کە پێشتر نە دەریان بڕیوەو نە گفتوگۆیان لەسەرکردووە بەڵام ئەگەر لایەنەکەی بەرامبەر پێچەوانەی چاوەڕوانییەکەی ئەم بکات زیانێکی گەورە بە پەیوەندییەکان دەگەیەنێت و بڕێکی زۆر لە پاشەکەوتەکەی رادەکێشێت.

بۆیە زۆر گرنگ و پێویستە هەمو چاوەڕوانییەکان دەرخەیت و بیانخەیتە بەرچاو. مرۆڤ بە سروشت وا دروست بووە کە لە هەڵوێست و رووداوە تازەکاندا لەرێی ئەو چاوەڕوانییەوە حوکم بەسەر بەرامبەرەکەیدا دەدات و ئەگەر هەست بکات شتەکە بەپێی پێشبینی و چاوەڕوانییەکەی ئەم نەبووە ئەوا پاشەکەوتەکە متمانەی لێی کەم دەبێتەوە. ئێمە زۆرجار بۆیە هەڵوێستی نەرێنی وەردەگرین چونکە پێمان وایە چاوەڕوانیەکانمان روون و ئاشکران و بەرامبەرەکەمان بە باشی تێیان گەیشتووە.

پاشەکەوتکردن لەم بوارەدا ئەوەیە هەر لە سەرەتاوە چاوەڕوانییەکان روون و ئاشکرابن، ئەمەش بەوە دەستبەردەبێت کە هەوڵی تەواو بدەیت و کاتی گونجاو ببەخشیت بە رونکردنەوەی داخوازی و چاوەڕوانییەکان. هەر هەوڵ و هەر ماوەیەك لەمەدا تەرخان بکەیت، دواتر کات و ماندوبونێکی زۆرترت بۆ دەگەڕێتەوە. ئەگەر چاوەڕواییەکان و پێشبینییەکان رون و ئاشکرا نەبن و خەڵکەکە بەشدار نەبن لەگەڵماندا ئەوا لێکحاڵینەبونە سادەکان ئاڵۆز دەبن و شەڕی قورسیان لێ دەکەوێتەوە و پەیوەندییەکان دەپچڕێن.

رونکردنەوەی چاوەڕوانییەکان زۆرجار پێویستی بە ئازایەتییەکی بەرچاو هەیە و هەندێك جاریش وا ئاسانترە بە جۆرێك رەفتار بکەیت وەك ئەوەی هیچ ناکۆکییەك لەگۆڕێدا نەبێت، بەهیوای ئەوەی ئیشەکە بڕوات. ئەمە لەبری ئەوەی ناچاربیت روبەروی ناکۆکیەکان بوەستیت و پێکەوە کاربکەن بۆ گەیشتن بە کۆمەڵە ئامانجێکی هاوبەش کە لەسەری رێك کەوتون.

## نیشاندانی پاکی (نەزاهە)

پاکیی خوڵقێنەری متمانەیە و بناغەی زۆرێك لە پاشەکەوتە جیاجیاکانە. نەبونی نەزاهە دەتوانێت زیان بە هەمو هەوڵەکانی دیکە بگەیەنێت کە بۆ

پاشەکەوتی چاکی متمانە دەدرێن. تۆ رەنگە بتوانیت لەگەڵ بەرامبەرەکەتدا بە باشی لێك تێبگەن و رەنگە بشتوانیت مەسەلە بچکۆلەکانت لەبیربێت و بەڵێنەکان ببەیتە سەرو پێشبینی و چاوەڕوانییەکانت رون بکەیتەوە، بەڵام ئەگەر لە ناخەوە ریاکارو دووڕوو بیت ناتوانیت متمانەی کەس بەدەست بهێنیت.

پاکیی مرۆڤ تەنیا هەر راستگۆیی نییە. راستگۆیی بریتییە لەوەی قسەی راست بکەیت – واتە قسەکانمان لەگەڵ واقیعدا چون یەك بن. پاکی (نەزاهە) بریتییە لەوەیواقیع بە قسەکانمان چون یەك بکەین. "واتە بەڵێنەکان بەرینە سەرو چاوەڕوانییەکان جێبەجێ بکەین. ئەمەش پێویستی بە کەسایەتی کامڵ هەیە و لە هەنگاوی یەکەمیشدا پێویستی بەوەیە لەگەڵ ناخی خۆیدا و ئینجا لەگەڵ ژیاندا (یەك) شت بێت.

یەکێك لە شێوازەکانی نیشاندانی پاکی ئەوەیە کە دڵسۆزبیت بۆ ئەو کەسانەی کە لێرە نین. ئەمە وا دەکات متمانە دروست بکەیت لەگەڵ ئەوانەدا کە لێرەن. بە بەرگری کردن لەوانەی کە خۆیان لێرەنین، متمانەی ئامادەبوان بەدەست دەهێنیت.

گریمان من و تۆ دووقۆڵی دانیشتوین و قسەدەکەین. رەخنە لە لێپرسراوەکەمان دەگرین بە جۆرێکی وا کە ئەگەر خۆی لێرەبێت نەوێرین ئاوا قسە بکەین. باشە ئەگەر من و تۆ رۆژێك لە رۆژان بو بەشەڕمان، ئایا دڵنیانیت لەوەی کە هەمو عەیب و عارو ناتەواوییەکانت بۆ کەسێکی دیکە باس دەکەم؟ وەك چۆن لە پاشملە زەمی لێپرسراوەکەمان کرد ئاواش زەمی تۆ دەکەم. سروشتی من شارەزایت و دەزانیت بەرەوڕوو قسەی خۆشت بۆ دەکەم و لە پاشملە بەخراپی باست دەکەم. چونکە شتی وات لێ بینیوم.

ئەمە کرۆکی دووڕوویی و مونافیقییە. ئایا من بەم شێوەیە دەتوانم خاوەنی هیچ پاشەکەوتێکی متمانە بم لەلای تۆ.

بەڵام ئەگەر گریمانەکە وا دابنێین کە تۆ دەستپێشخەریی بکەیت لە زەمکردنی سەرۆکەکەماندا و رەخنەی لێ بگریت، منیش پێت دەڵێم کە بە شێوەیەکی بنەڕەتی لەگەڵ ناوەڕۆکی هەندێك لە رەخنەکانتدام و پێشنیارم بۆ کردیت هەردوکمان بەجوتە بچینە لای و رای خۆمانی پێ بڵێین کە دەبوایە چۆن کارەکانی ئەنجام

بدایە. ئەوسا تۆ بە چاوێکی دیکە تەماشام دەکەیت و دڵنیاییت لەوەی ئەگەر کەسێك هات و لە پاشملە زەمی تۆی کرد، من چۆن وەڵامی دەدەمەوە.

نمونەیەکی دیکە: گریمان من بۆ ئەوەی پەیوەندیت لەگەڵدا دروست بکەم راوبۆچون و قسەیەکت لابدرکێنم کە پێکەوە لەگەڵ کەسێکی دیکەدا هاوبەشین و ئەم مەسەلەیە نهێنییەکەو نابێت کەس بیزانێت. "ئەوی راستی بێت ئەمە نهێنییەو نابێ پێت بڵێم" رەنگە بڵێم ".. بەڵام چونکە تۆ هاورێمیت .." ئایا من بەم ناپاکییەم دەرهەق بە کەسێکی دیکەو هەڵماڵینی نهێنییەکە دەتوانم پاشەکەوتی متمانە لە بانقەکەمدا لای تۆ بکەم؟ یاخود، ئەگەر نهێنییەکم پێ بڵێیت و من بڵێم قوربان گیان بیستومە، فیسارکەس پێی وتم، ئایا بەمە توشی شۆك نابیت؟

ئەم هەڵوێست و رەفتارە رەنگە بە رواڵەت پاشەکەوتکردن بێت لای کەسەکەی کە قسەکانی بۆ دەکەیت، بەڵام لەراستیدا پاشەکەوتکردن نییە بەڵکو لێ راکێشانە، چونکە رەفتارێکە پاکیی خۆتی پێ کەم دەبێتەوەو دەیسەلمێنیت کە ئەمین و زمان پاك و نهێنی پارێزنیت.

تۆ بەم رەفتارەت رەنگە هێلکە ئاڵتونییەکەت بە شێوەیەکی کاتی دەست بکەوێت و چێژ ببینیت لە زەلیل کردنی کەسێکی دیکە یاخود لە پشت شکاندنیدا، یاخود بە بەشداریکردن لە زانیارییەکی گرنگدا، بەڵام ئەمە رەفتارێکە قازەکەی تێدا دەکوژرێت و پەیوەندییەکەت لەگەڵ ئەو کەسەدا لاواز دەکات کە دەیتوانی بەختەوەریت بداتێ و ببێتە هاوکارت.

پاکی لە بواری متمانەدا، زۆر بە سادەیی بریتییە لە: رەفتارکردن لەگەڵ هەمواندا بەهەمان کۆمەڵە پرنسیپ. ئەگەر وابکەیت، خەڵك متمانەت پێ دەکەن. سەرەتا رەنگە خەڵکەکە ئەزمونە جوامێرانەکەی ئەو روبوروبونەوەیە نەنرخێنن کە پاکی (نەزاهە) دەیخوڵقێنێت. روبەروبونەوەکان پێویستیان بە ئازایەتییەکی زۆرەو رەنگە ئەمە لەگەڵ سروشتی زۆرینەی خەڵکەکەدا نەگونجێت کە حەزیان لە شتی ئاسان و رەخنەو قسەو قسەلۆك و پەیمانشکێنی و زەمو زەمکارییە. بەڵام تۆ ئەگەر رێگا سەختەکەی روبەروبونەوە بگریتە بەر ئەوا لە دوورمەودادا خەڵکەکە متمانەت پێدەکەن. رێزت لێ دەگرن بە مەرجێك کراوە و میهرەبان و جوامێر بیت لەگەڵیاندا.

ئەو پەندە زۆر راستە كە دەڵێت (متمانەت پێبكەن زۆر باشترە لەوەی خۆشیان بوێت.) من خۆم باوەڕی تەواوم هەیە كە مرۆڤ ئەگەر جێگەی متمانە بێت، ئەوا لەدوورمەودادا خۆشەویستیش دەبێت.

(چۆشوا)ی كوڕم كە منالّ بو زۆرجار پرسیارێكی لێ دەكردم كە پەیوەست بو بە خۆشرۆڤەكردنەوە. ئەو منالێكی زۆر هەستیارو دەست پاكو راستگۆبو، پەیوەندییەكەی نێوانیشمان لەوپەڕی باشییدا بو. هەركاتێك من بەرامبەر كەسێك كاردانەوەیەكی توندم هەبوایە یاخود سۆز و پشودرێژیم نەمایە، ئەو بە سادەیی دەیپرسی: "بابە، خۆشت دەوێم" مانای وابو، لەوكاتانەدا كە دەیبینی من بناغە و پرنسیپێكی بنەڕەتی ژیان بەرامبەر كەسێك دەشكێنم، گومانی ئەوەی لا دروست دەبو كە لەگەڵ ئەویشدا یاساو پرنسیپەكان دەشكێنم.

من وەكو مامۆستاو هەروەها وەكو باوكیش بۆم ساغ بۆتەوە كە كلیلی (٩٩)كە (١)ە، بەتایبەت ئەو یەكەی كە پشودرێژی و تاقەتی زۆربەی خەڵكەكە تاقی دەكاتەوە. ئەو (یەكە) خۆشەویستی و دیسپلینی تاقە خوێندكار و تاقە منالّەكەیە. ئەو (یەكە)یە كە خۆشەویستی دەگوێزێتەوە بۆ ئەوانی دیكە. چۆنێتی مامەڵەكردن لەگەڵ ئەو (یەكە)دایە كە دەریدەخات تۆ چۆن رەفتار لەگەڵ (٩٩)كەدا دەكەیت. چونكە هەمو كەسێك دواجار تەنیا (یەك)ێكە.

پاكی (نەزاهە) بریتییە لەوەش كە خۆت بەدووربگریت لە هەر گفتوگۆیەك بۆنی فێڵ و ریاكاریی و درۆی لێ بێت و مایەی رێزی خەڵكەكە نەبێت. (درۆ بریتییە لەو پەیوەندییەی كە ئامانجەكەی فێڵە). ئەمە یەكێكە لە پێناسەكانی درۆ. ئیتر پەیوەندییەكە بە قسە بێت یاخود بە هەڵسوكەوت. مرۆڤی پاك هەرگیز فێڵكردن ناكاتە ئامانج

## كە لە سەرمایەكەت راكێشا راستگۆیانە داوای لێبوردن بكە

ئەگەر هەستت كرد لە بانقی سۆزدارییدا سەرمایەت راكێشاوە پێویستە داوای لێبوردن بكەیت و راستگۆیانەش بیكەیت، چونكە پاشەكەوتی گەورە لە وشە راستگۆكاندایە

"من هەڵەبوم.

"ئەوەی کردم کارێکی خراپ بو"

"بێڕێزییم نواند بەرامبەرت"

"زۆر بەداخەوەم کە قەدری بەڕێزتم نەزانی"

"لەبەردەمی هاوڕێکانتدا بێزارم کردیت. نەدەبو شتی وابکەم. تەنانەت ئەگەر مەسەلەکەش رونکردنەوەی بویستایە هەرگیز نەدەبو وابکەم. بمبورە"

مرۆڤ بۆ ئەوەی بتوانێت خێراو لە دڵەوە، نەك لەروی بەزەییەوە، داوای لێبوردن بکات پێویستە خاوەنی کەسایەتییەکی بەهێز بێت. مرۆڤ پێویستە جڵەوی خۆی بەدەست خۆیەوە بێت و بە قوڵی هەست بە دڵنیایی و ئاسایش بکات دەرهەق بە پرنسیپە بنەڕەتییەکان و دەرهەق بە بنەماکان ئەگینا ناتوانێت راستگۆیانەو بێ هیچ فێڵ و تەڵەکەبازییەك داوای لێبوردن بکات.

ئەوانەی کە تەنیا خاوەنی برێکی کەم لە ئاسایش و دڵنیایین ناتوانن داوای لێبوردن بکەن، چونکە ئەوە هەستیاریان دەکات و زوو تورە دەبن و وا هەست دەکەن ئەگەر داوای لێبوردن بکەن مانای وایە مرۆڤی هەڵەشەو خاوەنی کەسایەتی لاوازن و دەترسن خەڵك سودی خراپ لە لاوازییەکانیان وەربگرن. لای ئەم جۆرە کەسانە ئاسایش بریتی‌یە لەوەی خەڵك بیروبۆچونی باشی هەبێت لەسەرت، لەبەرئەوە نیگەرانن لەوەی بەرامبەرەکە چۆن بیریان لێ دەکاتەوە. هەروەها ئەمانە بەجۆرێکن کە هەمیشە باوەڕیان بە کارەکەی خۆیان هەیەو لێی رازین و ئۆباڵی هەمو هەڵەیەك دەخەنە ئەستۆی کەسێکی دیکە. ئەگەر داوای لێبوردنیش بکەن شتەکە هەر روکەشەو لە دڵەوە نی‌یە.

حیکمەتێك هەیە دەڵێت: "ئەگەر چەمایتەوە بە زەلیلی بچەمێرەوە". داواکردنی لێبوردن بۆ ئەوەی ببێتە پاشەکەوتکردن پێویستە داوایەکی راستگۆبێت و پێویستە بەرامبەرەکەت هەستی پێبکات و بزانێت بەراستیتە. لیو رۆسکین دەڵێت: "لاواز ئەوکەسەیە دڵڕەقی دەنوێنێت. نەرمونیانی تەنیا هەر لە مرۆڤی بەهێز چاوەڕوان دەکرێت"

ئێوارەیەکیان من لە نوسینگەکەم سەرقاڵی نوسین بوم. نوسینەکەم دەربارەی هەمو شتێك بو لەسەر مەسەلەی پشودرێژیی. پاش ماوەیەك گوێم لە مناڵەکان بو لە هۆڵەکەدا رایان دەکردو غەڵبەغەڵبەیان بو. هەستم کرد خەریکە خۆم پێناگیرێت.

لەپڕ (دایڤید)ی کوڕم دەستی کرد بە لێدانی دەرگای حەمامەکە و بە هەمو هێزی خۆی هاواری دەکرد "بیکەرەوە، بیکەرەوە"

بە توڕەییەوە لە نوسینگەکەم هاتمە دەرێ و پێم وت: "دایڤید، ئەزانی ئەم هات و هاوارە چەند بێزارم دەکات؟ بیرم بۆ ناکرێتەوەو هیچم بۆ نانوسرێتەوە بڕۆرەوە ژوورەکەی خۆت و نەیەیتە دەرێ هەتا رەفتارت چاك نەکەیت." ئەویش بە بێزارییەوە رۆیشت و بە توڕەییەوە دەرگاکەی داخست.

کە گەڕامەوە نوسینگەکەم، کێشەیەکی دیکەم بینی. منالەکان یاری تۆپی پێیان دەکردو یەکێکیان ئانیشکێك بەردەمی کەوتبو پڕی کردبو لە خوێن. لە هۆڵەکەدا راکشابو خوێن لە دەمیەوە دەهاتە دەرێ. بۆم دەرکەوت دایڤید کە لە دەرگاکەی دەدا ویستوێتی بچێت پەڕۆیەکی تەڕ بهێنێت خوێنبەربونەکە بوەستێنێت بەلام ماریای خوشکی بەرێکەوت ئەوکاتە لە حەمامدا بووە. بۆیە ئەم ئاوا توند لە دەرگاکەی داوە.

بۆم دەرکەوت من خراپ مەسەلەکە حالی بوم لەبەرئەوە رۆیشتم داوای لێبوردن لە دایڤید بکەم

کە دەرگاکەم کردەوە، یەکەم قسەی ئەمەبو "لێت نابورم".

وتم: "بۆچی بە قوربان؛ باوەڕ بکە بێ نەمزانی ویستوتە یامەتی براکەت بدەیت. بۆچی لێم نابوریت"

دایڤید وەلامی دامەوە: "لەبەرئەوەی هەفتەی رابردوش هەر هەمان شتت کرد" دایڤید بە شێوازی خۆی ویستی پێم بلێت "بابە تۆ سەرمایە زۆر رادەکێشیت لە ژمارە حسابەکەت و بەم جۆرە رەفتارە ناتوانیت کێشەکە چارەسەر بکەیت"

ئەوی دلسۆزانە داوای لێبوردن بکات پاشەکەوت دەخاتە سەر ژمارە حسابەکەی. بەلام عوزرهێنانەوەی زوو زوو وا لێك دەدرێتەوە کە کابراکە بەڕاستی نیە و لەئەنجامدا دەبێتە راکێشان و ئەمەش لە شێوازی پەیوەندییەکاندا لە ئایندەدا رەنگ دەداتەوە.

هەلەکردن شتێکەو داوای لێبوردننەکردن شتێکی دیکەیە. مرۆڤ لە هەلەکان خۆش دەبێت، چونکە ئەو هەلانە هەلەی مێشکن و دەرەنجامی هەلە حساب کردن و هەلە تێگەیشتنن، بەلام ئەوەی کە مرۆڤ بە ئاسانی ناتوانێت لێی خۆش ببێت هەلەکانی دلە، مەبەستە چەوتەکانە، نیاز خراپیەو ئەوکەسە خۆبەزلزانەیە کە بڕوبیانو دەهێنێتەوە بۆ پاساوکردنەی هەلەی یەکەم.

## یاساکانی خۆشەویستی و یاساکانی ژیان

ئێمە کە دەست دەکەین بە پاشەکەوتکردنی خۆشەویستی بێمەرج و کە یاسا سەرەتاییەکانی خۆشەویستی ئەزمون دەکەین، لەراستیدا بەرامبەرەکەمان هان دەدەین یاسا سەرەتاییەکانی ژیان تاقی بکاتەوە. واتا کاتێك ئێمە بەبێ هیچ مەرج و کۆت و پێوەندێك کەسێکمان خۆش دەوێت مانای وایە یارمەتی دەدەین هەست بە ئاسایش و دڵنیایی بکات. هەست بە خۆسەلماندن و پشتڕاستکردنەوەی بەها گەورەرییەکان بکات .. هەست بە ناسنامەی خۆی و بە دەستپاکیی خۆی بکات. ئەوکەسە پرۆسەی گەشەکردنە سروشتییەکەی هان دراوە. ئێمە بەخۆشویستنی ئەو یارمەتی دەدەین یاساکانی ژیان ئەزمون بکات کە بریتین لە هاوکاری و بەشداری و خۆدیسپلینکردن و پاکیی. یارمەتی دەدەین لە ناخی خۆیدا راستگۆیی بدۆزیتەوە و تا ئەوپەڕی توانا لەگەڵیدا بژی. ئازادیی ئەوەی پێبەخشین بەپێی مەرج و فەرمانەکانی ناخی خۆی بژی نەك بەپێی مەرج و کۆتو پێوەندەکانی ئێمە. بەڵام ئەمە هەرگیز بەو مانایە نایەت کە شلوشێواو بین و مەسەلەکان بە جددی وەرنەگرین چونکە ئەمەش خۆی لەخۆیدا بە راکێشانێکی گەورە حساب دەکرێت .. خۆشەویستی بریتییە لەوەی کە هاوکات لەگەڵ ئەنجامدانی راوێژ و پێشکەشکردنی بەڵگە و هۆکارەکان و دیاریکردنی سنورەکان و پێشبینی و نرخاندنی پێشهاتەکاندا، ئێمە لە هەمو حاڵەتێکدا عاشقین.

پێشێلکردنی یاسا بنەڕەتییەکانی عیشق – واتا دروستکردنی مەرج و کۆت و پێوەند بۆ ئەو نیعمەتە – لەراستیدا هاندانی بەرامبەرەکەتە لەسەر پێشێلکردنی یاسا بنەڕەتییەکانی ژیان و دانانی لە هەڵوێستی بەرگریکردن و کاردانەوەدا بۆ ئەوەی وا هەست بکات هەمیشە فەرزە لەسەری بیسەلمێنێت کە: "ئەو وەکو کەسێکی جیاواز لە تۆ رەفتار دەکات".

لەراستیدا بەرامبەرەکەت بەو هەڵوێستەی تۆ وای لێ نایەت پشت بەخۆی ببەستێت، بەڵکو بە شێوە پێچەوانەو دژەکە هەڵسوکەوت دەکات و ئەمەش خۆی جۆرێکە لە جۆرەکانی پشتبەستن و سەرچاوەکەیشی لایەنە لاوازەکەیە. کەسی لەوجۆرە دەبێتە مرۆڤێکی کاردەرەوە و هەمو فکرو خەیاڵێکی هەر لەلای دوژمنە.

لەبری ئەوەی گوێ لە گیانی دەستپێشخەری بگرێت و فەرمانەکانی ناخی خۆی جێبەجێ بکات، تەنیا هەر بەرگری لە مافەکانی خۆی دەکاتەوە و هەر هەوڵی ئەوە دەدات بەڵگەو نیشانە پێشکەش بکات بۆ سەلماندنی سەربەخۆیی خۆی. یاخیبون و لاساریی گرێی دڵن نەك هی ئەقڵ. گرنگ ئەوەیە بەردەوام خۆشەویستی بێ قەیدو شەرت پاشەکەوت بکەیت.

هاوڕێیەکم هەبو راگری کۆلێژێکی بەناوبانگ و خاوەنی پێگەیەکی بەرز. ئەم هاوڕێیەم ساڵانێکی دورودرێژ نەخشەی ئەوەی دارشت کە بوار بۆ کوڕەکەی بڕەخسێنێت بچێتە ئەو کۆلێژە، بەڵام کە کاتی ئەوە هات بچێت کوڕە قبوڵی نەکردو نەچو.

ئەم مەسەلەیە بۆ باوکەکە زۆر گرنگ بو، چونکە تەواوکردنی ئەو کۆلێژە کە پێگەیەکی تایبەتی هەبو، دەبووە سەرچاوەیەکی هێز. جگە لەوەی کە هەمو ئەندامانی خێزانەکەش لەو کۆلێژە خوێندبویان: سێ نەوەی پێشتری خێزانەکە لەوێ دەرچوبون. باوکەکە زۆر لە کوڕەکەی پاڕایەوە، قسەی لەگەڵدا کردو هانی دا. هەروەها هەوڵیشی دا گوێی لێ بگرێت بۆ ئەوەی تێی بگات و هەمو هیوایەکی ئەوەبو کوڕەکە پەشیمان ببێتەوە.

پەیامە نەرمو رەوانەکەی ئەم باوکە پەیامی خۆشەویستییەك بو بە مەرجەوە. کوڕەکە هەستی کرد ئارەزووەکەی باوکی لەوەی ئەم بچێتە ئەو کۆلێژەوە لەوەوە نەهاتووە کە باوکەکە وەکو مرۆڤێك و وەکو جگەرگۆشەیەك تەماشای ئەم دەکات. بەڵکو شتەکە ئەوانەشی تێپەڕاندووە و ئەمەش هەڕەشەیەکی ترسناکە. بۆیە کوڕەکە بەرهەڵستی ئارەزووەکانی باوکی کرد و زیاتر ناسنامە و تایبەتمەندییەکی خۆی دەرخست، هەوڵی زۆریشی دەدا تا هۆکاری لۆجیکی بدۆزێتەوە بۆ رەتکردنەوەی ئەو کۆلێژە.

باوکەکە پاش شرۆڤەکردنێکی چڕوپڕی ناخی خۆی، بڕیاری دا قوربانییەك پێشکەش بکات – واز لەو خۆشەویستییە مەرجدارە بهێنێت، چونکە تێگەیشتبو کە رەنگە کوڕەکە حەزی لەوەبێت پێچەوانەی ئارەزووەکانی باوکی بێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کابرا، خۆی و ژنەکەی بڕیاریان دا بەبێ هیچ مەرجێك کوڕەکەیان خۆش

بوێت، هەرچەندە ئەم بڕیارەی کوڕەکەشیان بەلاوە زۆر دژواربو لەبەرئەوەی ئەزمونێکی زۆریان لە مەسەلەی پەروەردەدا هەبو، هەروەها سالانێکی دورودرێژیش بو نەخشەیان بۆ ئەوە داڕشتبو کە کوڕەکەیان بخەنە فلانە کۆلێژ.

باوك و دایکەکە قۆناغە سەختەکەیان تێپەڕاند و رەنجێکی زۆریان کێشا تا تێبگەن خۆشویستنی بێقەیدو شەرت چییە. هەروەها پێشیان راگەیاند کە ئەوان گەیشتونەتە باوەڕێکی تەواو کە بڕیاری کوڕەکە هیچ لەو خۆشەویستە بێ مەرجەیان بەرامبەر ئەو کەم ناکاتەوە. ئەمان وایان نەکرد بۆ ئەوەی کاری تێبکەن یاخود بەجۆرێك لە جۆرەکان ئارەزووەکانی خۆیانی پێبگەیەنن بەلکو ئەم هەلوێستە و ئەم خۆشەویستییە بێقەیدو شەرتەیان بۆ کوڕەکە دەرەنجامێکی سروشتی گەشەکردن و کەسایەتییان بو.

کوڕەکە سەرەتا هیچ کاردانەوەیەکی نیشان نەدا. بەلام چونکە باوك و دایکەکە لەوکاتەدا خاوەنی پارادیمێکی تایبەت بون بە خۆشویستنی بێ قەیدو شەرت، لەبەرئەوە هەست و هەلوێستیان بەرامبەر کوڕەکە نەگۆڕا. هەفتەیەك پاش ئەوە کوڕەکە باوك و دایکی ئاگادارکردەوە کە بڕیاری داوە نەچێتە ئەو کۆلێژە. ئەوان چاوەڕێی وەلامێکی وایان دەکرد و بەردەوامبون لە نیشاندانی خۆشەویستییە بێ مەرجەکان بۆی. هەمو شتێك ئاسایی بووەوە و ژیانیشیان رەوتە ئاسایی و سروشتییەکەی وەرگرتەوە.

دواتر پاش ماوەیەکی کەم، شتێکی سەرنجڕاکێش روویدا. ئیتر کوڕەکە کەوتە دۆخێکەوە کە چیتر هەست نەکات پێویستی بەوەبێت بەرگری لە هەلوێستی خۆی بکات، لەبەرئەوەی لە دلی خۆیدا قولتر مەسەلەکەی لێك دایەوەو بۆی دەرکەوت کە بەڕاستی دەیەوێت بچێتە ئەو کۆلێژە. داوایەکی پێشکەش کردو مەسەلەکەشی بە باوکی راگەیاند، ئەویش جارێکی دیکە خۆشەویستییە بێ مەرجەکەی بۆ دەرخست لەڕێی قبولکردنی ئەم بڕیارەی کوڕەکەیەوە. هاوڕێکەم ئەم بڕیارەی کوڕەکەی پێخۆش بو، بەلام زۆر زۆریش نا، چونکە ئیتر فێربوبو بەبێ هیچ مەرجێك خەلکی خۆش بوێت. (داگ هامەرسکجۆلد) سکرتێری پێشینی نەتەوە یەکگرتووەکان وتەیەکی بەناوبانگی هەیە کە دەلێت: "زۆر جوامێرانەترە مرۆڤ قوربانیی بۆ یەك

کەس بدات لەوەی کە خەبات بکات لەپێناوی رزگارکردنی هەزاران کەسدا."
مەبەستم لەوەیە کە خۆم حەفتەی شەش حەوت رۆژگار دەکەم و هەر رۆژەی هەشت سەعات و دە سەعات و دوانزە سەعات تەرخان دەکەم بۆ هەزاران کەس و بۆ کارو پرۆژەی جیاجیا لە دەرەوەی ماڵەکەی خۆم، کەچی هێشتا نە لەگەڵ هاوسەرەکەم و نە لەگەڵ کورە هەرزەکارەکەم و نە لەگەڵ هاوکارە هەرە نزیکەکانمدا، نەمتوانیوە پەیوەندییەکی قوڵی واتادار دروست بکەم. دیارە جوانتر و جوامێرانەتر و ئازایانەتر و بێ فیزانەتر ئەوەیە هەوڵی دروستکردنی پەیوەندییەکی وا بدەیت نەك ئەو هەمو ماوە زۆرە کار بکەیت لەپێناوی خەڵك و مەسەلە گشتییەکاندا.

بیست و پێنج ساڵ کارکردن و راوێژکردن لەگەڵ رێکخراوەکاندا وای لێ کردم ئەم قسەیەی (داگ) زۆر زۆر کارم تێبکات. چونکە زۆربەی زۆری کێشەکان لە دەزگا و رێکخراوەکاندا هەڵقوڵاوی پەیوەندییە زەحمەتەکانن لەسەر ئاستی سەرکردایەتییە باڵاکان. دوو هاوبەش لە کۆمپانیایەکدا، خاوەنی کۆمپانیاکەو سەررۆکەکە، سەرۆکی کۆمپانیاو جێگرەکەی .. ئایا جوامێرانە تر نییە مرۆڤ راستگۆیانە روبەروی ئەو مەسەلانە ببێتەوە لەبری ئەوەی بەردەوام بێت لەسەر خزمەتکردنی پرۆژەو خەڵکەکە دوور لە ماڵ و منالڵ".

یەکەمجار کە ئەم وتەیەی (داگ)م بەرچاوکەوت لەگەڵ رێکخراوێکدا کارم دەکرد کە پەیوەندی من و یاریدەدەرە هەرە نزیکەم تەمومژاوی بو. هێندە ئازا نەبوم روبەروی ناکۆکیەکانمان بوەستمەوە سەبارەت بە رۆڵ و نرخاندن و چاوەڕوانییەکان و شێوازی بەڕێوەبردنمان کە جیاوازی زۆرمان هەبو لەگەڵ یەکتریدا. بۆیە چەند مانگێك پەنام بردە بەرچارەسەری مامناوەندیی لەترسی ئەوەی ئەگەر روبەروی ببمەوە رەنگە شتی ناخۆش روبدات. دیارە لەو ماوەیەشدا زیاترو زیاتر لە ناخماندا رق و کینە بەرامبەر یەکتر دروست دەبو.

کە وتەکەی (دایگ)م خوێندەوە (زۆر جوامێرانەترە مرۆڤ قوربانی بۆ (یەك) کەس بدات لەوەی خەبات بکات بۆ رزگارکردنی هەزاران کەس) زۆرکاری تێکردم و بە جددی بڕیارم دا پەیوەندی لەگەڵ یاریدەدەرەکەمدا دروست بکەمەوە. دەمزانی کارەکە ئاسان نییە و قوتاربون لە جیاوازییەکانی نێوانمان بە ئاسانی نایەتەدی

لەبەرئەوە ناچاربوم ورە بدەمە خۆم بۆ زاڵبون بەسەر ناکۆکییەکان و بەدیهێنانی لێکتێگەیشتنێك و پابەندبونێکی قوڵ و هاوبەش. بیرمە کە دوای ئەو بڕیارە تەوقەم لەگەڵدا کرد بە پیاوێکی ئاسان نەهاتە بەرچاوم. لەبەرئەوە ڕێگا تایبەتەکانی خۆیم گرتەبەر چونکە پێویستم بە تواناو بەهرەکانی هەبو. دەشترسام هەر روبەروبونەوەیەك ئەو پەیوەندییە تێك بدات و لەئەنجامدا تواناکانیم لەکیس بچێت.

پاش ئەوەی کە تێی گەیشتم و ڕەهەندەکانیم ناسی، بڕیارەکەم لەسەر ئەوە ساغ بووەوە کە لەبری ڕەفتار و شێوازی کارکردن، بایەخ بە پرنسیپەکان بدەم. بەمەش لەناخەوە هەستم بە ئازایەتی و ئارامیی ئەوەکرد کە دەست بکەم بە پیەوەندیکردن بە یاریدەدەرەکەمەوە. کاتێك کە دانیشتین، بە سەرسوڕمانەوە بۆم دەرکەوت کابراش بەهەمان قۆناغ و ئەزمونی مندا دەڕوات و دەمێکە چاوەڕوانی پەیوەندییەکی لەم جۆرەیە، بەڵام وەکو کابرایەکی کەللەڕەق بەرگری لە هەڵوێستەکانی خۆی کردووە.

لەگەڵ ئەمەشدا شێوازی کارکردن و بەڕێوەبردنی من و ئەو لە یەکتری جیاوازبون. جیاوازییەکان ڕەنگیان دایەوە لە پێکهاتەو ڕێکخستنی ناوخۆیی کۆمپانیاکەدا و هەردوکیشمان ئاگاداری ئەو گیروگرفتانە بوین کە لەئەنجامی جیاوازییەکانی من و ئەوەوە دروست بون. یەکتربینینەکانمان زیادی کردو توانیمان روبەروی مەسەلە هەرە قوڵەکان ببینەوەو بیانخەینە سەر مێزی گفتوگۆ و بە گیانی ڕێز لەیەکتر گرتنەوە یەك یەك چارەسەریان بکەین و توانیمان من و ئەو ببینە ئەو تیمەی یەکتری تەواوبکەین.

خوڵقاندنی یەکپارچەیی و یەکبون لە کار و خێزان و هاوسەرگیریش پێویستی بە ئازایەتییەکی زۆرو بە کەسایەتی بەهێز هەیە.

مرۆڤ چەند شارەزایی هەبێت لە هونەری بەڕێوەبردنی کارە جەماوەرییەکاندا هێشتا هەر پێویستی بە خەسڵەتە جوانەکانی کەسایەتی هەیە بۆ بڕەودان بە پەیوەندییەکە. زۆر گرنگە بتوانیت لەسەر ئاستی تاکەکەسی گوزارشت لە پاسا سەرەتایی و بنەڕەتیەکانی عیشق و ژیان بکەیت.

## کێشەکانی بەرهەمهێنان دەبنە هەلی توانای بەرهەمهێنان

ئەزمونەکەی سەرەوە پارادیمێکی بەهێزی دیکەی پێبەخشیم دەربارەی هاوکاریکردنی خوڵقێنەر (یەکتر تەواوکردن). مەسەلەکە پەیوەستە بەوەوە کە ئێمە

چۆن کێشەکان دەبینین. من چەندین مانگ هەوڵم دەدا خۆم لەو کێشەیە بەدوور بگرم چونکە وام دەزانی کە سەرچاوەی نیگەرانی و تورەیی و کۆسپەکانە. ئاواتەخوازبوم خۆی بە شێوەیەك لە شێوەکان نەمێنێت. بەڵام مەسەلەکە وەرچەرخا و خودی کێشەکە بوو بە مایەی دەرکەوتنی هەبونی هەلێك، بۆ دامەزراندنی پەیوەندییەکی قوڵی وا کە توانیمان پێکەوە تیمێك دروست بکەین یەك ئەوی دیکە تەواو بکات.

من باوەڕم وایە لە هەر هەڵوێستێکدا کە پەیوەست بێت بە هاوکاری و پەیوەندی خولقێنەرەوە، هەمو کێشەیەکی بەرهەم لەراستیدا هەلێکە بۆ توانای بەرهەمهێنان. واتا بۆ دروستکردنی پاشەکەوتێك لە بانقی سۆزداریدا بە جۆرێك کە کاریگەرییەکی قوڵ لەسەر ئەو بەرهەمهێنانە دروست دەکات کە بەشەکانی پەیوەستن بە یەکترییەوە.

کاتێك کە باوك و دایك کێشەی مناڵەکانیان بەو چاوە تەماشا دەکەن کە هەلێکە بۆ دروستکردنی پەیوەندی نەك وەکو مەسەلەیەکی نەرێنی و بێزارکەر، ئەوا بە دڵنیاییەوە سروشتی کارلێکی نێوان منالەکەو دایك و باوکەکە گۆڕانی گەورەی بەسەردا دێت. ورەو ئارەزوییەکی گەورەتر لای دایك و باوکەکە دروست دەبن و زیاتر حەزدەکەن لە منالەکانیان تێبگەن و یارمەتییان بدەن. کە منالەکەت بە کێشەیەکەوە دێتە لات، تۆ لەبری ئەوەی بڵێی: "ئۆی نەبڕایەوە ئەم هەمو گیروگرفتە" پێویستە خاوەنی پارادیمێك بیت بڵێیت: "ئەمە هەلێکی راستەقینەیە هاتۆتە پێشێ تا یارمەتی منالەکەمان بدەین و پەیوەندییەکەمان پەرەپێبدەین."

بەشێکی زۆری کارلێکەکان گۆڕانیان بەسەردا دێت و لە مەسەلەیەکی ئیجرائییەوە دەبنە پەیوەندیی قوڵی چونیایەتی پڕ لە خۆشەویستی و متمانە هەموشیان دەرەنجامی ئەوەن کە منالەکە هەست بکات دایك و باوکەکە دەینرخێنن و بایەخ بە کێشەکانی دەدەن و وەکو مرۆڤ تەماشای دەکەن.

ئەم پارادیمە لە بواری بازرگانیشدا تێڕوانینێکی گرنگە. یەکێك لە سەنتەرە بازرگانییەکان کە ئەم پارادیمەی بەکارهێنا توانی جۆرە پابەندبونێك لەناو کڕیارەکاندا دروست بکات کە کڕیارێك بە کێشەیەکەوە دەچێتە ئەو سەنتەرە، کارمەندەکان بەوچاوەوە تەماشای کێشەکە دەکەن کە هەلێکە بۆ دروستکردنی

پەیوەنـدی لەگـەڵ ئـەو کڕیـارەدا و ئارەزوییـەکی ئـەرێنی نیشـان دەدەن بـۆ چارەسەرکردنی کێشەکە بەجۆرێك کە ببێتە مایەی دڵخۆشکردنی کڕیارەکە. هێندە بەئسوڵ و رێـزەوە رەفتـاری لەگـەڵ دەکـەن و لـە چارەسـەرکردنی کێشـەکەیدا خزمەتگوزارییـەکی وا پێشـکەش دەکـەن کـە کڕیارەکـە هـەرگیز بیر لـەوە نەکاتـەوە بچێتە شوێنێکی دیکە. زانینی ئـەو راستییە کە هاوسـەنگی نێوان بەرهـەم و توانـای بەرهەمهێنانـە مەسـەلەیەکی زۆر گرنگـە لـەبواری هاوکـاری و یـەکتر تەواوکردنـدا، دەتوانین کێشەکانمان بـە جۆرێـك هەڵبسـەنگێنین کـە ببنـە مایـەی زیادکردنی توانـای بەرهەمهێنان.

## خووەکانی یەکتری تەواوکردن لەگەڵ خەڵکیدا

ئەگـەر ئـەوە بهێنینـە بەرچـاوی خۆمـان کـە بـانقی سۆزداریی هەیـە، دەتـوانین ئامـادەیی ئـەوە لای خۆمـان دروسـت بکـەین کـە بگوێزرێنـەوە بـۆ لای خووەکـانی سـەرکەوتنی بەکۆمـەڵ و کـارکردن لەگـەڵ خەڵکیـدا بـە شـێوەیەکی سـەرکەوتو. کـە ئەمـەمان کـرد دەبیـنین ئـەو خووانـە چـۆن پێکـەوە کاردەکـەن بـۆ هاوکـاریکردنی خولقێنـەر لەگـەڵ خەڵکیـدا و هـەروەها دەشـبینین کـە چـۆن رەفتـارو بیرکردنـەوەی خەڵك کارمان تێدەکەن.

سـەرباری ئەمانــەش دەتــوانین زۆر قــوڵتر ئــەو راسـتیە ببیـنین کـە یـەکتر تـەواوکردن لەگـەڵ خەڵکیـدا تـەنیا ئەوکەسـانە دەتـوانن بـەدی بهێـنن کـە بەڕاسـتی پشتیان بە خۆیان بەستووە. مەحاڵە بتـوانین سـەرکەوتنی بەکۆمـەڵ و قـازانجی گشـتی مسۆگەر بکەین ئەگـەر تـەنیا هـەر پشـت بـە شـێوازی بـراوە/ بـراوە و چارەسـەرکردنی خولقێنەرانــەی کێشــەکان ببەســتین و خەســڵەتە جــوان و بنەڕەتییــەکانی مــرۆڤ فەرامۆش بکەین.

وەرن پێکەوە بە قوڵی لە خووەکانی سەرکەوتنی بەکۆمەڵ وردببینەوە.

## خووی چوارەم

# سودی هەموان

## بیرکردنەوە بە شێوازی براوە - براوە



## بنەماکانی سەرکردایەتی بەکۆمەڵ

ئێمە یاسا ئاڵتونییەکەمان ئەزبەر کردووە، دە با ئیتر لە ژیانماندا جێبەجێی بکەین
- ئیدوین مارکهام

جارێکیان کارم بۆ کۆمپانیایەک دەکرد کە سەرۆکەکەی زۆر نیگەران بو.
نیگەرانی ئەوەی کرێکارەکان هاوکارییان لەنێواندا نییە.
پێی وتم: ستیڤن، کێشە سەرەکییەکەمان ئەوەیە ئەوان زۆر خۆپەرستن.
یارمەتییان لەنێواندا نییە. دڵنیام ئەگەر یارمەتیم بدەن بەرهەمەکەمان زیاتر دەکات. ئایا تۆ دەتوانیت لەڕێی دارشتنی بەرنامەیەکی گونجاوەوە بۆ گەشەپێدانی پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکان ئەم کێشەیە چارەسەر بکەیت؟
لێم پرسی: ئایا کێشەکەی تۆ ئەو خەڵکەیە یاخود پارادیمەکەیە؟
وتی: خۆت بۆی بگەڕێ.
منیش وام کردو بۆم دەرکەوت کە خۆپەرستییەکی راستەقینەو رقێکی جددی هەیە بەرامبەر هەمو هاوکاری و یارمەتییەک. هەروەها رقەبەرایەتیکردنی دەسەڵاتیش باڵادەستە و لە پەیوەندیکردندا خۆپارێزن. هەروەها بۆم دەرکەوت کە هێندەیان لە بانقی سۆزداریی راکێشاوە کە ئەوپەڕی بێمتمانەیی بە یەکتری بۆتە کەلتورێکی باو. بەڵام من پرسیارم کردو وتم: با قوڵتر تەماشای کێشەکە بکەین. بەڕای تۆ ئەو خەڵکە بۆچی هاوکارییت ناکەن و لەو هاوکارینەکردنە چییان دەست دەکەوێت؟
وەڵامی دامەوە وتی: هیچیان دەست ناکەوێت. بە پێچەوانەوە، دڵنیات دەکەمەوە ئەگەر هاوکاریی بکەن دەستکەوتی زۆر زیاتریان دەبێت.
پرسیم: ئاووا؟
لەپشت پەردەی دیوارێکی ژوورەکەی نوسینگەی ئەم کابرایە تابلۆیەک هەڵواسرابو. تابلۆکە وێنەی کۆمەڵێک ئەسپی رایسز بو کە لەسەر هێڵی پێشبڕکێکە وەستابون و روخساری هەر ئەسپێک وێنەی روخساری بەڕێوەبەرێکی خرابوە سەر. لە کۆتایی گۆڕەپانی پێشبڕکێکەش پۆستەری گەشتێکی دڵڕفێن بو بۆ (بەرمۆدا)،

لەگەڵ وێنەی ئاسمانێکی شین و کۆمەڵێك پەڵە هەوری ورد و ژن و پیاوێك دەستیان لەناو دەستی یەکتردا بە قەراغ دەریاکەدا پیاسەیان دەکرد.

هەمو هەفتەیەك ئەم پیاوە تێکڕای کارمەندەکان بانگ دەکاتە ئەم نوسینگەیە و باسی یارمەتی دەکات "دەی با پێکەوە کاربکەین، بە یارمەتیدانی یەکتری پارەیەکی زۆرمان دەست دەکەوێت" ئینجا پەردەکە لادەدات و تابلۆی سەردیوارەکەیان نیشان دەدات و دەڵێت: "ئێستا کێ لە ئێوە خەڵاتی گەشتکردنی بەرمۆدا دەباتەوە؟"

لەراستیدا ئەمە وەکو ئەوە وایە بە گوڵێك بڵێیت خێراکە بڕوێ و کەچی گوڵێکی دیکە ئاوبدەیت. هەروەها وەکو ئەوە وایە بڵێیت: تا ورەمان چاك نەبێت هەر بەردەوام دەبین. ئەم کابرایە داوای یارمەتی دەکات و هاوکاریکردنی مەبەستە. دەیەوێت ئەوانەی کاری لەگەڵدا دەکەن یارمەتی یەکتری بدەن و یەکتری بەشدار بکەن و هەموان سودمەندبن، کەچی لەهەمان کاتیشدا دەیانخاتە پێشبڕکێوە لەگەڵ یەکتریدا، چونکە سەرکەوتنی بەڕێوەبەرێك واتە شکستهێنانی بەڕێوەبەرەکانی دیکە.

وەك زۆربەی ئەو نیشانەی دیکە کە لەناو خێزان و شوێنی کارو پەیوەندییەکانی دیکەدا روو دەدەن، هۆکاری ئەم کێشەیەش پارادیمی هەڵە بو. سەرۆکەکە هەوڵی دەدا بەری هاوکاری لە پارادیمی کێبڕکێکردنەوە بچنێتەوە. کە بینیشی ئەمە دادی نادات ویستی هانا بباتە بەر تەکنیك و پرۆگرام و دەرمانێکی خێرا لە پێناوی ئەوەی کارمەندەکانی هاوکاریی یەکتری بکەن.

بەلام دیارە بەبێ گۆڕینی رەگو ریشەی درەختەکە ناتوانیت میوەکە بگۆڕیت. کارکردن لەسەر رەفتار و هەڵسوکەوتی خەڵکە وەکو هەڵپاچینی درەخت وایە. لەبەر ئەوە ئێمە هاتین لەبری ئەوە جەختمان کردە سەر پێشخستن و زیادکردنی توانا رێکخراوەیی و تاکە کەسییەکان بە شێوازێکی تەواو جیاواز لەرێی گەشەدان بە زانیارییەکان و بە سیستمی پاداشتەکان کە سەرلەنوێ بایەخی هاوکاریکردنی چەسپاند.

یەکەم هەنگاو لە سەربەخۆییەوە بەرەو هاوکاریکردن لەگەڵ خەڵکیدا هەنگاونانە بەرەو رۆڵی سەرکردایەتی، ئیتر گرنگ نییە ئەوکەسە بەڕێوەبەربێت یاخود دەرگاوان. بەم هەڵوێست و هەنگاونانە کەسەکە دەبێتە خاوەنی کاریگەرێتی گرنگ لەسەر کەسانی دیکە. ئەمەش ناوەڕۆکی بیرکردنەوەیە بە شێوازی براوە/ براوە کە خوویەکە تایبەت بە کۆنترۆڵکردنی پەیوەندییەکان لەنێوان خەڵکیدا.

## شەش پاردایمەکەی پەیوەندی نێوان خەڵك

بیرکردنەوە بە شێوازی براوە – براوە (سودی هەموان) بە تەنیا هەر تەکنیك و ڕێگایەکی کارکردن نی‌یە، بەڵکو فەلسەفەیەکی تەواوە بۆ کارلێکە مرۆڤایەتییەکان. ئەم شێوازە، لەراستیدا، یەکێکە لە شەش پارادیمی کارلێکی ئێمەی مرۆڤ لەگەڵ یەکتریدا .. پارادیمەکانی دیکە بریتین لە براوە – دۆڕاو، دۆڕاو – براوە، دۆڕاو – دۆڕاو، براوەی تەنیا و براوە – دۆڕاو، یاخود هیچ.

### براوە/ براوە

براوە/ براوە چوارچێوەی ئەو ئەقڵ و دڵەیە کە هەمیشە و لە هەمو پەیوەندی‌یە مرۆڤایەتییەکاندا بیر لە سودی هەردولایەنەکە دەکاتەوە.

براوە / براوە مانای وایە کە چارەسەرەکان و ڕێکەوتنەکان سودی هەردولایەنەکەیان تێدایە و هەردولا پێی قایلن. ئەم شێوازی چارەسەرە مایەی خۆشحاڵی هەردولایەنەکەیە و پابەندیان دەکات بە پلانی کارکردنەکەوە. براوە – براوە بەو چاوە تەماشای ژیان دەکات کە گۆڕەپانێکە بۆ هاوکاری نەك بۆ ململانێکردنی یەکتری. ئێمەی مرۆڤ زۆربەمان ئەقڵێکی دوالیزمیمان هەیە. بەهێز یاخود لاواز، توندوتیژی یاخود نەرمونیانی، ببەمەوە یان بدۆڕێم. بەڵام ئەم شێوازی بیرکردنەوەیە ناتەواوییەکی گەوهەریی تێدایە، چونکە بیرکردنەوەیەکە بناغەی بریتییە لە دەسەڵات و هەڵوێست نەك بنەماو پرنسیپ. براوە/ براوە لەسەر ئەو پارادیمە دارێژراوە کە "شتەکە" بەشی هەمو کەس دەکات و سەرکەوتنی کەسێك هەرگیز لەسەر حسابی مەحرومکردنی خەڵکی دیکە نی‌یە لە سەرکەوتن.

براوە/ براوە باوەڕهێنانە بە ئەڵتەرناتیڤی سێیەم. ڕێگاکە ڕێگاکەی من نی‌یە، هەروەها ڕێگاکەی تۆش نی‌یە، بەڵکو ڕێگایەکی چاکترە، ڕێگایەکی باڵاترە.

### براوە/ دۆڕاو

یەکێك لە ئەڵتەرناتیڤەکانی شێوازی براوە – براوە، بریتییە لە شێوازی (براوە/ دۆڕاو). کە پارادیمی پێشبڕکێکەیە بۆ بەرمۆدا. پارادیمەکە دەڵێت ئەگەر من براوە بم، تۆ دۆڕاویت.

لە گۆشەنیگای خەڵکانی سەرکردەوە، براوە – دۆڕاو شێوازێکی سەرکوتکەرانەیە،

"من دەگەم بەڵام تۆ نابێت بگەیت" کەسێك ئەم شێوازە پەیڕەو بکات حەزی لێیە دەسەڵات و توانا و پارەو تاکڕەوێتی خۆی بەکاربهێنێت بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکەی.

ئێمە زۆربەمان هەر لە منالییەوە لەسەر ئەم شێوازی کارکردنە راهێنراوین. یەکەمین و گرنگترین پێگە لەم رووەوە خێزانە. کاتێك کە منالێك بە منالێکی دیکە بەراورد دەکرێت و سۆز و خۆشەویستی و پشوودرێژی و لێکتێگەیشتن لەسەر بنەمای ئەم بەراوردکارییانە دەدرێت بە منالەکە یاخود لێی دەسەندرێتەوە، ئەوە مانای وایە شێوازی براوە/ دۆڕاو پەیڕەو دەکات. تۆ ئەگەر کەسێکت بە مەرج خۆش بوێت و کەسەکە ناچاربێت ئەو خۆشەویستی‌یە بەدەست بهێنێت کەواتە خۆی لە ناخەوە شایستەی رێزو خۆشەویستی نییە. نرخەکە لە ناخی ئەودا نییە، بەڵکو لە دەرەوەیە. لە بەراوردکردنیدایە بە کەسێکی دیکە یاخود دەرهەق بە پێشبینی و مەرجێکی دیاریکراو.

گەنج چونکە هەستیارە و خێرا دەکەوێتە ژێر کاریگەرییەوەو زۆر پێویستی بە پشتیوانی و هاندانی دایك‌و باوکی هەیە، لەبەرئەوە ئەم خۆشەویستی‌یە مەرجدارە وای لێ دەکات بە شێوازی براوە — دۆڕاو بیربکاتەوە و رەفتار بکات.

"ئەگەر من لە براکەم چاکتر بم، دایك و باوکم زیاتر منیان خۆش دەوێت، کەواتە من هێندەی ئەو گرنگ و بایەخدار نیم". نمونەیەکی بەهێزی دیکەی ئەم شێوازە لەناو هەرزەکارە هاوتەمەنەکاندایە، کە لە سن و ساڵێکی نزیك یەکتریدان و زۆریش ململانێی یەکتری دەکەن. لەسەرەتادا منالّ بەدوای ئەوەدا دەگەڕێت کە دایك و باوکی قبوڵی بکەن، پاشان لەلایەن هاوتەمەنەکانیەوە. ئیتر ئەو هاوتەمەنە هاوڕێی بێت یاخود خزم. هەموشمان دەزانین کە هەندێك جار هاوتەمەن زۆر دڵڕەقە. ئەمانە زۆربەی کات لەسەر بناغەی پێوەرەکانی خۆیان بڕیار دەدەن کەسی بەرامبەر قبوڵ بکەن یان رەتی بکەنەوە. پێوەرەکەش ئەوەیە کە ئەوکەسە چەندێك دەگونجێت لەگەڵ رەفتار و پیاراپەرموونی ئەماندا. ئەمەش دیارە هێندەی دیکە شێوازی براوە/ دۆڕاو دەچەسپێنێت.

دنیای زانکۆ و خوێندنی ئەکادیمیاییش نمونەیەکی دیکەیە لەو نمونانەی کە

شێوازی براوە/ دۆڕاو برەو پێدەدەن. شێوازی دابەشکردن و وەرگرتنی نمرە، بە شێوەیەکی بنەڕەتی دەڵێت، تۆ بۆیە نمرەی (٨٠)ت وەرگرتووە چونکە کەسێکی دیکە نمرەی (٦٠)ی وەرگرتووە. کەواتە نرخی تۆ ئەنجامی بەراوردکار تۆیە لەگەڵ کەسێکی دیکەدا. کەواتە هیچ دانپێدانانێك نیە بە بەها ناوەکییەکانی مرۆڤ، هەمو کەسێك لە دەرەوە پێناسە دەکرێت و نرخەکەی دیاری دەکرێت.

"ئۆی چەندم پێخۆشە لەم کۆبونەوەیەی باوکاندا بینیمیت. بەڕاستی پێویستە شانازی بکەیت بە کچەکەتەوە کە لە خوێندکارە هەرە زیرەکەکانە"

"ئەمە مایەی خۆشحاڵیمە"

"بەڵام (جۆنی) کوڕت کێشەی هەیە. نمرەکانی زۆر نزمن"

"بەڕاست؟! ئۆی کە ناخۆشە! ئەی باشە چی بکەین؟"

ئەوەی ئەم بەراوردکارییە پێت ناڵێت ئەوەیە کە رەنگە (جۆنی) بەهێزی هەشت سیلندەر هەوڵ دەدات و ماندو دەبێت، بەڵام هەوڵی کچەکە لەنێوان ٤ - ٨ سلیندەردایە. واتە مرۆڤ وەکو خودی خۆی ناناسرێت و نرخی بۆ دانانرێت و لەگەڵ تواناکانی خۆیدا و هەوڵدانی ئێستای خۆیدا بەراورد ناکرێت، بەڵکو دەخرێتە بەراوردکارییەوە لەگەڵ خەڵکی دیکەدا. هەر ئەم پلەی بەراوردکارییەشە بەها کۆمەڵایەتییەکان دیاری دەکات و دەرگای هەل‌و فرسەتەکان کۆنترۆڵ دەکات. ئەوەی لە هەناو و کرۆکی پرۆسەی فێرکردندایە ململانێیە نەك هاوکاری. لەراستیدا بەو چاوە تەماشا دەکرێت کە پەیوەستە بە فێڵ و چەواشەکردنەوە.

نمونەیەکی دیکەی شێوازی براوە/ دۆڕاو لە بواری وەرزشدایە، بەتایبەت بۆ لاوانی قۆناغەکانی ئامادەیی و زانکۆ. زۆرجار ئەمان دەبنە خاوەنی پارادیمێك کە دەڵێت ژیان یارییەکی گەورەیە، یارییەك کە دەرەنجامەکەی سفرە چونکە بەشێك دەیباتەوە و بەشێکیش دەیدۆڕێنێت. لە بواری وەرزشدا (بردنەوە) واتا باڵادەستی.

بوارێکی دیکەی ئەم شێوازی بیرکردنەوەیە بواری یاسا و دادگایە. بێگومان ئێمە هەمومان پێویستمان بە یاسایە و لە کۆمەڵگایەکدا دەژین کە یاسا دەیپارێزێت. ئێمە کاتێك لەگەڵ کەسێکدا توشی کێشەیەك دەبین، یەکەمین مەسەلە بیری لێ بکەینەوە ئەوەیە بیدەینە دەست دادگا. واتە لەسەر حسابی ئەو کەسە (براوە) بین. بەڵام ئەم جۆرە نەقڵییەتە داکۆکیکارە نە خوڵقێنەرە و نە هاوکار.

ئێمەی مرۆڤ بە دڵنیاییەوە پێویستمان بە یاسایە، ئەگینا کۆمەڵگا دەفەوتێت. یاسا مایەی مانەوەی کۆمەڵگایە، بەڵام ناتوانێت هاوکاریی خولقێنەر فەراهەم بکات. ئەوپەڕەکەی بتوانێت کێشەی نێوان خەڵکەکە هەموار بکات، چونکە یاسا لەسەر بنەمای ناکۆکی و شکات دامەزراوە. ئارەزوی ئەوەی پارێزەرەکان و خوێندنگاکانی یاسا هان بدرێت کە هەوڵ بدەن هەردولایەنەکە بخەنە دانوستانەوە بەمەبەستی گەیشتنە چارەسەرێکی براوە/ براوە. چارەسەری کۆتایی کێشەکە نییە بەڵام دەتوانێت هۆشیارییەکی زیاتر دەربارەی ناکۆکییەکە دەستەبەر بکات.

بێگومان بواری شێوازی براوە/ دۆڕاو لەو شوێن و پێگانەدایە کە بەراستی شوێن و پێگەی ململانێن و ئاستی متمانەکردن تیایاندا ئاستێکی نزمە. بەڵام پێویستە ئەو راستییە بزانیت کە بەشێکی زۆری ژیان بریتی نییە لە ململانێ و پێشبڕکێ. ئێمە پێویست ناکات ژیانی رۆژانەمان تەرخان بکەین بۆ پێشبڕکێ کردن لەگەڵ هاوسەر و مناڵ و هاوسێ و هاوکار و هاورێکانماندا. بەراستی ئەو پرسیارە زۆر گەوجانەیە کە دەپرسێت لەم هاوسەرگیرییەدا کاممان براوەین؟ چونکە ئەگەر هەردوکتان براوە نەبن، بە دڵنیاییەوە هەردوکتان دۆڕاون.

بەشێکی زۆری ژیان پەیوەستە بە پەیوەندییەکان لەگەڵ خەڵکانی دیکەدا نەك بە سەربەخۆیی خۆمانەوە. زۆربەی ئەو ئامانج و ئەنجامانەی کە دەمانەوێن پەیوەستن بە هاوکاریمانەوە بە خەڵکانی دیکەوە و ئەقڵیەتی براوە — دۆڕاو لەراستیدا ئەم پەیوەندییە دەشێوێنێت.

## شێوازی بیرکردنەوەی دۆڕاو/ براوە

هەندێك کەس شێوازی دیکە پەیڕەو دەکەن — شێوازی دۆڕاو/ براوە.

(زیانی خۆت و سودی خەڵکی)

(من دەدۆڕێم — تۆ قازانج دەکەیت)

(بەردەوام بە. رێگەی خۆت لەگەڵ مندا ببڕە)

(ئەمجارەش پێت بنێ پێمدا — هەمو کەس وادەکات)

(من دۆڕاوم. من هەمیشە دۆڕاو بوم).

(من ئاشتیخوازم. هەمو شتێك دەکەم لەپێناوی پاراستنی ئاشتیدا). شێوازی

دۆڕاو/ براوە، شێوازێکە زۆر لە براوە/ دۆڕاو خراپترە. چونکە نە پێوەری هەیە و نە داواکاری هەیە و نە تێڕوانین. ئەوانەی بە شێوازی دۆڕاو/ براوە بیردەکەنەوە هەمیشە پەلەیانە لەوەی کە خۆیان قایل بکەن یان بەرامبەرەکەیان. هێزەکە لەوەدا دەبینن کە جەماوەریان هەبێت یاخود قبوڵ بکرێن. هێندە ئازانین بتوانن گوزارشت لە هەست و بیروباوەڕی تایبەتی خۆیان بکەن و زوو تەسلیمی ئەو خەڵکانە دەبن کە کەسایەتییان بەهێزە (خود، ego)

لە دانوستانەکاندا ئەم شێوازی بیرکردنەوەیە (براوە/ دۆڕاو) جۆرێکە لە تەسلیمبون – وازهێنان یاخود ملکەچبون. ئەم شێوازی بیرکردنەوەیە بۆ سەرکردایەتیکردن دەست نادات چونکە بە جۆرێك لە نەرمونیانی و چاوپۆشیلێکردن حساب دەکرێت. بیرکردنەوە بە شێوازی دۆڕاو/ براوە دەیەوێت بتکات بە کەسێکی چاك (پیاوێکی چاك) تەنانەت ئەگەر خەڵکە باشەکەش هیچ ئامانجێك بەدەست نەهێنن.

ئەوانەی بە شێوازی براوە/ براوە بیردەکەنەوە مەیلیان بەلای لایەنگرانی شێوازی دۆڕاو/ براوە زۆرە و خۆشیان دەوێن چونکە دەتوانن لەسەریان بژین (وەك دەڵێن رزقیان لەسەر ئەم جۆرە کەسانەیە). حەزیان لە لاوازییەکانی ئەم جۆرە کەسانەیە و سودی لێ وەردەگرن بۆ خۆیان. واتە لاوازییەکەی ئەوان دەبێتە مایەی زیاتر بەهێزبونی ئەمان.

بەڵام کێشەکە لەوەدایە کەسانی شێوازی دۆڕاو/ براوە بەشێوەیەکی وان کە بەشێکی زۆری هەست و دیدو بۆچوونەکانیان دەشارنەوە.

دیارە هەر هەست و ئارەزوویەکیش کە خاوەنەکەی نەتوانێت گوزارشتیان لێ بکات مانای وا نییە دەمرن. نەخێر هەرگیز نامرن و بە زیندویی لە قولایی ناخی کەسەکەدا دەمێننەوە و دواتر بە رێگای خراپتر و ناشیرینتر دەردەکەون. بۆ نمونە نەخۆشییە دەرونی – جەستەییەکانی کە هۆکاری ئەقڵی و سۆزداریی تایبەتیان هەیە، وەك نەخۆشییەکانی دڵ و کۆئەندامی هەناسە و نەخۆشییە دەمارییەکان لەراستیدا بەرجەستەکردنی هەستکردنن بە شکست و تورەیی و نائومێدبون و وەهم کە هەموویان بەهۆی ئەقڵیەتی دۆڕاو/ براوەوە سەرکوت کراون و شاردراونەتەوە. تورەبونی نائاسایی و گاڵتەپێکردن و کاردانەوەی توندوتیژ بەرامبەر بچوکترین وروژاندن چەند نمونەیەکی دیکەی بەرجەستەکراوی ئارەزووە سەرکوتکراوەکانن.

مرۆڤ ئەگەر بەردەوام هەست و ئارەزووەکانی بشارێتە و هەوڵ نەدات کە بیانگۆڕێت بە ئامانجی باشتر و باڵاتر، دواتر دەبینێت کە ئەمە کاری خراپ دەکاتە سەر جۆری ڕێز لەخۆگرتن و لە ئاکامیشدا پەیوەندییەکانی لەگەڵ خەڵکیدا تێك دەچن.

لەمەوە بۆمان دەرکەوت کە هەردوو شێوازەکە: براوە – دۆڕاو و دۆڕاو – براوە شێوازی لاوازن بناغەکەیان بریتی‌یە لە نیگەرانی و ناسەقامگیری. دیارە شێوازی براوە/ دۆڕاو لە کورت ماوەدادا دەتوانێت ئەنجامی زیاتر و باشتر دەستەبەر بکات چونکە بەشێوەیەکی گشتی و لە زۆربەی حاڵەتەکاندا پشت دەبەستێت بە هێز و بە بەهرەی کەسانی سەرەوە. بەڵام شێوازی دۆڕاو/ براوە هەر لەسەرەتاوە لاواز و تەمومژاوییە.

ڕێژەیەکی زۆری بەڕێوەبەران و جێبەجێکاران و تەنانەت باوکانیش وەکو بەندۆڵی سەعات لەنێوان ئەم دوو شێوازی بیرکردنەوەیەدا دێن و دەچن، جارێك براوە/ دۆڕاو پەیڕەو دەکەن و جارێکی دیکە لایەنگری دۆڕاو/ براوەن. براوە/ دۆڕاو ڕێز بۆ هیچ پێوەر و مەسەلەیەك دانانێت و دۆڕاو/ براوەش نەرمونیانە و چاوپۆشی لە زۆر مەسەلەو پرنسیپ دەکات.

ئەم جۆرە کەسانە ناتوانن ماوەیەکی زۆر خۆیان ڕابگرن لەبەرامبەر نائارامی و سەرلێشێوان و کەمی دیسپلین و پێشبینی و سیستم. یەکسەر هەڵوێست دەگۆڕن و دێن شێوازی براوە/ دۆڕاو پەیڕەو دەکەن تا ئەوکاتەی هەست کردن بە تاوان ورەیان دادەبەزێنێت و تاقەتی ئەو جۆرە ڕەفتارەیان تێدا نامێنێت و لەئاکامدا جارێکی دیکە دەگەڕێنەوە سەر ڕێبازی دۆڕاو- براوە تا ئەوکاتەی تووڕەیی و نائومێدی زۆریان بۆ دەهێنێت و سەرلەنوێ جارێکی دیکە دەچنەوە سەر شێوازی براوە/ دۆڕاو.

## دۆڕاو/ دۆڕاو

بەریەککەوتنی دووکەسی لایەنگری ڕێبازی براوە/ دۆڕاو بریتی‌یە لە کارلێکی نێوان دووکەسی کەللەڕەق و خۆپەرست کە لە بڕیاری خۆیان پەشیمان نابنەوە و ئەنجامەکەش بە زیانی هەردوکیان دەشکێتەوە. (دۆڕاو/ دۆڕاو) هەردولا زیانیان پێدەگات و هەردولاش بە شوێنی تۆڵەسەندنەوەدا دەگەڕێن. خواخوایانە جارێکی دیکە بواریان بدرێتێ بۆ تۆڵەسەندنەوە. بەڵام نازانن کە تۆڵەسەندنەوە تیغێکی

دوودەمەو پیاوکوشتنیش بەدەستی ئەنقەست لەڕاستیدا خۆکوشتنە.

من ئاگاداری پیاوێکم کە ژنەکەی تەڵاق داوە. حاکم پێی ڕاگەیاند پێویستە هەرچیەکت هەیە بیفرۆشیت و نیوەی پارەکەی بدەیت بە ژنە کۆنەکەت. ئەویش هەستا ئوتومبیلە دە هەزار دۆلارییەکەی فرۆشت بە پەنجا هەزار دۆلار و لەو پارەیە بیست و پێنج هەزار دۆلاری نارد بۆ ژنە کۆنەکەی. کاتێک ژنە کۆنەکەی گردی بە هەرا، تەماشایان کرد هەمو شتەکانی دیکەی ئاوا تاڵانفرۆش کردووە.

هەندێک کەس هێندە بیر لە دوژمنەکەیان دەکەنەوە و هێندە خەیاڵ دەدەنە رەفتاری کەسەکەی بەرامبەریان کە ئیتر هیچ شتێکی دیکە نابینین جگە لەوەی چۆن وابکەن ئەوکەسە زیانی پێبگات، تەنانەت ئەگەر شتەکە بە زیانی خۆشیان تەواو ببێت. ئەم شێوازی دۆڕاو/ دۆڕاوە فەلسەفەی ململانێی دوژمنکارانەیە و فەلسەفەی شەڕە. (کورد دەڵێت تۆپینی خۆی و زەرەری خاوەنی دەوێت)

شێوازی دۆڕاو/ دۆڕاو فەلسەفەی ئەو کەسانەشە کە خەمبار و دڵتەنگن و بێ ئەوەی هیچ هۆکارێکی ماقوڵ هەبێت، بون بە بار بەسەر خەڵکییەوە. شێوازی دۆڕاو/ دۆڕاو دەڵێت: زیانیش بکەیت قەیناکە، بە مەرجێک بەرامبەرەکەیشت زیان بکات.

## براوە:

شێوازێکی دیکەی بیرکردنەوەیە کە زۆر باوە، ئەوەیە کە تۆ قازانج بکەیت و بەس. خاوەنی ئەمجۆرە ئەقڵیەتە مەرج نییە پێی خۆش بێت بەرامبەرەکەی زیانی پێبگات. نەخێر مەسەلەکە ئەوە نییە. گرنگ ئەوەیە ئەم خۆی بگاتە ئامانج و بەس. شێوازی براوە رەنگە ئاسانترین و باوترین شێوازبێت بەتایبەت لەو بابەت و مەسەلانەدا کە کێبڕکێ و ململانێیان تێدا نیە؛ خاوەنی ئەم جۆرە ئەقڵیەتە بیر لە زامنکردنی بەرژەوەندییەکانی خۆی دەکاتەوە و دەڵێت: تۆش ئازابەو بەرژەوەندییەکانی خۆت بپارێزە.

## کام شێوازە باشترینە؟

پێنج فەلسەفەکەی کە تا ئێستا باسمان کردن بریتین لە: براوە/ براوە، براوە/ دۆڕاو، دۆڕاو/ براوە، دۆڕاو/ دۆڕاو، پێنجەمینیش شێوازی براوەیە واتە قازانجی خۆت و بەس. ئەگەر بپرسین بڵێین کامەیان لە هەموان باشتر و کاریگەرترە؟ وەڵامەکە

دەڵێت بەپێی بابەتەکەیە. بۆ نمونە لە یاری فتبۆڵێندا سەرکەوتنی تۆ تەنیا بەوە دێتە دی کە تیمەکەی بەرامبەر بدۆڕێت. هەروەها ئەگەر لە نوسینگەیەکی ناوچەییدا کاربکەیت کە چەندین میل لە نوسینگە ناوچەییەکی دیکە دوور بێت و ئەم دوو نوسینگەیە بە کردەوە هیچ پەیوەندییەکیان لەگەڵ یەکتریدا نەبێت ئەوا ئاساییە پێشبڕکێکەت لەگەڵیدا بە شێوازی براوە/ دۆڕاو بێت بەمەبەستی ئەوەی کارەکە بخەیتە جوڵە و هاندان بێنیتە ئاراوە .. بەڵام بە دڵنیاییەوە شێوازی براوە/ دۆڕاو بۆ ئەو جۆرە کارو بوارانە دەست نادات کە ئەنجامەکە پێویستی بە هاوکاری گروپ و تاکەکانە لەنێوان خۆیاندا بۆ بەدەستهێنانی ئەوپەڕی سەرکەوتن، هەروەها لەو بوارانەشدا کە ململانێ لەناو کۆمپانیاکەدا هەبێت، یاخود بۆ نمونە خەڵاتێکی دیاریکراو هەبێت بۆ براوە (وەك نمونەکەی پێشبڕکێکردن بۆ گەشتی بەرمۆدا)

ئەگەر لە پەیوەندییەکی دیاریکراودا هەستت کرد مەسەلەکە بایەخێکی ئەوتۆی نییە، ئەوا بیرکردنەوە بە شێوازی دۆڕاو/ براوە لە هەندێك بارودۆخدا گونجاوە بۆ ئەوەی راستگۆیی و خۆشەویستی خۆت بۆ کەسەکە بسەلمێنیت (تۆ بەلامەوە گرنگیت نەك مەسەلەکە، لەبەر ئەوە باشترە کە بە دڵی تۆ بێت). نمونەیەکی دیکەی ئەو حاڵەتانەی کە شێوازی دۆڕاو/ براوە گونجاوە ئەوەیە کە ئەگەر هەست بکەیت بردنەوەت لەم گەمەیەدا زیان بە بنەما باڵاکانت دەگەیەنێت و ئەوە ناهێنێت خۆتی بۆ ماندو بکەیت و کاتی تیا بەفیڕۆ بدەیت.

دیارە هەندێك بارودۆخی دیکەش هەن کە دەتەوێت براوە بیت تیایاندا و زۆر بەلاتەوە گرنگ نییە ئەم بردنەوەیە کارێکی چۆن دەکاتە سەر بەرامبەرەکەت (ئەویش براوە دەبێت یاخود دەدۆڕێت). بۆ نمونە ئەگەر ژیانی منداڵەکەت لە مەترسیدا بێت، ئەوا گرنگترین مەسەلە بەلای تۆوە رزگارکردنی ژیانی منداڵەکەتە و هێندە گوێ نادەیتە خەڵکەکە و بارودۆخەکە.

کەواتە هەڵبژاردنی شێوازەکە پەیوەستە بە واقیعی مەسەلەکەوە. گرنگترین مەسەلە ئەوەیە چۆن ئەو واقیعە بەراستی و بە وردی بخوێنیتەوە.

لەراستیدا زۆربەی هەڵوێستەکان جۆرێك لە هاوکاری و یەکترتەواوکردنیان تێدایە، لەم حاڵەتەشدا تاقە هەڵبژاردن لەناو ئەو پێنج هەڵبژاردەیەدا فەلسەفەی براوە/ براوەیە (چاکەی هەموان) کە قابیلی جێبەجێکردن بێت.

**فەلسەفەی براوە/ دۆڕاو قابیلی جێبەجێکردن نییە، چونکە هەڵوێست و بیروبۆچونت بەرامبەرم دەگۆڕێن. بۆ نمونە: ئەگەر من هاوردەکاری کەلوپەل بم بۆ کۆمپانیاکەتان و لەڕێی جۆرە دانوستانێکەوە قازانجێك بۆ خۆم مسۆگەر بکەم کە بە زیانی تۆ تەواو ببێت و ئەمڕۆ بگەمە ئەو ئامانجەی مەبەستم بوو، ئایا تۆ ئامادەیت جارێکی دیکە مامەڵەم لەگەڵدا بکەیت؟ دەستکەوتێکی کەمی کورتخایەن ئەگەر چاك لێی وردبیتەوە، لە مەودایەکی درێژخایەندا زیانە، بە تایبەت ئەگەر ئیتر هیچ مامەڵەیەك لەنێوانماندا روونەدات. لەبەرئەوە فەلسەفەی براوە/ دۆڕاو بۆ ئەو کەسانەی کە بیانەوێت هاوکاریی خوڵقێنەر بنوێنن لە مەودایەکی درێژدا دەبێتە دۆڕاو/ دۆڕاو.**

**شێوازی دۆڕاو/ براوەش، بەهەمان شێوە، رەنگە لەم چرکەساتەی ئێستادا مەبەستەکەت بۆ بهێنێتەدی. بەڵام ئایا ئەم شێوازی بیرکردنەوەیە کارناکاتە سەر ئاییندەی پەیوەندییەکانی نێوان من و تۆ و ئایا ئەمەك و پابەندبونم بە رێکەوتنەکەوە ناگۆڕێت؟ رەنگە وام لێ بێت کە ئیتر حەزنەکەم دڵخۆشت بکەم و لە دانوستانەکانی ئاییندەدا هەوڵ بدەم زیانت پێ بگەیەنم و پەیوەندییم لەگەڵ ئەوانەدا پتەو دەبێت کە بە جۆرێکی خراپ لە خۆت و لە کۆمپانیاکەت تێگەیشتون. بەمەش وامان لێ دێت هەمومان خۆمان لە چوارچێوەی دۆڕاو/ دۆڕاودا ببینینەوە و ئاشکراشە کە فەلسەفەی دۆڕاو/ دۆڕاو (زیانی هەموان) بە هیچ جۆرێك قابیلی جێبەجێکردن نییە.**

**خۆ ئەگەر تەنیا هەر جەخت لەسەر قازانجی خۆم بکەم و هیچ حسابێك بۆ بیروبۆچونی تۆ نەکەم، ئەوا پەیوەندییەکەمان هیچ بەرهەمێکی نابێت.**

**ئەگەر لە مەودای دووردا هەردوولامان قازانج نەکەین مانای وایە هەردوکمان دۆڕاوین. لەبەرئەوە تاقە هەڵبژاردە شێوازی براوە- براوەیە لەو واقیعانەدا کە هاوکاری و هاودەستییان تێدایە.**

**جارێکیان ئیشم لەگەڵ کابرایەکدا دەکرد سەرۆکی کۆمەڵێك فرۆشگا بو. پێی وتم: "ئەو بیرۆکەیەی کە داوادەکات هەردولا براوە بن بە رواڵەت بیرۆکەیەکی جوانە، بەڵام زۆر ئایدیالییە و لە واقیعدا مەحاڵە. چونکە دنیا واقیعی و بەهێزەکەی بازرگانی بەم شێوەیە نییە. لە هەمو شوێنێك دۆڕاو هەیە و براوە هەیە. تۆش هەر ئەو یارییەت لەبەردەمدایە."**

پێم وت، "زۆرچاکە. بیر لە شێوازی دۆڕاو/ براوە بکەرەوە. خۆت قازانج بکەی و بەرامبەرەکەت زیانی پێ بگات. ئایا ئەمە شێوازێکی کردەنی و باشە؟

وەڵامی دامەوە: نەخێر؟

- بۆچی

* چونکە هەمو کڕیارەکانم لەکیس دەچێت.

- زۆرچاکە. کەواتە شێوازی دۆڕاو/ براوە بەکاربهێنە. دەستبەرداری فرۆشگاکەت ببە.

* ناتوانم ئەوە بکەم. نە هێندە پارەدارم و نە رێکخراوی خێرخوازییم داناوە.

ئیتر کە هەمو شێواز و رێگا جۆراوجۆرەکانمان شی کردەوە، بۆمان ئاشکرابو کە شێوازی براوە/ براوە تاقە شێوازێکە کە بەڕاستی واقیعی بێت.

وتی: وابزانم ئەم شێوازە بۆ کڕیارەکان باشە، بەڵام بۆ هاوردەکاران دەست نادات.

پێم گوت: بەڕای تۆ، ئەو کابرایەی کاڵا بۆ تۆ دەهێنێت بۆچی ئەم پرنسیپە جێبەجێ ناکات؟

وتی: ئەوی راستی بێت من لەگەڵ خاوەنەکانی ئەم مۆڵە و هەروەها لەگەڵ کاربەدەستەکانیشدا مەسەلەی گرێبەستەکانمان باس کردو شێوازی براوە – براوەمان پەیڕەوکرد. زۆر کراوە و لۆجیکی بوین لەگەڵیاندا و هەوڵمان دەدا رازییان بکەین و دڵیان رابگرین، بەڵام ئەوان ئەم هەڵوێستەی ئێمەیان بە لاوازی حساب کرد بۆمان و لە ئەنجامدا شکستمان خوارد.

لێم پرسی: بۆچی شێوازی دۆڕاو/ براوەت پەیڕەو نەکرد

- پەیڕەومان نەکرد. شێوازی براوە/ براوەمان بەلاوە پەسەندبو

* فەرموت ئەوان لە دانوستانەکاندا ئێوەیان بەزاند

- بەڵێ

* یەعنی دۆڕانتان؟

- بەڵێ

* ئێوە دۆڕانتان و ئەوان بردیانەوە؟

- بەڵێ

* کەواتە ئەم شێوازە ناوی چییە؟

کابراکە تێگەیشت ئەوەی ئەو بە شێوازی براوە/ براوە تێی گەیشتووە لەراستیدا

شێوازی دۆڕاو/ براوە بوو، توشی شۆك بو. كە لە ئەنجامی دوورمەودای ئەم شێوازەش وردبوینەوە و تێبینی ئەو هەمو بنەما پێشێل كراوەو ئەو رق و بێزاریەیان كرد كە لەدیوی ناوەوەی پەیوەندییەكاندا خۆیان دەخۆنەوە، تیگەیشتین كە مەسەلەكە لەراستیدا بە زیانی هەموان (دۆڕاو/ دۆڕاو) كۆتایی هاتووە.

ئەم كابرایە ئەگەر بەراستی شێوازی براوە/ براوەی مەبەست بوایە دەبو ماوەیەكی زۆرتر بۆ پەیوەندیكردنەكە تەرخان بكات و زیاتر گوێی لە خاوەنی مۆڵەكە بگرتایە ئینجا بە ئازایەتییەكی زۆرترەوە بیروبۆچونی خۆی دەرببڕیایە و بەردەوام بوایە لەسەر گیانی براوە/ براوە تا ئەوكاتەی دەگەیشتنە چارەسەرێك هەردولایەنەكە پێی رازی ببن و ئەمەش هەڵبژاردەی سێیەمە. كە دەبوایە هەڵبژاردەیەكی هاوكارییانەی داهێنەرانە بوایە.

## شێوازی براوە/ براوە یان هیچ

ئەگەر ئەو كەسانە نەگەیشتنایەتە چارەسەرێكی داهێنەرانەی هاوكارانەی وا كە هەردوو لایەنەكە پێی رازی بن مەسەلەكە دەگەیشتە دۆخێكی گەورەتر لە شێوازی براوە/ براوە كە ئەویش شێوازێكە پێی دەوترێت شێوازی براوە/ براوە یان هیچ (واتە یان هەموولایەنەكان سودمەند بن یاخود هیچ رێكەوتنێك نەكرێت.)

رێكنەكەوتن بە شێوەیەكی بنەڕەتی مانای ئەوەیە كە ئەگەر نەتوانین رێگە چارەیەك بدۆزینەوە سودی بۆ هەردوكمان هەبێت، ئەوا لەسەر ئەوە رێك دەكەوین كە رازی بین جیاوازیمان هەبێت و ئەو جیاوازیەشمان قبوڵ بێت. واتە هیچ رێكەوتنێك لەگۆڕێدا نابێت. ئیتر هیچ لەیەكتری چاوەڕوان ناكەین و كاری هاوبەش ئەنجام نادەین و لە كارەكەمدا هاوكاریم ناكەیت چونكە ئاشكرایە ئامانج و بنەماكانی من پێچەوانەی ئاڕاستەی ئەوانەی تۆن. دیارە كارێكی زۆر چاكیشە كە ئەگەر لەسەرەتاوە درك بەم راستیە بكرێت نەك لەگەڵ رەوتەكەدا بڕۆیت و لەپاشان نائومێد بیت كە دەبینیت كە پێشبینییەكانت نەهاتونەتە دی.

مرۆڤ ئەگەر لە مێشكی خۆیدا ئەم رێكەوتنە وەك یەكێك لە هەڵبژاردنەكان دابنێت، ئیتر هەست بە ئازادی دەكات، چونكە پێویستی بەوە نابێت گوشار بخاتە سەر خەڵكی و بەزۆر بەرنامەكەی خۆی بسەپێنێت. ئەم هەڵبژاردەیە مانای وایە

مرۆڤ هەم دەتوانێت کراوەبێت و هەم دەشتوانێت هەوڵ بدات راستگۆیانە لەو مەسەلانە تێبگات کە قوڵترن. سەرباری ئەم هەڵبژاردەیەش کە هەڵبژاردەی رێکنەکەوتنە دەتوانێت بڵێین لەراستیدا شێوازێکە لە شێوازی براوە/ براوە، کە من دەمەوێت خۆم قازانج بکەم و دەمەوێت تۆش قازانج بکەیت. نامەوێت بە شێوازێك رێگەی خۆم بگرمە بەر کە تۆ ناڕەحەت بکات. هەروەها باوەڕیش ناکەم تۆش هەست بە ئیسراحەت بکەیت ئەگەر ببینیت سەرکەوتنی تۆ تەسلیم بون و شکست هێنانی منە. لەبەر ئەوە با بە شێوازی براوە/ براوە کاربکەین. با هەوڵی بۆ بدەین و بەدوایدا بگەڕێین و ئەگەر نەمان دۆزییەوە لەسەر ئەوە رێك بکەوین کە هیچ گرێبەست و رێککەوتنێکی کۆتایی نابەستین. رێکنەکەوتن زۆر لەوە باشترە کە لەگەڵ بڕیارێکدا بژین بۆ کەسمان گونجاو نەبێت. بەهەرحاڵ رەنگە رۆژێك بێت بتوانین بگەینە رێکەوتنێك دوای ئەوەی کە بە باشی تێگەیشتین چەمکی براوە/ براوە یان هیچ مانای چییە؟

سەرۆکی کۆمپانیایەکی بچکۆلەی بەرنامەکانی (سۆفت وەیر) ئەم ئەزمونەی بۆ گێڕامەوە:

"کۆمپانیاکە سیستمێکی نوێی سۆفت وەیری ئامادە کردو خستمانە بەردەم بانقێکی دیاریکراو بە گرێبەستێکی پێنج ساڵە. سەرۆکی بانقەکە زۆر سەرسام و خۆشحاڵ بو سەبارەت بە بەرنامەکە، بەڵام ستافەکەی لەراستیدا ئەم رێکەوتنەیان پێ خۆش نەبوو.

پاش چەند مانگێك بەڕێوەبەری بانقەکە گۆڕاو بەڕێوەبەرە تازەکە وتی: من بە گۆڕانکارییەکانی ئەم سیستمی سۆفت وەیرە رازی نیم و کێشەی بۆ ناومەتەوە کارمەندەکان حەزیان بەو پرۆگرامە نییە و ناتوانن ئیشی پێبکەن. لەبەر ئەوە راستگۆیانە پێتان دەڵێم ناتوانم چیتر لەسەر ئەم بەرنامەیە بەردەوام بم. لەڕووی یاساییەوە کۆمپانیاکەی من کێشەی دارایی گەورەی هەبوو، دڵنیاش بوم لەوەی کە ئەگەر بیگەیەنینە دادگا من دەعواکە دەبەمەوە و گرێبەستەکە جێبەجێ دەکرێت بەڵام لە ناخی خۆمدا باوەڕم بە شێوازی براوە/ براوە هەبوو.

لەبەرئەوە پێم وت: ئێمە گرێبەستێکمان لەنێواندایە و بانقەکەی ئێوەش خزمەتگوزاری ئێمەی بەدەست هێناوە بۆ گۆڕینی پرۆگرامەکە بەڵام وا هەست

دەکەم کە تۆ خۆشحاڵ نیت لەو ڕێککەوتنە، لەبەرئەوە ئێمە گرێبەستەکە و پارەی دڵنیاییەکەت بۆ دەگێڕینەوە. ئەگەر لە ئایندەشدا پێویستت بە چارەسەری بەرنامەی (سۆفت وەیر) هەبوو، دەتوانیت پەیوەندیمان پێوە بکەیت.

من بەم هەڵوێستەم زۆر بابەتیانە وازم لە گرێبەستێك هێنا کە بایی هەشتاوچوار هەزار دۆلار بوو، ئەمەش خۆکوشتنێکی دارایی بوو، بەڵام هەستم کرد کە ئەگەر پرنسیپی (براوە/ براوە یان هیچ) پرنسیپێکی ڕاست بێت ئەوا لە ئایندەدا بابەتەکە دەگەڕێتەوە و پارەکەش دەدات.

پاش تێپەڕبونی سێ مانگ، بەڕێوەبەرە تازەکەی ئەو بانقە بانگهێشتی کردم و وتی: من دەمەوێت گۆڕانکاریی بکەم لە شێوازی داتاکان و دەمەوێت لەم بوارەدا کار لەگەڵ تۆدا بکەم. ئیتر گرێبەستێکی لەگەڵماندا ئیمزا کرد بە بڕی دوسەدو چل هەزار دۆلار."

هەر شتێك لە شێوازی (براوە/ براوە یان هیچ) کەمتربێت لە پەیوەندییە هاوکاریەکاندا ئەکەوێتە پلەی دووەمەوە و لە دورمەودادا کاری خراپ دەکاتە سەر پەیوەندیەکان. نرخی ئەم کاریگەریەش پێویستی بە لێکۆڵینەوەی ورد هەیە. تۆ ئەگەر نەگەیشتیتە براوە/ براوەیەکی ڕاستەقینە، لە زۆربەی زۆری حاڵەتەکاندا وا باشترە هیچ ڕێککەوتنێك نەکەیت.

شێوازی براوە/ براوە یان هیچ لە پەیوەندیەکانی ناو خێزاندا سەربەستییەکی سۆزداری گەورە دەڕەخسێنێت. بۆ نمونە ئەگەر ئەندامانی خێزانێك زانییان کە هەر هەمویان چێژ لە تەماشاکردنی ڤیدیۆیەك نابینن، دەتوانن زۆر بە سادەیی بڕیاربدەن کارێکی دیکە بکەن. ئەویش ڕێك نەکەوتنە. ئەم ڕێك نەکەوتنە باشترە لەوەی هەندێکیان لەسەر حسابی هەندێکی دیکەیان چێژ وەربگرن.

* * *

هاوڕێیەکم هەیە کە ئەندامانی خێزانەکەی ماوەی چەند ساڵێك پێکەوە گۆرانییان دەوت. ئەوان کە مناڵ بون، هاوڕێکەم مۆسیقاکەی ڕێك دەخست و ئەو جلوبەرگەی بۆ دابین دەکردن کە لە ئاهەنگەکاندا دەیان پۆشی. هەروەها بەدەم پیانۆ لێدانیشەوە سەرپەرشتی گۆرانیوتنەکەیانی دەکرد.

کە منداڵەکان گەورەبون و تەمەنیان هەڵکشا، زەوقی مۆسیقایشیان گۆڕانی بەسەردا هات و ویستیان لە مەسەلەی جلوبەرگ و لە چۆنێتی گۆرانیوتنیشدا رۆڵی گەورەتریان هەبێت، لەبەر ئەوە کەمتر گوێیان بە ڕێنماییەکانی هاوڕێکەم دەدا.

بەڵام هاوڕێکەم خاوەنی ئەزمونێکی چەندین ساڵە بوو لەو بوارەدا و دەیزانی خەڵك حەزی لە چییە. لەبەر ئەوە هەستی کرد پێشنیاری خوشك و براکانی پێشنیارێکی گونجاو نییە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا دەیزانی کە ئەوان پێویستە ئازادی رادەربڕینیان هەبێت و بەشداری بکەن لە بڕیارەکاندا.

لەبەرئەوە هاوڕێکەم شێوازی (براوە/ براوە یان هیچ)ی پەیڕەو کرد و پێی وتن کە دەیەوێت لەگەڵیاندا بگاتە رێکەوتنێکی وا کە هەموویان پێی رازی بن، ئەگەر نا با بەدوای شێوازی دیکەدا بگەڕێن بۆ چێژوەرگرتن لە بەهرە و ئارەزووەکانیان. لە ئەنجامی ئەمەشدا خوشك و براکانی هەستیان بە ئازادی تەواو کرد لە چۆنێتی گوزارشت کردنی هەست و بیروبۆچوندا. تا وایان لێ هات ئەنجامەکە هەرچییەك بێت قبوڵی بکەن، چونکە ئیتر هەموویان لەروی سۆزدارییەوە هیچ گوشار و نیگەرانیەکیان لەسەر نەمابوو. ئەم شێوازی بیرکردنەوەیە زیاتر لە سەرەتای کارەکاندا باشە. لەسەرەتای پەیوەندی و یاخود دامەزراندنی کۆمپانیاکاندا، چونکە لەگەڵ بەردەوام بونی کارەکەدا جێبەجێکردنی ئەم شێوازە زەحمەتتر دەبێت و رەنگە گیروگرفتی توندی لێ بکەوێتەوە، بەتایبەت لە کاروباری خێزاندا، یان لەو ئیشوکارانەدا کە بە شێوەیەکی بنەڕەتی لەسەر سۆز و راستگۆیی هەڵچنراون.

مرۆڤ لە هەوڵی پاراستنی پەیوەندیەکاندا، رەنگە ساڵەهای ساڵ سازش لەدوای سازش پێشکەش بکات. لەم بوارەدا هەندێك بە شێوازی براوە/ دۆڕاو و هەندێك بە شێوازی دۆڕاو/ براوە رەفتار دەکەن. کەچی وا دەزانن کە رێبازی براوە/ براوە یان هیچ جێبەجێ دەکەن. ئەمەش کێشەی قورسی لێ دەکەوێتەوە هەم بۆ خەڵکەکە و هەم بۆ کاروبارەکانیش بەتایبەت ئەگەر پێشبڕکێکە لەسەر بناغەی براوە/ براوە یان هیچ دامەزرابوو. بەبێ ئەم رێکنەکەوتنە زۆر کارو پرۆژە دەڕوخێن یان شکست دەهێنن و یاخود رووبەرووی بەڕێوەبەری شارەزا دەکرێنەوە: ئەزمونەکانی ژیان دەریان خستووە کە زۆر جار وا باشترە رێك نەکەوتن لەبەرچاو بگیرێت بەتایبەت ئەگەر کارە بازرگانیەکە لەگەڵ خزم و کەسوکار و هاوڕێدا بوو. واتە جۆرێك لە

شێوازی کڕین و فرۆشتنی تێدا بێت ئەگینا زۆر ڕێی تێدەچێت شکستی کارەکە ببێتە هۆی نەمانی پەیوەندیەکە بە شێوەیەکی هەمیشەیی.

بێگومان هەندێك پەیوەندی هەن کە ئەم شێوازی ڕێك نەکەوتنە لەگەڵیاندا دەست نادات. بۆ نمونە لەگەڵ هاوسەر و منداڵەکانی خۆتدا. "لە دۆخی وادا ئەگەر ناچار بویت دەتوانیت ڕێگەی سازش بگریتە بەر کە شێوەیەکی نزمترە لە شێوازی براوە/ براوە یان هیچ."

بەڵام لە زۆربەی حاڵەتەکانی دیکەدا دەتوانیت لەسەر ئەم شێوازی (براوە/ براوە یان هیچ)ە. سازش بکەیت و ئەو ئازادیەی کە لەم ڕێبازەدایە ئازادیەکی سەرسوڕهێنەرە.

## پێنج ڕەهەندی براوە/ براوە

بیرۆکەی براوە/ براوە لەڕاستیدا خۆی سەرکردایەتیکردنی بەکۆمەڵە و بریتییە لە مەشق و ڕاهێنانکردن لەسەر هەمو بەهرە بێهاوتاو سروشتییەکانی مرۆڤ و هەروەها خۆناسین و ئەندێشە و ویژدان و سەربەخۆیی بڕیاردان. لەسەر ئاستی پەیوەندییەکایشمان بریتیە لە ئاڵوگۆڕکردنی زانیاری و قازانج و کاریگەریی.

خوڵقاندنی ئەم سوودە هاوبەشانە پێویستی بە بیرکردنەوەو بە ئازایەتییەکی گەورە هەیە، بەتایبەت ئەگەر بەرامبەرەکەت لەو کەسانە بو کە شێوازی براوە/ دۆڕاو لە ناخیاندا چەسپیوە.

بۆیە ئەم خووە پرنسیپەکانی سەرکردایەتی بەکۆمەڵی لەخۆ گرتووە. ئەم سەرکردایەتییەش پێویستی بە زەمینڕوونی و ئاسایش و حەکیمی و هێز و ڕێنماییکردن هەیە کە هەمویان خەسڵەتی جۆرە کەسایەتییەکن پرنسیپ گەوهەرەکەی بێت.

پرنسیپی براوە/ براوە بەردی بناغەی سەرکەوتنە لە هەمو کارلێکێکدا و خاوەنی پێنج ڕەهەندی هاوکارانەی خوڵقێنەری ژیانە. لە کەسایەتییەوە دەست پێدەکات بە ئاڕاستەی پەیوەندییەکان و ڕێکەوتنەکانی لێوە دەردەچن. ئەم پرنسیپە لە ژینگەیەکدا گەورە دەبێت کە هەم پەیکەرەکە و هەم سیستمەکە لەسەر بناغەی براوە/ براوە داڕێژراون. ڕەهەندێکی دیکەی ئەم پرنسیپە (پرنسیپی براوە/ براوە) بریتییە لە پرۆسە، چونکە هیچ کەسێك ناتوانێت بە کەرەسەکانی براوە/ دۆڕاو یاخود دۆڕاو/ براوە ئامانجەکانی براوە/ براوە بهێنێتە دی.

شێوەکەی خوارەوە پەیوەندی رەهەندەکان لەگەڵ یەکتریدا دیاری دەکات




ئێستاش یەك یەك رەهەندەکانی باس دەکەین.

## رەوشت

رەوشت بناغەی فەلسەفەی بیرکردنەوەی براوە/ براوەیە. هەروەها بناغەی هەمو شتێکی دیکەیە کە لە ئاکامی بیرکردنەوەی براوە/ براوەدا بێتە گۆڕێ. لە پارادایمی براوە براوەدا رەوشت (٣) سێ خەسڵەتی بنەڕەتی هەیە.

پاکی (نەزاهە): ئێمە پێشتر نەزاهەمان وا پێناسەکرد کە ئەو رێز و بەهایەیە مرۆڤ بە خۆی دەبەخشێت. خووەکانی ژمارە (١-٢-٣) یارمەتی دەرن لە پاراستن و گەشەپێدانی دەستپاکیدا. ئێمە کاتێك پێناسەی بنەماکانمان دیاری دەکەین و رێکیان دەخەین و رۆژانە جێبەجێیان دەکەین لەراستیدا بەو کردەوەیە پرۆسەی خۆ ناسینمان گەشە پێدەدەین و هەروەها برەو دەدەین بە ویستی سەربەخۆیی خۆمان لەرێی خولقاندنی پەیمان و ئامانجی واتادار و پاراستنیان

ئێمە تەنانەت ئەگەر لە ناخیشەوە هەست بە پێکهێنەرەکانی شێوازی براوە نەکەین و نەزانین چەند هاوئاهەنگن لەگەڵ پرنسیپە قوڵەکانی ناخماندا هێشتا هیچ چارەیەکی دیکەمان نییە و هەر دەبێت ئەو شێوازە پەیرەو بکەین. مرۆڤ ئەگەر لەگەڵ ناخی خۆیدا راستگۆ نەبێت و نەتوانێت بەڵێنەکانی بپارێزێت ئەوا ناتوانێت

لەگەڵ خەڵکیشدا راستگۆ بێت و پەیمانەکانی بباتەسەر. لەئەنجامیشدا هەست بە دووڕوویی دەکات و متمانەی بە هیچ شتێك نامێنێت کەواتە بەبێ دەستپاکی ئەم شێوازی براوە براوەیە دەبێتە تەکنیکێکی ڕووکەش. دەستپاکی بەردی بناغەی ئەم فەلسەفەیە پێکدەهێنێت.

کامڵبوون: کامڵبوون هاوسەنگییە لەنێوان ئازایەتی و ڕەچاوکردندا. من ئەم پێناسەیەی کامڵبون لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٥دا فێربووم لە مامۆستایەکی مەزنی زانکۆوە کە ناوی (هاراندساکسینیان) بوو لە خوێندنگەی هارڤارد بەشی کارە بازرگانییەکان. ئەو لەوێ ئاسانترین و قوڵترین پێناسەی کامڵبوونی فێرکردین، پێناسەکەش ئەمەیە "توانای گوزارش کردن لە هەستی تایبەت و لەهەمان کاتیشدا باوەڕ بوون بەوەی کە پێویستە ئەم گوزارشتکردنە هاوتەریب بێت لەگەڵ بیرکردنەوە لە هەست و بۆچونی خەڵکی و بەهەند وەرگرتنیان"

ساکسینیان لە توێژینەوەکەیدا بۆ نامەی دکتۆراکەی ئەم پێوەرەی پەیڕەوکرد و گەشەی پێدا لە بواری توێژینەوەی راستەوخۆی مێژوویی‌دا. پاشان دەقە ڕەسەنەکەی ئەو توێژینەوەیەی لە ساڵی ١٩٥٨دا نوسی و کۆمەڵێك پێشنیاریشی پێوە پەیوەست کرد بە مەبەستی پەیڕەوکردنیان لە بواری پراکتیکیدا. دیارە ئێمە زاراوەی کامڵبوون لە حەوت خووەکەدا بە شێوازێك بەکاردەهێنین جیاواز لە زاراوەکەی ساکسینیان. لەلای ئێمە کامڵبوون پەیوەستە بە پرۆسەی گەشەکردن و گەشەپێدانەوە. واتە لە دۆخی پشت بەستن بە خەڵکییەوە بۆ پشت بەستن بە خودی خۆمان و لەوێشەوە بۆ قۆناغی هاوکاری کردنی خولقێنەر لەگەڵ خەڵکیدا. زۆربەی ئەو پرسیار و فۆرمە دەرونیانەی کە بەکاردەهێنرێن لە بوارەکانی دامەزراندن و راهێنان و پێشخستندا بە شێوازێك داڕێژراون کە بتوانن ئەم جۆرە کامڵبوونە هەڵبسەنگێنن چ لەوەدا کە پێی دەوترێت هاوسەنگی لەنێوان هێزی من/ هاوسۆزی یاخود لە هاوسەنگی نێوان متمانە بەخۆبون و ڕێزگرتنی بەرامبەردا یاخود لە قازانجی هەردولایەنەکەدا (لە بواری گرێبەستەکاندا) ئەمانە هەموویان بەکردەوە هاوسەنگیین لەنێوان ئازایەتی و رەچاوکردندا.

ئەم خەسڵەتە کە بابەتێکی رەسەنە لە تیۆری کارلێکی مرۆیی و سەرکردایەتیدا

لەراستیدا بەرجەستەکردنێکی بەهێزی هاوسەنگییە لەنێوان بەرهەم هێنان – توانای بەرهەم هێناندا (ب/ ت ب).

لە کاتێکدا ئازایەتی دەیەوێت هێلکە ئاڵتونییەکە بەدەست بهێنێت، رەچاوکردن دەیەوێت لەسەر ئاستێکی دوورمەودادا بەرامبەرەکەش خۆش گوزەران بکات. ئەرکی بنەڕەتی سەرکردایەتی بەرزکردنەوەی ئاست و جۆری ژیانی هەموانە. زۆرکەس لە بیرکردنەوەیاندا شێوازی؛ یان ئەمە یان ئەوە پەیڕەو دەکەن. باوەڕیان وایە مرۆڤ ناتوانێت پیاوی چاکیش بێت و سازشکەریش نەبێت. بەڵام شێوازی براوە/ براوە هەم پیاوچاکیشە و هەم سازشیش قبوڵ ناکات، تەنانەت پێداگرتریشە لە شێوازی براوە/ دۆڕاو.

مرۆڤ بۆ ئەوەی بتوانێت لەسەر رێبازی براوە/ براوە بەردەوام بێت نەك هەر پێویستە پیاوچاك و نەرمونیان بێت بەڵکو پێویستە ئازاش بێت. نەك هەر سۆز کاری تێبکات بەڵکو پێویستە ئازاش بێت. بەدیهێنانی هاوسەنگی لەنێوان ئازایەتی و رەچاوکردندا ئەو گەوهەرەیە کە پێی دەڵێن کامڵبونی راستەقینە. ئەمەش کرۆکی رێبازی براوە/ براوەیە.



مـرۆڤ ئەگـەر زۆر ئازابێـت بـەڵام رەچـاوی بەرامبەرەکـەی نـەکات ئـەوا شـێوازی بیرکردنەوەکەی بریتی دەبێت لە براوە/ دۆڕاو. مرۆڤی لـەوجۆرە مرۆڤێکـی بـەهێزە و زۆر پەیوەسـتە بـە خـووی خۆیـەوە و متمانـەی بـە بیروبۆچـونەکانی خـۆی هەیـە و کەسـێکی ئازایــە بــەڵام رەچـاوی بەرامبەرەکــەی ناکــات و گــوێی پێنــادات. بـۆ قەرەبوکردنەوەی ئـەو کەموکورییـەی کـە هەیـەتی لـە کامڵبوون و هێـزی سـۆز رەنگـە کەسـەکە پـەنا بـۆ پۆسـت و دەسـەڵاتەکەی ببات یـاخود هانـا بـۆ پێگـە بەرزەکـەی و بڕوانامەکانی و خێزان و بنەماڵەکەی ببات.

جـۆرێکی دیکـەشمان هەیـە کـە ئـەو کەسـانە دەگرێتــەوە زۆر سـڵ دەکەنــەوە و رەچاوی بەرامبـەر دەکـەن بـەڵام ئـازا نـین. مرۆڤـی لـەوجۆرە شـێوازی دۆڕاو — بـراوە پەیڕەو دەکات. بە وریاییەوە مامەڵە لەگـەڵ بۆچون و ئارەزووەکانی کەسی بەرامبـەر دەکـات و رێزیـان بـۆ دادەنێـت، بـەڵام ئازایـەتی ئـەوەی تێـدا نـیـیە بیروبـاوەڕ و بۆچونەکانی خۆی دەرببڕێت و بیانهێنێتەدی.

رێبازی براوە براوە پێویستی زۆری بـە هـەردوو توخمەکە هەیە بـە ئازایـەتیش و بـە رەچـاوکردنی بەرامبەریشـی. ئەمـە هاوسـەنگییەکە کـە بـە نیشـانەی کـامڵ بـونی راستەقینە حساب دەکرێت ئەو هاوسەنگیـیە وات لێ دەکات دەوروبەرەکەت ببینیت و ببیستیت و تێی بگەیت بەڵام لەهەمان کاتیشدا لە بەرامبەریاندا ئازایەتی بنوێنێت.

بەرچـاوتێریی: سـێیەمین تـوخمی رەوشـت و پایەیـەکی گرنگـی دیکـەی رێبـازی براوە/ براوە بەرچاوتێرییە. ئەوەیە کە بڕوات هەبێت شتەکە بەشی هەموان دەکات.

زۆربەمان وا راهێنراوین کە بەرچاوتەنگ بین. وا دەزانین سەرمێزەکە تـەنیا یـەك کـولێرەی لێیــە و ئەگـەر تـۆ پارچـەیەکی گـەورەی لێ بکەیتـەوە، ئێمـە باقییەکـەمان لەبرسانا دەمرین. ئەم جۆرە ئەقڵییەتە هەمیشە ئەنجامەکەی سفرە.

مرۆڤـی بەرچـاوتەنگ پـێی ناخۆشـە بەشـداری بکـات لـە رێزگـرتن و متمانـە بەخشیندا، لە دەسـەڵات و قازانجدا. تەنانـەت لەگـەڵ ئەوانەشـدا کـە بەشـداری دەکەن لــە بەرهەمهێنانــدا. هــەروەها ســەرکەوتنی خەڵکیشــیان پێناخۆشــە، بەتایبــەت سەرکەوتنی هاوڕێ و کەسە نزیکەکانیان و کـە تـۆ پلەیـەك بەدەست دەهێنیت یـاخود خەڵاتێك دەبەیتەوە وا دەزانیت لە خۆی کەم بۆتەوە.

ئـەو بـە سـەرزارەکی وای دەردەخـات کـە سـەرکەوتنی بەرامبەرەکـەی پێخۆشـە،

بەڵام لە ناخدا خەریکە شەق دەبات لەداخدا. ئەو نرخی خۆی لە بەراوردکردندا دەبینێت. لەبەر ئەوە سەرکەوتنی کەسێکی دیکە یەکسانە بە شکستهێنانی خۆی. بەو لۆجیکە بیردەکاتەوە کە دەڵێت: چەند خوێندکارێك دەتوانن لە لیستی یەکەمەکاندا بن، بەڵام تەنیا یەك خوێندکار دەتوانێت خوێنکاری ژمارە (یەك) بێت. لەبەر ئەوە ئەگەر بتەوێت براوە بیت پێویستە بەرامبەرەکەت ببەزێنیت.

زۆرجار کەسی بەرچاوتەنگ لە ناخدا ئاواتێکی دەرنەبڕاوی هەیە کە بەرامبەرەکەی بەدبەخت بێت. زۆر بەدبەخت نا، تۆزێك بەدبەخت. هێندە بەدبەخت بێت کە لە شوێنی خۆیدا بمێنێتەوە و گەشە نەکات. چونکە هەمیشە خەریکی بەراوردو پێشبڕکێیە و هەمو هەوڵێك دەخاتە گەڕ بۆ ئەوەی خەڵکەکان و شتەکان هەموی ببنە ملکی ئەو تا زیاتر هەست بە نرخی خۆی بکات.

مرۆڤی بەرچاوتەنگ دەیەوێت خەڵك لەسەر ئەو ڕێگەیە بڕوات کە ئەم دەستنیشانی کردووە و زۆرجار هەوڵ دەدات ئەو خەڵکە فۆتۆکۆپی بکات و کەسی وا لەخۆی نزیك دەخاتەوە کە هەر (بەڵێ) بزانێت. کەسێك کە لە خۆی لاوازتر بێت و بیر لە ململانێکردن نەکاتەوە.

کەسی بەرچاوتەنگ زەحمەتە بتوانێت لە تیمێکدا ببێتە ئەندام کە ئەندامەکانی یەکتری تەواو بکەن، چونکە پێی وایە جیاوازییەکان نیشانەی پابەندنەبوونە و خەسڵەتی یاخییەکانە.

لە بەرامبەردا بەرچاوتێریی هەڵقوڵاویی هەستێکی ڕاستەقینە و قووڵە بەنرخی خۆت و بەوەی کە هەڕەشەت لەسەرنییە. ئەو پارادیمەیە کە شتەکە بەشی هەموان دەکات. بۆیە زۆر بە دڵخۆشییەوە بەشداری دەکات لە ڕێزگرتن و بڕیاردان و سودەکاندا. بەرچاوتێری دەرگای تواناکان و داهێنان و هەڵبژاردە و ئەڵتەرناتیڤەکان دەکاتەوە. بەرچاوتێری وا دەکات کە بەختەوەری کەسەکە و قایلبون و خووەکانی یەکەم و دووەم و سێیەم ببنە مەسەلەیەکی ئاشکراو ڕێزی تایبەتیش بۆ مەسەلە سەرنجڕاکێش و بێ هاوتاکان دابنێت و چالاکی و هەوڵ و تەقەلای بەرامبەریش بەهەند وەربگرێت. بەرچاوتێری ئەو ڕاستیە دەزانێت و ڕێزیشی لێ دەگرێت کە سنورەکانی نەشونما کردن و گەشەکردنی ئەرێنی کۆتاییان نییە و لەوانەشەوە دەتوانرێت ئەڵتەرناتیڤێکی تازەی کاریگەر یان گونجاو دروست ببێت.

## ئەڵتەرناتیڤی سێیەم

مەبەست لە سەرکەوتنی بەکۆمەڵ سەرکەوتن نییە بەسەر خەڵکیدا، بەڵکو سەرکەوتنە لە کارلێکێکی بەدوورو تەئسیردا کە بتوانێت کۆمەڵێك ئەنجامی بەسودی هاوبەش بۆ هەمو بەشداربووان دابین بکات. سەرکەوتنی بەکۆمەڵ هەروەها بریتییە لە کاری بەکۆمەڵ و لە پەیوەندی بە کۆمەڵ و لەوەی ئەو ئەنجامانە بەدەست بهێنن کە خەڵکەکە نەتوانن خۆیان بەتەنیا بەدی بهێنن. سەرکەوتنی بەکۆمەڵ بەرهەمی ئەقڵی بەرچاو تێرە. هەر کەسایەتیەك کە دەست پاك و کامڵ و بەرچاو تێر بو هێندە راستگۆ و بێگەردە کە دەتوانێت بە باشترین شێواز بەشداری بکات لە کارلێکە مرۆییەکاندا. بۆ ئەو کەسانەی کە شێوازی براوە/ دۆڕاو پەیڕەو دەکەن، من وا پێشنیار دەکەم کەسێك بکەن بە نمونەی خۆیان کە بە شێوازی براوە/ براوە رەفتار دەکات، چونکە پەیڕەوکەرانی شێوازی براوە — دۆڕاو زۆرجار پەیوەندییان هەر بە خەڵکی وەکو خۆیانەوە هەیە و بواریان بۆ نارەخسێت بە شێوەیەکی پراکتیکی فەلسەفەی براوە/ براوە پەیڕەو بکەن. لەبەرئەوە من پێشنیاری خوێندنەوەی دەقە ئەدەبیەکان دەکەم، بەتایبەت ژیاننامە ئیلهام بەخشەکەی ئەنور سادات، هەروەها ئەو شانۆگەری و فیلمە بەناوبانگانەی کە تایبەتن بە گەڕان بەدوای خودی خۆتدا. بەڵام بیرت نەچێت: ئەگەر ئێمە بە قوڵی بە ناخی خۆماندا بگەڕێین - بێگوێدانە راهاتن و بێ گوێدانە هەڵسوکەوتەکانی کە فێریان بوین - دەبینین کە فەلسەفەی براوە/ براوە و هەمو بنەمایەکی دیکەی راست و دروست لە ژیانی تایبەتی خۆماندان.

## پەیوەندییەکان

بنیادنان و راگرتنی پەیوەندییەکانی براوە/ براوە لەسەر بناغەی رەوشتە. کرۆکی فەلسەفەی براوە/ براوە بریتییە لە متمانە و لە پاشەکەوتەکەی کە لە بانقی سۆزداریدا خاوەنیان نین. ئەگەر متمانە نەبێت گەورەترین ئەنجام بتوانین تۆماری بکەین دۆزینەوەی چارەسەرێکی مامناوەندییە. ئەگەر متمانە نەبێت ئەو راستگۆییەش لە ئارادا نابێت کە پێویستە بۆ هەموو لێفێربونێك و هەمو پەیوەندییەکی کراوەو هەمو داهێنانێکی راستەقینە.

بەڵام ئەگەر پاشەکەوتی ناو بانقی سۆزداریمان پاشەکەوتێکی چاك بو راستگۆیی ئیتر کێشە نابێت، چونکە پاشەکەوتەکە بایی ئەوە دەبێت کە تۆش بزانیت و منیش بزانم ئێمە هەردوکمان بەراستی رێزی یەکتریی دەگرین. ئەمە وا دەکات کە ئیتر بایەخ بدەین بە مەسەلەکان نەك بە پۆست و کەسایەتییەکان.

ئێمە کە رێزی یەکتریمان گرت، مانای وایە لەگەڵ یەکتریدا کراوە دەبین. کاغەزی یارییەکەمان لەسەر مێزەکە بە ئاشکرا دادەنێین. ئێمە کە متمانەمان بە یەکتری هەبو، ئیتر تێڕوانینی جیاوازیشمان بۆ مەسەلەکان نابێتە کێشە، چونکە دڵنیام تۆ پێت خۆشە بە رێزەوە گوێ لە من بگریت لەکاتێکدا باسی کچە گەنجەکەت بۆ دەکەم، تۆش دڵنیایت کە ئەگەر باسی خانمە پیرەکەم بۆ بکەیت من بەهەمان رێزەوە گوێت لێ دەگرم. ئێمە هەردوکمان پابەندی ئەوەین هەوڵبدەین گۆشەنیگای یەکتری تێبگەین و پێکەوە کاربکەین بۆ ئەڵتەرناتیڤی سێیەم، کە چارەسەرێکی هاوکارانەی خولقێنەرە و بۆ هەردوکیشمان باشترە.

ئەو پەیوەندییەی کە پاشەکەوتی بانقی سۆزدارییەکەی بەرزبێت و هەردوولایەنەکەش باوەڕی قوڵیان بە شێوازی براوە/ براوە هەبێت باشترین خاڵی دەستپێکە بۆ هاوکاری خولقێنەری گەورە (خووی ٦). ئەو پەیوەندییە نە جیاوازییەکان دەسڕێتەوەو نە هیچ شتێکیش لە راستی و بایەخی مەسەلەکان کەم دەکاتەوە. بەڵام ئەو وزە نەرێنییە رادەماڵێت کە جەخت دەکاتە سەر جیاوازییەکان لە کەسایەتی و پلەو پایەداو وزەیەکی ئەرێنی هاوئاهەنگ دەخولقێنێت کە بایەخ بەوە بدات مەسەلەکان بەقوڵی تێبگەین و بە جۆرێك چارەسەری بکەین سودی هاوبەشی تێدابێت.

بەڵام ئەی ئەگەر ئەم جۆرە پەیوەندییە لەئارادا نەبو؟ ئەگەر ناچاربوین لەگەڵ کەسێکدا بگەینە رێکەوتن کە تەنانەت ناوی شێوازی براوە/ براوەشی نەبیستووە و باوەڕی رەهای هەیە بە شێوازی براوە/ دۆڕاو، یان بە شێوازەکانی دیکە؟

باشترین شێواز بۆ تاقیکردنەوەی براوە/ براوە ئەوەیە هەڵسوکەوت لەگەڵ براوە/ دۆڕاودا بکەیت. زۆر بەدەگمەن شێوازی براوە/ براوە بە ئاسانی دێتە دی، بەڵکو پێویستی بەوەیە هەڵسوکەوت لەگەڵ مەسەلە قوڵەکان و جیاوازییە بنەڕەتییەکاندا

بکەیت. بەڵام بە دڵنیاییەوە کارەکە ئاسانتر دەبێت ئەگەر هەردولایەنەکە ئاگاداری ئەم شێوازە بن و بە ئاگاییەوە پەیڕەوی بکەن و پەیوەندییەکەشیان خاوەنی پاشەکەوتێکی باش بێت لە بانقی سۆزدارییدا.

سەنگی مەحەك لەو دۆخەشدا هەر پەیوەندییەکانە کە بەرامبەرەکەت پارادیمی براوە/ دۆڕاوی هەبێت. لەم دۆخەدا تۆ هەمو بایەخێك دەدەیت بە بازنەی دەوروتەئسیرەکەت و پاشەکەوتی بانقی سۆزدارییەکەت زیاد دەکەیت لەڕێی نەرمونیانی و ڕێز و پێزانینی ئەو کەسەو گۆشەنیگاکەی. ئەمە دەبێتە هۆی درێژکردنەوەی ماوەی پەیوەندییەکەت و زیاتر و قوڵتر دەبیستیت و بە ئازایەتییەکی زیاترەوە گوزارشت لە خۆت دەکەیت. تۆ هەڵوێستەکانت کاردانەوە نین. ڕۆ دەچیتە ناخی خۆتەوە بۆ بەهێزکردنی ئەو ڕەوشتەی کە پێویستە بۆ ئەوەی جڵەوی مەسەلەکان بگریتە دەست و بەردەوام دەبیت لە دروستکردنی پەیوەندییەکەتدا تا کەسەکەی بەرامبەرت لە مەبەستی تۆ تێدەگات و دەزانێت ڕاستگۆیانە و دڵسۆزانە دەتەوێت چارەسەرەکە دەستکەوتێکی ڕاستەقینە بێت بۆ هەردوکتان. ئەم پرۆسەیەش بە پاشەکەوتکردنێکی گەورە حساب دەکرێت لە بانقی سۆزداریتدا. مرۆڤ هەتا بەهێزتر بێت و هەتا کەسایەتیەکی ڕاستگۆی هەبێت و هەتا زیاتر بتوانێت بارودۆخەکان کۆنترۆڵ بکات و زیاتر پابەندی شێوازی براوە — براوە بێت زیاتر دەتوانێت کاریگەری گەورە لەسەر بەرامبەرەکەی دروست بکات. هەر ئەمەشە مەرجی ڕاستەقینەی سەرکردایەتی بەکۆمەڵ کە سەرکردایەتیکردنی ئاسایی تێدەپەڕێنێت و دەیکاتە جۆرە سەرکردایەتییەك کە تەواوی مەسەلەکە بگۆڕێت. واتە هەم گۆڕینی کەسەکان و هەم گۆڕینی پەیوەندییەکانیش.

ڕێبازی براوە/ براوە لەبەرئەوەی پرنسیپێکە خەڵك دەتوانن بیکەنە مەسەلەیەکی فەرمی و یاسایی لە ژیانیاندا کەواتە زۆر بە ئاسانی دەتوانین باوەڕ بە خەڵکەکە بهێنین کە ئەگەر هەوڵ بدەین مەبەستی هەردولامان بپێکین ئەوا ئەوان دەستکەوتی زیاتریان بۆ دابین دەبێت. بەڵام نابێت لەبیرمان بچێت کە تەنیا ڕێژەیەکی کەمی خەڵکەکە بەم شێوەیە بیردەکەنەوە. زۆربەیان لایەنگری ڕێبازی براوە/ دۆڕاون. لەم دۆخەدا ڕێك نەکەوتن باشترین هەڵبژاردەیە لەگەڵیاندا. خۆ ئەگەر نەکرا دەتوانیت بگەیتە سازشێك لەگەڵیاندا کە شێوەیەکی بچکۆلەی ڕێبازی براوە/ براوەیە.

گرنگە ئەو راستی‌یە بزانین کە مەرج نییە هەمو بڕیارەکان لەسەر شێوازی براوە/ براوە بن تەنانەت ئەگەر پاشەکەوتی بانقی سۆزدارییش بەرز بێت. دوبارەی دەکەینەوە کە کلیلی مەسەلەکە بریتییە لە پەیوەندییەکان. بۆ نمونە ئەگەر من و تۆ پێکەوە کاربکەین و تۆ رۆژێك بێیتە لام بڵێیت؛ (ستیفن ئەزانم تۆ ئەم بڕیارەت پێ خۆش نی‌یە بەڵام بوارم نی‌یە بۆت رون بکەمەوە. هەقت نەبێ بەسەرەوە. ببە بە شەریکم و ئەگەر ئێستەش بە هەڵەی بزانی گرنگ نی‌یە قەیناکە. دەڵێی چی؟) دیارە ئەگەر تۆ لەلای من خاوەنی پاشەکەوتێکی باشی سۆزداری بیت بە دڵنیایی‌یەوە پشتگیریت دەکەم. هیواداریش دەبم من هەڵەبم و تۆ راست بیت. هەمو هەوڵێکیش دەدەم بۆ سەرخستنی بڕیارەکەت و بەدەستهێنانی ئەنجامی باش.

بەڵام ئەگەر پاشەکەوتت نەبێت و کەسێك بیت هەڵوێستەکانت هەموی کاردانەوە بن ئەوا بێ‌گومان پشتگیری بڕیارەکەت ناکەم و هیچ سەرمایەگوزارییەك بۆ سەرخستنی بڕیارەکەت ناکەم.

خۆ ئەگەر لەوجۆرە کەسانە بم کە توندڕەون لە کاردانەوەیاندا ئەوا دور نییە هەوڵی تێکدانی بڕیارەکەت بدەم و هەرچی‌یەکیشم لەدەست بێت بەکاری دەهێنم بۆ ئەوەی خەڵکانی دیکەش هەمان شت بکەن و بڕیارەکەت لێ تێك بدەن. یاخود رەنگە فێڵبازانە گوێڕایەڵت بم و هەرچی‌یەکم داوا لێ بکەیت ئەنجامی بدەم بەڵام نەچمە ژێرباری ئەنجام و بەرپرسیارێتییەکانەوە.

لە ماوەی ئەو پێنج ساڵەدا کە لە بریتانیای مەزندا دەژیام دوجار ئەو وڵاتەم بینی هێنرایە سەرچۆك چونکە بلیتبڕەکانی شەمەندەفەر زۆر گوێڕایەڵی ئەو یاسا و فەرمانانە بون کە لەسەر کاغەز نوسرابون.

بڕیاری سەرکاغەز هیچ بایەخێکی ئەوتۆی نی‌یە ئەگەر رەوشت و پەیوەندی وای لەگەڵدا نەبێت کە رۆحی بڕیارەکە بپارێزێت. لەبەرئەوە پێویستە بە ئارەزویەکی راستەقینەوە سەرمایەگوزاری بکەین لەو پەیوەندییانەدا کە شێوازی براوە/ براوە بەدی دەهێنن.

## رێکەوتنەکان

لە پەیوەندییەکانەوە رێکەوتنەکان هەڵدەقوڵێن و رێکەوتنەکانیش شێوازی بیرکردنەوەی براوە / براوە دەستنیشان و ئاراستە دەکەن. ئەو رێکەوتنانە هەندێك

جار ڕێکـەوتنی ئەنجامـدانن و هەنـدێك جـاریش ڕێکـەوتنی بەشـداریکردنن. کـە پارادیمی پەیوەندیـیە بەرهەمهێنەکـە دەگۆڕێـت لـە سـتونییـەوە بـۆ ئاسـۆیی و لـە چاودێریکردن و سەرپەرشـتییکردنێکی دودڵ و ناوبـەناوەوە بـۆ خـۆ چـاودێریکردن و هەوڵۆێستوەرگرتن و بۆ بەشداریکردن لە سەرکەوتندا.

ڕێکەوتنـەکانی شـێوازی بـراوە/ بـراوە مەودایـەکی زۆری ئـەو پەیوەندییانـە دەگرنـەوە کـە پەیوەسـتن بـە یەکترییـەوە. ئێمـە لـە خـووی ژمـارە (۳)دا نمونەیـەکی گرنگـی چـۆنێتی جێبـەجێکردنی ئـەم ڕێکەوتنـەمان لـە چـیرۆکی (سـەوز و چـاك)دا ڕونکردەوە. هەر پێـنج توخمەکەی کـە لەوێـدا ڕیزمـان کـردن پەیکـەری ڕێکەوتنـەکانی شێوازی بیرکردنەوەی براوە/ براوە پێك دەهێـنن لـەنێوان خـاوەن کـارو کارمەنـدەکانـدا و لەنێوان خەڵکە سەربەخۆکەدا کە پێکەوە لـە پرۆژەکانـدا کاردەکـەن و لـەنێوان ئـەو گروپانـەدا کـە هاوکـاریی یـەکتری دەکـەن لـەپێناوی ئامـانجێکی هاوبەشـدا و لـەنێوان کۆمپانیاکــان و هاوردەکارانــدا و لــەنێوان ئەوانــەدا کــە بــۆ تــەواوکردنی کارەکــە پێویستیان بە هاوکاریی یەکترییە. ئەم پێویستییانە ڕێگەیـەکی کاریگـەر دەخـوڵقێنن بـۆ ڕونکردنـەوە و سەرپەرشـتیکردنی ئـەو چاوەڕوانییانەی کـە خەڵکـە بەشـدارەکە هەیانە لەو هەوڵە هاریکارییە خوڵقێنەرەو یەکترتەواوکەرەدا.

**لە ڕێکەوتنی براوە/ براوەدا ئەم پێنج توخمەی خوارەوە زۆر ئاشکران:**

★ ئامانجـە خوازراوەکـان (نـەك ڕێگاکـان) ئەرکەکـە و کـاتی ئەنجامـدانی ئەرکەکـە دیاری دەکەن.

★ هێڵـە ڕێنیشاندەرەکان پارامیتـەرەکان دیـاری دەکـەن (پرنسـیپ و سیاسـەتەکان و .... تاد) کە لە چوارچێوەیاندا ئەنجام بەدی دەهێنرێت.

★ سەرچـاوەکان پشـتیوانـییـە مرۆیـی و دارایـی و هونـەری و ڕێکخراوەییـە دابینکراوەکان دیاری دەکەن بۆ یارمەتیدانی تەواوکردنی ئەنجامەکان

★ ڕونکردنەوەی وردەکاریی بۆ دیاریکردنی ئاستەکانی ئەنجامدان و کاتی هەڵسەنگاندنەکە.

★ پێشهاتەکان بـۆ دیـاریکردنی بـاش و خـراپ و سروشـتی لـۆجیکی و ئـەوەی ئێستا ڕوودەدات و ئەوەش کە بەپێی هەڵسەنگاندنەکە پێشبینی دەکرێت ڕووبدات.

ئـەم پێـنج توخمـە مایـەی زینـدوبون و مانـەوەی ڕێکەوتنـەکانی بـراوە/ بـراوەن.

لێکتێگەیشتنێکی روون و هاوبەش و گەیشتنە رێکەوتن لەم بوارانەدا ئاستێکی وا دەخولقێنێت کە مرۆڤ بتوانێت لە رێگەیەوە سەرکەوتنی تایبەتی خۆی بپێوێت.

دیارە هەمو چاودێریکردنێکی سەرکوتکەرانەی کلاسیکی لەراستیدا پارادیمێکی براوە/ دۆڕاوە .. هەروەها ئەنجامی راکێشانی زیاد لە ئەندازەیە لەو پاشەکەوتەی کە لە بانقی سۆزداریدا هەیە. نەبونی متمانە و نەبونی دیدێکی هاوبەش بۆ ئەنجامە خوازراوەکان دەبێتە هۆی دوودڵی و سەرلەنوێ چاوخشاندنەوە و ئاڕاستەکردن. مادام متمانە لەئارادا نییە، تۆ بە ناچاری هەوڵی کۆنترۆلکردنی بەرامبەرەکەت دەدەیت.

بەڵام ئەگەر پاشەکەوتی متمانەکە پاشەکەوتێکی زۆربو، چی؟ لاچۆ لەسەر رێگەیاندا و مادام رێکەوتنێکیان هەیە لەسەر رێبازی براوە – براوە و ئەوانیش ئەرکەکەیان شارەزان و دەزانن چیان لێ چاوەڕوان دەکرێت، کەواتە رۆڵی تۆ تەنیا پشتگیریکردن و وەرگرتنی راپۆرت و رونکردنەوەکانیانە.

کاری جوامێرانە ئەوەیە بەرامبەرەکەت هێندە بەتوانابکەیت خۆی حوکم بەسەرخۆیدا بدات نەك تۆ حوکمی بەسەردا بدەیت.

ئەمە لەو کۆمەڵگایانەدا راستتر و وردترە کە متمانە تیایدا لە ئاستێکی باڵادایە. لەزۆربەی حاڵەتەکاندا مرۆڤ بە چاوی دڵ زۆر باشتر شتەکان دەبینێت لەوەی کە راپۆرت و تۆمارەکان نیشانی دەدەن. سەلیقە و زیرەکی زۆرجار لە هەمو پێوەر و تێبینییەك وردترن.

## راهێنان لەسەر بەڕێوەبردنی شێوازی براوە/ براوە

چەند ساڵێك لەمەوبەر، من بە شێوەیەکی ناراستەوخۆ بەشداریم کرد لە پرۆژەیەکی راوێژکاریدا بۆ دەزگایەکی گەورەی بانق کە دەیان لقی هەبو. داوایان لێ کردین پرۆگرامی راهێنانی کارگێڕییان هەڵبسەنگێنین و چاکسازی تێدا بکەین کە ساڵانە بودجەیەکی (٧٥٠) هەزار دۆلاریی بۆ تەرخان کرابو. پرۆگرامەکە پێك هاتبو لە هەڵبژاردنی دەرچوانی زانکۆ و ئینجا ماوەی زیاتر لە شەش مانگ بخرێنە بەشە جیاجیاکانەوە بۆ ئەوەی زانیاری گشتی پەیدا بکەن دەربارەی پیشەسازی. لەبەرئەوە دوو هەفتەیان لە قەرزە بازرگانییەکان و دوو هەفتەی دیکەش لە قەرزە پیشەسازییەکاندا و دوو هەفتەش لە خستنە بازاڕدا بەسەربرد و .. تاد. پاش

کۆتایهاتنی ماوەی شەش مانگەکە هەریەکەیان کرا بە یاریدەدەری بەڕێوەبەری لقێکی جیاوازی بانقەکە.

ئەرکی ئێمە بریتی بو لە هەڵسەنگاندنی ماوەی راهێنانە فەرمیە شەش مانگییەکە. کە دەستمان دایە کارەکە بۆمان دەرکەوت زەحمەترین بەشی ئەرکەکە بەدەستهێنانی وێنەیەکی روونی ئامانجە خوازراوەکانە. لە گشت بەڕێوەبەر و جێبەجێکارەکانمان پرسی: ئەمانە کاتێک کە خولی راهێنانەکەیان تەواو دەکەن پێویستە توانای چییان هەبێت و چ کارێك بگرنە ئەستۆ؟ پرسیارەکەمان پرسیارێکی گرنگ بو، بەڵام وەڵامەکان تەمومژاوی و دژبەیەك بوون.

بەرنامەی راهێنانەکە بایەخی بە رێکارەکان دەدا نەك بە ئەنجامەکان. لەبەرئەوە ئێمە پێشنیارمان کرد بەرنامەیەکی سەرەکی "پێشەنگ" دروست بکەن کە لەسەر پارادیمێکی جیاواز دامەزرابێت. بەرنامەکە پێی دەوترێت "ئەو بەرنامەیەی کە فێرخواز کۆنترۆڵی دەکات" ئەمەش رێکەوتێك بو لەسەر شێوازی براوە/ براوە کە دیاریکردنی کۆمەڵێك ئامانج و پێوەر لەخۆ دەگرێت و شێوازی ئەنجامدانی ئەرکەکە رون دەکاتەوە و هەروەها رێنماییەکان و سەرچاوەکان و میکانیزمی چاودێرییە داراییەکان دەستنیشان دەکات، هەروەها ئەو نیشانانەش کە پاش بەدیهێنانی ئامانجەکان دەردەکەون. پێشهاتەکانیش لەم دۆخەدا بەرزکردنەوەیە بۆ پۆستی یاریدەدەری بەڕێوەبەر، بە شێوازێکی وا کە پۆستەکە بەشێك بێت لە راهێنانەکە و هەروەها زیادکردنی موچەش بە شێوەیەکی بەرچاو.

ئێمە بۆ رونکردنەوە و دیاریکردنی ئەو ئامانجانە ناچاربوین گوشار بکەین. دەتەوێت ئەوان چی بزانن لە ژمێریاریدا؟ ئەی لە مەسەلەی خستنە بازاڕەوە؟ ئەی دەربارەی قەرزەکانی ملکداریی؟ لەم بارەیەوە لیستێکمان ئامادەکرد کە زیاتر لە سەد پرسیاری گرتبوەخۆ. پاشان بە رونکردنەوە و کورتکردنەوە و جێبەجێکردن توانیمان بیکەینە (٣٩) ئامانجی دیاریکراو، کە هەر ئامانجێك رەفتار و پێوەری تایبەتی خۆیی لەگەڵدابو.

رەخساندنی فرسەت و زیادکردنی موچە پاڵنەری گەورەبون بۆ ئەوەی بەشدارانی راهێنانەکە هەوڵی خۆگونجاندن بدەن لەگەڵ پێوەرەکاندا بە زووترین کات. ئەمە هەم قازانجێکی گەورەی بەشداربووەکانی تێدابو، هەم سودێکی مەزنیشی بە

کۆمپانیاکە گەیاند، چونکە بوبووە خاوەنی ژمارەیەك یاریدەدەری – بەڕێوەبەری وا کە بەڕاستی هوشیارییان هەبێت لەسەر چۆنێتی بەدیهێنانی ئامانجەکان، نەك هەر بە رواڵەت خۆیان نیشان بدەن و لە کردەوەشدا کارێکی ئەوتۆیان لەدەست نەیەت.

لەبەرئەوە هاتین ئەو جیاوازییانەمان بۆ راهێنراوەکان روونکردەوە کە لەنێوان ئەو دوو شێوازەی فێرکردنەدا هەیە، فێرکردنێك کە فێرخواز خۆی کۆنترۆڵی دەکات و ئەو فێرکردنەی کە سیستەمەکە کۆنترۆڵی دەکات. پێمان وتن: ئەمانە ئامانج و پێوەرەکانن، ئەمانەش سەرچاوەکانن، بەوەشەوە کە لەیەکتری فێرببن. هەر کاتێك گەیشتنە ئاستی دیاریکراو، پۆستەکانتان بەرزدەکرێتەوە بۆ یاریدەدەری بەڕێوەبەر".

خولەکە بە سێ هەفتە و نیو کۆتایی هات. کەواتە ئێمە بە وەرچەرخاندنی پارادیمی راهێنانەکە توانیمان هاندان و خولقاندنێکی چاوەڕواننەکراو بهێنینە ئاراوە.

ئەم کارەی ئێمەش، وەك هەمو وەرچەرخاندنێکی دیکەی پارادیمەکان بێ بەرهەڵستکار نەبو. زۆربەی زۆری بەڕێوەبەرە گەورەکان باوەڕیان نەدەکرد. کاتێکیش بە بەڵگەوە بۆمان سەلماندن کە پێوەرەکان هاتونەتە دی، قسەی سەرەکییان ئەمە بوو: "راهێنراوەکانً بێ ئەزمونن و ئەو مەسەلە بنەڕەتییانەیان ناتەواوە کە بتوانن ببنە یاریدەدەری بەڕێوەبەر و خاوەن بڕیار".

پاشتر کە قسەمان لەگەڵدا کردن تێگەیشتین مەبەستیان ئەوەیە ئەمان خۆیان زەحمەتیان زۆر بینیوە تا گەیشتونەتە ئەو پۆست و پلانە، ئیتر چۆن قایل دەبن ئەم راهێنراوە تازانە بە ئاسانی ببنە یاریدەدەری بەڕێوەبەر؟ .. بەڵام بە ئاشکرا ئەوەیان نەدەوت، بەڵکو بیانوی دیکەیان دەهێنایەوە "ئەزمونیان کەمە" سەرباری ئەمانەش و لەبەر کۆمەڵێك هۆکاری ئاشکرا (لەوانە بودجە ٧٥٠ هەزار دۆلارییەکەی کە بۆ پرۆگرامێکی شەش مانگی تەرخان کرابو) بەشی خۆیەتی کۆمپانیاکە تورە و بێزاربو.

لە وەڵامدا پێمان وتن: "زۆرچاکە. با کۆمەڵێك پێوەر و ئامانجی زیاتریان بۆ دیاری بکەین، بەڵام لەسەر هەمان پارادیمی ئەو بەرنامەیەی فێرخواز کۆنترۆڵی دەکات". توانیمان هەشت ئامانجی دیکە بە پێوەری زۆر قورس و زەحمەتەوە دابنێین بە مەبەستی دڵنیاکردنی بەڕێوەبەرە باڵاکان کە ئەو راهێنراوانە ئامادەن و مەرجی ئەوەیان تێدایە ببنە یاریدەدەری بەڕێوەبەر و درێژە بە راهێنانەکەیان بدەن لەو پۆستەدا. دوای بەشداریکردنیان لە هەندێك دانیشتنی خولەکەدا پاش دانانی پێوەرە

زەحمەتەکان، زۆرێك لە بەڕێوەبەرە باڵاکان رایانگەیاند کە ئەگەر بەشداران بتوانن ئەو پێوەرە سەختانە جێبەجێ بکەن لەو کەسانە باشتر دەردەچن کە خولی شەش مانگییان بینیوە.

ئێمە بەشداربوانمان وا ئامادەکرد کە بتوانن وەڵامی بەرهەڵستکاران بدەنەوە. ئامانجە تازە سەرەڕاییەکان و پێوەرەکانمان بۆ ئاشکراکردن و وتمان: وەك پێشبینیمان دەکرد، بەڕێوەبەرایەتی کۆمپانیاکە پێی باشە ئێوە هەندێك ئامانجی زیاتر تەواو بکەن بە پێوەری زەحمەتترەوە. ئەوان ئەمجارە دڵنیایان کردوینەتەوە کە ئەگەر مەرجەکانتان تێدا بەرجەستە ببێت دەتانکەنە یاریدەدەری بەڕێوەبەر.

بەشداران بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش دەستیان دایە ئەرکەکە. سەردانی بەشە جیاجیاکانیان دەکرد، بۆ نمونە دەچونە بەشی ژمێریاری و قسەی ئاوایان دەکرد "گەورەم، من ئەندامێکی ئەم پرۆگرامە پێشەنگەم کە پێی دەوترێت ئەو راهێنانەی فێرخواز کۆنترۆڵی دەکات. ئاگاداریشم کە بەڕێزت بەشدارییت کردووە لە داڕشتنی ئامانج و پێوەرەکاندا.

"من لەم بەشەی کۆمپانیاکەدا پێویستە شەش مەرج جێبەجێ بکەم. سیانیان لە زانکۆ فێریان بوم و یەکێکیشیان خۆم لەڕێی خوێندنەوەی کتێبەوە شارەزاییم تێدا پەیدا کردووە و پێنجەمیشیان ئەو هاوڕێیەم فێری کردم کە بەڕێزت حەفتەی رابردوو مەشقت پێکرد. ماوەتەوە مەرجی شەشەم. ئاخۆ کەسێك لەم بەشەدا هەیە چەند سەعاتێك کاتی خۆیم بداتێ و فێرم بکات؟؟ بەم شێوەیە، لەبری ئەوەی دوو هەفتە لەوبەشەدا بمێنێتەوە، هەریەکەیان کارەکەی بە نیو رۆژ تەواوکرد.

بەشدارانی راهێنانەکە هاوکاری یەکترییان دەکردو بیروبۆچونی سەرنجڕاکێش و کتوپڕیان ئاڵوگۆڕ دەکرد و لە ماوەی هەفتەو نیوێکدا ئامانجی زیاتریان بەدەست هێنا. بەم جۆرە ماوەی خولەکە لە شەش مانگەکەوە بو بە پێنج حەفتەو ئەنجامەکانیش بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش زیاتر و قوڵتر بون. دەتوانرێت بەهەمان شێوە ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە لە هەمو بوارێك لە بوارەکانی ژیانی رێکخراوەیدا کاریگەریی بنوێنێت، بە مەرجێك خەڵکەکە ئازایەتی ئەوەیان تێدابێت پارادیمەکانیان ئاشکرا بکەن و جەخت بخەنە سەر شێوازی براوە/ براوە. من هەمیشە سەرسامم بەو ئەنجامانەی کە دەزگاکان و تاکە کەسەکان بەدەستی دەهێنن

کاتێك کە خەڵکە بەرپرسیار و ڕێچکە شکێن و خۆ ئاڕاستەکەرەکان جڵەوی کارەکە دەگرنە دەست.

## ڕێکەوتنەکانی ئەنجامدانی شێوازی براوە/ براوە

خوڵقاندنی ڕێکەوتنی تایبەت سەبارەت بە چۆنێتی ئەنجامدانی شێوازی براوە/ براوە پێویستی بەوەیە وەرچەرخاندنی بنەڕەتی لە پارادیمەکاندا بهێنیتە دی. جەختەکە لەسەر ئەنجامەکانە نەك لەسەر ڕێکارەکان. ئێمە زۆربەمان حەزمان لەوەیە چاودێری ڕێکارەکان بکەین. بەڵام ڕێکەوتنەکانی براوە — براوە زیاتر ئامانجەکانیان لەلا مەبەستەو ئەمەش توانا مرۆییە گەورەکان ئازاد دەکات و هاوکارییەکی خوڵقێنەری مەزنتر دەهێنێتە ئاراوە و لەبری ئەوەی تەنیا هەر جەخت بکاتە سەر بەرهەمهێنان، کارێك دەکات توانای بەرهەمهێنان فراوانتر و زیاتر بێت.

فەلسەفەی براوە/ براوە جۆرە بەرپرسیارێتییەکە مرۆڤ خۆی هەڵسەنگاندن بۆ خۆی بکات. شێوازە کلاسیکییە بێبەرهەمەکەی هەڵسەنگاندن کە خەڵکی پەیڕەوی دەکەن لە هەڵسەنگاندنی یەکتریدا گەمەیەکی بێ ئەنجامە و پەیوەندییەکان دەشێوێنێت و لاوازیان دەکات. لە شێوازی براوە/ براوەدا خەڵککە بەو پێوەرانە خۆیان هەڵدەسەنگێنن کە یارمەتییان داون لە پێشخستنی خۆیاندا و هەر خۆشیان ڕۆڵیان هەبووە لە داڕشتنی ئەو پێوەرانەدا. ئامادەکردن و ڕێکخستنی ئەم پێوەرانە بە باشی مەرجێکی گرنگە بۆ ئەوەی خەڵکی بتوانن جێبەجێی بکەن. لە شێوازی براوە/ براوەدا تەنانەت منداڵی حەوت ساڵانیش دەتوانێت خۆی هەڵبسەنگێنێت و بزانێت تا چەند دەتوانێت (حەوشەکە بە سەوزی و پاکی) بهێڵێتەوە.

باشترین ئەزمونی قۆناغی مامۆستایەتیم لە زانکۆ هی ئەو کاتەیە کە توانیم بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکەمان لێکتێگەیشتنێکی هاوبەش بهێنینە ئاراوە سەبارەت بە شێوازی بیرکردنەوەی براوە/ براوە. "ئامانجەکەی کە هەوڵ دەدەین پێی بگەین ئەمەیە .. ئەمانەش پێویستییەکانن یەك و دوو و سێ، ئامانجی منیش ئەوەیە یەك بە یەکتان یارمەتی بدەم پلەی یەکەم بەدەست بهێنێت. ئێستا ئیتر پێویستە خۆت ئەو مەسەلانە شرۆڤە بکەیت کە قسەمان لێوە کرد، بۆ ئەوەی بزانیت دەتەوێت لەپێناوی بەدەستهێنانی ئامانجەکەدا چی بکەیت و چ ڕۆڵێك بگێڕیت، کە هەر

تایبەت بێت بە خۆت. پاشان پێکەوە دادەنیشین بزانین تۆ حەزت لە پلەی چەندەمەو چ پلانێکت لە خەیاڵدایە بۆ بەدەستهێنانی ئەو پلەیە."

فەیلەسوف و راوێژکاری کارگێڕی (پیتەر دراکەر) پێشنیاری بەکارهێنانی "نامەی بەڕێوەبەر" دەکات، وەك ئامرازێك بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی رێکەوتنی نێوان بەڕێوەبەر و کارمەندەکانی. مەبەستیش لە نامەی بەڕێوەبەر ئەمەیە: پاش گفتوگۆ و بیرو را گۆڕینەوەی قوڵ و تێروتەسەل سەبارەت بە پێشبینییەکان و رێنمایی و سەرچاوەکان بە مەبەستی دڵنیابون لەوەی کە ئەمانە گشتیان هاوئاهەنگن لەگەڵ ئامانجەکانی رێکخراوەکەدا، ئینجا کارمەندەکە نامەیەك بۆ بەڕێوەبەر دەنوسێت کە پوختەی گفتوگۆکانی تێدا تۆمار دەکات و ئاماژەش بەوە دەکات کەی پلانی ئەنجامدانی ئاییندە جێبەجێ دەکرێت یاخود کەی چاودەخشێنرێتەوە بە گفتوگۆکاندا.

پێکهێنانی رێکەوتنی لەمجۆرە بە گرنگترین ئەڵقەی کارگێڕی ئەژمار دەکرێت. لە رێکەوتنی ئاوادا کارمەندەکان دەتوانن خۆیان لەناو چوارچێوەی رێکەوتنەکەدا رێك بخەن. بەڕێوەبەرەکەش دەتوانێت تەنیا رۆڵی ئەو ئۆتومبیلە ببینێت کە لە پێشبڕکێکاندا خێراییەکە دیاری دەکات. واتە شتەکان دەخاتە گەڕ و رێگەکەیان بۆ چۆڵ دەکات.

کە سەرۆکی دەزگاکە دەبێتە یارمەتیدەری یەکەمی یەك بەیەکی کارمەندەکانی خۆی، ئەوا دەتوانێت زیاتر کۆنترۆڵی مەسەلە کارگێڕییەکە بکات و خۆی لە بابەتی لاوەکی و بێکەڵك رزگار بکات .. لەبری سەرپەرشتیکردنی شەش حەوت کەس، دەتوانێت بیست سی کەس بگرە زیاتریش سەرپەرشتی بکات.

لە رێکەوتنەکانی ئەنجامدانی شێوازی براوە/ براوەدا ئەنجامە سروشتی و لۆجیکییەکە بریتی دەبێت لە پێشهاتەکان نەك لەو پاداشت و سزا سەرکوتکەرانەیەی کە بەرپرسیارەکە دیارییان دەکات.

لە بنەڕەتدا چوار جۆر پێشهات (پاداشت و سزا) هەن کە بەڕێوەبەرایەتییەکان و باوکان و دایکان دەستیان بەسەریاندا دەڕوات. دارایی، دەرونی، هەل و بەرپرسیارێتی. پێشهاتە داراییەکان بابەتی وەکو داهات و پشك و مافی کڕین و فرۆشتن و سزای پارە لەخۆ دەگرێت. پێشهاتە دەروونییەکانیش بریتین لە رێز و ددانپێدانان و راستگۆیی و لەدەستدانی متمانە. جۆری سێیەمی پێشهاتەکانیش (هەل) بریتییە لە مەشق و

گەشەکردن و سوودەکانی دیکە. بەرپرسیارێتیش ئەو مەسەلانە دەگرێتەوە کە پەیوەستن بە دەسەڵات و ئامانجەوە، کە هەرکامێکیان ئەگەری گەورەبون و لەناوچونیان هەیە. ڕێکەوتنەکانی بواری براوە/ براوە هەمیشە پێشهاتەکان لە یەکێک یاخود زیاتری ئەو بوارانەدا دیاری دەکات و مەسەلەکەش بە جۆرێک دەبێت کە ئەوانەی ناو ڕێکەوتنەکە دەیزانن و هەستی پێ دەکەن، لەبەرئەوە پێویست بە فێڵ و ئەمسەر و ئەوسەر ناکات، شتەکە لەسەرتاوە روونە.

سەرباری ئەم پێشهاتە کەسێتی و لۆجیکیانە، مەسەلەیەکی زۆر گرنگی دیکە ئەومیە پێشهاتە سروشتییە ڕێکخراوەییەکان دیاری بکەیت. بۆ نمونە ئەگەر درەنگ چویتە سەرکار چی روودەدات؟ یاخود ئەگەر لەگەڵ کارمەندەکانی ژێردەستی خۆتدا ڕێکەوتنێکی باش لە شێوازی براوە/ براوەدا نەهێنیتە ئاراوە، یاخود ئەگەر بەرپرسیاریان نەکەم بەرامبەر ئەنجامە خوازراوەکان یاخود ئەگەر پاڵپشت و هاندەریان نەبم بۆ پێشکەوتنیان لە بواری کارو پیشەکانیاندا.

کاتێک کچەکەم تەمەنی گەیشتە شانزە ساڵ، ئێمە سەبارەت بە چۆنێتی بەکارهێنانی ئوتومبیلەکەی ماڵەوە ڕێکەوتنێکی براوە/ براوەمان لەگەڵدا کرد. وا ڕێک کەوتین کە ئەو پێویستە یاساکانی هاتوچۆ پەیڕەو بکات و ئوتومبیلەکە بە پاکی و بە چاکی رابگرێت و هەر بۆ کاری پێویست لێی بخورێت و ئەگەر من و دایکی ئیشێکمان هەبو، بە ئوتومبیلەکە بمانگەیەنێت و هەروەها پێویستە بە ڕوویەکی خۆشەوە ئەرکەکانی دیکەیشی ئەنجام بدات. ئەمانە قازانجەکانی ئێمە بون.

هەروەها ڕێکەوتنەکە ئەوەشی تیابو کە ئەرکی دابینکردنی ئوتومبیلەکە و بەنزین و پارەی بیمە لە ئەستۆی من بێت. حەفتەی یەک جاریش (پاشنیوەڕۆی کۆتایی هەفتە) کۆببینەوە بۆ هەڵسەنگاندنی ئیش‌وکارەکان تا بزانین ئیش‌وکارەکان لە چوارچێوەی ڕێکەوتنەکەدان یان نا. ئەنجامەکانیش روون و ئاشکرابون. هەتا ئەو پابەندی مەرجەکان بوایە، دەیتوانی ئوتومبیلەکە بەکاربهێنێت، بەڵام ئەگەر پابەند نەبوایە، ئوتومبیلەکەمان لێ دەسەندەوە تا ئەوکاتەی بڕیاری دەدایەوە پابەندی مەرجەکان بێت.

ئەم ڕێکەوتنە براوە/ براوەیە وای کرد هەر لەسەرتاوە هەردولامان بەرچاومان رون بێت و بزانین ئەو ئەگەرانە چین کە رەنگە رووبدەن: بۆ کچەکەمان

ڕێکەوتنێکی براوە/ براوە بو. چونکە بۆی هەبو ئوتومبیلەکەی پێ بێت. دیارە بە دڵنیاییەوە بۆ من و هاوسەرەکەشم قازانجی هەبو. بەم ڕێکەوتنە ئەو هەمو ئەرکەی گواستنەوەی خۆی و هەندێك لە هاتوچۆی ئێمەی دابین کرد. ئێمەش مەسەلەی پاك ڕاگرتن و ئیدامەی ئوتومبیلەکەمان لەکۆڵ کەوت. هەروەها بەرپرسیارێتی و متمانەشمان بەرامبەر کچەکەمان هەبو. پێویستی نەدەکرد تاقیبی بکەم و دەست بخەمە ئیش‌وکارییەوە .. زیرەکی و پاکی و بەویژدانی و ئەو پاشەکەوتە زۆرەی کە لە بانقی سۆزداریدا هەمان بو، هەمو وایان لێ کرد ئیش‌و کارەکان زۆر باشتر ئەنجام بدات. پێویستمان بەوە نەبو چاودێری هەمو هەڵسوکەوتێکی بکەین و ئەگەر شتێکی کرد بە دڵی ئێمە نەبو سزای بدەین. نەخێر ئێمە لەگەڵ ئەودا ڕێکەوتنێکمان هەیە و ئەو ڕێکەوتنەش هەردولامانی ئازادکردووە.

ڕێکەوتنەکانی بواری براوە/ براوە تا ئەندازەیەکی زۆر بە ڕێکەوتنی ئازادیبەخش هەژمار دەکرێن، بەڵام لەبەرئەوەی بەرهەمی تەکنیکن و تەکنیکیش ڕەنگە گۆشەگیربێت کەواتە بەردەوامبونیشی مەسەلەیەکی حەتمی نییە ئەگەر متمانەی بەهێزمان بە یەکتری نەبێت و بەرامبەرەکەمان بە دەستپاك و ڕاستگۆ نەزانین.

ڕێکەوتنی ڕاستەقینەی شێوازی بیرکردنەوەی براوە/ براوە بەرهەمی پارادیمە، کە پەیوەندی و ڕەوشت لەوێوە گەشە دەکەن. لەبەرئەوە ڕێکەوتنی لەمجۆرە، هاوکارییە خوڵقێنەرەکان دەستنیشان و ئاراستە دەکات، ئەو هاوکارییە کە هەر لەسەرەتاوە ڕێکەوتنەکەی لەپێناودا داڕێژراوە.

## سیستم:

بیرکردنەوەی براوە/ براوە لە هیچ ڕێکخراوێکدا ناتوانێت بژی ئەگەر سیستمەکە پشتگیریی نەکات. تۆ ئەگەر بە قسە باسی براوە/ براوە بکەیت بەڵام لەسەر بناغەی براوە/ دۆڕاو خەڵات بدەیتە بەرامبەرەکەت مانای وایە بەرنامەکەت شکستخواردو دەکەیت.

چی بچێنیت هەر ئەوە دەدوریتەوە. مرۆڤ ئەگەر بیەوێت ئامانجەکانی بەدەست بهێنێت و بنەماکانی ڕەنگ بدەنەوە لە پەیامەکەی ژیانیدا، پێویستە ئەو سیستمەی کە خەڵکەکەی پێ خەڵات دەکات هاوتەریب بێت لەگەڵ ئەم پرنسیپ و ئامانجانەدا. ئەگەر ئەو شێوازی خەڵاتکردنە بە شێوەیەکی سیستیماکی هاوئاهەنگ نەبێت، ئەوا

قسەو کردارت رێك نایەنەوە. وەك ئەو بەڕێوەبەرەت لێ دێت کە پێشتر ئامازەمان پێ کرد، بە دەم باسی هاوکاری دەکرد کەچی کارمەندەکانی هان دەدا پێشبڕکێ بکەن لەگەڵ یەکتریدا.

من ماوەی چەند ساڵێك لەگەڵ کۆمپانیایەکی گەورەی خانووبەرەدا کارم کرد لە خۆرهەلاتی ناوەڕاستدا. یەکەم ئەزمونم لەگەڵ ئەم دەزگایەدا سەبارەت بە کۆبونەوەیەکی گەورەی فرۆشتن بو. زیاتر لە (٨٠٠) دەزگای فرۆشیار – بۆ تاوتوێکردنی بەرنامەی پاداشتی ساڵانە کۆبونەوە. لە دانیشتنەکەدا هەمو دڵخۆش و سەرحاڵ بون. کۆمەڵێك خوێندکاری زانکۆش لە دانیشتنەکەدا ئامادە بون و بەشدارییان هەبو لە غەڵبەغەڵب و پێکەنینەکاندا.

لەناو ئەو (٨٠٠) کەسەدا کە ئامادەبون، نزیکەی چل کەسیان خەڵاتیان وەرگرت. ناونیشانی خەڵاتەکانیش جۆراوجۆر بون، بۆ نمونە (زۆرترین فرۆش) و (زیاترین بڕ) و (راکێشانی زۆرترین کڕیار) و (خاوەنی گەورەترین لیست) و .. تاد.

لەکاتی پێشکەشکردنی خەڵاتەکانیشدا هەمو جارێك دەبووە چەپڵەلێدان و پێکەنین و خۆشیی.

دیارە لەم ڕێورەسمەدا چل کەس سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، بەڵام ئەوەش بە ئاشکرا درکی پێ دەکرا کە (٧٦٠) کەس دۆڕاون.

لەبەرئەوە خێرا پرۆسەیەکی فێرکاری و ڕێکخستنی وامان دەست پێکرد کە سیستەم و پەیکەرەکانی ئەو کۆمپانیایە ڕێبازی براوە/ براوە پەسەند بکات. خەڵکەکەشم بەشدارکرد لە پێشخستنی ئەو سیستەم و بناغانەی کە دەتوانن لەم ڕووەوە پشتیوانی بکەن. هانیشمان دان یارمەتی و هاوکاریکردنی یەکتری پەیڕەو بکەن تا بتوانن ئەو ئامانجە خوازراوانە بەدی بهێنن کە پێشتر خۆیان لەناو خۆیاندا لەسەری ڕێك کەوتون.

ساڵێك پاش ئەوە و لە کۆبونەوەی داهاتودا، زیاتر لە هەزار دەزگای فرۆشیار بەشدارییان کرد. لەم ژمارەیە نزیکەی هەشتسەد کەسیان خەڵاتیان وەرگرت. ژمارەیەکی کەمی خەڵاتەکان لەسەر بناغەی بەراوردکاریی بو، بەڵام پرۆگرامەکە بە شێوەیەکی سەرەکی بایەخی دابو بەو کەسانەی کە بە شێوازی تایبەتی خۆیان ئامانجی گرنگیان بەدەست هێنابو. هەروەها جەختی کردبووە سەر ئەو گروپانەش

کە بە کاری دەستەجەمعی توانیبویان ئامانجی گروپەکان دەستەبەر بکەن. ئیتر پێویستی بەوەش نەدەکرد خوێندکاری زانکۆ و ئامادەیی بانگهێشت بکەین بێن چەپڵە لێ بدەن و ئاهەنگ بگێڕن و بە زۆری زۆرداریی کەشوهەوایەکی گوایە خۆش و پڕ لە ورە بخوڵقێنن. شتەکە زۆر سروشتی و سەرنجڕاکێش بو، چونکە ئامادەبوان هەمویان بەشداربون لەو خۆشییەدا و زۆربەی هەرە زۆریان براوە بون، کە یەکێك لە خەڵاتەکانیان گەشتێکی بەکۆمەڵ بو بۆ شوێنێکی گەشتیاری.

خاڵە گرنگەکەی ئەوەبو کە زۆربەی هەرە زۆری ئەو (٨٠٠) کەسانەی خەڵاتەکەیان وەرگرت لەو ساڵەدا، بەرهەمی هەر یەکێکیان لەڕووی قەبارەو قازانجەوە هێندەی بەرهەمی چل کەسەکەی ساڵی پێشو بو. کەواتە ئەم گیانی براوە/ براوەیە توانویتی ژمارەی هێلکە ئاڵتونییەکان بە رێژەیەکی بەرچاو زیاد بکات و لەهەمان کاتیشدا خواردنی قازەکە دابین بکات و بەهەروە توانا سەرسوڕهێنەرەکانی مرۆڤی تەقاندەوە. هەروەها هاوکارییەکی خوڵقێنەرانەی وای درێژە پێدا کە هەمو بەشدارانی سەرسام کرد.

دیارە پێشبڕکێکردن لە دنیای بازرگانی و بازاڕدا شوێنی خۆی هەیە و هەروەها لە بەرامبەر ئیشوکاری ساڵی رابردووشدا دەتوانیت پێشبڕکێ بکەیت. تەنانەت دژی نوسینگەیەك یاخود دژی کەسێکی دیکەش کە هاوکاری نەکات (چونکە لەم دۆخەدا ئیتر پێویستت بە هاوکاری نامێنێت). بەڵام هاوکاریکردنی لە شوێنی کاردا زۆر گرنگە و مەرجێکی بنەڕەتکیە بۆ ئازادکردنی کۆمپانیاکە. ململانێکردن لە دنیای بازاڕدا چەند گرنگە، هاوکاریکردن لە شوێنی کاردا هێندە گرنگە. ئەو ژینگەیەی کە رکابەری و ململانێ خەسڵەتی بن ژینگەیەك نییە گیانی براوە/ براوە بتوانێت تیایدا بژی.

ئەگەر بمانەوێت شێوازی براوە/ براوە بتوانێت بژی و کاربکات پێویستە سیستەمکە پشتیوانی لێ بکات. چۆن؟ لەڕێی سیستەمەکانی راهێنان و نەخشەسازی و بودجە و پەیوەندییەکان و زانیاری و قەرەبوکردنەوە و .. تاد. واتە پێویستە تێکڕای ئەمانە لەسەر بناغەی براوە/ براوە دابڕێژرێن.

جارێکی دیکەش کۆمپانیایەك داوای یارمەتی و راوێژکاری لێ کردم. کۆمپانیاکە وای دەزانی هیچ ناتەواوییەك لە سیستەمەکەیدا نییە بەڵکو ناتەواوییەکە لە

کارمەندەکاندایە. بۆیە داوایان کرد خولێکی راهێنان بۆ ئەو کارمەندانە بکەمەوە و ئاستی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ کڕیاردا چاك بکەم.

بەڕێوەبەری کۆمپانیاکە پێی وتم: بە ئارەزوی خۆت فرۆشگایەك هەڵبژێرە و بڕۆ بزانە کارمەندەکان چۆن هەڵسوکەوتت لەگەڵدا دەکەن. تەنیا هەر فەرمان جێبەجێ دەکەن. نازانن چۆن دڵی کڕیار رابگرن و هیچ شارەزاییەکیان نییە لەوەی کڕیار راکێشن بەلای بەرهەمەکاندا.

منیش لەسەر قسەکەی ئەو، چەندین فرۆشگا گەڕام و بۆم دەرکەوت کابرا راست دەکات. بەڵام کابرا وەڵامی ئەو پرسیارەی لانەبو کە: بۆچی ئەمە وایە؟

بەڕێوەبەرەکە پێی وتم: تەماشاکە، ئێمە ئەوپەڕی کێشەمان هەیە. سەرۆکبەشی زۆر بەتوانامان هەیە. پێمان وتون دوو لەسەرسێی بۆ فرۆشتن بێت و یەك لەسەر سێشی بۆ کارگێڕی. لەمەشدا زۆر سەرکەوتوون. تەماشای فرۆشیان بکە، لە هەموان باشترە. تەنیا ئەوەمان لەتۆ دەوێت خولێکی راهێنان بۆ ئەوانەی فرۆشگاکان بکەیتەوە:

بەم قسەیە ئاڵای سور بەرزبووەوە. وتم: با نەختێك زانیاری وەربگرم.

بەڕێوەبەرەکە ئەم قسەیەی منی پێ خۆش نەبو، چونکە، بە حسابی خۆی، دەیزانی کێشەکە چییە و دەیویست خولی راهێنانەکە دەست پێبکەم و بەس. بەڵام من سوربوم لەسەر هەڵوێستی خۆم و لە ماوەی دوو ڕۆژدا توانیمان کێشە راستەقینەکە بدۆزینەوە. کێشەکە لە چیدابو؟ لە پێناسەی پۆست و لە سیستمی پاداشتکردندا بو. سیستمەکە بە جۆرێك داڕێژرابو کە هەمو بەرهەم و قازانجەکە بۆ بەڕێوەبەرەکان بێت. کارێکیان کردبو ئیشە زەحمەت و کەم بایەخ و پیسەکان بۆ فرۆشیارەکان بێت، بۆ نمونە ئەنبارکردن و پاکوخاوێنی و پشکنینی کەلوپەلەکان. خۆیشیان کۆمپانیاکەیان دادەدۆشی.

لەبەر ئەوە ئێمە تەنیا دەستکاری (یەك) سیستەممان کرد — سیستمی پاداشت. بەمەش کێشەکە دەستوبرد چارەسەر کرا، چونکە سیستمەکەمان وا لێ کرد کە هەتا فرۆشیارەکان قازانجی خۆیان دەست نەکەوێت، بەڕێوەبەرەکان هیچ قازانجێك نەکەن. وامان کرد ئامانج و پێویستیەکانی بەڕێوەبەرەکان تێکەڵی ئامانج و پێویستییەکانی فرۆشیارەکان ببن. لەبەر ئەوە ئیتر پێویستی بەوە نەما خولی راهێنان لەسەر

پەیوەندییە مرۆییەکان بکەمەوە. خاڵە گەوهەرییەکە ئەوەبو سیستمێکی پاداشتکردنی راستگۆ و راستەقینەی وا بهێنمە ئاراوە کە لەگەڵ شێوازی براوە/ براوەدا بگونجێت.

نمونەیەکی دیکە ئەوەبو کە جارێکیان لەگەڵ بەڕێوەبەری کۆمپانیایەکدا کارم کرد. کۆمپانیاکە دەیویست هەڵسەنگاندنی فەرمی بکات بۆ توانای کارمەندەکانی. ئەم بەڕێوەبەرە کێشەیەکی هەبو چونکە نەیدەزانی چۆن بتوانێت یەکێك لە سەرۆك بەشەکان هەڵبسەنگێنێت. وتی: ئەو شایستەی ئەوەبو بخرێتە خانەی سێیەمەوە. بەڵام من خستمە خانەی یەکەمەوە، کە پۆستەکەی پێ بەرز دەبێتەوە.

لێم پرسی: بۆچی ئەوت خستە خانەی یەکەمەوە؟

وتی: لە مەسەلەی ئامار و داتادا زۆر باشە

پرسیم: ئەی بۆچی دەڵێیت شایستەی خانەی سێیەمە؟

وتی: لەبەرئەوەی گوێ ناداتە کەس و ئاژاوەگێڕە.

وتم: وا دیارە ئەم کابرایە تەنیا هەر بایەخ بە بەرهەم دەدات. لەبەر ئەوە تۆ خەڵاتی دەکەیت و پلەکەی بەرزدەکەیتەوە. بەڵام بۆچی بە راشکاویی کێشەکەی لەگەڵدا باس ناکەیت؟ هەق وایە تێبگەیەنیت کە توانای بەرهەمهێنان گرنگترە لە بەرهەم.

وتی: زۆرم هەوڵ داوە. کەڵکی نییە.

وتم: ئەی بۆچی رێکەوتنێکی براوە/ براوەی لەگەڵدا نابەستیت کە هەردوکتان رێك کەون لەسەر ئەوەی لە سێ بەش دووبەشی هەڵسەنگاندەکە لەسەر بەرهەم بێت – واتە لەسەر ئامار و ژمارەکان و بەشێکیشی لەسەر هێزی بەرهەمهێنان بێت – واتە لەسەر ئەوەی خەڵك چۆن هەڵی دەسەنگێنن و چۆن لێپرسراوێکەو تا چ ئاستێك دەتوانێت گروپەکە بەڕێوە ببات و خەڵکی باش دروست بکات؟

وەڵامی دامەوە وتی: بیرۆکەیەکی باشە.

زۆرجار کێشەکە لە خەڵکەکەدا نییە بەڵکو لە سیستمەکەدایە. لە سیستمی خراپدا کەسی باش و بەتوانا هەشبن ئەنجامەکان هەر خراپ دەردەچن. پێویستە ئەو گوڵە ئاوبدەیت کە دەتەوێت گەورە ببێت.

مرۆڤ ئەگەر بەڕاستی فێرببێت بە شێوازی براوە/ براوە بیربکاتەوە، دەتوانێت

سیستمێك بهێنێتە ئاراوە ئەو شێوازی بیرکردنەوەیە بەهێز و کاریگەر بکات. هەروەها دەتوانن لەبری پێشبڕکێ و رکابەرایەتیکردنی یەکتری هاوکاری و یارمەتی خوڵقێنەر بهێننە ئاراوە و دەتوانن رۆڵی کاریگەریان هەبێت لە بەرهەم و توانای بەرهەمهێنانیشدا.

لە کاروباری بازرگانیدا، بەڕێوەبەر (سەرۆك) دەتوانێت سیستمەکە وا لێ بکات بتوانێت تیمی بەرهەمهێنی بەتوانای وا بخوڵقێنێت کە پێشبڕکێ بکات لەگەڵ دەزگاکانی دیکەدا .. لەبواری پەروەردە و فێرکردنیشدا مامۆستاکان دەتوانن جۆرە سیستمێك بۆ نمرەدانان دابڕێژن کە هەم لەگەڵ ئاستی خوێندکارەکەدا بگونجێنن، هەم خوێندکارەکانیش هان بدەن هاوکاری یەکتری بکەن لە فێربون و داهێناندا. لەناو خێزانیشدا دایك و باوك دەتوانن پێشبڕکێ و ململانێکردنی یەکتری بگۆڕن بە هاوکاری. لەسەر ئاستی چالاکییەکانیش، بۆ نمونە لە یاری بۆڵینـدا، دەتوانن ژمارەیەك بۆ خێزانەکەیان بەدەست بهێنن کە لە ژمارەی تۆمارکراوی جاری پێشوو زیاتر بێت. هەروەها دەتوانن فەلسەفەی براوە/ براوە بۆ ئەرکەکانی ناوماڵیش پەیڕەو بکەن چونکە رێبازێکە هیچ بۆڵەو گلەییەك ناهێڵێت و دایك و باوکەکەش هەر ئەو ئەرکانە جێبەجێ دەکەن کە تەنیا هەر خۆیان دەتوانن بیانکەن.

جارێکیان لەگەڵ هاوڕێیەکمدا پێکەوە تەماشای ئەفلامکارتۆنێکمان دەکرد. دوو منداڵ بون پێکەوە قسەیان دەکرد. یەکێکیان بەوی دیکەیانی وت: "ئەگەر ئائێستا دایکم لە خەو هەڵنەسێت، ئێمە لە قوتابخانە دوادەکەوین". ئەم قسەیە سەرنجی هاوڕێکەمی راکێشا بۆ خاڵێکی گرنگ، کە ئەگەر فەلسەفەی براوە/ براوە لە خێزاندا نەچەسپێت کێشەی چۆن روویان تێدەکات.

فەلسەفەی براوە/ براوە ئەرکی بەدەستهێنانی ئامانجێکی دیاریکراو دەخاتە ئەستۆی (تاك) لە چوارچێوەی کۆمەڵێك سەرچاوە و رێنمایی دیاریکراودا. ئەم فەلسەفەیە وا لە کەسەکە دەکات بەرپرسیاربێت بەرامبەر چۆنێتی ئەنجامدان و هەڵسەنگاندنی ئەنجامەکان. هەروەها سڵ لە پێشهاتەکانیش دەکاتەوە. ئەم فەلسەفەیە ژینگەیەك دەخوڵقێنێت کە پشتگیری رێکەوتنەکان بکات و گەشەیان پێبدات.

## پرۆسە

هەرگیز ناتوانیت ئەنجامی شێوازی براوە/ براوە بە پەیڕەوکردنی براوە/ دۆڕاو یاخود دۆڕاو/ براوە بەدەست بهێنیت. ناتوانیت بڵێیت من مەبەستم براوە/ براوە بوو، کەواتە دەبێت ئەو ئامانجەشم دەست بکەوێت. کەواتە پرسیاردکە ئەمەیە: چۆن بگەینە ڕێگە چارەیەکی براوە/ براوە.

(ڕۆجەر فیشەر) و (ویلیام یوری) کە دوو پرۆفیسۆری بواری یاسان لە زانکۆی هاڤارد لە کتێبە گرنگەکەیاندا (گەیشتن بە بەڵێ)دا توانیان ڕەوتێکی تازە بدۆزنەوە. ئەم ڕەوتە تازەیە کە ڕەوتێکی پرنسیپئامێزە پێچەوانەی ئەو ڕەوت و شێوە بۆچوونەیە کە هەر پێگە کۆمەڵایەتی و هەڵوێستەکان دەبینێت، واتە: بنەما و پرنسیپ لە بەرامبەر هەڵوێست و پێگەدا. هەرچەندە لەم کتێبەدا ناوی شێوازی براوە/ براوە نەهێنراوە، بەڵام ڕۆح و فەلسەفەی کتێبەکە زۆر هاوئاهەنگن لەگەڵ شێوازی براوە/ براوەدا.

ئەم دوو نوسەرە لە کتێبەکەیاندا دەڵێن کە ناوەڕۆکی دانوستانی پشت بەستو بە بنەماو یاساکان ئەوەیە کەسەکە لە کێشەکە جیابکەیتەوە و بایەخ بە بەرژەوەندییەکان بدەیت نەك بە هەڵوێستەکان و هەروەها هەوڵی بەدەستهێنانی ڕێگای قازانجی هاوبەش بدەیت و سوربیت لەسەر پێوەرە بابەتییەکان.

- هەندێك پرنسیپی دەرەکی و پرنسیپی وا کە هەردوو لایەنەکە پێی قایل ببن.

من لە ئەنجامی ئەو ئەزمونانەی کە لە دەرەنجامی کارکردنمدا فێریان بوم لەگەڵ خەڵك و لایەنی جیاجیادا لە مەسەلەی چارەسەرەکانی براوە/ براوەدا پێم وایە ئەم هەنگاوانەی خوارەوە زۆر گرنگن.

یەکەم، کێشەکە لە چاوی کەسەکەی بەرامبەرتەوە ببینەو گۆشەنیگای ئەو بەهەند وەربگرە .. پێویستە ڕاستگۆیانە هەوڵ بدەیت پێویستی و ئارەزووەکانی لایەنی بەرامبەر تێبگەیت و بۆیشی ڕوون بکەیتەوە کە تێیان گەیشتویت (وەك خۆیان یان باشتر لە خۆیان).

دووەم: گوێ مەدەرە هەڵوێست و پلەو پایەکان بەڵکو مەسەلە گرنگەکان و ئارەزووە سەرەکییەکان دیاری بکە.

سێیەم، بزانە هەمو لایەنەکان کام ئەنجام بە چارەسەرێکی تەواو و قبولکراو دەزانن.

چوارەم، بۆ بەدیهێنانی ئەو ئەنجامانە شێواز و میکانیزمی گونجاو دیاری بکە.

خووەکانی ژمارە (٥) و (٦) راستەوخۆ پەیوەستن بەم پرۆسەیەوە و ئێمە لە بەشەکانی داهاتوودا بە دووردرێژی باسیان دەکەین.

بەڵام رێگەم بدەن ئالێرەدا سەرنجتان بۆ سروشتی ئەو پەیوەندییە بالایە رابکێشم کە پرۆسەی بیرکردنەوەی براوە/ براوەی لەگەڵ گەوهەری ئەو فەلسەفەیەدا هەیەتی. رێگا چارەی براوە/ براوە هەر لە پرۆسەی براوە/ براوەوە دێتەدی. ئەنجام و پرۆسەکە لێك جیاناکرێنەوە و یەك شتن.

شێوازی براوە/ براوە تەکنیکێك نییە پەیوەندی بە خودی کەسەکەوە هەبێت. بەڵکو پارادیمێکە سەرومڕ پەیوەستە بە کارلێکە مرۆڤایەتییەکان (پەیوەندییەکانی نێوان خەڵکی) و هەڵقوڵاوی خەسڵەتەکانی دەستپاکی و کامڵی و بەرچاوتێرییە و لەناو ئەو پەیوەندییانەدا گەشە دەکات کە متمانەی بەرزی تێدایە. لەو رێکەوتنانەدا بەرجەستە دەبێت کە پێشبینییەکان و دەستکەوتەکان کۆنترۆڵ دەکات و لەو سیستمانەدا نەش‌ونما دەکات کە هاندانیان تێدایە و لە پرۆسەیەکدا دێتە دی کە ئێمە لە خووەکانی (٥) و (٦)دا بە تەواوی باسی دەکەین.

## چەند پێشنیارێك بۆ جێبەجێکردن:

١. بیر لە کارلێکی چاوەڕوانکراو بکەرەوە کە هەوڵ دەدەیت بگەیتە رێکەوتنێك یاخود لەپێناوی چارەسەرێکدا دانوستاندن دەکەیت. هەر لە ئێستاوە هەوڵ بدە هاوسەنگییەك رابگریت لەنێوان ئازایەتی و رەچاوکردندا.

٢. لیستێك بکە بە ناوی ئەو گیروگرفتانەی کە زوو زوو دەبنە رێگر لەبەردەمتدا لە مەسەلەی جێبەجێکردنی شێوازی براوە/ براوەدا. ئینجا بیربکەرەوە بزانە لە چوارچێوەی بازنەی دەوروتەئسیرەکەتدا چۆن دەتوانیت ئەم رێگرانە لاببەیت.

٣. پەیوەندییەکی دیاریکراو هەڵبژێرە کە پێت خۆشە رێکەوتنێکی براوە/ براوەی تێدا ببەستیت. هەوڵ بدە خۆت لە شوێنی ئەوکەسە دابنێیت و ئینجا بەراشکاوی بنوسە ئەو کەسە چۆن رێگا چارەکە دەبینێت. پاشان لە گۆشەنیگای خۆتەوە لیستێك ئامادە بکە بەو شتانەی کە تۆ پێت وایە بەلای تۆوە قازانج

بەهەردوولاتان دەگەیەنێت. ئینجا لە کەسەکە نزیک ببەرەوەو لێی بپرسە بزانە پێی خۆشە لەپێناوی گەیشتنە رێکەوتن و خاڵی هاوبەشدا ئامادەیە هاوکاریت بکات؟

٤. سێ پەیوەندی سەرەکی ژیانت دیاری بکە و ئینجا ئاماژە بدە بە هەندێك لەو هاوسەنگییانەی کە هەست دەکەیت هەرکام لەو پەیوەندییانە لە بانقی سۆزدارییدا هەیانە. ئینجا چەند رێگایەك باس بکە بۆ زیادکردنی پاشەکەوتی هەرکام لەو ژمارە حسابانە.

٥. بە قوڵی شێواز و رەشنوسی کارکردنی خۆت شرۆڤە بکە. بزانە ئایا شێوازی براوە/ دۆڕاوە؟ ئایا ئەمە چۆن کاردەکاتە سەر هەڵسوکەوتت لەگەڵ خەڵکیدا؟ ئایا دەتوانیت سەرچاوەی سەرەکی ئەم رەشنوسە دیاری بکەیت و ئایا ئەم جۆرە دەقە دەتوانێت لە دۆخی ئێستای تۆدا سودت پێبگەیەنێت.

٦. هەوڵ بدە نمونەیەکی وای براوە/ براوە دیاری بکەیت کە تەنانەت لە بارودۆخە سەختەکانیشدا بەڕاستی سودی هاوبەش بگەیەنێت. بڕیاربدە زۆر بە وردی چاودێری ئەو کەسە بکەیت و لێوەی فێر ببیت.

# خووی پێنجەم

# بۆ ئەوەی تێت بگەن، سەرەتا هەوڵ بدە تێبگەیت



## پرینسیپەکانی پەیوەندیە هاوسۆزییەکان

**دڵ کۆمەڵێک حوکم و لۆجیکی تایبەت بە خۆی هەیە کە ئەقڵ لێیان بێئاگایە**
**- پاسکاڵ**

**گریمان تۆ بەهۆی کێشەیەکی چاوتەوە بڕیارت دا بچیت بۆلای پزیشکێکی چاو و ئەویش دوای ئەوەی بە کورتی گوێی لێ گرتیت سەبارەت بە ناڕەحەتییەکەت یەکسەر دەستی بردو چاویلکە پزیشکییەکەی خۆی داکەند و دایە دەستت و وتی: ئەم چاویلکەیە بکەرە چاوت. دە ساڵە من دەیکەمە چاوم و باشترین سودم لێ بینیوە. بیبە بۆ خۆت، لەماڵەوە چاویلکەی دیکەم هەیە. تۆش لەسەر قسەی ئەو، چاویلکەکە دەکەیتە چاوت بەڵام دۆخەکە خراپتر دەبێت.**

**تۆ دەڵێیت: شتێکی زۆر خراپە، هیچ نابینم.**

**پێت دەڵێت: قسەی سەیر .. من بەکارم هێناوەو زۆر زۆر باش بووە. ئەمجارە تاقی بکەرەوە بزانە.**

**وەڵامی دەدەیتەوە: چی تاقی بکەمەوە دکتۆر گیان ..! دنیا لەبەرچاوم هەموی تەمە**

**دەڵێت: ئەوە چیتە؟ نەختێك گەشبین بە عەیبە**

**وەڵام دەدەیتەوە: زۆر گەشبینم کاك دکتۆر، بەڵام باوەڕت بێ هیچ نابینم.**

**بە سەرزەنشتەوە پێت دەڵێت: ئای رۆڵە چەند سپڵەیت !! ئەئاوا چاکەم دەدەیتەوە ؟!**

**پرسیارەکە ئێستا ئەمەیە: ئایا تۆ ئیتر بڕای بڕای دەچیتەوە بۆلای ئەو پزیشکە؟ باوەڕناکەم، چونکە کەس متمانە بە پزیشکێك ناکات کە پێش ئەوەی نەخۆشییەکە دیاری بکات چارەسەر و دەرمانی بداتێ.**

**بەڵام ئایا ئێمە لە ژیانی رۆژانە و لە پەیوەندییەکانماندا چەند جار روودەدات کە پێش دەستنیشانکردن چارەسەر پێشکەش بکەین. "دەی بەقوربان، هیچم لێ مەشارەوە .. دەزانم ئەم شتە زەحمەتە، بەڵام هەوڵ دەدەم تێی بگەم."**

"وی دایە .. نازانم .. بەبێ ئەقڵم تێدەگەیت"

"بێگومان شتی وا نابێت. دەی پێم بڵێ. کەس ئەوەندەی من دڵسۆزت نیيە. من تەنیا بەرژەوەندی تۆم مەبەستە. بۆچی ئەوەندە خەمباریت؟"

"ئۆی .. نازانم"

"دەی کچی خۆم .. چی بووە؟ .."

"زۆرچاکە .. مادام وای لێ هات راستییەکەت پێ دەڵێم .. من تاقەتی خوێندنم نەماوە."

یەکسەر دەتەقیتەوە. "یەعنی چی تاقەتی خوێندنم نەماوە؟ پاش ئەو هەمو رەنج و ماندوێتییەی کە کێشامان بۆ ئەوەی خوێندن تەواو بکەی ئینجا وا ئەڵێی؟! خوێندنت نەبێ پاشەرۆژیشت نابێت. چاو لە خوشکە گەورەکەت بکە، ئەها ئەو هەمیشە خەریکی خوێندن و دەرس و دەورەکەیەتی!! .. قورگمان وشک بو ئەوەندەمان ئامۆژگاری کردیت. دە بەسە ئیتر وامەکە .. کچێکی ئاقڵ و باش و زەریفیت، بەس ئەوەیە سەعی ناکەیت. بیر بکەرەوە و هۆش بێنەرەوە دەرونی خۆت."

چرکەیەك بێدەنگی

"دەی رۆڵە .. وتت چی؟"

ئێمەی مرۆڤ هەمیشە ئارەزووی ئەوەمان هەیە گوڕ بخۆینەوە و تەنیا بە ئامۆژگاریکردنی چاك هەوڵی چاکسازی و راستکردنەوەی هەڵەکان بدەین، بەڵام بایی ئەوە کاتی خۆمان تەرخان ناکەین کێشەکە دەستنیشان بکەین و لێی تێبگەین بزانین چیيە.

ئەگەر بمەوێت لە یەك رستەدا ئەو پرنسیپە هەرە مەزنە کورت بکەمەوە کە لە بواری پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا فێری بوم دەڵێم: یەکەمجار هەوڵ بدە تێبگەیت، بۆ ئەوەی بە ئاسانی لێت تێبگەن. ئەم پرنسیپە کلیلی هەمو پەیوەندییەکی کاریگەرە لەنێوان خەڵکیدا

## رەوشت و پەیوەندی

تۆ ئێستا کتێبێك دەخوێنیتەوە کە من نوسیومە. خوێندنەوە و نوسینیش هەریەکەیان شێوەیەکن لە شێوەکانی پەیوەندی. دیارە قسەکردن و گوێگرتنیش هەروان. لەراستیدا قسەکردن و گوێگرتن و خوێندنەوە و نوسین چوار شێوەی

بنەڕەتیی پەیوەندی پێك دەهێنن. بیهێنەرە بەرچاوی خۆت بزانە ڕۆژانە چەند سەعات لەهەركام لەو چوار كردەوەیەدا بەسەردەبەیت. چۆنێتی ئەنجامدانی ئەو كردارانە بایەخێكی ڕەهای هەیە لەسەر دەوروتەئسیریان.

مەزنترین مەسەلە لە ژیاندا پەیوەندییە. ئێمە زۆربەی كاتەكانی بێداریمان خەریكی پەیوەندیكردنین. بەلام تكایە سەرنج لەمە بدە: ئێمەی مرۆڤ سالانێكی زۆری تەمەنمان تەرخان دەكەین بۆ فێربونی خوێندنەوە و نوسین، چەندین سالیش بۆ فێربونی قسەكردن، كەچی بایەخ نادەین بە گوێگرتن و هیچ كاتێك و هەولێكی بۆ تەرخان ناكەین. لەخۆت بپرسە بزانە چ مەشق و ڕاهێنانێكت بینیوە بۆ ئەوەی بتوانیت بە جۆرێك گوێ لە بەرامبەرەكەت بگریت كە بەڕاستی تێی بگەیت، بە قولی تێی بگەیت و وەكو مرۆڤێكی سەربەخۆ و تەواو.

ئەوانەی كە مەشق و ڕاهێنانیان لەسەر هونەری گوێگرتن بینیوە ڕێژەكەیان كەمە. زۆربەی زۆری خەلكەكە لە مەسەلەی گوێگرتندا كۆلن و بنەماكانی ڕەوشتی و پەیوەندییە جەوهەرییەكان ڕەچاو ناكەن كە مەرجی سەرەكین بۆ تێگەیشتنی ڕاستەقینە لە كەسی بەرامبەر. تۆ ئەگەر بتەوێت كاریگەرانە ڕەفتارم لەگەلدا بكەیت و دەورو تەئسیرت هەبێت لەسەرم، یەكەمجار پێویستە تێم بگەیت. هاوسەرەكەشت و كوڕەكەشت و هاوسێكەشت و هاوڕێ و هاوكارەكەشت هەمان شتیان پێویستە. تێگەیشتنیش هەر قسەو روالەت نییە. من ئەگەر هەستم كرد ڕاستم لەگەلدا ناكەیت و بە شێوازی جۆراوجۆر خۆت وا نیشان دەدەیت كە تێم گەیشتویت یەكسەر هەست بە دووڕوویيت دەكەم و لە خۆم دەپرسم دەلێم ئاخۆ مەبەست و ئامانجت چییەو هەرگیز وام لێ نایەت ئامادەبم ناخی خۆمت بۆ بكەمەوە.

تۆ ئەگەر بتەوێت دەوروتەئسیر لەسەر بەرامبەرەكەت دروست بكەیت، كلیلەكە خۆتیت، هەلسوكەوتی خۆت هەمو شتێكە. كەسایەتی خۆت وێنە سروشتی و ڕاستەقینەكەت دروست دەكات نەك ئەوەی خەلكەكە چۆن باست دەكەن، یان ئەوەی كە تۆ دەتەوێ بە منی قبول بكەیت. ئەمەش بەچیدا دەردەكەوێت و ساغ دەبێتەوە؟ بەو ئەزمونەی كە بە كردەوە تێی دەپەڕێنیت. كەسایەتی تۆ دائیم و دەرهەم ڕەنگ دەداتەوە و بەردەوام دەبێت و لەمەشەوە من دەگەیەنێتە ئەوەی متمانەت پێبكەم یان نا.

مرۆڤ ئەگەر لەگەڵ بەرامبەرەکەیدا هەردەمەی لەسەر مەزاجێك بێت و لەنێوان ساردو سڕی و گەرموگوڕی و سۆز و دڵڕەقیدا هەمیشە هەڵبەز و دابەز بکات زەحمەتە بتوانێت وا لە بەرامبەرەکەی بکات ناخی خۆی بۆ هەڵبڕێژێت. لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە هەڵسوکەوتی تایبەتمان لەگەڵ کەسێکی دیاریکراودا هاوئاهەنگ و گونجاو بێت لەگەڵ رەفتاری گشتیماندا. کەسێك ئەگەر لەناو کۆمەڵدا بەوە ناسرابێت کە پەیمان شکێنە ناتوانێت لەگەڵ کەسێکی دیاریکراودا خۆی بە سەرڕاست نیشان بدات. من رەنگە حەز بکەم و بگرە پێویستیشم بە سۆز و بە دەورو تەئسیری تۆ هەبێت بەڵام ناتوانم هێندە بڕوات پێبکەم کە بیروبۆچون و ئەزمون و هەستو نەستی خۆمت بۆ دەرببڕم چونکە نازانم سبەی رۆژ چی روودەدات."

تۆ ئەگەر لێم تێنەگەیت و درك بە هەستو هەڵوێست و قوڵایی ناخی من نەکەیت چۆن دەتوانیت ئامۆژگاریم بکەیت و ببیتە راوێژکارم. قسەکانت جوان و شیرینن بەڵام ناتوانن کارم تێبکەن.

رەنگە تۆ پێم بڵێیت کە رێزی منت بەلاوە گرنگەو منت زۆر مەبەستە، رەنگە منیش زۆر پێویستم بەوەبێت باوەڕ بەو قسانەت بکەم، بەڵام چۆن بزانم کە تۆ منت پێگرنگە لەکاتێکدا کە هێشتا نەتتوانیوە تەنانەت تێم بگەیت؟ تۆ تاکو ئێستا هەر قسەت کردووە و قسەی رووتیش جێی متمانە پێکردن نییە. ئەمەی کە ناتوانم بکەومە ژێر کاریگەریی قسەکانتەوە دەبێتە مایەی بێزاری و توڕەبونم چونکە لە ناخی خۆمدا پێویستم پێتە، دڵنیابە ئامۆژگاریەکانیشت ناتوانن. مرۆڤ ئەگەر بیەوێت ببێتە گوێگرێکی چاك. واتە ئەو گوێگرتنە سۆزدارییەی کە لێوانلێوە لە کرانەوە و متمانە. پێویستە پاشەکەوتێکی چاك لەو هەستە راستگۆیانەی هەبێت کە لە بازاڕی دڵاندا رەواجی زۆرە.

## گوێگرتنی هاوسۆزی

ئەو قسەیەی کە دەڵێت: "یەکەمجار هەوڵبدە تێبگەیت" لەراستیدا پاردایمی ئێمە هەڵدەگێڕێتەوە و ئەوپەڕی گۆڕانکاری بەسەردا دەهێنێت، چونکە ئێمە وا راهاتوین کە هەوڵبدەین یەکەمجار بەرامبەرەکەمان تێمان بگات. زۆربەمان کاتێك کە گوێ دەگرین بەو مەبەستە گوێ ناگرین کە تێبگەین بەڵکو هەر بۆ ئەوە گوێ

دەگرین کە وەڵام بدەینەوە. واتە یان قسە دەکەین یاخود خۆمان بۆ قسەکردن ئامادە دەکەین. هەمو شتێك لە پارادیمی خۆمانەوە هەڵدەهێنجین و لە ژیاننامەی خەڵکیدا ژیاننامەی خۆمان دەخوێنینەوە.

"رێك دەزانم هەست بە چی دەکەیت"

"منیش هەمان بەزمم بەسەردا هاتووە. با ئەزمونەکەی خۆمت بۆ باس بکەم".

بەردەوام فیلمە سینەمایییەکانی خۆیان بەسەر هەڵسوکەوتی خەڵکیدا نمایش دەکەن. چاویلکە پزیشکییە تایبەتەکەی خۆیان وەکو چارەسەر پێشکەشی هەمو کەسێك دەکەن و ئەگەر لەگەڵ هاوسەر و منداڵ و بەرێوەبەر و کارمەندێکی خۆیاندا کێشەیەکیان هاتەرێ دەڵێن: ئەم زەلامە هیچ تێناگات.

برادەرێکم رۆژێکیان باسی کورەکەی خۆی بۆ کردم، وتی من لەو کورەم تێناگەم و تەنانەت گوێشم لێ ناگرێت. پێم وت رێگەم بدە قسەکەت بەم شێوەیە دابرێژم: تۆ لە کورەکەت تێناگەیت چونکە گوێت لێ ناگرێت؟

وەڵامی دامەوە: بەڵێ.

پێم وت: با ئەمجارە بیڵێمەوە، تۆ لە کورەکەت تێناگەیت چونکە گوێت لێ ناگرێت.

بە بێزارییەوە وەڵامی دامەوە: بەڵێ وایە.

وتم: بە بروای من مرۆڤ ئەگەر بیەوێت لە کەسێك تێبگات پێویستە گوێی لێ بگرێت.

بە سەرسوڕماوییەوە وتی (ئۆو) پاشان قەدرێکی باش بێدەنگی لێ کردو ئەوسا جارێکی دیکەش وتییەوە (ئۆو). ئەمەی بە جۆرێك بو وەك ئەوەی شتێکی تاریکی لێ روون بوبێتەوە .. ئۆو. بەڵام من لێی تێگەیشتوم. دەزانم خەریکی چییە. منیش بەهەمان ئەزموندا تێپەریوم، بەڵام تێناگەم نازانم بۆچی گوێم لێ ناگرێت.

ئەم کابرایە هیچ ئاگای لەوە نییە کورەکەی بیر لە چی دەکاتەوە، تەنیا تەماشای سەری خۆی کردووە و وا دەزانێت هەمو دنیای بینیوە، بە سەری کورەکەی خۆیشیەوە.

زۆربەی زۆرمان وەك ئەو کابرایە واین. سیخناخین لە هەستی ئەوەی کە ئێمە راستین. سەرقاڵی ژیان و ژیاننامەی خۆمانین و هەر ئەوە دەبینین کەچی حەزیش دەکەین بەرامبەرەکەمان تێمان بگات. قسەکانمان یەکپارچە مۆنۆلۆگە و نازانین لە ناخی ئادەمیزادەکەی بەرامبەرماندا چی روودەدات.

گوێگرتن چوار ئاستی هەیە. ئەوکاتەی کە بەرامبەرەکەت قسەت بۆ دەکات، تۆ بە ئاستێك لەو ئاستانە گوێی لێ دەگریت. ڕەنگە فەراموٚشی بکەیت و لەڕاستیدا هیچ گوێی لێ نەگریت. ڕەنگە خۆت وا نیشان بدەیت کە گوێی لێ دەگریت و بە درۆوە سەری بۆ ئەلەقێنیت و بڵێی (وای .. ئۆو .. بەراست؟) لەوانەشە تەنیا گوێ لە چەند بەشێکی دیاریکراوی قسەکانی بگریت. ئەمە شێوازی گوێگرتنە لە چەنەبازییەکانی ئەو منداڵەی کە هێشتا نەخراوەتە قوتابخانە. جاری واش هەیە گوێگرتنەکەمان لەئاستی گوێگرتنی سەرنجدەردا (وریادا) دەبێت، واتە بە وریاییەوە گوێ دەگرین و دیققەت دەدەین لەو شتانەی کە دەیانڵێت. بەڵام تەنیا ڕێژەیەکی کەمی مرۆڤ گوێگرتنەکەی لە ئاستی پێنجەمدایە کە بەرزترین ئاستە و پێی دەڵێن گوێگرتنی هاوسۆزیی.

کە دەڵێم گوێگرتنی هاوسۆزی، مەبەستم ئەوە نییە زیرەکانە خۆت بۆ قسەکانی مەڵاس دابێیت بۆ ئەوەی لە نزیکترین فرسەتدا وەڵامی بدەیتەوە، چونکە ئەمە مەبەستی خۆپەرستانەی لەدوایە و هیچ گفتوگۆیەکی قووڵی لێ ناکەوێتەوە و ئامانجەکەی بریتییە لە وەڵامدانەوە و کۆنترۆڵکردن و فۆرغکردن.

مەبەست لە گوێگرتنی هاوسۆزیی گوێگرتنە بە نیازی تێگەیشتن. واتە تۆ دەتەوێت یەکەمجار تێبگەیت، تێگەیشتنێکی ڕاستەقینە و دیارە ئەمەش پارادیمێکی زۆر جیاوازە.

هاوسۆزیی بریتییە لەوەی لەڕووی هەستەوە خۆت بخەیتە شوێنی بەرامبەرەکەت، بۆیە گوێگرتنی هاوسۆزیی دەتخاتە ناخی بەرامبەرەکەتەوە و وات لێ دەکات لە چاوی ئەوەوە بڕوانیتە شتەکان و بەو شێوەیەی ئەو دنیا ببینیت و لە پارادیم و هەست و نەستەکانی بگەیت.

خۆ خستنە شوێنی بەرامبەرەکەت لەروی سۆزەوە بریتی نییە لە ئاڵوگۆڕکردنی سۆزەکان، چونکە ئەم ئاڵوگۆڕە شێوەیەکە لە شێوەکانی ڕێکەوتن و جۆرێکە لە داڕێژەرەکانی بڕیار، کە هەندێك جار خراپترین سۆز و کاردانەوەی لێ دەکەوێتەوە. گوێگرتنی هاوسۆزی مانای ئەوە نییە کە تۆ لەگەڵ بەرامبەرەکەتدا هاوڕایت بەڵکو ئەو مانایە دەبەخشێت کە تۆ بەراستی و بە تەواوی و بە قووڵی لەو کەسە تێگەیشتویت.

گوێگرتنی هاوسۆزیی تەنیا هەر تۆمارکردن و بیرکردنەوە و تەنانەت تەنیا هەر قسەکانیش نین کە دەوترێن. لەراستیدا زاناکانی بواری پەیوەندیکردن باوەڕیان وایە وشەکان تەنیا ١٠٪ی گفتوگۆکان پێك دەهێنن. دەنگی وشەکانیش (واتە دەنگی خۆمان و شێوەی دەربڕینی وشەکان) پێکهێنەری ٣٠٪ گفتوگۆکانن، بەلام رێژە زۆرەکە، کە دەکاتە ٦٠٪ی گفتوگۆکان، بریتییە لە زمانی جەستە. لە گوێگرتنی هاوسۆزییدا تۆ تەنیا هەر بە گوێچکەکانت گوێ ناگریت، بەلکو گرنگترەکە، بە چاو و بە دڵیش گوێ دەگریت. گوێ لە هەستەکان دەگریت، گوێ لە واتاو رەفتارەکان. گوێگرتنی هاوسۆزی هەر تەنیا نیوەی چەپی مێشکی تێدا بەکارناهێنرێت، بەلکو نیوە راستەکەی دیکەش بەکاردەهێنرێت. لەم جۆرە گوێگرتنەدا گوێگرەکە تێدەگات و پێشبینی دەکات و هەست دەکات. هێزی ئەم جۆرە گوێگرتنە لەوەدایە کە زانیاری وا وردت دەداتێ بتوانیت هەنگاوەکانتی لەسەر بنیاد بنێیت و ئیتر لە بری ئەوەی ژیاننامەی خۆت بگێڕیتەوە و هەست و بیرۆکە و پاڵنەر و لێکدانەوەکانی خۆت بسەپێنیت، رووبەرووی ئەو راستییە دەبیتەوە کە لە دڵ و مێشکی بەرامبەرەکەتدایە. ئەم جۆرە گوێگرتنە بۆ پێشوازیکردنە لە ئاماژە هەرە قوڵەکانی مرۆڤەکەی بەرامبەرت.

سەرباری ئەمانەش گوێگرتنی هاوسۆزیی سەرچاوەی کەڵەکەبوونی پاشەکەوتنەکانتە لە بانقی هەستەکاندا چونکە ئەوەی تۆ دەیکەیت تەنیا کاتێك بە پاشەکەوت لەقەڵەم دەدرێت کە بەرامبەرەکەت پێی بزانێت و هەستی پێ بکات.

ئەم پاشەکەوتە کەڵکی نابێت ئەگەر بۆ ئەوە نەبێت کە تێبگەیت بزانیت هەنگاوی گرنگی دووهەم لای بەرامبەرەکەت چییە و بگرە بە خراپەش دەشکێتەوە و وا لێك دەدرێتەوە کە ئامرازێکە بۆ مۆنۆپۆڵکردن و سودی تایبەتی خۆت.

گوێگرتنی هاوسۆزی خۆی لە خۆیدا پاشەکەوتێکی زۆر گرنگە لە ژمارە حسابی بانقی هەستەکاندا. دەرمانێکی چارەساز و کاریگەرە. چونکە هەناسە بەخشی رۆح و دەرونە.

ئەگەر کتوپڕ هەمو هەوای ئەم ژوورە هەڵمژرێت کە تۆی لێ دانیشتوی ئایا ئەم کتێبەی بەدەستتەوەیە هیچ بایەخێکی دەمێنێت؟ بێگومان نەخێر، نەك هەر کتێبەکە بەڵکو هیچ شتێك بایەخی نامێنێت و هەمو هەوڵت بۆ ئەوە دەبێت تۆزێك

هەوا بەدەست بهێنیت. لەم دۆخەدا تاقە هەوڵت بۆ ئەوەیە بە زیندویی بمێنیتەوە. کاتێکیش کە هەوات دەست دەکەوێت ئیتر هەواکە ئەو پاڵنەرەی تۆزێ لەوەوپێشی نامێنێت. ئەمەش یەکێکە لە خەسڵەتە هەرە قوڵەکانی پاڵنەرە مرۆیی‌یەکان: "پێویستی‌یە تێرکراوەکان هەرگیز نابن بە پاڵنەر" بەڵکو ئەو پێویستی‌یانە دەبنە پاڵنەری مرۆڤ کە تێر نەکراون. گرنگترین پێویستی‌یەکانی مرۆڤیش یەکسەر دوای مانەوەی جەستەیی بریتییە لە مانەوەی مەعنەوی. واتە ئەوەی کە خەڵك لێت تێ بگات و پێگەی شیاوی خۆتت هەبێت و ڕێزت لێ بگیرێت و .. تاد. تۆ کاتێك هاوسۆزانە گوێ لە بەرامبەرەکەت دەگریت بەم کردەوەیەت بوارێکی مەعنەوی بۆ دەرەخسێنێت هەناسە بدات، ئینجا پاش وەڵامدانەوەی ئەم پێویستی‌یە گرنگە ئیتر دەتوانیت گۆڕانکاری بەدی بهێنیت یاخود کێشەکە چارەسەر بکەیت. لە هەمو ئاستێك لە ئاستەکانی ژیاندا مرۆڤ پێویستی بەم هەناسەدانە مەعنەوی‌یە هەیە.

* * *

من جارێکیان لە کۆڕێك لە کۆڕە فێرکارییەکانمدا ئەم چەمکەم لە شیکاگۆ باس کردو داوام لە بەشداران کرد شێوازی گوێگرتنی هاوسۆزیی پەیڕەو بکەن لە ئێوارەی دوای کۆڕەکەدا.

بۆ ڕۆژی دواتر کابرایەك زۆر بە خۆشحالییەوە بە هەڵەداوان هاتە لام و پێی وتم: (ئەزانیت دوێنێ شەو چی ڕویدا؟ با بۆت باس بکەم. من ئەم ماوەیەی کە لێرە بوم لە شیکاگۆ دەمویست مامەڵەیەکی بازرگانی گەورە بەئەنجام بگەیەنم، چەند جارێکیش لەگەڵ کڕیارەکان و پارێزەرەکانیاندا کۆبومەتەوە و هەمو جارێك شتی تازەیان دەهێنایە گۆڕێ. وام دەهاتە بەرچاو کارەکە سەرناگرێت و ڕەنجی ئەو شەش مانگی رابردووەم بەفیڕۆ دەڕوات. ئەمەش بۆ من شتێکی ناخۆش بو، چونکە وەکو دەڵێن هەمو هێلکەکانم کردبووە ئەم سەبەتەیەوە. هەمو هەوڵێکی خۆم خستەگەڕ بۆ ئەوەی بەربەستەکان بشکێنم. دواجار هەوڵم دا بڕیارەکە دوابخەم. ئەوان قبوڵیان نەکرد و وتیان دەمێکە خەریکی ئەم مامەڵەیەین لەبەر ئەوە پێویستە یەکلایی بکەینەوە. ئا لەم کاتەدا من لە دڵی خۆمدا وتم باشە بۆچی هەوڵی ئەوە نەدەم یەکجار لێیان تێبگەم بۆ ئەوەی ئەوانیش بە ئاسانی لێم تێبگەن. چیم لەکیس دەچێت. بۆیە بە کابراکەم وت ڕێگەم بدە بە باشی لێت تێبگەم بزانم بۆچی لە

قسەکانی من دەترسیت، بۆ ئەوەی پێکەوە چارەسەرێکی بکەین. بەراستی ویستم خۆم بخەمە شوێنی ئەو. هەوڵمدا وەکو ئەو گوزارشت لە پێویستی و گومانەکانی بکەم .. ورده ورده کابرا وای لێ هات ناخی خۆیم بۆ بکاتەوە. قسەکانم دەربارەی گومان و نیگەرانی‌یەکانی کارێکیان کرد کابرا زیاتر و زیاتر بکرێتەوە، دواجار لە گەرمەی گفتوگۆکانماندا هەستاو چووە لای تەلەفۆنەکەوە و قسەی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا کرد پێی وت ئەوە رێك کەوتین تەواو. ئەمەش وای لێ کردم لە شەوەوە تا ئێستا قسەم بۆ نەکرێت.) چیرۆکی ئەم کابرایە چیرۆکی پاشەکەوت کردنی برێکی زۆر هەست و متمانەیە لە بانقی هەستەکاندا. توانیوێتی بواری هەناسەدانێکی مەعنەوی بۆ بەرامبەرەکەی برەخسێنێت. کە مەسەلەکە بگاتە ئێرە ئیتر شتەکانی دیکە وەکو یەکیان لێ دێت. لە هەمو شتێکدا مەسەلە مرۆیی‌یەکان زۆر لە رەهەندە پێکەوەییەکانی مامەڵە بازرگانییەکان گرنگترن.

دیارە ئەمەش کارێکی زەحمەتە. ئاسان نی‌یە هەوڵبدەیت یەکەمجار تێبگەیت و پێش ئامۆژگاری و رەچەتە نوسین، نەخۆشییەکە دەستنیشان بکەیت. ئەوە کارێکی قورسە. ئیشە ئاسان و قەدبڕەکان ئەوەیە ئەو چاویلکەیەی خۆت پێشکەشی بەرامبەرەکەت بکەیت کە ساڵەهای ساڵە سودت لێ بینیوە. ئەمە بۆ مەودا کورتەکان کارێکی زۆر ئاسانە، بەڵام لە ئایندەیەکی دووردا کاریگەریی زۆر خراپ دەکاتە سەر بەرهەم و توانای بەرهەمهێنان. تۆ ئەگەر زانیاری وردت نەبێت لەسەر بەرامبەرەکەت و نەزانیت سەرچاوەی رەفتارەکانی لەکوێوە هەڵدەقوڵێن ناتوانیت سودی تەواو لە هاوکاری و پەیوەندیەکان ببینیت .. هەروەها پەیوەندی‌یە دەستە جەمعییەکانیش بەرهەمێکی ئەوتۆیان لێ ناکەوێتەوە ئەگەر ئەو کەسانەی هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکەیت هەست نەکەن بە تەواوی تێیان گەیشتویت. هەروەها پێویستە ئەوەش بڵێین کە گوێگرتنی هاوسۆزی مەترسی زۆری تێدایە و پێویستی بەوەیە بچیتە ناو ئەزمونەکانی گوێگرتنەوە. گوێگرتنێکی قوڵی وا کە رەنگە کاریگەریت لەسەر دروست بکرێت و ئەمەش خۆی لە خۆیدا ناکۆکی دروست دەکات لەگەڵ ئامانجەکەتدا. واتە بۆ ئەوەی بتوانیت کاریگەری دروست بکەیت پێویستە بکەویتە ژێر کاریگەرییەوە. بە کورتییەکەی یەعنی پێویستە بەراستی لە بەرامبەرەکەت تێبگەیت.

لەبەر ئەوە خووەکانی یەکەم و دووەم و سێیەم بناغەی پتەوی دورمەودایان هەیە. ئەم خووانەن کە ناوەڕۆکێکی گەوهەرداری وا بە مرۆڤ دەبەخشن کە نەگۆڕبێت و وای لێ بکات ببێتە خاوەنی ئەو ناوەندە سەرەکی‌یەی کە بە ئاسانی دەست بداتە مەسەلە دەرەکی‌یەکان.

## دەستنیشانکردن پێش چارەسەر

مەسەلەی دەستنیشانکردن پێش چارەسەر، یاخود ئەوەی سەرەتا تێبگەیت و ئینجا هەوڵ بدەیت لێت تێبگەن هەرچەندە زەحمەت و مەترسیدارە بەلام لە زۆربەی بوارەکانی ژیاندا پرنسیپێکی راست و دروستە. کەسانی پرۆفیشناڵی راستەقینە بەوجۆرە رەفتار دەکەن و بەلای پزیشکان و پزیشکانی چاویشەوە مەسەلەیەکی یەکجار گرنگ و هەستیارە، مەحاڵە تۆ متمانە بە رەچەتەی ئەو پزیشکە بکەیت کە گومانت هەبێت لە دەستنیشانکردنەکەیدا.

جارێکیان (جولی) کچمان لە تەمەنی دوومانگیدا کتوپڕ نەخۆش کەوت. بیرمە ئەو رۆژە رۆژی شەممە بو، کە لە شارۆچکەکەی ئێمەدا یاری تۆپی پێ زۆربەی هەرە زۆری خەڵکەکەی بەخۆیەوە سەرقاڵ کردبو. یارییەکەش هێندە گرنگ بو نزیکەی شەست هەزار کەس چوبون بۆ تەماشاکردن. من و ساندرای هاوسەریشم حەزمان دەکرد بچینە تەماشای، بەلام دڵمان نەهات کچە بچکۆلەکەمان تەنیا جێ بهێڵین کە سکچوون و رشانەوەیەکی کتوپڕ شپرزەی کردبو.

پزیشکی ئێشکگریش (کە پزیشکی خێزانەکەمان نەبو) لە سەیری یارییەکە بو. کە دۆخی کچەکەمان تێک چو ناچاربوین پەیوەندی بکەین بە پزیشکەکەوە.

ساندرای هاوسەرم لە ڕێی ئامێرێکی تایبەتەوە پەیوەندی پێوەکرد و ڕێکەوتیش کاتی پەیوەندیکردنەکە ئەو یارییە لە قۆناغێکی زۆر هەستیاردا بو هاوسەرەکەم لە تۆنی قسەکانی پزیشکەکەدا هەستی بەوەکرد کە لە وەلامدا پێی وت "بەڵێ فەرمو چی بووە؟".

- "من هاوسەری دکتۆر (کۆڤی)م. تەندروستی کچەکەمان (جینی) نیگەرانی کردوین" ساندرا مەسەلەکەی بۆ باس کردو پزیشکەکە وتی "زۆرچاکە، دەرمانەکەتان بۆ دیاری دەکەم .. ناوی ئەو دەرمانخانەیەم پێ بڵێن کە مەعمیلی ئێوەیە"

کە ساندرا قسەکانی تەواو کرد، هەستی کرد لەتاو شپرزەیی خۆی مەسەلەکەی بە تەواوی بۆ پزیشکەکە روون نەکردۆتەوە. لێم پرسی: "تۆ بلێی بزانێت (جینی) ساوایە"

وتی: من دڵنیام لەوە

وتم: چوزانیت !! خۆ ئەو پزیشکی خێزانەکەمان نییە و لەوەو پێشیش (جینی)مان نەبردووە بۆلای.

وتی: بە هەرحاڵ، من زۆر دڵنیام کە دەزانێت.

ساندرا نەختێك بێدەنگ بو، پاشان رووی تێکردم و لێی پرسیم: چی بکەین ئێستا؟

پێم وت: پەیوەندی پێوەبکەرەوە.

وتی: نا .. تۆ بیکە

بە قسەم کرد. پەیوەندییەکەم ئەمجارەشیان لە یارییەکەی دابڕی. پێم وت: ئایا ئەو دەرمانەی نوسیوتە دەگونجێت بۆ منداڵێکی دوو مانگ؟ جینی تەمەنی دوو مانگە دوکتۆر.

بە سەرسوڕماوییەوە وتی: نەخێر نەمدەزانی .. زۆر چاکت کرد پەیوەندیت پێوە کردمەوە. ئا ئێستا دەستبەجێ رەچەتەکەی بۆ دەگۆڕم.

کەواتە ئەگەر متمانەت بە دەستنیشانکردنەکە نەبێت متمانەشت بە چارەسەرەکە نابێت.

ئەم قسەیە لە کڕین و فرۆشتنیشدا راستە. فرۆشیاری لێهاتو یەکەمجار هەوڵ دەدات بزانێت خەڵکەکە پێویستی بە چییە و کڕیارەکان چۆن بیر دەکەنەوەو لە چ وەزعێکدان. فرۆشیاری نەشارەزا کاڵا دەفرۆشێت بەڵام ئەگەر پرۆفیشناڵ و شارەزا بێت چارەسەری کێشەو پێویستیەکان دەفرۆشێت. ئەم دوو رێبازەش دوو رێبازی زۆر جیاوازن. کەسی پرۆفیشناڵ فێری ئەوە دەبێت شتەکە دەستنیشان بکات و تێی بگات، هەروەها دەشزانێت چۆن پێویستی خەڵکەکە ببەستێت بە بەرهەم و خزمەتگوزارییەکانی خۆیەوە. هەروەها بایی ئەوەش راستگۆ و سەرڕاستە کە ئەگەر بەرهەمەکەی یاخود خزمەتگوزارییەکەی بەکەڵکی کڕیارەکە نەیەت رێك و رەوان پێی بڵێت.

دەستنیشانکردنی پێش چارەسەر لە بواری یاساشدا بایەخێکی سەرەکی هەیە. پارێزەری پرۆفیشناڵ و لێهاتو سەرەتا دەست دەکات بە کۆکردنەوەی زانیارییە راستەکان بۆ ئەوەی لە مەسەلەکە تێبگات و پێش ئامادەکردنی بابەتەکە بە تەواوی لە پێشینەکان و لە یاساکان حاڵی بوبێت. پارێزەری باش زۆرجار پێش ئەوەی مورافەعەکەی خۆی بنوسێت، خۆی دەخاتە شوێنی پارێزەری لایەنەکەی بەرامبەر و لە گۆشەنیگای ئەوەوە موڕافەعەکە دەنوسێت.

ئەم دروشمە لە بواری دیزاینکردنی بەرهەمیشدا راستو گرنگە. ئایا هەرگیز رێی تێدەچێت کەسێك لە کۆمپانیایەکدا بڵێت "زەوقی کڕیار بە جەهەننەم .. بڕۆن خەریکی بەرهەمهێنان بن". گوێ نەدان بە زەوق و نەریتی کڕیار و خۆسەرقاڵکردن بە دروستکردنی بەرهەمەوە هیچ سەرکەوتنێکی لێ بەدی نایەت.

ئەندازیاری بەتواناش سەرەتا هەوڵ دەدات ئەندازەی هێز و گوشارەکان تێبگات ئینجا دەست بداتە دیزاینکردنی پردەکە. مامۆستای بەتواناش بەر لەوەی وانەکە بۆ خوێندکارەکان شەرح بکات هەوڵ دەدات بیانناسێت و هەڵیانبەسەنگێنێت. خوێندکاری لێهاتوش پێش ئەوەی زانیارییەکە پراکتیك بکات هەوڵ دەدات تێی بگات. باوکی لێهاتوش بەر لە بڕیار و حوکم دەرکردن هەوڵ دەدات مەسەلەکە تێبگات. کلیلی هەمو بڕیارێکی راست لە تێگەیشتنیدایە. بازدان بەسەر ئەمەدا و حوکمدەرکردنی خێرا مرۆڤ نامەحروم دەکات لە تێگەیشتنی تەواو.

سەرەتا هەوڵ بدە تێبگەیت .. ئەمە پرنسیپێکی رون و ئاشکرای راستە بۆ هەمو بوارەکان. پرنسیپێکی سەراپاگیر و کۆڵەکەی هاوبەشە، بەڵام گرنگترین کاریگەرییەکان لە بواری پەیوەندییە دەستەجەمعییەکانی مرۆڤدایە.

## چوار کاردانەوەکەی ژیاننامە

ئێمە لەبەر ئەوەی لە پارادیمی ژیاننامەی خۆمانەوە تەماشای شتەکان دەکەین، حەزدەکەین بە یەکێك لەم چوار رێگایە کاردانەوە نیشان بدەین — یەکەمین هەڵسەنگاندن — شتەکەمان بە دڵە یان بەدڵ نییە- دووەمیان لێکۆڵینەوەیە. لە گۆشەنیگای خۆمانەوە پرسیار ئاڕاستە دەکەین — سێیەمینیان ئامۆژگاریکردنە- لە روانگەی ئەزمونەکانی خۆمانەوە ئامۆژگاری پێشکەش دەکەین- چوارەمیشیان

لێکدانەوەیە- هەوڵ دەدەین لە روانگەی پاڵنەرەکان و رەفتارەکانی خۆمانەوە لە نهێنی بەرامبەرەکەمان تێبگەین و پاڵنەرەکان و رەفتارەکانیان لێك بدەینەوە.

ئەم کاردانەوانەمان بە شێوەیەکی سروشتی بۆ دێت، چونکە کۆمەڵە دەقێکە رۆچونەتە ناخمانەوە و هەمیشە بە دەوری ئەواندا دەژین. بەڵام ئایا ئەم کاردانەوانە یارمەتیدەرن لەوەی راستو دروست لە شتەکان تێبگەین؟

بۆ نمونە من ئەگەر بمەوێت پەیوەندیم لەگەڵ کوڕە هەرزەکارەکەمدا بەو شێوەیە بێت کە هەمو قسەکانی هەڵبسەنگێنم، ئایا کوڕەکەم هەست بە ئازادی دەکات لەگەڵمدا و ئامادەیە بەراستی خۆیم نیشان بدات؟ ئایا بەم جۆرە پەیوەندییە دەتوانم هەناسەدانێکی مەعنەوی پێ ببەخشم؟

کە هەست بکات من لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا دەکەم چی بەسەردێت؟ لێکۆڵینەوە بیست جۆر پرسیار لەخۆ دەگرێت. شتێکە پەیوەستە بە ژیاننامەی تایبەتی خۆمەوە و گوزارشت لە کۆنترۆڵکردن و داگیرکردن دەکات. لێکۆڵینەوە هەروەها لەژێر کاریگەریی لۆجیکدایە. زمانی لۆجیکیش جیاوازە لە زمانی هەست و خۆشەویستی. تۆ دەتوانیت رۆژ تا ئێوارە پرسیار بکەیت، بەڵام هیچ زانیارییەکی وات دەست نەکەوێت کە یارمەتیدەرت بێت لە ناسینی کەسەکە. ئەم جۆرە لێکۆڵینەوە بەردەوامە یەکێکە لەو هۆکارانەی کە ناهێڵێت باوکان لە کوڕەکانیان نزیك ببنەوە.

★ چۆنیت کورم؟

- باشم

★ دەنگوباس؟

- هیچ

★ ئەی هی مەکتەب؟

- هیچی وا نییە.

★ ئەتەوێ هەینی چی بکەیت؟

- نازانم

بەمجۆرە گفتوگۆیە (کە لەراستیدا لێکۆڵینەوەیە) ناتوانیت وای لێ بکەیت واز لە تەلەفۆنەکەی بهێنێت لەگەڵ هاوڕێکەیدا. وەڵامەکەشی لە یەك دوو وشە زیاتر تێناپەڕێت.ماڵەکەت بەلای ئەوەوە لە مۆتێلێك زیاتر هیچی دیکە نییە کە تیایدا

دەخوات و دەخەوێت، بەڵام هەرگیز نە دەکرێتەوە لەگەڵتدا و نە بەشداریی هیچی شتێکیش دەکات. بەینی خۆمان بێت، ناهەقیشی نییە چونکە هەر جارێک کە ویستبێتی ناخی خۆیت بۆ بکاتەوە و ناسکترین هەستی خۆیت بۆ دەربڕێت، تۆ بە ئامۆژگارییەکەت ئەو هەست و ناوەڕۆکەت پێشێل کردووە و بێزارت کردووە. هێندەت لێ دووبارە کردۆتەوە: پێم وتیت، بۆم باسکردیت، ئاگادارم کردیت .. تاد.

بە شێوەیەکی گشتی ئێمە هەموومان زیاد لە پێویست پابەندی ئەم جۆرە کاردانەوانەین کە وەکو دەقی نوسراو وان و تەنانەت ناشزانین کەی بەکاریان بهێنین. من خۆم ئەم چەمکەم بۆ هەزاران کەس روونکردۆتەوە لە سەرتاسەری وڵاتدا. جارێکیش نەمدیوە خەڵکەکە بەوە توشی سەرسوڕمان نەبێت کە بینیوێتی چۆن پەیڕەوکردنی گوێگرتنی هاوسۆزیی دەرەنجامی گرنگ و چاکی لێ دەکەوێتەوە. بەلای زۆربەی خەڵکەوە ئەم خووە کە دەڵێت یەکەمجار هەوڵبدە تێبگەیت، سەرنجراکێشترین خووە و جێبەجێکردنی دەستبەجێشی لە هەمویان ئاسانترە.

ئێستاش با چاوێک بخشێنین بە گفتوگۆیەکی ئاسایی و کلێشەیی نێوان باوکێک و کوڕە هەرزەکارەکەی. تکایە بەپێی ئەو زانیارییانەی کە باسمان کرد قسەکانی باوکەکە یەکەیەکە پۆلێن بکە.

- بابە من بۆم دەرکەوتووە خوێندن یەك فلسی قەڵب ناهێنێت.

* چی بووە کوڕم (لێکۆڵینەوە)

- خوێندن زۆر بێ هوودەیە .. من هیچ سودێکی لێ نابینم

* ئێستا وا هەست دەکەیت کوڕم .. منیش کە لە تەمەنی تۆدا بوم هەمان هەستم هەبو. بیرم دێت کە چومە پۆلەوە وامدەزانی کات بەفیڕۆدانە. بەڵام دواتر خوێندن بو بە باشترین پشتیوانم. پێویستە بەردەوام بیت لە خوێندن و پشو درێژبیت. (ئامۆژگاری)

- دە ساڵی رەبەقە خەریکی خوێندنم. پێم ناڵێیت س + ص کەڵکی چی هەیە، دوور نەڕۆین بۆ فیتەرێك؟

* فیتەر؟ دڵنیام سوعبەت دەکەیت (هەڵسەنگاندن)

- نەخێر سوعبەت ناکەم. تەماشای یوسف بکە. وازی لە خوێندن هێناو خووی دایە فیتەری. ئێستا ئەوەندە دەوڵەمەند بووە حسابی خۆی نازانێت. بەڕاستی ئەوە بڕیارە.

★ ڕەنگە ئێستا شتەکە وا دەربکەوێت. بەڵام پاش چەند ساڵێکی دیکە یوسف پەشیمان دەبێتەوە لەوەی خوێندنی واز لێ هێناوە. فیتەریی بەکەڵکی تۆ نایەت. پێویستە بخوێنیت و ببیت بە شتێکی چاکتر. (ئامۆژگاری)

- نازانم، بەڵام ئێستا یوسف وەزعی باشە.

★ گوێ بگرە کوڕم، ئایا تۆ بەڕاستی هەوڵت داوە لەگەڵ دەرس و دەورەکانتدا؟ (لێکۆڵینەوە، ئامۆژگاری)

- ئەی چۆن هەوڵم نەداوە. تائێستا (دە) ساڵی خۆم بەس لە ئامادەییدا سەرف کردووە. بەڵام دڵنیام بە هیچ ناچێت.

★ خوێندنگاکەت خوێندنگایەکی زۆرباشە کوڕم. پێویستە حەقی خۆیی بدەیتێ (هەڵسەنگاندن، ئامۆژگاریی)

- خوێندکارەکانی دیکەش هەر وەکو من بیردەکەنەوە

★ تۆ دەزانیت من و دایکت چ ڕەنجێکمان کێشاوە تا تۆمان گەیاندۆتە ئەم ئاستە! ناکرێت پاش ئەم هەموو ساڵە واز لە خوێندن بهێنیت. (هەڵسەنگاندن)

- دەزانم چەند قوربانیتان داوە بابە، بەڵام خوێندن ئەوە ناهێنێت.

★ دڵنیام ئەگەر ئەو کاتە زۆرەی بەدیار تەلەفزیۆنەوە خەساری دەکەیت خوو بدەیتە خوێندنەکەت بۆچونت دەگۆڕیت (ئامۆژگاریی، هەڵسەنگاندن)

- گوێ بگرە بابە، قوتابخانە باش نییە و تەواو .. هەفت نەبێت بەسەرمەوە. حەزناکەم جارێکی دیکە بە هیچ شێوەیەك باسی ئەم مەسەلەیە بکەم.

ئاشکرایە کە باوکەکە نیازی باشە و دەیەوێت یارمەتی بدات، بەڵام ئایا بە کردەوە تەنیا یەك هەنگاویشی ناوە بۆ ئەوەی بە ڕاستی تێبگات!

دەبا ئێستا وردتر سەرنج لە کوڕەکە بدەین. نەك تەنیا قسەکانی بەڵکو هەست و بۆچوونەکانیشی (کە لە خوارەوە لەناو کەوانەکاندا روونیان دەکەینەوە) و بزانین کاردانەوە ئاسایی و تەقلیدییەکانی باوکی چی بون لەسەری کە باوکەکە لە ژیاننامەی خۆیەوە هەڵی هێنجاون.

★ بابە من بۆم دەرکەوتووە. خوێندن یەك فلسی قەڵب ناهێنێت. (دەمەوێت قسەت لەگەڵدا بکەم، بابەخم پێ بدەیت)

- چی بووە کوڕم؟ (کەواتە تۆ بایەخ دەدەیت بە مەسەلەکە، ئەمە شتێکی چاکە)

نـاکرێ نـا .. بـە هـیچ شـێوەیەك سـوودی لێ نـابینم (کێشـەم هەیـە لەگـەڵ قوتابخانەکەدا، هەستێکی خراپم تیا دروست بوە)

- شتێکی ئاسایی‌یە ئێستا هەست بـە سوودەکانی خوێنـدن نەکـەیت. منـیش کـە لـە تەمـەنی تـۆدا بـوم هـەمان هەسـتم هـەبو (وای، نـا. ئەمـە بەشـی سـێیەمی ژیاننامـەی باوکەکەیـە. ئـەوەی کـە مـن حەزدەکـەم قسـەی لـەبارەوە بکـەیت ئەمـە نـی‌یـە. هـیچ بەلامەوە گرنگ نی‌یە، کاتی خـۆی ئـەو چ هـەژاری و دەردەسـەرییەك خوێنـدنی تـەواو کردووە. من دەمەوێت بگەمە کرۆکی کێشەکە؟

- بیرمە منیش گاڵتەم بە خوێندن دەهات و دەمگوت کـات کـە شـتێکی بێ‌هوودەیـە، بـەڵام لـە کۆتاییـدا هـەر خوێنـدن و دەرس‌و دورەکـە فریـام کـەوتن. تـۆش پێویسـتە بەردەوام بیت و بخوێنیت. پەلەت نەبێ (زەمـەن کێشـەکەی مـن چارەسـەر ناکـات. ئـای چەند حەزدەکەم پێت بڵێم. چەند حەزدەکەم دەری ببڕم)

* دە ساڵی تەمـەنی خـۆمم پێ‌بەخشیوە. دەتوانیـت پـێم بڵێیـت (س + ص) سـودی چی دەگەیەنێت بە من بۆ نمونە گەر بمەوێت ببمە فیتەر.

- فیتەر؟ دڵنیـام سوعبەت دەکـەیت (ئەگـەر ببـم بـە فیتـەر خۆشـی نـاوێم، ئەگـەر خوێندنەکەم تەواو نەکەم خۆشی نـاوێم لەبـەر ئـەوە پێویسـتە بڕوبیـانو بـۆ قسـەکانم بهێنمەوە)

* نەخێر سوعبەت ناکەم تەماشای یوسف بکە، لەوەتـەی وازی لـە خوێنـدن هێنـاوە و خووی داوەتـە چاککردنەوەی ئوتومبیـل کۆڵێـك دەوڵەمەنـد بـووە. ئەمەیـە بڕیـاری چاك‌و کردەنی.

* ڕەنگە ئێستا شتەکە بە ڕواڵەت وابێت، بـەڵام پـاش چـەند سـاڵێکی دیکە دڵنیـام یوسـف پەشـیمان دەبێتـەوە و دەڵێـت ئـاخ خۆزگـە خوێنـدم واز لێ نەهێنایـە. (ئـۆی، ئەمەشیان موحازەرەیەکی دیکەیە دەربارەی خوێندن)

* خۆ بە خێری ناتەوێت ببیت بـە فیتـەر (تـو چوزانی نامـەوێت باوکـە؟ ئایا تـۆ ئاگات لە حەز و ئارەزووەکانی منە؟)

* تۆ پێویستت بەوەیە بخوێنیـت و خـۆت ئامـادە بکـەیت ببیتـە شـتێکی زۆر چاك. فیتەریی چی‌یە؟!

- نازانم، بەڵام یوسف کە وازی لە خوێندن هێناوە وەزعی زۆر باشە (خۆی خەسارنەکردووە، یوسف کە وازی لە خوێندن هێنا خۆی خەسار نەکرد)

★ گوێ بگرە کوڕم، ئایا تۆ بە جددی هەوڵت داوە لە دەرس و دەورەکانتدا پێش بکەویت؟ (دیسانەوە راوەڕاوێیەکەیە بابە؟ ئاخ خۆزگە گوێت لێ دەگرتم. من بەڕاستی پێویستم بەوەیە قسەت لەگەڵدا بکەم دەربارەی شتێکی گرنگ)

- تا ئێستا دوو ساڵم بەس لە قۆناغی ئامادەییدا بەسەربردووە. ئیتر چۆن هەوڵم نەداوە .. بەڵام لە کات بەفیڕۆدان زیاتر هیچی دیکە نییە

★ خوێندنگاکەت خوێندنگایەکی زۆر ناسراوە کوڕم. پێویستە نەختێك مافی خۆیی بدەیتێ (زۆر جوانە. باسی هەق و راستگۆیی دەکەیت. خۆزگە دەمتوانی بە ئارەزوی دڵی خۆم لەمبارەیەوە قسەم بکردایە.

- خوێندکارەکانی دیکەش هەر وەکو من بیردەکەنەوە (منیش گەمژەنیم، نەختێك لە دنیا گەیشتوم)

★ دەزانیت من و دایکت چ رەنجێکمان کێشاوە تا تۆمان گەیاندۆتە ئەم رۆژە؟ (دەی دەی دەتەوێت وام لێ بکەیت هەست بە گوناح و تاوان بکەم .. قوتابخانە شتێکی باشە و دایك و باوکیشم زۆر مەزنن، بەس من گێل و هیچ و پوچم؟

★ پاش ئەم هەمو ساڵە تازە چۆن دەتوانیت واز لە خوێندن بێنیت؟

- بابە من دەزانم چەند قوربانیتان داوە، بەڵام خوێندن ئەوە ناهێنێت (تۆ مەسەلەکە تێنەگەیشتویت)

★ گوێ بگرە کوڕم. دڵنیام ئەگەر لەباتی ئەو هەمو کاتەی بە تەماشاکردنی تەلەفزیۆنەوە خەساری دەکەیت خووت بدایەتە دەرس و دەورەکەت (باشە بابە گیان تەواو – هیچ کێشەیەکم نییە و ئەسڵەن بێ ئەقڵیش بوم کە ویستم بۆت باس بکەم)

★ گوێ بگرە بابە. خوێندن باش نییەو تەواو .. منیش ئیتر بە هیچ شێوەیەك حەزناکەم باسی ئەم مەسەلەیە بکەمەوە.

ئێستا دەزانیت تواناکان و دەستکەوتەکان چەند سنوردار دەبن ئەگەر بمانەوێت تەنیا لەرێی قسەوە لە بەرامبەرەکەمان تێبگەین، بە تایبەت ئەگەر لە هاوێنە تایبەتەکانی خۆمانەوە تەماشای ئەو کەسە بکەین؟ بەراستی ئەم شێوەی کاردانەوەیە

کە هەر بەپێی ژیاننامەی خۆمانەو ڕێگرییەکی گەورە دروست دەکات و دەستوپێمان دەبەستێتەوە لە ئاست ئەو کەسەدا کە بە جددی هەوڵدەدات وامان لێ بکات ژیاننامەکەی ئەو تێبگەین. تۆ بە هیچ شێوەیەك ناتوانیت بچیتە ناخی هیچ کەسێکی دیکەوە و وەکو ئەو جیهان ببینێت. ئەگەر خاوەنی ئارەزوویەکی ڕاستگۆ و کەسایەتییەکی بەهێز و سەرمایەیەکی باش نەبیت لە بانقی هەستو سۆزەکاندا و شارەزاییت نەبێت لە گوێگرتنی هاوسۆزییدا.

ئەگەر گوێگرتنی هاوسۆزیی بریتی بێت لە شاخێکی سەهۆڵ ئەوا شارەزاییەکان کە چوار قۆناغ لەخۆ دەگرن تەنیا هەر لوتکەی شاخەکەیە. چوار قۆناغەکەش ئەمانەن: یەکەمین قۆناغ کە لە هەموویان کەمتر کاریگەریی هەیە قۆناغی لاساییکردنەوە و دووپاتکردنەوەی ناوەڕۆکی قسەیە. مرۆڤ ئەم جۆرە کاردانەوەیە لەڕێی گوێگرتنی چالاکەوە فێر دەبێت کە هەندێك جار تەعبیرییشە. ئەگەر هیچ پەیوەندییەکی بە کەسایەتی و جۆری پەیوەندییەکانەوە نەبێت وا لە کەسەکە دەکات بە ناچاری کۆتایی بە قسەکانی بهێنێت. بەڵام بە هەرحاڵ ئەم جۆرە گوێگرتنە یەکەمین قۆناغ و شارەزاییە و هیچ نەبێت وات لێ دەکات گوێ لە قسەکە بگریت.

لاساییکردنەوەی ناوەڕۆك (دەق) کارێکی ئاسانە. تەنیا گوێ لە وشەکان بگرە کە لە دەمی قسەکەرەوە دێنە دەرێ و دوپاتیان بکەرەوە. ئەسڵەن هەر پێویست بەوە ناکات مێشکیشت بخەیتە کار.

(بابە، بۆم دەرکەوتووە خوێندن یەك فلسی قەڵب ناهێنێت)

(بۆت دەرکەوتووە خوێندن یەك فلسی قەڵب ناهێنێت) واتە تۆ ناوەڕۆکی قسەکە دووبارە دەکەیتە و بەس. نە هەڵسەنگاندنت کردووە، نە لێکۆڵینەوە، نە ئامۆژگاری و تەنانەت نە وەرگێڕانیش. بەڵام لانی کەم ئەوەت نیشانی بەرامبەرەکەت داوە کە گوێ دەگریت لە قسەکانی. ئەمە باشە، بەڵام ئەگەر بتەوێت تێبگەیت پێویستت بە کاری زیاترە.

قۆناغی دووەمی ئەم جۆرە گوێگرتنە پێی دەگوترێت قۆناغی (داڕشتنەوەی ناوەڕۆك) کە لە قۆناغی یەکەم کاریگەرترە بەڵام هێشتا هەر لە سنوری پەیوەندی

"بابە، من بۆم دەرکەوتووە خوێندن یەك فلسی قەڵب ناهێنێت"

"ئیتر ناتەوێت بچیتەوە بۆ قوتابخانە"

لەم قۆناغەدا تۆ مەبەستەکەی ئەو بە وشەی خۆت دەردەبڕیت کەواتە بیر لە قسەکانی دەکەیتەوە، بەڵام بیرکردنەوەکە زیاتر لە نیوەی چەپی مێشکتدایە، واتە لە نیوەکەی لۆجیك و لێکدانەوەدا.

قۆناغی سێیەم کە ئاستەکەی بەرزترە قۆناغی گوزارشت کردنە لە هەستو سۆز.

"بابە، بۆم دەرکەوتووە خوێندن یەك فلسی قەڵب ناهێنێت"

"لەوە دەچێت زۆر نائومێدبیت"

لەم ئاستەی پەیوەندیدا هێندەی کە تۆ بایەخ بە قسەکانی بەرامبەرەکەت دەدەیت سەد هێندە بایەخ بەو هەست و باری دەروونییەی کەسەکە دەدەیت کە لە کاتی دەربڕینی قسەکەدا نیشانی دەدات. قۆناغی چوارەم بریتییە لە هەردوو قۆناغی دووەم و سێیەم پێکەوە. واتە هەم قسەکە دادەڕێژیتەوە و هەم هەست و سۆزەکەشی نیشان دەدەیتەوە.

"بابە من بۆم دەرکەوتووە خوێندن یەك فلسی قەڵب ناهێنێت"

"بەراستی نائومێدبویت بەرامبەر خوێندن" نائومێدبون هەستەکەیە و خوێندنیش ناوەڕۆکەکە. لەم پەیوەندییەدا تۆ هەردوو لای مێشکت بەکاردەهێنیت بۆ ئەوەی هەردوو رەهەندی قسەکە تێبگەیت.

لەکاتی بەکارهێنانی ئەم ئاستی چوارهەمەی گوێگرتنی هاوسۆزییدا، شتی وا روودەدات خۆیشت باوەڕناکەیت. تۆ کە ناوەڕۆکی قسەکە بە وشەی تایبەتی خۆت دادەڕێژیتەوە و هەستو سۆزی بەرامبەرەکەت بە هەند وەردەگریت و گوزارشتی لێ دەکەیت لەراستیدا هەناسەدانێکی مەعنەویی پێدەبەخشیت. هەروەها یارمەتیشی دەدەیت هزر و سۆزی خۆی بکاتە ڕێڕەوی کارەکانی و هەتا زیاتر متمانە بەوە بکات کە تۆ راستگۆیانە ئارەزومەندیت گوێی لێ بگریت و تێی بگەیت، زیاتر دیواری نێوان ناخی خۆی و تۆ دەڕوخێت. ئیتر وا نامێنێت کە هەستو هزری شتێك بن و قسەکانیشی شتێکی دیکە، بەڵکو هەمویان هاوجوت دەبن، چونکە بەوپەڕی هەستو هزری قوڵەوە متمانەت پێ دەکات.

"بابە، من بۆم دەرکەوتووە خوێندن فلسێکی قەڵب ناهێنێت." "دەمەوێت قسەت

لەگەڵدا بکەم، بایەخم پێبدەیت."

"بەراستی هەست بە نائومێدی دەکەیت لە خوێندن" "راستە هەستی پێدەکەم"

"بە دڵنیاییەوە بۆم ناکرێ و بە هیچ شێوەیەك سودی لێ نابینم"

"تۆ هەست دەکەیت خوێندن هیچ چاکەیەکی بۆت نابێت" "ئایا مەبەستەکەی تۆ ئەمەیە؟"

"بەڵێ وایە. هیچ شتێکی بەکەڵکی لێوە فێرنابم. مەبەستم ئەوەیە تەماشای یوسف بکە. خوێندنی واز لێ هێناو ئێستا ئیشی فیتەری دەکات. پارەی چاکی دەست دەکەوێت. شتی پراکتیکی ئاوایە."

"تۆ وا هەست دەکەیت یوسف ئیشێکی چاکی کردووە" (زۆرباشە ..)

(ئەی خراپییەکەی چیە؟ پارەی چاکی دەست دەکەوێت)

"بەڵام گرەو دەکەم چەند ساڵێکی دیکە پەشیمان دەبێتەوە" "بە بڕوای تۆ یوسف سبەی رۆژ هەست دەکات بڕیارێکی هەڵەی داوە"

"دڵنیام هەستی پێدەکات. دەزانی چی لەخۆی کردووە" "مەبەستم ئەوەیە مرۆڤ بەبێ خوێندن هیچ شتێکی چنگ ناکەوێت لەم جیهانەدا"

"خوێندن گرنگە و نکوڵیی لێ ناکرێت"

"بەڵێ مەبەستم لەوەیە مرۆڤ ئەگەر بەڵگەنامەیەکی نەبێت و نەتوانێت کارێکی دەست بکەوێت یان بچێتە زانکۆ ئیتر دەتوانێت چی بکات"

چار نیە هەر دەبێت بخوێنیت و تەواوی بکەیت

"خوێندن بۆ ئایندەت گرنگە"

"بەڵێ وایە .. ئەزانی چی .. بەراستی نیگەرانم. گوێ بگرە. هیچ شتێك لەمبارەیەوە بۆ دایکت باس نەکەیت. باش"

"تۆ پێت خۆش نیە دایکت بە مەسەلەکە بزانێت"

"نا. زۆر بەلامەوە گرنگ نیە .. دەتوانیت پێی بڵێیت. ئەمڕۆ بێت یان سبەی هەر پێ دەزانێت. تەماشاکە بابە. ئەمڕۆ چوومە تاقیکردنەوەوە .. تاقیکردنەوەی خوێندنەوە بو، وتیان ئاستی چوارەمە بۆ قۆناغی یەکەمی ئامادەیی، واو! ئای لێك تێگەیشتن چ جیاوازییەکی گەورە دروست دەکات. وەکو دەڵێت هەمو ئامۆژگارییە باشەکان تورێك ناهێنن ئەگەر کێشە راستەقینەکە بە هەند وەرنەگرن. مرۆڤ ئەگەر

خۆی رادەستی بۆچونە تایبەتەکانی خۆی بکات و ماوەیەکی زۆریش چاویلکەکەی دانەکەندبێت بۆ ئەوەی جیهان لە پارادیمێکی دیکەوە ببینێت ناتوانێت بگاتە کرۆکی کێشەکە.

"بابە من دەرناچم. وابزانم واز لە خوێندن بهێنم باشترە لەوەی کە راسیب ببم. بەلام حەزناکەم وازی لێ بهێنم"

"هەست دەکەم خراپ گیرت خواردووە و کەوتویتە گێژاوەوە"

"بەرای تۆ چی بکەم باشە بابە؟"

باوکەکە بەم کردارەی کە ویستی یەکەمجار تێبگات، توانی ئاستی هاوکێشەکە لە ئالوگۆڕکارییەوە بکات بە گۆڕانکاریی. واتە لەجیاتی ئەوەی پەیوەندییەکە هەر لە ئاستێکی روکەشدا رابگرێت و تەنیا هەر ئەرکێك جێبەجێ بکات، توانی دەرەفەتێك بهێنێتە کایەوە لە رێگەیەوە دەوروتەئسیرێکی وای هەبێت گۆڕانکاریی دروست بکات، گۆڕانکاری نەك هەر لە کوڕەکەیدا، بەلکو گۆڕانکاریی لەو پەیوەندییەشدا دروست بکات کە بە کوڕەکەیەوە دەیبەستێتەوە. هەروەها توانیشی ژیاننامەکەی خۆی بنێتە لاوەو بەراستی هەوڵ بدات یەکەمجار تێبگات. ئەو توانی پاشەکەوتێکی گەورە بخاتە سەر ژمارە حسابی (بانقی هەست و سۆزەکان) و وردە وردە وای لە کوڕەکەی کرد کراوەتر و کراوەتر و کراوەتربێت تا دەگاتە کرۆکی مەسەلەکە.

بەم شێوەیە باوك و کوڕەکە ئێستا لە تەنیشت یەکترییەوەن نەك بەرامبەری یەکتری و وەك دوو هاوکار تەماشای کێشەکە دەکەن نەك وەکو دووڕکابەر. کوڕەکە ئێستا لە پێناوی بەدەستهێنانی رێنمایی و ئامۆژگاریدا ژیاننامەکەی باوکی کردۆتەوە.

باوکەکە کە لەم بارودۆخەشدا ئامۆژگاری پێشکەش دەکات پێویستە وریابێت لە مەسەلەی پەیوەندیکردن بە کوڕەکەیەوە. هەتا کاردانەوەکان لۆجیکی بن باوکەکە بەردەوام پرسیار دەکات و کاریگەرانەش ئامۆژگارییەکانی رادەگەیەنێت، بەلام هەرکاتێك هەستی کرد کاردانەوەکە بووە بە کاردانەوەیەکی سۆزداری، پێویستە دەستبەجێ بگەڕێتەوە بۆ گوێگرتنی هاوسۆزیی.

"بە باوەڕی من، هەندێك مەسەلە هەن پێویستە رەچاویان بکەیت"

"وەکو چی بابە؟"

"وەك ئەوەی لە بواری خوێندنەوەدا بەدوای یارمەتی تایبەتدا بگەڕێیت و وابزانم لە خوێندنگای تەکنیکی بەرنامەیەکی تایبەتیان هەیە بۆ ئەو بوارە"

"پرسیاری ئەوەم کرد بابە، دووشەو و رۆژێکی رەبەق دەخایەنێت. ئەوەش کاتێکی زۆرە."

لەم وەڵامەدا باوکەکە هەست بە زاڵبونی سۆز دەکات، لەبەر ئەوە یەکسەر دەگەڕێتەوە بۆ پەیوەندی هاوسۆزیی"

"زۆرە"

"بێجگە لەوە بابە، من خوێندکارەکانی قۆناغی شەشەمم بەتەما کردووە کە ببمە راهێنەریان".

"ناشتەوێت دەستبەرداریان بیت"

"بەڵام دەمەوێت یەك شتت پێ بڵێم بابە. ئەگەر زانیم خوولی فێرکردنەکە سودی دەبێت، هەمو شەوەکان ئامادەی دەبم و هەوڵ دەدەم راهێنەرێکی دیکە بۆ خوێندکارەکان هەڵبژێرم."

"کەواتە تۆ بە جددی بەدوای یارمەتیدا دەگەڕێیت بەڵام نازانیت ئەو خولە سودت پێ دەگەیەنێت یان نا."

"تۆ لەو باوەڕەدایت سودی هەبێت بابە؟"

بەم شێوەیە کوڕە جارێکی دیکەش گەڕایەوە سەر ئەوەی کە کراوەتر و لۆجیکیتر بێت. جارێکی دیکەش ژیاننامەکەی باوکی کردەوە و فرسەتێکی دیکە بۆ باوکەکە هەڵکەوت کە هەم خۆی بگۆڕێت و هەم کاریگەرییشی هەبێت.

هەندێك جار وەرچەرخانەکە و گۆڕانەکە پێویستیان بە ئامۆژگاری دەرەکی نابێت. بەشێوەیەکی سروشتی، مرۆڤ فرسەتی ئەوەی بۆ هەڵبکەوێت کە کراوە بێت، خۆی کێشەکانی خۆی چارەسەر دەکات و لەو ماوەی کرانەوەیەیدا چارەسەرەکە لەبەر چاویدا روون و ئاشکرایە.

جاری دیکەش رێك دەکەوێت کە پێویست بە هاوکاری دەرەکی و تێڕوانینی زیادە بکات. کلیلی مەسەلەکە لەوەدایە چەندە راستگۆیانە هەوڵ دەدرێت لەپێناوی چاکەی کەسەکەدا و چەندێك گوێگرتنی هاوسۆز بەرقەرارە و رێگە بۆ کەسەکە خۆش کراوە خۆی لە کێشە تێبگات و بەپێی تواناو بواری رەخساوی خۆی چارەسەری بکات.

مەسەلەکە وەکو پاککردنی سەلکە پیازێك وایە کە توێکڵ توێکڵ لای دەبەیت هەتا دەگەیتە ناوکە نەرمەکەی ناوی ناوەوە. تۆ ئەگەر راستگۆیانە گوێ لە بەرامبەرەکەت بگریت بە مەبەستی تێگەیشتن ئەویش بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر بۆت دەکرێتەوە، تەنانەت ئەگەر پێشتر نیازی ئەوەبوبێت ئازارت پێ بگەیەنێت. کرانەوە شتێکی سروشتییە لە مرۆڤدا. منداڵانیش بە هەمو شێوەیەك کرانەوەیان دەوێت. دەیانەوێت زیاتر بەرووی باوك و دایکاندا بکرێنەوە. وەك لە هاوتەمەنەکانیان. منداڵ کاتێك دەکرێتەوە کە هەست بکات تۆ بێ هیچ قەیدو شەرتێك خۆشت دەوێت. کە ئەو هەستەیان لا دروست بو ئیتر دڵسۆزی خۆیان دەردەبڕن، بێ ئەوەی پێویست بکات فەرمانیان بۆ دەربکەیت یاخود گاڵتەیان پێبکەیت.

تۆ ئەگەر بەراستی و بەبێ هیچ کینەو دووڕوویییەك هەوڵی تێگەیشتن بدەیت، ئەوا خۆیشت سەرت سوڕدەمێنێت لەو هەمو زانیاری و تێگەیشتنەی کە بە لێشاو لە بەرامبەرەکەتەوە پێت دەگەن. دیارە بۆ ئەو تێگەیشتنە قووڵەش مەرج نییە هەمو جارێك پێویست بەوە بکات قسە بکەیت. بەڵکو هەندێك جار قسە دەبێتە رێگر. ئەمەش یەکێکە لەو هۆکارانەی کە بۆچی شێواز بە تەنیا خۆی هیچ ئەنجامێك نادات بەدەستەوە. ئەم جۆرە تێگەیشتنە شێوازەکان تێدەپەڕێنێت. شێواز ئەگەر بە تەنیا هەر خۆی بێت، لەم بوارەدا حسابی رێگری بۆ دەکرێت.

ئەم مەسەلەی گوێگرتنی هاوسۆزییەم بۆیە وا بە درێژی باس کرد چونکە بایەخێکی گرنگی هەیە لە هەمو خوویەکدا و ئێمە هەمومان پێویستمان بەوەیە شارەزابین لەم بوارەدا. بەڵام دیسانەوە دووپاتی دەکەمەوە کە هیچ شارەزاییەك کاریگەر نابێت ئەگەر سەرچاوەکەی ئارەزوویەکی قوڵی تێگەیشتن نەبێت، چونکە هیچ کەسێك بە ئاسانی خۆی نادات بەدەستەوە و بەرهەڵستی هەر هەوڵێك دەکەن کە بیەوێت کۆنترۆڵیان بکات. لەراستیدا ئەگەر ئەو کەسەی مامەڵەی لەگەڵدا دەکەیت پەیوەندی پتەوی پێتەوە هەبو باشتر وایە پێیان بڵێیت کە دەتەوێت چی بکەیت.

"کاتێك من ئەم کتێبەم دەخوێندەوە کە باسی گوێگرتنی هاوسۆزی دەکات بیرم لە پەیوەندییەکانی نێوان خۆم و ئێوە کردەوە؛ بۆم دەرکەوت کە وەکو پێویست گوێم

لێ نەگرتون و ئێستا پێم خۆشە بەراستی گوێتان لێ بگرم. ڕەنگە مەسەلەکە بۆ من کارێکی زەحمەت بێت و هەندێك جاریش سنوربەزێنم، بەڵام سورم لەسەر ئەوەی سەرکەوتن بەدەست بهێنم. من بەراستی ئێوەم بەلاوە گرنگە و دەمەوێت تێبگەم، داواشتان لێ دەکەم یارمەتیم بدەن". یەکێك لە پاشەکەوتە گەورەکان ئەوەیە مرۆڤ جەخت لە پاڵنەرەکانی خۆی بکاتەوە.

بەڵام ئەگەر دڵسۆز نەبویت باشتر وایە نەیکەیت. چونکە مەسەلەکە کرانەوەی لێ دەکەوێتەوە و هەمو بەربەستەکان لادەبات و ئەمەش لەوانەیە خراپ بەسەرتدا بشکێتەوە و زیانی گەورەت پێ بگەیەنێت ئەگەر بەرامبەرەکەت بۆی دەرکەوت کە تۆ مەسەلەکەت بەلاوە گرنگ نەبووە و نەتویستووە بەراستی تێبگەیت و مەبەستت تەنیا ئەوەبووە ئەو کەسە نهێنییەکانی خۆیت بۆ دەربخات و ناخی خۆی هەڵبماڵێت بۆ ئەوەی تۆ زیانی پێبگەیەنیت. تەکنیك، کە لوتکەی شاخە سەهۆڵەکەیە، پێویستە لەو بنکە فراوانەوە دەربچێت کە خەسڵەتە رەوشتییەکانی لەخۆی گرتووە. هەندێك کەس ڕەخنەی ئەوە لە گوێگرتنی هاوسۆزیی دەگرن کە کاتێکی زۆری دەوێت. لەراستیدا ئەم جۆرە گوێگرتنە لە سەرەتادا ڕەنگە کاتێکی زۆر ببات، بەڵام دواتر کاتێکی زۆر و زەبەندت بۆ دەگێڕێتەوە. تۆ ئەگەر پزیشك بیت مەزنترین کار کە بیکەیت و بتەوێت چارەسەرێکی سەرکەوتو دیاری بکەیت ئەوەیە کە نەخۆشییەکە بە وردی دەستنیشان بکەیت. کەس لێت قبوڵ ناکات بڵێیت "من زۆر پەلەمە کاکە، فریاناکەوم نەخۆشییەکە دەستنیشان بکەم. فەیناکە ئەم دەرمانە بخۆ."

بیرمە جارێکیان کە لە (ئۆهۆ) بوم لە هاوای، خەریکی شت نوسین بوم لە ژوورێکی فەراخ دەریادا و شەماڵێکی خۆشی هەبو. دوو پەنجەرەم کردەوە، یەکێکیان هی پێشەوەو یەکێك هی لاتەنیشتی ژوورەکە بۆ ئەوەی ئەو هەوا خۆشەم لێ بدات. سەرمێزەکەش کۆمەڵێك کاغەزی نوسراوی لەسەردانرابو کە بەش بەش ڕێکم خستبون.

لەپڕ شەماڵەکە بو بە ڕەشەبایەکی بەهێز و هەمو کاغەزەکە بابردی. ئای کە هەستێکی ناخۆش بو. کاغەزەکان هەمویان تێکەڵ بون و بۆ نەگبەتیش هەندێك لاپەڕە ژمارەیان نەخرابووە سەر. خێرا رامکرد فریای کاغەزەکان بکەوم. سودی نەبو. دواتر بۆم دەرکەوت باشتر وایە (ماوەی دە چرکە) کاتی خۆم تەرخان بکەم بچم یەکێك لە پەنجەرەکان دابخەم.

کەواتە راستە، گوێگرتنی هاوسۆزیی کاتی دەوێت، بەڵام هەرگیز و لە هیچ شوێنێك هێندەی ئەوکاتە نابێت کە گەڕانەوەو راستکردنەوەی خراپ لێك حاڵیبونەکان و هەڵکردن لەگەڵ گیروگرفتەکاندا دەیانەوێت. بیرت نەچێت هەڵسوکەوتکردنیش لەگەڵ ئەو ئەنجامانەی کە دابیننەکردنی بواری هەناسەپێدانی مەعنەوی دروستی دەکەن ئەویش کاتێکی زۆر و وزەیەکی زۆرت دەبات.

تۆ ئەگەر وریابیت و هاوسۆزانە گوێ لە بەرامبەرەکەت بگریت دەتوانیت زۆر بە خێرایی ناخی بەرامبەرەکەت بخوێنیتەوە و ببیتە جێگەی رەزامەندیشی و هێندە لێت تێبگات کە ئامادەبێت بۆت بکرێتەوە بۆ ئەوەی چین چین دەست بەریت و بگەیتە گەوهەرە ناسکەکەی قوڵایی ناخی ئەو، واتە بۆ ئەو شوێنەی کە کێشە راستەقینەکەی تیا حەشاردراوە.

مرۆڤ بە شێوەیەکی گشتی پێی خۆشە بەرامبەرەکەی لێی تێبگات. هەر سەرمایەگوزارییەکیش لەپێناوی ئەم مەبەستەدا بکرێت بە خەسار ناچێت، چونکە سوودەکانی لەرووی کاتەوە زۆر زۆرترە لەبەرئەوە بە وردی لە کێشەکان گەیشتویت و پاشەکەوتەکەش لە بانقی هەست و سۆزەکاندا هێندە گەورەیە کە تەواو نابێت.

## تێگەیشتن و دید و بۆچون

کە بە قوڵیی گوێ لە خەڵك بگریت، دەزانیت چەندین شێوازی جۆراوجۆری بۆچوون هەیە. جیاوازی لێکدانەوەو بۆچوونەکان کاریگەری زۆریان هەیە لەسەر خەڵکی کە هەوڵدەدەن پێکەوە کاربکەن و هەڵوێستی وایان دێتەرێ کە پشت بەیەکتر ببەستن. رەنگە تۆ ژنە گەنجەکە ببینیت و منیش خاتوونە پیرەکە و هەردوکیشمان بۆمان هەیە راست بین.

رەنگە تۆ لە چاویلکەیەکەوە تەماشای دنیا بکەیت کە هەر هاوسەرەکەت دەبینیت، بەڵام چاویلکەکەی من تەنیا هەر پارەو مەسەلە ئابورییەکانی بەلاوە گرنگ بێت.

رەنگە تۆ کەسێکی بەرچاو تێر بیت، بەڵام من یەکێکم لە بەرچاوتەنگەکان و رەنگە تۆ لە پارادیمی بەشی راستی مێشکەوە مامەڵە لەگەڵ کێشەکاندا بکەیت کە سەنتەری تێڕوانینە زەینییەکان و پێشبینی غەریزی و بەپیرۆز راگرتنی شتەکانە،

بەڵام من لە کۆمەڵەی نیوەی چەپدابم و لە گۆشەنیگای بەدواداهاتن و زمانەوانیەوە تەماشای کێشەکە بکەم.

رەنگە بۆچوونەکانی جیاوازی زۆریان لەنێواندا هەبێت. هەریەکەمان ساڵەهای ساڵ لەگەڵ پارادیمی تایبەتی خۆماندا دەژین و بەراستییەکی بێ ئەملاوئەولای دەزانین و گومان لە کەسایەتی و زیرەکی هەرکەسێکیش دەکەین کە ئەو راستیانە نابینن.

ئێستاش، سەرباری ئەو هەمو جیاوازییانە، هەوڵ دەدەین پێکەوە بین لە کاردا یاخود لە پرۆسەی هاوسەرگیریدا، یان لە پرۆژەیەکی خزمەتگوزاری گشتیدا و .. تاد.

دیارە سەرکەوتن لەو کارەدا وا پێویست دەکات سنوری بۆچوونە تاکەکەسییەکانی خۆمان تێبپەڕێنین و پەیوەندی قوڵو تۆکمە دروست بکەین بۆ ئەوەی بتوانین لە مەسەلەکاندا هاریکاریی یەکتری بکەین و بگەینە ئەو چارەسەرانەی کە بەرژەوەندی هەمو لایەکی تێدایە (براوە/ براوە).

بەدەستهێنانی ئەو هەمو مەبەست و ئامانجانە لە خووی پێنجەمدایە. ئەم خووە هەنگاوی یەکەمی براوە/ براوەیە.

تەنانەت ئەگەر (بە تایبەت ئەگەر) بەرامبەرەکەت سەر بەم پارادیمە نەبو، هەوڵبدە یەکەمجار تۆ تێی بگەیت.

ئەم پریسنیپە سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێنا لای بەڕێوەبەرێکی ئاشنا، کە ئەم چیرۆکەی بۆ گێڕامەوە:

"من لە کۆمپانیاییەکی بچوکدا کارم دەکرد کە کەوتبووە دانوستاندن لەگەڵ دەزگایەکی گەورەی بانقدا بەمەبەستی ئیمزاکردنی رێکەوتننامەیەك لەگەڵیدا. دەزگاکە دوو پارێزەری لە سانفرانسیسکۆ و نوێنەرێکی گەورەی لە (ئۆهایۆ) و کۆمەڵێك گەورە کارمەندی دیکەی لە بانقەکەوە ناردو بە هەمویان وەفدێکی هەشت کەسییان دروست کرد. کۆمپانیاکەی منیش پێشوەخت بڕیاری دابو پرنسیپەکە ئەوەبێت کە یان هەردولا براوە-براوە بن یان هیچ رێکەوتنێکیان لەگەڵدا ئیمزا ناکەن، کۆمپانیاکەی ئێمە بە راستی دەیویست هەم ئاستی جۆری بەرهەم بەرزبکاتەوە هەم نرخەکەشی، بەڵام داواکارییەکانی ئەو دەزگا داراییە گەورەیە نیگەرانییەکی زۆری دروست کردبو."

"سەرۆکی کۆمپانیاکەمان، سەرەتای دانوستاندنەکەی ئەوەبو کە وتی: ئێمە پێمان خۆشە ئێوە خۆتان ڕێکەوتنەکە بنوسن بەو شێوەیەی کە دەتانەوێت تا بتوانن بە باشی لە داواکارییەکانتان تێبگەن و بزانن بایەخ دەدەن بە چی. کە ئێمە وەڵامی هەمویان دەدەینەوە، پاشان دەربارەی نرخەکان گفتوگۆ دەکەین."

بەمە دانوستاندنکەرەکەی بەرامبەر واقیان وڕماو پێیان سەیربو کە فرسەتیان دراوەتێ گرێبەستەکە بنوسن. ئەم گرێبەستە سێ ڕۆژی پێچوو.

کاتێکیش گرێبەستەکەیان نیشان داین سەرۆکەکەمان پێی وتن: ئێستا ڕێگەمان بدەن با تێبگەین بزانین چیتان دەوێت. ئینجا کەوتە خوێندنەوەی گرێبەستەکە و ناوەڕۆکەکەی بە شێوازی خۆی دارشتەوە. لە گۆشەنیگای سۆز و هەستی تیمی بەرامبەرەوە. پاشان ئەویش و ئەوانیش زانییان چی بەلایانەوە گرنگە (بەڵێ ئەمە راستە- نەخێر مەبەستەکەمان ئەمە نییە. بەڵێ ئێستا مەبەستەکە تێگەیشتم.)

"کاتێکیش بە قوڵی لە گۆشەنیگاکەی ئەوان حاڵی بو، دەستی کرد بە رونکردنەوەی گۆشەنیگاو پارادیمەکەی خۆی و ئەوانیش گوێیان لێ گرت. ئامادەی گوێگرتن بوون. هیچ شتێك نەبو بۆنی خۆسەپاندنی لێ بکرێت. ئەو کەش و هەوایەی کە لەسەرەتادا زۆر فەرمی دەرکەوت و کەمترین متمانە و باوەڕپێکردنی پێوە دیاربو، بگرە تەنانەت دوژمنکارانەش بو، گۆڕدرا بە ژینگەیەکی بەپیت و بەرەکەتی هاوکاریکردنی یەکتری. کە گفتوگۆکانیش کۆتاییان هات، تیمەکەی بەرامبەرمان رایگەیاند: "ئێمە دەمانەوێت کارتان لەگەڵدا بکەین و پێمان خۆشە گرێبەستەکە ئیمزا بکرێت. بەس پێمان بڵێن چ نرخێکتان پێ باشە با پەسندی بکەین."

## ئینجا .. هەوڵ بدە تێت بگەن

هەوڵبدە یەکەمجار تۆ تێبگەیت .. بۆ ئەوەی بە ئاسانی تێت بگەن. زانینی ئەوەی چۆن وابکەیت تێت بگەن بەشی دووەمی خووی پێنجەم پێك دەهێنێت و هێندەی بەشی یەکەمیش گرنگە لە بەدەستهێنانی ئەنجامی براوە-براوەدا. پێشتر ئێمە پێناسەی کامڵبونمان کردو وتمان کامڵبون بریتییە لە هاوسەنگی نێوان ئازایەتی و ڕێزگرتنی هەستی بەرامبەردا. ئەگەر بتەوێت تێبگەیت پێویستت بە تەگبیرو بە ڕێزگرتنی هەستی بەرامبەرەکەتە. ئەگەر بشتەوێت خەڵکەکە لێت

تێبگەن پێویستە ئازابیت. گەیشتن بە ئەنجامی براوە- براوە و بەدەستهێنانی سودی هەموان پێویستی بە ئاستێکی بەرزی هەردوو خەسڵەتەکە هەیە. لەبەر ئەوە زۆر گرنگە بۆ ئێمە کە خەڵکەکە لێمان تێبگات بەتایبەت لەو هەڵوێستانەدا کە پێویست دەکەن لەگەڵ دەوروبەردا متمانەمان بە یەکتری هەبێت.

لە گریکی کۆندا فەلسەفەیەکی جوان هەبو کە لە سێ وشەدا کورت کرابۆوە. وشەکان بە شێوەیەکی مەنهەجی ریزکراون و بریتین لە ئیثۆس، پاثۆس و لۆگۆس.

(ئیثۆس ethos) واتە متمانەی دەوروبەر، بریتییە لە ناوبانگی تایبەتی تۆ، لەو باوەڕەی کە خەڵکەکە هەیەتی بە شارەزایی و سەرراستیت. ئەو متمانەیە کە ئیلهامبەخشەکەی تۆیت، پاشەکەوتکردنە لە بانقی هەستو سۆزەکاندا. وشەی (پاثۆس pathos) واتە هاوسۆزیی. واتە لایەنی هەست و دڵنیایی. واتە تۆ هاوئاهەنگ و گونجاویت لەگەڵ ئەو تەوژمە سۆزدارەی کە پەیوەندی کەسەکەی بەرامبەرت هەڵی گرتووە. وشەی (لۆگۆس logos) واتە ئەقڵ و مەبەست لێی لۆجیکە، بەشە ئەقلانییەکەی نمایشەکە پێك دەهێنێت.

تکایە سەرنج لە ریزبەندی وشەکان بدە، متمانەی خەڵکەکە، هاوسۆزیی، ئەقڵ، واتە کەسایەتیت، پەیوەندییەکانت، ئینجا ئەو لۆجیکەی کە خۆنمایشکردنەکەت دەفەلسەفێنێت. دیارە ئەمەش وەرچەرخانێکی گەورەی پارادیم دروست دەکات. زۆربەمان کە بمانەوێت رەزامەندیی بەرامبەرەکەمان لەسەر مەسەلەیەك بەدەست بهێنین یەکسەر پەنا دەبەین بۆ ئەقڵ، بۆ لۆجیکی بەشی چەپی مێشك. واتە بێ ئەوەی سەرەتا هیچ بایەخێك بە متمانەی کۆمەڵ و بە هاوسۆزیی بدەن هەوڵ دەدەن لەڕێی لۆجیکەوە بەرامبەرەکەیان قەناعەت پێبهێنن.

برادەرێك دەناسم خراپ تێك شکابو چونکە وای هەست دەکرد لێپرسراوەکەی کەسێکی داخراوە و لە سەرکردایەتیکردندا شێوازێکی زۆر بێکەڵك پەیرەو دەکات.

لێی پرسیم: "نازانم بۆچی هیچ ناکات؟! چەندین جار باسی ئەم مەسەلەیەم بۆ کردووە و زۆر چاك لێی ئاگادارە، کەچی هیچ شتێك ناکات"

پێم وت: " ئەی بۆچی تۆ خۆت نمایشێکی کاریگەر پێشکەش ناکەیت؟"

"کردم"

"لای تۆ کاریگەر یەعنی چی؟ کە نوێنەرەکەی بەشی فرۆشتن شکست دەهێنێت،

بۆ جاری دووهەم کێ دەنێرنەوە؟ کڕیارەکە؟ کاریگەر بە شتێك دەوترێت کە سەرکەوتن بەدەست بهێنێت و کارەکە ئەنجام بدات. بریتییە لە بەرهەم و توانای بەرهەمهێنان (ب/ت ب) ئایا تۆ ئەو گۆڕانەت خولقاندووە کە مەبەستت بووە؟ ئایا لەو پرۆسەیەدا پەیوەندییەکت دروست کردووە؟ دەرەنجامی کارو نمابشەکانت چی بوون؟"

"پێم وتیت ئەو هیچ شتێك ناکات – گوێ ناگرێت"

"کەواتە پێویستە نمایشێکی کاریگەر ئەنجام بدەیت .. دەبوایە بچویتایەتە ناو قوڵایی سەرییەوە. پێویست بو چوارچێوەی ئەقڵی تێپەڕێنیت و بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا راوبۆچونی خۆتت بۆ دەربڕیایە و لە خۆی باشتر ئەو ئەڵتەرناتیڤەت بۆ باس بکردایە کە پشتیوانی لێ دەکات.

ئەمە رەنگە پێویستی بە کارو خۆماندوکردنی زیاتر هەبێت .. ئایا ئامادەیت

"ئینجا بۆ بیکەم؟ من چ مەجبورم؟"

"کەواتە تۆ دەتەوێت کابرا بە تەواوی شێوازی سەرکردایەتیکردنەکەی بگۆڕێت بەڵام خۆت ئامادەییت تیا نییە شێوازی دەرخستنی دۆخەکەت بگۆڕیت؟"

"وابزانم وایە"

"زۆرباشە .. بە سنگفراوانییەوە دۆخەکە قبوڵ بکەو لەگەڵیدا بژی"

"ناتوانم بژیم لەگەڵیدا .. بۆ من جوان نییە"

"زۆرچاکە، کەواتە دەستپێشخەری بکەو کاریگەرانە دۆخەکەی بۆ باس بکە. ئەمە کارێکە لە سنوری دەوروتەئسیری خۆتدا"

لە ئەنجامدا ئاشناکەم نەیتوانی شتی وابکات چونکە پێی وابو سەرمایەگوزارییکردنەکە لەو مەسەلەیەدا شتێکە گەورەتر لە تواناکانی ئەو.

ناسیاوێکی دیکەشم، کە مامۆستای زانکۆبو، کێشەیەکی لەوجۆرەی هەبو. بەڵام ئەو حەزی دەکرد و ئامادەیی تیابو خەرجییەکەی بگرێتە ئەستۆ. رۆژێکیان پێی وتم چی بکەم ستیڤن؟ زانکۆ ئامادە نییە پارەی ئەو لێکۆڵینەوەیە بدات کە خەریکیم چونکە لێکۆڵینەوەکە لەگەڵ ئەو هێڵە سەرەکییەدا ناگونجێت کە سەرۆکایەتی زانکۆ پەیڕەوی دەکات.

پاش گفتوگۆیەکی دوورودرێژ، پێشنیارم بۆ کرد لەڕێی بەکارهێنانی متمانە و هاوسۆزیی و لۆجیکەوە نمایشێکی کاریگەر پێشکەش بکات.

پێم وت: من دەزانم تۆ چەند دڵسۆزیت و دڵنیاشم لێکۆڵینەوەکەت دەرەنجامی مەزنی لێ دەکەوێتەوە. هەوڵبدە لە خۆیان باشتر ئەو ئەلتەرناتیڤە روون بکەیتەوە کە سەرۆکایەتی زانکۆ پشتیوانی لێ دەکات و بۆیان بسەلمێنە کە تۆ چاک تێیان گەیشتویت. پاشان بۆیان روون بکەرەوە کە ئەو داواکارییەی تۆ چۆن لۆجیکێکی تیایە.

"زۆرباشە، هەوڵ دەدەم"

"پێت خۆشە پێکەوە مەشقی لەسەر بکەین؟"

ئامادەیی نیشان دا و هەمو رێوشوێنە پێویستەکانمان گرتەبەر. لەسەرەتای باسکردنی بیرۆکەکەیدا وتی:

"یەکەمجار تکایە رێگەم بدەن بزانم من تێگەیشتووم لەوەی کە ئێوە ئامانجەکەتان چییە و نیگەرانییەکانتان دەربارەی پێشنیارەکانی من بریتین لە چی؟"

ئیتر لەسەرخۆ و وردە وردە کەوتە روونکردنەوە و لەکاتی نمایشکردنی بۆچوونەکانیدا رێز و تێگەیشتنێکی قوڵی نیشان دەدا سەبارەت بە بیروبۆچونەکانی ئەوان. یەکێك لە مامۆستا گەورەکان سەری لە مامۆستایەکی دیکە نزیك کردەوە و چەند جارێك سەریان بۆ یەکتری لەقاند، پاشان بە ئاشناکەمیان وت: پیرۆزە، رەزامەندیت وەرگرت.

کەواتە مرۆڤ ئەگەر بتوانێت بیروبۆچوونەکانی بە روونی و دیاریکراوی و بەرجەستەکراوی دەرببڕێت وە لەوانەش گرنگتر – لە سیاقی پارادیم و بایەخەکانی ئەواندا گوزارشت لە دیدو تێڕوانینەکانی بکات - دەتوانێت تا ئەندازەیەکی چاك متمانەی خۆی بەرز بکاتەوە.

مرۆڤ بونەوەرێك نییە گیرۆدەی (تایبەتمەندییەکانی) خۆی بوبێت و تەنیا هەر دەربڕی ناخی خۆی بێت بە شێوەیەکی رەقوتەق، بەڵکو بونەوەرێکە دەتوانێت بەراستی لە شتەکان تێبگات. ئەوەی کە دەیڵێت رەنگە جیاوازبێت لەوەی کە تۆزێك لەمەوپێش باوەڕی پێی بووە چونکە لەکاتی هەوڵدانتدا بۆ تێگەیشتن، زانیاری دیکەت دەستکەوتووە.

خووی پێنجەم وا لە مرۆڤ دەکات وردتر و سەرڕاستتر بێت. خەڵکەکە ئەمە دەزانن و دەشزانن کە تۆ کاتێك گوزارشت لە ناخی خۆت دەکەیت و ڕێز و پێزانینیش بۆ هەمو دیدو بۆچونەکان و ڕاستییەکانی دیکە دادەنێیت، کارێکە سودی هەموان مسۆگەر دەکات و ئەنجامی براوە- براوەی تێدا دابین دەکرێت.

## هەنگاو بە هەنگاو

خووی پێنجەم بۆیە بەهێزە چونکە لەناوجەرگەی بازنەی دەوروتەئسیری خۆتدایە. لە پەیوەندیەکانماندا لەگەڵ دەوروبەردا کە متمانە بە یەکترکردنیان تیا پێویستە، کۆمەڵێك هۆکار هەن لە بازنەی ئەو شتانەدا کە مایەی بایەخی ئێمەن — کێشەکان، بارودۆخەکان و ڕەفتاری خەڵکی و ڕێکنەکەوتنەکان چەند نمونەیەکن لەوانە. مرۆڤ ئەگەر زۆر جەختیان بخاتە سەرو خۆیان پێوە خەریك بکات، ئەوا وزەیەکی زۆریان تیا خەسار دەکات بێ ئەوەی ئەنجامی گەورەی باشیان لێ بەدەست بهێنێت. بەڵام تۆ دەتوانیت یەکەمجار هەوڵ بدەیت خۆت تێبگەیت. ئەمە کارێکە لەژێری کۆنترۆڵی خۆتدایە .. تۆ کە ئەم کارە دەکەیت و کە فۆکەس دەخەیتە سەر بازنەی دەوروتەئسیریت، لەراستیدا کارێك دەکەیت بە قوڵی لە خەڵکەکە تێبگەیت. ئینجا ئیتر زانیارییە ڕاستەکانت دەستگیر دەبێت و دەگەیتە کرۆکی مەسەلەکان و پاشەکەوتی بانقی هەست و سۆزەکانت زیاتر دەبێت و ئەو ئۆکسجینە دەرونییەیان پێ دەبەخشیت کە پێویستیانە بۆ ئەوەی پێکەوە چالاکانە کاربکەن.

ئەمە نزیکبونەوەیەکە لەناوەوە بۆ دەرەوە. کە ئەم کارە دەکەیت سەرنج بدە بزانە بازنەی کاریگەرییەکانت چی بەسەر دێت. تۆ کە بەراستی گوێت لەبەرامبەرەکەت گرت کاریگەریشت لەسەری زیاتر دەبێت. ئەمە وا دەکات کاریگەریت لەسەر خەڵکی دیکەش زیاتر ببێت. بازنەکەت فراوان و فراوانتر دەبێت. دواتر وات لێ دێت کاریگەری زیاترت هەبێت لەسەر ئەو بابەتانەی کە دەکەونە ناو بازنەی بایەخەکانت. تەنانەت خودی خۆیشت گۆڕانت بەسەردا دێت. هەتا زیاتر لە بەرامبەرەکەت تێبگەیت، زیاتر ڕێزی دەگریت و زیاتر بایەخی پێ دەدەیت کە تۆ بەر ڕۆحی مرۆڤێکی دیکە دەکەویت وەك ئەوە وایە بەسەر زەوییەکی پیرۆزدا بڕۆیت.

خووی پێنج، شتێکە هەر ئێستا دەتوانیت پەیڕەوی بکەیت. ئیتر کە ویستت پەیوەندی بە کەسێکەوە بکەیت مەسەلە تایبەتەکانی خۆت و ژیاننامەی خۆت بخەرە ئەولاوە. دڵسۆزانە هەوڵبدە لێی تێبگەیت. ئەمە پەیڕەو بکە تەنانەت ئەگەر بەرامبەرەکەت نەیویست کێشەکانی خۆیت بۆ باس بکات، تۆ هەر دەتوانیت هاوسۆز بیت. دەتوانیت هەست بە ناخ و رۆح و دڵی بکەیت و ئەم هەستەش بە رستەیەك دەربېڕیت بڵێیت تۆ ئەمڕۆ لە باش ناچیت. رەنگە ئەو هیچ نەڵێت. قەی چێکا!! گرنگ ئەوەیە تۆ رێز و هاوسۆزیت بەرامبەری دەربڕی.

پەلەمەکە. پشوو درێژبە و تا دەتوانیت رێزی بەرامبەرەکەت بگرە. کەس کاردانەوەی باش بەرامبەر قسەکانت دەرنابڕێت هەتا تۆ هاوسۆزی نەنوێنیت: تۆ دەتوانیت بە درێژایی رۆژەکە، بە هەڵسوکەوتی خۆت، هاوسۆزییان لەگەڵدا بنوێنیت. پێویستە زیرەك و هەستیار و وریابیت و لەکاتی پێویستیشدا واز لە تایبەتمەندێتی و ژیاننامە تایبەتەکەی خۆت بهێنیت.

خۆ ئەگەر کاردانەوە ئەرێنییەکەت لە پلەیەکی بەرزدابو دەتوانیت رێ لە سەرهەڵدانی کێشەکانیش بگریت و پێویست نەکات چاوەڕێ بیت منداڵەکەت لە خوێندندا فلانە کێشەی بێتەڕێ یاخود خۆت لە پیشەکەدا فیسارە تەنگو چەڵەمەت رووبەروو ببێتەوە، ئینجا هەوڵبدەیت تێبگەیت.

لە ئێستاوە کاتی گونجاو تەرخان بکە بۆ ئەوەی لەگەڵ منداڵەکانتدا بیت، یەك یەك .. گوێیان لێ بگرەو تێیان بگە. تەماشای ماڵەکەت بکە، تەماشای ژیانی ناو خوێندنیان بکەو بزانە چ کێشەو ململانێییەکیان هەیە. لە چاوی ئەوانەوە هەمو شتەکان ببینە. ژمارە حسابی بانقی هەستو سۆزیان لەگەڵدا بکەرەوە، ئۆکسجینی مەعنەوییان پێ ببەخشە.

هەمو جارێك لە کاتێکی دیاریکراودا لەگەڵ هاوسەرەکەتدا بچۆرە دەرەوە. نانی ئێوارەی لەگەڵدا بخۆ یان دووقۆڵی خۆتان سەرگەرمی کارێك بکەن کە چێژی لێ دەبینن. گوێ لە یەکتری بگرن و هەوڵی لێکتێگەیشتن بدەن. لەچاوی یەکترییەوە ژیان ببینن.

من ئەوکاتەی کە رۆژانە لەگەڵ (ساندرا)ی هاوسەرمدا بەسەری دەبەم بە هیچ شتێکی ئەم دنیایەی ناگۆڕمەوە. ئێمە جگە لەوەی کە هەوڵ دەدەین لەیەکتری

تێبگەین، لەهەمان كاتیشدا هاوسۆزانە گوێ لەیەكتری دەگرین بۆ ئەوەی پەیوەندی باشتر لەگەڵ منداڵەكانماندا دروست بكەین.

زۆرجار دیدو بۆچونی جیاوازی خۆمان دەربارەی مەسەلەكان دەردەبڕین و هەوڵ دەدەین ڕێگە چارەی باشتر بۆ ئەو كێشانە بدۆزینەوە كە لەنێوان ئەندامانی خێزانەكەماندا سەرهەڵدەدەن.

بۆ نمونە من ڕۆڵی كوڕەكەم یاخود كچەكەم دەبینم و داوا دەكەم لە مەسەلەیەكی دیاریكراودا ئیمتیازێكی تایبەتم بدرێتێ بێ ئەوەی ئەركی بەرپرسیارێتییەكی بنەڕەتی ناو خێزانەكە بگرمە ئەستۆ، ساندراش ڕۆڵی خۆی دەبینێت..

مەسەلەكە چەندین جار دێنین و دەبەین و ئەوپەڕی هەوڵی خۆمان دەخەینە گەڕ بۆ ئەوەی هەڵوێستەكە بە چاكی ببینین تا بتوانین لە ڕوانگەی بنەماكانەوە منداڵەكانمان چاك پەروەردە بكەین. هەندێك لەو ڕۆڵانەی كە دەیابینین و لە هەمویان سەركەوتترن، ئەوانەن كە بە دیمەنێكی سەخت و دژواری رابردودا دەچینەوە، ئەو دیمەنانەی كە یەكێكمان تەقاندویەتییەوە.

بڕی ئەو كاتەی كە تۆ سەرمایەگوزاری دەكەیت لەپێناوی تێگەیشتنی قوڵ لە خۆشەویستەكانت دەستكەوتی گەلێك زۆر دابین دەكات بۆ پەیوەندییە كراوەكان. زۆربەی ئەو كێشەو گیروگرفتانەی كە ڕووبەڕووی هاوسەرگیرییەكان و خێزانەكان دەبنەوە سەرچاوەكەی ئەوەیە كە فریا ناكەون بە تەواوی پێبگەن و دەم بكێشن، چونكە پەیوەندییەكە دەگاتە ئاستێك لە كراوەنەو ڕاشكاوییدا كە كێشە دەرنەكەوتووەكان لە قۆناغی مەلۆتكەییدا لەناو دەبات. هەروەها بانقی هەستو سۆزەكەش بایی ئەوە پاشەكەوتی تێدایە كە بتوانێت چارەسەری هەركێشەیەك بكات كە بیەوێت سەرهەڵبدات.

لە بواری كاركردنیشدا ئەم پرنسیپە شتێكی ڕاست و پێویستە. تۆ دەتوانیت ناوبەناو كاتێك تەرخان بكەیت و بیبەخشیت بە كارمەندەكانت بۆ ئەوەی گوێیان لێ بگریت و تێیان بگەیت. سیستمێكی ڕێكوپێك و زانستی پەیڕەو بكە بۆ ژماردنی سەرچاوە مرۆییەكان و زانیاری دەربارەی خاوەن پشكەكان لە بواری كارەكەتدا بۆ ئەوەی فیدباكی وردو ڕاستت هەبێت دەربارەی كارمەندو كڕیار و هاوكارەكان. كارێك بكە كە لایەنی (مرۆڤ) هەر وەك لایە تەكنیكی و داراییەكان گرنگ بێت. تۆ بەم

کارەت هەم کاتێکی زۆر و هەم وزە و بودجەیەکی زۆر دەگێڕێتەوە بۆ بەرکەماڵکردنی پەیوەندی گونجاو بە سەرچاوە مرۆییەکانەوە لە هەمو ئاستە جۆراوجۆرەکانی کاردا. مرۆڤ بە گوێگرتن فێر دەبێت و ئۆکسجینێکی مەعنەوی زۆرچاکیش دەبەخشێت بە هاوکارەکانی. ئەم جۆرە رەفتار و مامەڵەیە وا لە بەرامبەرەکەت دەکات ببێتە لایەنگر و پشتیوانی تۆ و زۆر بە ئاشکرا ئەو دەستکەوتە ماددیانە تێپەڕێنێت کە پێی دەوترێت (هەشت بەرامبەر بە پێنج) و بۆ کارمەندێتی شتێکی پێویستە.

یەکەمجار هەوڵبدە خۆت تێبگەیت. رێ لە سەرهەڵدانی کێشە بگرەو خۆت دەستپێشخەری بنوێنە. تکایە پێش ئەوە دۆخەکە هەڵبسەنگێنرێت و دەست بکەیت بە دیاریکردنی چارەسەر و پێش ئەوەی هیچ رایەکی خۆت دەرببڕیت، هەوڵبدە سەرەتا خۆت فێرببیت. ئەمە هۆیەکی زۆر گرنگ و بایەخدارە لە بواری هاوکاری کردنی ئەوانی دیکەدا.

من و تۆ ئەگەر بەراستی و بە قوڵی یەکتریمان ناسی، ئەوا دەرگا بەروی چارەسەرە خولقێنەرەکان و سێ ئەڵتەرناتیڤەکەدا دەکەینەوە. هەروەها ناکۆکی و جیاوازییەکانیشمان نابنە کۆسپ و تەگەرەی سەر رێگەی پەیوەندی پێشکەوتن. بەڵکو لەبری ئەوانە، دەبنە بەردەبازی سەررێی سەرکەوتنمان.

## چەند پێشنیارێك بۆ جێبەجێکردن

١. یەکێك لەو پەیوەندییانە هەڵبژێرە کە هەست دەکەیت پاشەکەوتی لە بانقە سۆزدارییەکەدا زۆرخراپە. هەوڵبدە تێبگەیت و ئینجا مەسەلەکە لە گۆشەنیگای کەسەکەی بەرامبەرتەوە بنوسە. دواتر لە یەکەمین پەیوەندیدا گوێ بگرە بۆ ئەوەی تێبگەیت. قسەکانی کە دەیانبیستیت بەراوردیان بکە بەوانەی نوسیوتن. ئایا بۆچوونەکانت تا چەند راست نەبون؟ ئایا بەراستی دیدو بۆچونی بەرامبەرەکەت تێگەیشتویت.

٢. لەگەڵ کەسێکی نزیك و متمانەپێکراوی خۆتدا هەوڵی هاوسۆزی و قوڵبونەوە بدە. پێی رابگەیەنە کە تۆ دەتەوێت ئەزمونی گوێگرتنی راستەقینە لە خەڵك تاقی بکەیتەوە و داوای لێ بکە تێبینییەکانی خۆیت لە ماوەی حەفتەیەکدا پێبگەیەنێت.

ئایا ئەم کارەت ئەنجامەکەی چۆن بو؟ چ جۆرە کاریگەرییەکی لەسەر هەست و سۆزی ئەو کەسە بەجێ هێشت.

٣. لە نزیکترین فرسەتدا ئەگەر بۆت هەلکەوت چاودێری دووکەس بکەیت خەریکی پەیوەندی و گفتوگۆبون، ماوەی چەند خولەکێك توند دەست بنێ بە گوێچکەتەوە و تەنیا هەر تەماشا بکە. ئایا تۆ چی لە دۆخەکە حاڵی بویت و ئەو شتانە چی بون کە تێیان گەیشتیت بێ ئەوەی گوێت لە قسەکان بێت (ئەو هەستو سۆزانەی کە تەنیا هەر بە قسە ناگوێزرێنەوە.)

٤. ئەمجارە ئەگەر هەستت کرد سەرگەرمی ئەو جۆرە پەیوەندییەیت کە ژیاننامەو تایبەتمەندییەکانی خۆتی تیا بەکاردەهێنیت و خەریکی لێکۆڵینەوە یاخود هەڵسەنگاندن یاخود ئامۆژگاری یاخود لێکدانەوەیت هەوڵبدە خێرا هەڵوێستەکە بگۆڕەو لەڕێی ددانپیانان و داواکردنی لێبوردنەوە بیکەیت بە پاشەکەوتێك و بڵێ: (ببورە). ئا ئێستا بۆم دەرکەوت کە نەمویستوە تێبگەم .. ئایا دەتوانین سەرلەنوێ دەست پێبکەینەوە؟

٥. با نمایشکردنەی داهاتوت (پێشکەشکردنەکەت) لەسەر بناغەی هاوسۆزی بێت. گۆشەنیگای بەرامبەرەکەت وەکو خودی کەسەکەو یان باشتر لەو روون بکەرەوە. ئینجا هەوڵ بدە ئەویش وەکو خۆی لە تۆ تێبگات.

## خووی شەشەم

# یەکتر تەواو کردن



## پرنسیپەکانی هاوکاریی داهێنەرانە

**من ڕێنمایی خۆم لە دوعای پیاوچاکانەوە وەردەگرم**
**یەکێتی لە هەڵوێستە دژوارەکاندا**
**هەمەڕەنگی لە هەڵوێستە گرنگەکاندا**
**بەخشندەیی لە هەمو هەڵوێستەکاندا**

**- بەشێك لە وتەکانی (جۆرج بوش)**
**سەرۆکی ئەمریکا لەکاتی دەستبەکاربونیدا**

کاتێك کە (وینستۆن چرچڵ) بانگهێشت کرا ئەرکی سەرۆکایەتیکردنی چالاکییە جەنگییەکانی بریتانیای مەزن لەئەستۆ بگرێت، رایگەیاند وتی: من هەمو ژیانم تەنیا بۆ ئەم سەعاتەی ئامادەکردووم. بەهەمان واتاش دەتوانین بڵێین کە پەیڕەوکردنی تێکڕای خووەکانی دیکە بۆ ئەوە ئامادەمان دەکات کە هاوکاری خوڵقێنەرانە بنوێنین و لەگەڵ خەڵکیدا یەکتری تەواو بکەین.

مرۆڤ ئەگەر بەرامبەرەکەی بەراستی تێی گەیشتبێت ئەوا هاوکاریکردن مەزنترینی هەمو چالاکییەکانە لە ژیانیدا، چونکە تاقیکردنەوە و گوزارشتکردنی راستەقینەی هەمو خووەکانی دیکەیە پێکەوە.

شێوە هەرە باڵاکانی هاوکاریکردن، هەرچوار بەهرەکانی مرۆڤ و پاڵنەرەکانی شێوازی براوە — براوە .. و شارەزاییەکانی بواری پەیوەندیی سۆزداریش دەردەخات لە ئاست ناخۆشترین و قورسترین ململانێدا کە لە ژیاندا دێتەڕێت. بەرهەمی ئەم هاوکارییە شتێکە وەکو موعجیزە. مرۆڤ لەڕێی ئەم خووەوە ئەلتەرناتیڤی گونجاو دەخوڵقێنێت. شتێك کە لەوەوپێش نەبووە.

هاوکاریکردنی خوڵقێنەرانە گەوهەری ئەو جۆرە سەرکردایەتیکردنەیە کە پشت بە پریسنیپەکان دەبەستێت و دەیانکاتە سەنتەری خۆی. گەوهەری باوکایەتیکردن و دایکایەتیکردنێکە پرنسیپەکان سەنتەری بن. ئەم هاوکاریکردنە مەزنترین توانا شاراوەکانی مرۆڤ دەبزوێنێت و یەکیان دەخات و دەیانتەقێنێتەوە و تێکڕای هەمو

خووەکانی دیکە کە پێشتر رونمان کردنەوە، ئامادەمان دەکەن بۆ ئەوەی لە موعجیزەی ئەم جۆرە هاوکارییەدا (هاوکاریی خوڵقێنەر) داهێنان بکەین. یەکتر تەواوکردن (هاوکاری خوڵقێنەر) چیە؟ ئاسانترین پێناسە ئەوەیە کە (هەمو گەورەترە لە کۆی گشتی پارچەکانی. واتا ئەو پەیوەندییەی کە بەشەکان پێکەوە هەیانە بەشێکە لە خۆیان و بۆ خۆیان. ئەم پەیوەندیە تەنیا هەر بەشێك نیە و بەس، بەڵکو هاندەرترین و وزەبەخشترین و بزوێنترین و سەرنجراکێشترین بەشەو لە هەموشیان زیاتر بەشەکان پێکەوە دەبەستێت و دەیانکات بە یەك.

پرۆسەی داهێنان، جگە لەمانەش، ترسناکترین بەشە، چونکە کەس بە وردی نازانێت لەئەنجامدا چی روودەدات و مەسەلەکە دەگاتە کوێ. کەس نازانێت ئەو هەڕەشە و ململانێ تازانە چین کە دێنە رێێ. مرۆڤ بۆ ئەوەی بتوانێت بە گیانێکی سەرنجراکێشانەوە دەست پێبکات، گیانی داهێنان و دۆزینەوەی شتە نەزانراوەکان، پێویستی بەوەیە لە ناخی خۆیدا زۆر زۆر هەست بە ئاسایش و ئارامی بکات .. بێگومان ئەمەش وا دەخوازێت کە ناوچە ئیسراحەتەکەی ژیانی خۆت جێبهێڵێت و رووبکەیتە جیهانێکی تەواو نەزانراو و کێویی نوێ. دەبیتە پێشەنگ و سەرقافڵەی کاروانی رێی نەزانراوەکان. بواری نوێ و کیشوەری نوێ و ئەگەری نوێت بەروودا دەکرێنەوە بۆ ئەوەی خەڵکی دیکە شوێنت بکەون.

ئەم جۆرە هاوکاریە لە هەمو شوێنێکی سروشتدا هەیە .. تۆ ئەگەر دوو رووەك لە نزیك یەکترییەوە بڕوێنیت ئەوا رەگەکانیان تێکەڵی یەکتری دەبن و خاکەکەش لەرووی چۆنایەتییەوە چاکتر دەبێت بە جۆرێکی وا کە هەردوو رووەکەکە باشتر گەشە دەکەن لەوەی کە ئەگەر هەریەکەیانت بە تەنیا بڕواندایە. بەهەمان شێوەش ئەگەر دوو پارچە تەختە پێکەوە ببەستین بەرگەی کێشی زیاتر دەگرن وەك لەوەی بە تەنیا بونایە. (هەمو) گەورەترە لەکۆی گشتی پارچەکانی. یەك زائید یەك دەکاتە سێ و بگرە زیاتریش. گرنگ ئەوەیە ئێمە بتوانین پرنسیپەکانی هاوکاریی خوڵقێنەر، کە لە سروشتەوە فێریان دەبین، لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا جێبەجێ و پەیڕەو بکەین. ژیانی ناو خێزان سەرچاوەیەکی باشە چەندین نمونەی ئەم جۆرە هاودەستییەی لێوە فێر ببین. ئەو رێگەیەی کە ژن و پیاو منالی پێ دەهێننە دنیاوە هاوکارییەکی خوڵقێنەرە. یەکترتەواوکردن لە ناوەڕۆکدا بریتییە لە

نرخانـدن و رێزگرتنـی جیاوازییـەكان و بـریتـیـە لـە جەختكردنـە سـەر خاڵـە بەهێزەكان و قەرەبوكردنی خاڵە لاوازەكان.

دیـارە ئێمـە هـەمومان بایـەخی جیاوازییـە جەسـتەییەكانی نێـوان ژن و پیـاو دەزانین، بەڵام ئایا بەهەمان شێوەش ئاگادارین لـە جیاوازییـە كۆمەڵایـەتی و ئـەقڵی و عاتیقییەكانی نێوانیـان؟ ئایـا ئـەم جیاوازییانـە نـاتوانن ببنـە سەرچاوەی داهێنـان بـۆ شـێوازی نـوێ و سەرنجڕاكێشـی ژیـان بـۆ خوڵقانـدنی ژینگەیـەكی وا كـە بەڕاسـتی رەچاوی رێز لەخۆگرتن بكات و هەموانیشی پێ قایـل بـبن و بـواری سـەربەخۆبون بـۆ هـەمو كەسـێك بخوڵقێنێـت لـە روانگـەی پشـت بەخۆبەسـتنەوە و پاشـانیش وردە بگەنـە ئاسـتی هاوكـاریكردنی یـەكتری بـە شـێوازێكی خوڵقێنـەر. ئایـا ئـەم جـۆرە یەكترتەواوكردنـە ناتوانێـت ببێتـە دەسـتورێكی ژیـان بـۆ نـەوەكانی داهـاتوو ــ دەسـتورێك كـە زیـاتر پابەنـدی خزمـەتكردن و بەشـداریپێكردن بێـت و كـەمتر خۆپەسەندو موحافیزكارانە و دوژمنكارانە و سیاسی بێت. زیاتر بەخشش و متمانـە دروست بكات و كراوەتـر بێـت. كـەمتر لـەبیری پـاوانكردن و حوكمدەركردنـدا بێـت و زیاتر شایستەی خۆشەویستی بێت و مەسەلەكان بەهەند وەربگرێت.

## پەیوەندی هاوكارانە

مرۆڤ كاتێك كە بـە شێوەیەكی هاوكارانـە پەیوەنـدی دروست دەكات لەراسـتیدا مێشك و دڵ و گوزارشتەكانی روخساری دەكاتەوە بەرووی ئەگەری نوێ و هەڵبژاردە و ئەڵتەرناتیڤی نوێدا. ئەم كارە بە رواڵەت وادەردەكەوێت كە پەراوێزخستنی خووی ژمارە دوو بێت (كە دەستت پێكرد با كۆتاییەكەیت لە خەیاڵدا بێت). بـەڵام شـتەكە لەراستیدا وانیـە. پەیوەنـدیكردنی هاوكارانـە رێـك پێچەوانەیە و جێبـەجێكردنی ئەو خوومیە. مرۆڤ كە سـەرقاڵی پەیوەنـدی هاوكارانـە دەبێـت نازانێـت مەسـەلەكان چۆن بەڕێوە دەچن و چ ئەنجامگەلێكی دەست دەكەوێت، بەڵام لە ناخەوە دەكەوێتـە ژێر كاریگـەریی هەسـتێكی هێنـدە سـەرنجڕاكێش و دڵنیـایی و پرسەركێشییەوە كـە دەیگەیەنێتە ئەو باوەڕەی كە مەسەلەكان باشتر دەبـن لـە رابـردوو ــ ئەمـەش رێـك ئەو ئامانجەیە كە بیری لێ كرابۆوە.

تـۆ بـەو بـاوەڕەوە دەسـت پێدەكـەیت. كـە لایەنـە بەشـدارەكان زانیـاری و

بەرچاوروونیی زیاتریان دەست دەکەوێت و چێژ و خۆشییەکانی ئەو تێگەیشتن و بەرچاو روونی‌یە هاوبەشە پاڵنەرێك دروست دەکات بە ئاراستەی فێربون و گەشەکردن و بەدەستهێنانی بەرچاو روونی زیاتر.

لەراستیدا زۆر کەس هەن خاوەنی ئەزمونێکی مامناوەندییش نین لە مەسەلەی هاودەستیدا، نە لە ژیانی خێزانیاندا و نە لە پەیوەندییەکانی دیکەدا. ئەمانە بە جۆرێك راهێنراون و رێکخراون کە لە پەیوەندییەکانیاندا خۆپارێز بن و دەستپێشخەری نەکەن و لەوباوەڕەدان نە ژیان و نە دەوروبەر هیچیان شایستەی باوەڕ و متمانە پێکردن نین؛ لەئەنجامیشدا دەبینین کە هەرگیز ناتوانن بەرووی خووی شەشەم و ئەم پرنسیپانەدا بکرێنەوە.

ئەمە یەکێکە لە تراجیدیا و لە خەسارەتەکانی ژیان، چونکە بڕێکی زۆری وزە و تواناکان هەر بە نەدۆزراوەیی دەمێننەوە بێ ئەوەی بە تەواوی بەکاربهێنرێن یاخود بواری گەشەکردنیان بۆ بڕەخسێنرێن؛ خەڵکە گێلەکەش ژیانی رۆژانەیان دەگوزەرێنن بێ ئەوەی هیچ سەرمایەگوزارییەك بکەن لە تواناشاردراوەکانیاندا و هەمو هاوکارییە خوڵقێنەرەکانیان لە بواری کەمبایەخ و پەراوێزکراودا جێبەجێ دەکەن.

رەنگە کۆمەڵێك بیرەوەرییان هەبێت لەسەر چەند ئەزمونێکی خوڵقێنەری نائاسایی، بەتایبەت لە بواری وەرزشدا. بۆ نمونە رەنگە ماوەیەك کەوتبنە کەش‌وهەوایەکی راستەقینەی وەرزشی، یاخود لە چالاکییەکی فریاگوزاریدا بەشدارییان کردبێت کە لە پێناوی رزگارکردنی ژیانی کەسێکدا یاخود لە پێناوی گەیشتنە ئامانجێکی دیاریکراودا وایان لێ هاتبێت فیداکارییان نواندبێت.

بەلای زۆربەی خەڵکەکەوە ئەو کارانە کاری نائاسایی و گرنگن و بگرە دەشکەونە خانەی موعجیزەکانەوە. بەڵام مەسەلەکە بەم جۆرە نی‌یە. ئەمانە شتگەلێکن کە رۆژانە لە ژیانی زۆربەماندا روودەدەن. کەچی پەیوەندی هاوکارانە و هاوکاری خوڵقێنەر پێویستیان بە ئاستێکی باڵای کراوەیی و گیانی سەرکێشی و ئارامی رۆح هەیە.

زۆربەی هەوڵە خوڵقێنەرەکان لەوانەن کە مرۆڤ بە شێوەیەك لە شێوەکان غافلگیر دەکەن. هەمیشە ناڵۆز دێنە بەرچاو، قابیلی ئەوەن هەڵەیان تێدا بکەیت و

شکستت توش ببێت و زامن کردنیشیان مسۆگەر نی یە. لەبەر ئەوە ئەگەر زۆر لێبوردە نەبیت لەئاست مەسەلە ئالۆز و تەمومژاوییەکاندا و پابەندبونت بە پرنسیپ و بەها ناوخۆییەکاندا دڵنیاییت پێ نەبەخشێت، ئەوا بێگومان چوونە ناو ئەزمونێکەوە کە لە ئاستێکی بەرزی خوڵقاندندایە رەنگە رقو کینەی لێ بکەوێتەوە. چونکە ئەم ئەزمونە پتەوی و دڵنیایی و توانای پێشبینیکردنی گەرەکە.

## هاوکاریی خوڵقێنەر لە پۆلدا

من، وەکو مامۆستایەك، گەیشتومەتە ئەو باوەڕەی کە بەشێکی زۆری خوێندنگا هەڵکەوتووەکان خەریکن لە لێواری ئاژاوەو پشێویی نزیك دەبنەوە. هاودەستی بەوە تاقی دەکرێتەوە کە ئایا مامۆستاکان و خوێندکاران بەراستی کراوەن لەئاست ئەو پرنسیپەدا کە دەڵێت (هەمو) گەورەترە لە کۆی گشتی پارچەکانی و جاری وا هەیە نە مامۆستاکە و نە خوێندکارەکە هیچیان ئاگایان لە دۆخەکە نی یە. لە سەرەتادا کەش‌وهەوایەکی سەلامەت لە گۆڕێدایە کە یارمەتی خەڵکەکە دەدات بەراستی بکرێنەوە و فێرببن و گوێ لە بیرو بۆچوونەکانی یەکتری بگرن، پاشان لەپڕ (زریانی مێشك: بیرکردنەوەی ئازاد و تۆمارکردنی هەمو ئەو بابەت و شتانەی دێن بە خەیاڵدا = کۆڕگرتنی ئازاد و بێجڵەو) دێتە ئاراوە کە گیانی هەڵسەنگاندن لەئاست گیانی خوڵقاندن و بیرکردنەوە و کاری ئەقڵانیدا دەچێتە پەراوێزەوە. پاشان دیاردەیەکی نائاسایی سەرهەڵدەدات. تێکڕای پۆلەکە دەبزوێت لە ئاکامی ئەم دیدو بۆچون و ئەم سەرهەڵدانە نوێیە. ئەم ئاراستە نوێیەی کە پێناسەکردنی زەحمەتە کەچی لەهەمان کاتدا خەڵکە پەیوەندیدارەکە هەستی پێدەکەن. هاوکاریی خوڵقێنەرانە (یەکتر تەواوکردن) وەکو ئەوە وایە کۆمەڵەکە تێکڕا بڕیاربدەن دەقە کۆنە دەسەڵاتدارەکە بخەنە لاوەو دەقی نوێ بنوسن.

هەرگیز ئەو قۆناغەی کۆلێجم بیرناچێتەوە کە دەرسی فەلسەفە و سیستمی سەرکردایەتیکردنم پێ دەوتنەوە. هێشتا سێ حەفتەبو خوێندن دەستی پێکردبو، کە یەکێك لەکاتی دەرسەکەدا باسی ئەزمونی خۆی کرد. ئەزمونەکە زۆر بەهێز و لێوانلێو بو لە سۆز و بەرچاوروونیی. قسەکانی ئەم وای کرد کەشێکی ریزو بێ فیزیی پۆلەکە بگرێتەوە. ڕێز و پێزانین دەرهەق بەو خوێندکارە ئازایە.

ئـەم گیانــە وای کــرد لــە پۆلەکــەدا زەمینێکــی بــەپیت مەیســەر ببێــت بــۆ پەیڕەوکردنی هەوڵی هاوکارانە و خوڵقێنـەر. خوێنـدکارەکانی دیکـەش هـەمان کاریـان دەست پێکردو کەوتنـە روونکردنـەوەی ئـەزمون و تێڕوانینـەکانیان. تەنانـەت تـرس و گومانـە تایبەتەکانیشیـان بـاس دەکـرد. ئـەم گیـانی متمانـە و سـەلامەتیـە زۆربـەی خوێنـدکارەکانی هـان دەدا بـە تـەواوی بکرێنـەوە و جڵەو بـۆ هێزەکـانی نـاخی خۆیـان بـەرەڵڵا بکـەن. ئـیتر وایـان لێ هـات لـەجیاتی نمایشکردن و پێشکەشکردنی بابـەتی ئامادەکراو، سود لـە دیـد و بۆچون و جیهانبینی یـەکتری وەربگـرن. واتـە خوڵقانـدنی سـیناریۆیەکی تـەواو جیـاواز. سـیناریۆیەك کـە گوزارشـت بکـات لـەو واتایـەی ئـەمان دەیبەخشـن بـە پۆلەکـە. مـن بـە تـەواوی چـوبومە نـاو پرۆسـەکەوە. لەراسـتیدا مەسـەلەکە هێنـدە سیحراوی و داهێنەرانـەبو، مـن وام دەزانـی خـەوی موگناتیسـیم لێ کەوتووە. وردە وردە وام لێ هات دەستبەرداری ئەو مـەرج و پێویستییانە بم کە پێشتر بۆ پۆلەکەم دانابو. ئیتر دۆخێکی تازەو تواناگـەلێکی نـوێ هاتبونـە ئـاراوە. مەسـەلەکە تـەنیا خـەیاڵ و فـەنتازیا بـو، بـەڵکو هەسـتکردنێکی راسـتەقینەبو بـە هاوسـەنگی و پێگەیشتن و بابەتێك کە زۆر بەرنامەو پێکهاتەی کۆنی تێپەڕاندووە.

بەمجۆرە ئێمە مەنهەجە کۆنەکە و تێکڕای کتێب و نمایشەکانمان خستە لاوە کە پلانمان بۆ دانابون و ئامـانج و ئـەرك و پرۆژەگـەلێکی نوێمـان داڕشت: مەسـەلەکەمان هێندە بەلاوە سەرنجڕاکێش بوو کە پاش سێ حەفتە بڕیارمان دا خـەڵکی دیکـەش لـەم ئەزمونەی خۆماندا بەشدار بکەین.

بڕیارمـان دا کتێبێـك بنوسـین سـەبارەت بـە زانیـاری و تێڕوانینـەکانمان دەربـارەی بابەتەکـە - سـەرەتاکانی سـەرکردایەتیکردن - ئەرکـەکان گۆڕانیـان بەسـەردا هـات و پرۆژەی نوێ و تیمی نوێ هاتنە ئاراوە.

خەڵکەکە زیاتر و جددیتر خۆیان مانـدووە کـرد لـەوەی کـە لەسـەردەمی پێشوتردا دەیانکردو مەسەلەکەش دیاربو لەبەر چییە؟ لەبـەر ئـەوەبو کۆمەڵـە هۆکـارێکی نـوێ هاتوونەتە ئاراوە.

لـەم ئەزمونــەوە کـەلتورێك هاتـە ئـاراوە ئەوپـەڕی بـێ هاوتـایی و پێکـەوەیی و لێوانلێو لە هاوکاری خوڵقێنەر کـە چـەندین سـاڵیش پـاش کۆتـایی هـاتنی خوێندنەکـە

درێژەی کێشا. خوێندکارەکان دوای دەرچوونیشیان کۆدەبونەوە و ئێستاش کە یەکتری دەبینین باسی ئەو سەردەمە دەکەین و بەسەرهات و هۆکارەکانی دەگێڕینەوە.

خاڵێکی سەرنجڕاکێش بەلای منەوە ئەوەبو کە چۆن ئەو ماوە کورتە توانی متمانەیەکی وا لەنێوانماندا دروست بکات ئەو یەکترتەواوکردنەی لێ بەدی بێت. وابزانم هۆکارەکە ئەوەبو کە خەڵکەکە تا ئەندازەیەك خەڵکی کامڵ و پێگەیشتوبون. ئەوان لە قۆناغی کۆتایی خوێندنی زانکۆدا بوون و ئامانجەکەیان شتێك بو زیاتر لەوەی کە تەنیا هەر زانیارییەکی نوێی زانکۆیی بەدەست بهێنن .. ئەوان تینوی شتێکی نوێ و سەرنجڕاکێش بون .. تینوی شتێك کە واتایەکی هەبێت و بتوانن بیخوڵقێنن. شتەکە بریتی بو (لەو بیرۆکەیەی کە کاتی هاتووە)

هەروەها بارودۆخەکەش و پرۆسەکەش راست و گونجاو بون. هەستم دەکرد کە تاقیکردنەوەی یەکترتەواوکردنەکە بە شێوەیەکی پراکتیکی زۆر لەوە بەهێزتربو کە هەر بە قسە باسی بکرێت و بەرهەمهێنانی شتێکی نوێ زۆر واتادار ترە لەوەی کە تەنیا هەر دەقێکی کۆن بخوێنیتەوە.

من سەرباری ئەمانەش، کاتی وام بەسەردا هاتووە، کە دڵنیام خەڵکی دیکەش بەسەریاندا هاتووە، کە لێوانلێو بووە لە هاودەستی و هاوکاریی خوڵقێنەر لە لێواری گێژاو و بێ سەروبەریدا و چەندین جاریش لەبەر هۆکاری جیاجیا خلیسکاومەتە ناویانەوە. بەداخەوە زۆربەی ئەو خەڵکەی بە ئاگری ئەم شکستە سوتاون، کاتێك کە ئەزمونێکی نوێ دەست پێدەکەنەوە کاریگەری خراپی ئەو شکستەیان هەر لەسەرەو بۆ ئەوەی خۆیانی لێ بپارێزن رێ لە هەمو هاوکارییەك و یەکترتەواوکردنێکی نێوانیان دەهێنن.

ئەمە لە چی دەچێت؟ لە هەڵوێستی ئەو کارگێڕانە دەچێت کە یاسا و رێسای نوێ دادەنێن لە روانگەی ئەو سەرپێچی و خراپەکارییانەی کە ژمارەیەکی کەمی کارمەندانی دەزگاکە ئەنجامی دەدەن بەمەش ئازادی و ئەگەرەکانی داهێنان بەرووی زۆرینەدا دادەخەن. هەروەها هاوبەشە بازرگانانەکانیش بەهەمان شێوەن، مەبەستم لەوانەیە کە خراپترین ئەگەر و سیناریۆ دەهێننە پێش چاوی خۆیان و ئینجا دێن لە بەڵگەنامەیەکی یاساییدا تۆماری دەکەن. بەمەش هەمو گیانێکی داهێنان و سەرکێشی و هاوکاری خوڵقێنەر دەکوژن.

ئێستاش کە بیر لە ئەزمونەکانی خۆم دەکەمەوە لە بواری راوێژکاری و فێرکردنی بەڕێوەبەرەکاندا دەتوانم بڵێم لە زۆربەی زۆریاندا هەمیشە مۆرکی هاوکاری خوڵقێنەر زاڵ بووە. دیارە هەمیشەش چرکەساتێکی سەرەتایی هەبووە کە پێویستی بە ئازایەتی و راستگۆیی زۆر هەبووە بۆ رووبەرووبونەوەی راستییەکی تایبەت دەربارەی کەسەکە یاخود خێزانەکە یاخود دەزگاکە کە پێویست بو بوترایە، بەڵام ئازایەتییەکی زۆر و خۆشەویستییەکی راستگۆی تیا سەرف کرا ئینجا وترا لە ئاکامی ئەمەدا خەڵکەکەی دیکە وایان لێ هات کراوەتر و سەرڕاستتر و راستگۆتر بن لەگەڵ خۆیاندا و پاشان پرۆسەی پەیوەندیکردنە خوڵقێنەرەکە دەستی پێکرد. هێزی خوڵقاندنەکەی زیاتر و زیاتر بو، ئینجا گەیشتە قۆناغی تێڕوانینی راست و نەخشەی وا کە لەسەرەتادا کەس بیری لێ نەکردبۆوە.

(کارڵ رۆجەرز) لە وانەیەکیدا دەڵێت "ئەوەی کە زۆر تایبەتە لە هەموان گشتیترە". تۆ هەتا دڵسۆزتر بیت و هەتا راستگۆیانەتر گوزارشت لە شتەکان بکەیت، بەتایبەت لە ئەزمونە تایبەتەکان و لەگومان لەخۆکردندا، ئەوا خەڵك زیاتر و زیاتر متمانەت پێ دەکەن کە لای تۆ ناخی خۆیان ئاشکرا بکەن و زیاتر و زیاتریش ئاماژە بە رۆحی گوزارشتەکانی تۆ دەکەن. ئەم گوزارشتەش لە رۆحی کەسەکەدا رەنگ دەداتەوە و بەمەش پەیوەندییە خوڵقێنەرە راستەقینەکە لەدایك دەبێت و تێڕوانینی قوڵ و نوێی لێ دەکەوێتەوە و هەستکردن بە بزوتن و گیانی سەرکێشی دەبنە هۆکاری بەردەوامبونی پرۆسەکە. ئیتر خەڵکەکە وایان لێ دێت بە نیوە رستەیەك لەیەکتری تێبگەن، کە هەندێك جار پێویستیش ناکات پەیوەندییان بەیەکترییەوە هەبێت، بەڵام چونکە لە ناخی یەکتری شارەزابون یەکسەر تێی دەگەن. دوابەدوای ئەوە نۆرەی دەرکەوتنی دنیایەکی نوێیە لە تێڕوانینی قوڵ و هەستەوەری نوێ و پارادیمی تازەی وا کە ئەو هەڵبژاردانە بچەسپێنێت. هەروەها ئەڵتەرناتیفی واش دێنە ئاراوە کە شایستەی بیرلێکردنەوە بن. هەرچەندە هەندێك جار ئەم بیرۆکانە لە هەوادا بە هەڵواسراوی دەمێننەوە، بەڵام زۆرجار دەگەنە بەندەرێکی سودمەند و پراکتیکی.

## هاوکاری خوڵقێنەر لە بواری کاردا

یەکێك لە ئەزمونە بەچێژەکانم لە بواری هاوکاریکردنی خوڵقێنەردا ئەوکاتە بو

کە لەگەڵ یاریدەدەرەکانمدا سەرقاڵی دارشتنی پەیامی دەزگاکەمان بووین. لەو ئەزموونەدا، کە چەندین واتای قوڵی پێ بەخشیم، زۆربەی ئەندامانی کۆمپانیاکە چوینە ناوچەیەکی بەرزی شاخاوی. لەوێ، لەناو دیمەنە دڵفرێنەکانی سروشتدا دەستمان کرد بە نوسینی یەکەمین رەشنوس، کە بەلای هەندێکمانەوە نمونەیەکی نایابی پەیام بو.

لەسەرەتادا پەیوەندی نێوان ئەندامەکان رێز و وریای و سڵەمینەوە و پێشنبینیکردنی پێوە دیاربو. بەڵام هەر کە باسی ئەڵتەرناتیڤە جۆربەجۆرەکانی فرسەت و ئەگەرەکانی بەردەممان کرا، خەڵکەکە ئیتر وایان لێ هات بە کراوەیی قسە بکەن و بەوپەڕی دڵسۆزییەوە بیروڕای خۆیان ئاشکرا دەکرد، وەك چۆن مرۆڤ بە دەنگی بەرز بیردەکاتەوە ئاوا بوین بەم شێوەیە مەسەلەی دارشتنی پەیامی کۆمپانیاکە بواری ئەوەی رەخساند کە پێکەوە ئازادانە بەشدارییەکی بەکۆمەڵ بکەین و خۆبەخشانە بیرۆکەکان کەڵەکەبوون. خەڵکەکە بەوپەڕی ئازایەتی و جۆش‌وخرۆشی راستەقینەوە کاریان دەکرد. ئیتر قۆناغی رێز لە یەکگرتن و لە یەکتێگەیشتنمان تێپەڕاندو چوینە قۆناغی پەیوەندی بە هاوکارییە داهێنەرە خولقێنەرەکە.

مەسەلەکە زۆر سەرنجڕاکێش بو. هەمومان هەستمان پێ‌دەکرد. کە پەیوەندییەکەش گەیشتە لوتکەی پێگەیشتن، سەرلەنوێ گەڕاینەوە بۆ دەربڕینی بەکۆمەڵی تێڕوانینی خۆمان، سەرنجەکانمان کردە وشە، کە هەر وشەیەك بەلای بەشدارانەوە واتایەکی دیاریکراو و چەمکێکی وای هەبو کە پێویست بو پابەندبین پێوەی.

## پەیامی دەزگاکە ئەمەی خوارەوە بو:

"پەیامەکەمان بریتییە لە تواناسازیی خەڵك و دەزگاکان بە زیادکردنی ئاستی ئەنجامدانیانەوە لەپێناوی بەدیهێنانی ئامانجی گرنگ و شایستە لەڕێی لێکتێگەیشتن و پەیڕەوکردنی ئەو سەرکردایەتیکردنەی کە سەنتەرەکەی پێك هاتبێت لە پرنسیپەکان"

ئەم پرۆسەی یەکتێتەواوکردنە کە پەیامی دەزگاکەمانی خولقاند شوێنی شیاوی خۆی لە دڵو مێشکی هەمومانـدا هـەلکۆڵی، هـەروەها بـوو بـە چوارچێوەی ئـەو سەرچاوەیەی کە خەریکی بووین و هەروەها هی ئەوەش کە لێوەی دووربوین.

ئەزمونێکی دیکەی گرنگی من لەم بواری هاوکاریکردنی خولقێنەرەدا ئـەوەبو کـە بانگهێشتێکم قبـوڵ کـرد، رۆڵـی هانـدەر (کـارای یاریـدەدەر) ببینـم لـە گفتوگۆکـانی پلاندانانی ساڵانەی یـەکێك لـە کۆمپانیـا زەبەلاحـەکانی بیمـەدا. چـەند مانگێك پێش ئـەم کۆبونەوەیـە، چاوم کـەوت بـە لیژنـەی ئامادەکاری کۆبونەوەکـەوە کـە دوو رۆژی دەخایانـد و بڕیـار وابـو هـەمو بەڕێوەبـەرە جێبـەجێکارەکان لـەخۆ بگرێت. لیژنەکـە پـێی وتم، هەمیشـە لـەم جـۆرە کۆبونەوانـەدا لـەڕێی چـاوپێکەوتن و پرسـیار و راپرسـییەوە چـوار پێـنج بابـەتی سـەرەکی دیـاری دەکـرێن. بەڕێوەبـەرە جێبـەجێکارەکانیش پێشـنیاری ئەڵتـەرناتیف پێشـکەش دەکـەن. لەبەرئـەوە کۆبونـەوەکانی پێشـووی گفتوگـۆ و بـیروڕا دەربڕینـەکان رێزلێگرتنـی پێـوە دیـاربو، هەرچـەندە هەنـدێك جار شـەڕی بـراوە – دۆڕاوەی بەرگریشی لێ دەکەوتـەوە، بـەڵام هەمیشـە ئـەو شـەڕانە شـەڕی چـاوەڕوانکراوبون و هـیچ داهێنانێکیـان تیانـەبووە و مایەی بێزاری و وەڕسبونیش بون.

کە لەگەڵ لیژنەکەدا باسی هاوکاری خولقێنـەرم کـرد هەستم کـرد ئـەوانیش بـە پێویسـتی دەزانـن، بـەڵام سـڵی لێ دەکەنـەوە، بۆیـە بـە ترس‌ونیگەرانییـەکی زۆرەوە رەزامەندییمان دەربڕی شێوازی گفتوگۆکان دەستکاری بکرێت.

داوایان لە چەند بەڕێوەبەرێك کرد کۆمەڵێك (کاغەزی سپی) بۆ ئیمزا ئامادە بکـەن دەربـارەی هـەر یـەك لـە بابەتـە هـەرە گرنگـەکان، ئینجـا داوایـان لـە هـەمو بەڕێوەبەرەکان کرد لەسەرەتای کۆبونەوەکەدا خۆیـان بـەو کاغەزانـەوە خـەریك بکـەن بـە مەبەسـتی تێگەیشـتنی بابەتـەکان و هـەروەها تێگەیشـتنی دیـدو بۆچـوونە جیاوازەکان. پێویست بو لەسـەریان بـە جۆرێك بچنە کۆبونەوەکەوە کە ئامادەییان تێدا بێت زیاتر گوێ بگـرن نـەك قسە بکـەن، ئامادەییان تێدا بێت بۆ داهێنـان و یەکتێتەواوکردن نەك بۆ پاراستن و بەرگریکردن.

ئێمە نیوەی ڕۆژی یەکەممان لە کۆبونەوەکە بۆ ئەوە تەرخانکرد کە خووەکانی چوارەم و پێنجەم و شەشەم و پرنسیپەکانیان فێری بەشداران بکەین. باقی کاتەکەی دیکە تەرخانکرا بۆ هاوکاریکردنی خوڵقێنەر.

ئەمە وزەیەکی خوڵقێنەری سەرسوڕهێنی هێنایە ئاراوە. جوڵەو چالاکی نواندن شوێنی بێزاریی گرتەوە. خەڵکەکە لەئاستی یەکتریدا بە تەواوی کرانەوە و لەمەشەوە تێڕوانین و هەڵبژاردەی نوێ دروست بوون. لە کۆتایی کۆبونەوەکەدا چەمکێکی تەواو نوێ خەملێنرا دەربارەی سروشتی ئەو ململانێ ناوەندییەی کە دەزگاکە روبەڕوی دەبێتەوە. بەمجۆرە کاغەزە سپییەکان بونە بارستاییەکی پەراوێزخراو. جیاوازییەکانیش وەلانران و تێڕوانینێکی هاوبەش و نوێ سەری هەڵدا.

سروشتی ئەم هاوکارییە خوڵقێنەرە وایە کە هەرکەسێك بیکات گۆڕانی گەورەی بەسەردا دێت و ئیتر هەمان کەسەکەی جاران نابێت، چونکە دەزانێت هەر سەرکێشییەکی هاوشێوە کە لە ئایندەدا ئەنجامی بدات دەبێتە مایەی فراوانبونی توانا ئەقڵییەکانی.

هەرچەندە کەمجار ڕێك دەکەوێت کە دوبارەکردنەوەی هەمان ئەزمونی هاریکاری خوڵقێنەر سەرکەوتنی گەورە بەدەست بهێنێت، بەڵام دەتوانرێت کرۆکی مەبەستەکەی لەم هەوڵە خوڵقێنەرەدا بەرجەستە بکرێتەوە. مەسەلەکە ڕێك ئەو حیکمەتەی خۆرهەڵاتی دوورە کە دەڵێت: "ئێمە نامانەوێت لاسایی مامۆستاکانمان بکەینەوە، بەڵکو دەمانەوێت بزانین ئەوان بەدوای چیدا دەگەڕان." واتە ئێمەش هەوڵ نادەین لاسایی ئەزمونەکانی پێشوو بکەینەوە لە هاوکاری خوڵقێنەردا، بەڵکو زیاتر بەدوای ئەزمونی نوێدا دەگەڕێین بۆ بەدیهێنانی مەبەستی جیاواز و نوێ و تەنانەت باڵاتریش.

## هاوکاری خوڵقێنەر و مەسەلە پەیوەندییەکان

هاوکاریکردنی خوڵقێنەر پڕە لە چالاکی و سەرسوڕمان .. داهێنان پڕە لە چالاکی و سەرسوڕمان. ئەو ئەنجامانەی کە پەیوەندی و کرانەوە بەدیدەهێنن مەزن و فراوانن. ئەم جۆرە کرانەوەیە لەباریدا هەیە دەستکەوتی گەورە و پێشکەوتنی گرنگ و راستەقینە زامن بکات، لەبەرئەوە دەهێنێت مرۆڤ سەرکێشی بکات لەپێناویدا.

لەپاش دووهەمین جەنگی جیهانی، ویلایەتە یەکگرتووەکان (دەیڤید لینثال David Lienthal)ی کردە سەرۆکی کۆمیسیۆنی نوێی وزەی ئەتۆمی. ئەویش کۆمەڵێك کەسی هێنا کە هەموویان خەڵکی کاریگەر و هەڵکەوتوبون و هەریەکەیان لە بواری کارەکەی خۆیدا ناوبانگێکی چاکی هەبو.

ئەم گروپە پێکهاتووە لە کەسایەتی جیاواز ئەجینداى ئەوپەڕی سەختی رووبەروو کرابۆوە و ئەوانیش زۆر بە پەرۆش بون کە بە زووترین کات ئەرکەکەیان تەواو بکەن. سەرباری ئەوەش گوشاری رۆژنامەنوسانیشیان لەسەربو. کەچی (لینثال) چەند حەفتەیەکی تەرخان کرد بۆ دروستکردنی پاشەکەوتێکی چاك لە ژمارە حسابی بانکی سۆزدارییدا. هەوڵیدا ئەندامانی لیژنەکە یەکتری بناسن و پاشخان و ئامانج و کێشە و هەند و پارادیم و چوارچێوەی سەرچاوەکانی یەکتری چاك چاك بزانن. (لینثال) بەم کارەی توانی ئەو کارلێکە مرۆڤایەتییە ئاسان بکات کە زامنی خولقاندنی پەیوەندییە مەزنەکانی نێوان خەڵکییە. ئەو بەم کارەی گلەیی و رەخنەی زۆری هاتەسەر کە کاتێکی زۆری لەو مەسەلانەدا بەفیڕۆ داوە.

بەڵام دەرئەنجامە کۆتاییەکە لەوەدا خۆی بینییەوە کە ئەندامانی لیژنەکە پەیوەندییەکی توندوتۆڵ و زۆر نزیکیان لەنێواندا دروست بو. بە تەواوی لەئاست یەکتریدا کرانەوە و ئاستی داهێنان و هاوکاری خولقێنەری نێوانیان گەیشتنە ئەوپەڕی. رێزی یەکتریان هێندە لەلا مەزن بو، کە ئەگەر لە مەسەلەیکدا بیرو بۆچونی جیاواز سەری هەڵبدایە لەنێوانیاندا، ئەوا لەبری بەرگری و بەرهەڵستیکردنی یەکتری، بەڕاستی هەوڵیان دەدا لە یەکتری تێبگەن. ئاڕاستەکە بەم شێوەیە بو کە (ئەگەر کەسێك لە ئاستی زیرەکی و لێهاتوویی و سەرڕاستی مندا بیروبۆچونەکەی جیاوازتر بێت لەوەی من، کەواتە بە دڵنیاییەوە هۆکارێك بۆ ئەو جیاوازییەش هەیە کە شتێکە من تێی ناگەم و پێویستە تێی بگەم. تۆ خاوەنی تێڕوانینێك و چوارچێوەیەکی دیاریکراویت و من پێویستم بەوەیە لێیان ئاگاداربم).

لەمەوە ئیتر کارلێکێك دروست دەبێت کە بەرگریکارانە نییە و دەبێتە مایەی لە دایکبونی کەلتورێکی نائاسایی.

نزمترین ئاستی پەیوەندی دەرئەنجامی ئەو هەڵوێستانەیە کە متمانەکانیان نزمن. خەسڵەتەکانیشی بریتین لە بەرگریکاری، خۆپاراستن و زۆرجاریش بەکارهێنانی

سانێکی یاسایی کە هەمو بناغەکان دەگرێتەوە و بە دوورودرێژیش واتای وشە و راوەکان روون دەکاتەوە بۆ ئەوەی لە لێپرسینەوەکان خۆی دەرباز بکات ئەگەر هاتو ۆخەکە تێکچوو. ئەم جۆرە پەیوەندییە تەنیا (یەك) ری لێ دەردەچێت ئەویش اخود بەدەستهێنانی هەمو شتێکە یان لەدەستدانی هەمو شتێکە. ئەم جۆرە ەیوەندی‌یە جۆرێکی کاریگەر نی‌یە – ناتوانێت هاوسەنگی دروست بکات لەنێوان ەرهەم و توانای بەرهەمهێناندا و لە ئاکامدا هەر ئەوەی لێ دەکەوێتەوە کە هۆکاری یاتر دروست بکات بۆ بەرگریکردن و خۆپاراستن. بەڵام هەڵوێستی ناوەڕاست ریتییە لەوجۆرە پەیوەندییەی کە رێزی تێدایە. ئەمە بریتییە لەو شێوە ەیوەندییەی کە خەڵکی ساغ و پێگەیشتو پەیڕەوی دەکەن. ئەمانە رێزی یەکتریان ەلایە و لەهەمان کاتیشدا سڵ لەوە دەکەنەوە هەڵوێستێك بێتە پێشەوە توشی حانەحەپەشێ و ململانێی ناخۆش ببن. لەبەرئەوە مامەڵەکردنیان زۆر ئەدەب و ێزی تێدایە، بەڵام بەتاڵە لە هەمو سۆز و گەرموگوڕییەك. ئەمان رەنگە مێشکی ەرامبەرەکەیان بخوێننەوە. بەڵام ناچنە قوڵایی پاردایمی کەسەکەوە و بەلایانەوە گرنگ نی‌یە کە بزانن بەرامبەرەکەیان ئەگەر بکرێتەوە چی لەباردا دەبێت.

ئەم هێڵکارییەی خوارەوە بۆمان روون دەکاتەوە کە متمانە چەند پەیوەندی هەیە بە ئاستە جیاجیاکانی پەیوەندییەوە.



ئـەم شـێوە پەیوەندییـە رێـزدارە لـە هەڵوێستـە سـەربەخۆکاندا پەیوەندییـەکی سـەرکەتووە، بگـرە لـەو هەڵوێستانەشـدا سـەرکەوتووە کـە دوولایەنەکـە پێویسـتیان بەیـەکترە، بـەڵام ناتوانێـت دەرەنجـامێکی خوڵقێنـەری کـراوەی هـەبێت. دیـارە لـەو حاڵەتانەشـدا کە لایەنـەکان پشت بەیـەکتری دەبەسـتن، ئـەم جۆرە پەیوەندییـە هـەر ئـەوەی لەدەسـەڵاتدایە کـە چارەسـەرێکی مامناوەنـدی بدۆزێتـەوە. (واتـە ١ + ١ = ١،٥) واتە هەردولاکە هەم وەردەگرن و هـەم دەشبەخشن. پەیوەندییەکە نەبەرگریکاریـیە، نـە خۆپارێزییـە، نـە تورەیـە و نـە کۆنترۆڵکەریشـە. گفتوگۆیـەکی پـاك و راسـتگۆ و رێـزدارە. بـەڵام خوڵقێنـەر و یەکترتەواوکـەر نـییـە. دەرەنجامەکەشـی دەرەنجـامێکی لاوازی شێوەی براوە/ براوەیە. بەڵام لە پەیوەندی جۆری سێیەمدا کە هاوکاریکردنی خوڵقێنـەرە ١ + ١ رەنگـە یەکسـان بێـت بـە ٨ یـاخود بـە ١٦ یـاخود تەنانـەت بـە (١٦٠٠)یـش. هەڵوێستی ئـەم جـۆرە هاوکـاری و پەیوەندییـە بناغەکـەی بریتییـە لـە ئاسـتێکی هـەرە بـەرزی متمانـە و چارەسـەری وای لێ دەکەوێتـەوە کـە لـە تێکـڕای چارەسـەرە پێشـنیارکراوەکان چاکترە، لایەنـەکانیش ئەمـە دەزانـن و لێـی تێدەگـەن. جگـە لـەوەش هـەمو لایـەك بەڕاسـتی چێـژ لـەم رێکەوتنـە خوڵقێنـەرە وەردەگـرن. رووەکێکی بچکۆلەیە کە مرۆڤ هەم لەپێناویـدا دڵخۆشـە و هـەم لـە بەدەستهێنانیشیدا، هـەروەها دەتوانێت هاوسـەنگی بـەدی بهێنێـت لـەنێوان بەرهـەم و توانـای بەرهەمهێناندا، ئەگەرچی هەندێکجار ئەو هاوسەنگییە زۆر ناخایەنێت.

دیارە هەندێك بارودۆخیش هـەن کـە مـرۆڤ ناتوانێـت. هاوکـاری خوڵقێنـەری تێـدا بەدی بهێنێت و رێکەوتن مەحاڵە سـەربگرێت. بـەڵام تەنانـەت لـەم جـۆرە دۆخانەشـدا رۆحـی هەوڵـە دڵسـۆزەکان هەمیشـە دەتـوانن رێگـا چـارەی مامناوەنـدیی کاریگـەرتر دەستەبەر بکەن.

## گەڕان بەدوای ئەلتەرناتیڤی سێیەمدا

بۆ ئـەوەی بیرۆکەیـەکی باشـترت دەسـتبکەوێت سـەبارەت بـە کاریگـەرێتی ئاسـتی پەیوەندییەکان لەسەر چالاکییەکانی نێوانمـان، باشـتر وایـە ئـەم سیناریۆیەی خـوارەوە بهێنیتە پێش چاوی خۆت:

کاتی پشووەکان نزیك بۆتەوە و مێردەکە دەیەوێت لەگەڵ ماڵ و منالێدا بـڕۆن بۆ

قەراخ دەریاچەیەك لە لادێ و لەوێ چێژ لە ژیانی ناو چادرو لە راوەماسی وەربگرن. ئەمە پرۆژەیەکی زۆر گرنگە بەلایەوە و بە درێژایی ساڵەکە پلانی بۆ داناوە و خۆیی بۆ ئامادەکردووە. دەمێکە کوخێکی لەوێ گرتووە و بەلەمێکیشی بەکرێ گرتووە. کوڕەکانیشی زۆر بە پەرۆشن کە ئەو سەیران و گەڕانە بکەن.

بەڵام هاوسەرەکەی دەیەوێت لەم پشووەدا سەردانی دایکە پیر و نەخۆشەکەی بکات کە ماڵەکەیان نزیکەی (٢٥٠) میل لەمانەوە دوورە. ئەم نایپەرژێت و فرسەتی بۆ هەڵ ناکەوێت کە زوو زوو سەر لە دایکی بدات، لەبەر ئەوە زۆر گرنگە لەم پشووەدا بچێت بۆلای.

ئەم جیاوازییەی نێوان ژنو مێردەکە دەتوانێت ببێتە مایەی دروستبونی کێشەیەکی گەورە و ئەزمونێکی زۆر خراپ. مێردەکە پێی دەڵێت: ئێمە تازە هەمو شتێکمان بڕانۆتەوە و کوڕەکان زۆر زۆریان پێخۆشە. لەبەرئەوە هەر دەبێت بچین.

ژنەکە وەڵامی دەداتەوە: بەڵام کێ دەزانێت دایکم چەندی دیکە دەژی. دەمەوێت لەلای بم و هەر ئەم کاتی پشووەشم بەدەستەوەیە کە بتوانم چەند رۆژێك بە دیارییەوە بم.

- ئێمە ساڵێکی رەبەقە بەتەمای ئەم حەوت رۆژی پشووەین. مناڵەکان بێتاقەت دەبن. یەك هەفتە لە ماڵی نەنکیاندا دابنیشتن چی بکەن. شێت دەبن. خۆ شوکر دایکیشیت هێندە ناساغ نییە. با خوشکەکەت لەلای بێت. ئەو ماڵیان زۆر نزیکە لێوەی.

٭ بە تەنیا هەر دایکی خوشکەکەم نییە. دایکی میشە. دەمەوێت لەلای بم.

- دەتوانیت هەمو شەوێك بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵدا بکەیت. بێجگە لەوە ئێمە دەمێکە بڕیارمان داوە لە پشووی سەری ساڵدا هەمو لەوێ کۆببینەوە. بیرتە؟

٭ لە ئێستاوە تا جەژنی سەری ساڵ پێنج مانگی ماوە. کێ دەڵێت دایکم تا ئەوکاتە دەمێنێت. هەروەها دایکم ئێستا پێویستی پێمە.

- خۆ شوکور لە هیچی کەم نیە، دوای ئەوە منیش و کوڕەکانیش پێویستمان پێتە.

٭ دایکم لە راوەماسی گرنگترە

- بەڵام مێردەکەت و مناڵەکانت لە دایکیشت گرنگترن

پاش ئەم هەمو بگرەو بەردەیە، یەکێك لە ئەنجامەکان رەنگە ئەوەبێت بگەنە رێگە چارەیەکی مامناوەندی: رەنگە رێك بکەون لەسەر ئەوەی ژنەکە بچێتە

سەردانی دایکی، کابرا و کوڕەکانیش بڕۆن بۆ سەیرانەکەیان. بەڵام هەردوولا هەست بە پەشیمانی و بێتاقەتی دەکەن، بەتایبەت کوڕەکان کە هیچ خۆشییەك لە پشووەکە نابینن.

یاخود رەنگە مێردەکە بچێتە سەرقسەی ژنەکەی و سەیرانەکە هەڵوەشێنێتەوە. بەڵام شتەکە بە نابەدڵی دەکات، لەبەرئەوە بەخۆی بزانێت یان نەزانێت، ئەو ماوەیە هەر خەریکی برۆبیانو هێنانەوە دەبێت بۆ سەلماندنی قسەکەی خۆی کە ئەو حەفتەیە لە هەمویان بە ناخۆشیی دەڕوات.

لەوانەشە، بە پێچەوانەوە، ژنەکە بچێتە سەرقسەی مێردەکەی، بەڵام گۆشەگیر و مات و مەلول دادەنیشێت و کاردانەوەی زۆر توندی دەبێت بەرامبەر هەر رووداوێك لە تەندروستی دایکیدا رووبدات. خۆ ئەگەر ئەو ماوەیە دایکی نەخۆشییەکی قورسی گرت و مرد، ئەوا ئیتر نە مێردەکە لە خۆی خۆش دەبێت، نە ژنەکەشی لێی خۆش دەبێت.

رێگا چارە مامناوەندییەکەی کە لەسەری رێك دەکەون هەرچییەك بێت، پاش چەند ساڵێکی دیکە وەك بەڵگەیەکی خراپی هەست و سۆزیان بەرامبەر یەکتری تەماشای دەکەن، یان بە برِیارێکی کەمتەرخەمی لێك دەدەنەوە یاخود دەڵێن پەلەپرۆزێی تیابووە و زیانی بە هەردوو لایەنەکە گەیاندووە. دووریش نیە رێگا چارەی مامناوەندیی ماوەی چەند ساڵێکی بەردەوام ببێتە مایەی ناکۆکی و دووبەرەکی لەناو یەك خێزاندا. زۆریش لەو پرۆسە هاوسەرگیرییانەی کە جاران کامەرانی و خۆرسکی و نەرمونیانی لێ دەبارى لە سایەی رێگا چارە مامناوەندییەکانەوە نزمبونەتەوە بۆ خراپترین ئاستەکانی رق و دوژمنایەتی. ژنەکە و مێردەکە هەریەکەیان بە شێوەیەکی جیاواز لە هەڵوێستەکە دەڕوانێت. ئەم جیاوازییەش رەنگە وایان لێ بکات ببنە دوو جەمسەری دژبەیەك. هەروەها لەوانەشە ببێتە مایەی نزیکبونەوەیان لە یەکتری بۆ ئاستێکی چاکتر.

ئەم دوو لایەنە ئەگەر کردبێتیان بە (خوو) کە کاریگەرانە پشت بە یەکتری ببەستن لە پەیوەندییەکانیاندا، دەتوانن لە پارادیمێکی تەواو جیاوازەوە لە یەکتری نزیك ببنەوە. چونکە پەیوەندییەکەیان لەسەر ئاستێکی باڵاترە.

ژن و مێرد ئەگەر پاشەکەوتێکی چاکیان هەبێت لە بانکی هەستو سۆزدا ئەوا هاوسەرگیرییەکەیان لێوانلێو دەبێت لە متمانە و کراوەیی. هاوسەرانی لەوجۆرە بە شێوازی براوە — براوە بیردەکەنەوە لەبەر ئەوە بەدوای ئەڵتەرناتیڤی سێیەمدا دەگەڕێن، واتە بەدوای چارەسەرێکدا کە بۆ هەردولا بەسودترە لەوەی کە ئەوان پێشتر پێشنیاریان کردبو. ئەوان لە سایەی گوێگرتنی هاوسۆزیی لەیەکتری و هەوڵدانیان لەپێناوی ئەوەی کە یەکەمجار تێبگەن ئینجا هەوڵبدەن بەرامبەرەکە لێیان تێبگات، بە دڵنیاییەوە لە ناخی خودی خۆیان و لە پەیوەندی نێوانیشیاندا دەگەنە ئاستی ئەوەی باش بزانن ئەو بەهاو بایەخانە چین کە لەکاتی بڕیاردانىدا پێویستە رەچاو بکرێن.

ئەم کۆمەڵە توخمە پێکەوە — پاشەکەوتێکی بەرچاو لە بانکی هەست و سۆزەکاندا، بیرکردنەوە بە شێوازی براوە/ براوە و هەوڵدانی ئەوەی کە سەرەتا خۆت تێبگەیت - خوڵقێنەری ئەو ژینگە نمونەییەن کە هاوکاری خوڵقێنەر پێویستی پێیەتی.

بودایسم ئەمەی ناوناوە (رێگەی سێیەم) سێیەم لێرەدا مەبەست لە رێگاچارەی مامناوەندی نییە، بەڵکو شتێکی بەرزتر دەگرێتەوە، بۆ نمونە وەکو لوتکەی سێگۆشە.

لە پرۆسەی گەڕاندا بۆ ئەم رێگا "ناوەڕاستە" بڵندە ژن و مێردەکە دەزانن کە خۆشەویستی و پەیوەندی نێوانیان بەشێکە لە هاوکارییە خوڵقێنەرەکەیان.

بەمجۆرە، لە ئەنجامی پەیوەندییانیدا لەگەڵ یەکتری، مێردەکە بە قوڵی لە هەستی ژنەکەی تێدەگات و درک بەوە دەکات کە ئەو چەند پێویستی بەوەیە لای دایکی بێت. تێدەگات کە ژنەکەی چۆن دەیەوێت هەندێک ئەرک لەسەرشانی خوشکەکەی سوک بکات کە بەشی سەرەکی بەرپرسیارێتی چاودێریکردنی دایکیان کەوتۆتە سەرئەم خوشکە. پیاوەکە هەروەها درک بەوەش دەکات کە بەڕاستی نازانن خەسووەکەی چەندێکی دیکە دەژی و ئەم ژنە بە دڵنیاییەوە لە سەیران و راوەماسی گرنگترە.

ژنەکەش بەهەمان شێوە زۆر چاک درک بەوە دەکات کە مێردەکەی چەندێک ئارەزومەندە ماڵومناڵ لە سەیرانێکدا کۆبکاتەوە و خۆشییەك ببەخشێت بە کوڕەکانی. دەزانێت کە رەنجێکی زۆریان داوەو پارەیەکی زۆریان سەرف کردووە بۆ

دابینکردنی پێویستییەکانی ئەم سەیرانەو دەشزانێت کە چەند گرنگە هاوبەشییان بکات لە دروستکردنی بیرەوەرییەکی خۆشدا.

لەبەرئەوە هەمو ئارەزووەکان بە هەند وەردەگرن و کۆیان دەکەنەوە و بەرامبەر ئەم کێشەیە هەڵوێستی دژبەیەك وەرناگرن. ناچنە دوو بەرەی دژ بەیەکەوە بەڵکو هەموویان لە (یەك) لادا دەمێننەوە و پێکەوە سەرنج لە کێشەکە دەدەن و لە پێویستییەکان تێدەگەن و کار بۆ خوڵقاندنی ئەڵتەرناتیڤێکی سێیەم دەکەن کۆیان بکاتەوە.

مێردەکە پێشنیار دەکات: هەر لەم مانگەدا کاتێکی دیکە رێك دەخەین سەردانی دایکتی تیا بکەیت. خۆم لە کۆتایی هەفتەدا ئیش‌وکاری ماڵەکە دەکەم و بۆ سەرەتای هەفتەش کە تۆ لە ماڵ نابیت چارەسەرێکی دیکە دەدۆزمەوە بۆ ئەوەی خەمی ئێرەت نەبێت و ئەو ماوەیە لای دایکت بیت.

یان رەنگە لە نزیك ماڵی دایکتەوە شوێنێکی وامان دەست بکەوێت کە چادر و راوە ماسییەکەی مسۆگەر بێت. مەرج نییە ناوچەکە زۆر خۆش‌و دڵرفێن بێت. گرنگ ئەوەیە کاتی پشووەکە لە ماڵ نەبین و فریای هەندێك لە ئیش‌و کارەکانیش بکەوین. کورەکانیش لەناو چواردیوارەکەی ماڵەوەدا زیندانی نەبن. هەروەها فرسەتێکیش دەبێت لەگەڵ خاڵ و مام و خزمان و مناڵەکانیاندا نەختێك رابوێرین پێکەوە. بەم شێوەیە هاودەستی دەکەن. مەسەلەکە دەهێنن و دەبەن تا دەگەنە چارەسەرێك کە هەردولا پێی رازی بن. ئەم چارەسەرە لە چارەسەرەکانی پێشتر چاکترە کە پێشنیاریان کردبو. لە رێگا چارەی مامناوەندییش چاکترە. رێگە چارەیەکی یەکترتەواوکەری خوڵقێنەرە کە بەرهەم و توانای بەرهەم بنیات دەنێن (ب/ ت ب) واتە لەجیاتی ئاڵوگۆڕ، گۆڕان روودەدات. هەردوکیان ئەو ئامانجەیان دەست دەکەوێت کە ئارەزویان لێ بووە و لەهەمان کاتیشدا برەو بە پەیوەندییەکانیان دەدەن.

## هاوکاریکردنی خوڵقێنەرانەی نەرێنی

گەڕان بەدوای ئەڵتەرناتیڤی سێیەمدا لەراستیدا وەرچەرخانێکی گەورەی پارادیمە و دورکەوتنەوەیە لە ئەقڵەیەتی دووانیزم، ئەقڵەیەتی یان ئەمە یان ئەوە (رەش یان سپی). بەڵام تەماشای ئەنجامەکان بکە بزانە چەند جیاوازن. بیرکەرەوە

بزانە ئێمەی مرۆڤ لەم واقیعەدا کە هەمومان پێویستمان بە یەکترییە چەندێك وزەی نەرێنی بەفیڕۆ دەدەین کاتێك دەمانەوێت بڕیارێك بدەین یاخود کێشەیەکی دیاریکراو چارەسەربکەین. چەندێك کاتی خۆمان بەفیڕۆ دەدەین بۆ سەلماندنی خەتاو ناتەواوییەکانی کەسەکەی بەرامبەرمان، بۆ ململانێ و قۆرخکردن و دروستکردن و گەورەکردنی ناکۆکییەکان؟! چەندە بە خۆڕایی خۆمان ماندو دەکەین لە قوڵکردنەوەی گومانەکان و پەیڕەوکردنی هەلپەرستی و شاردنەوەی روخساری راستەقینەی خۆماندا.

ئێمە زۆربەمان لەبری ئەوەی قاچ لەسەر ئیستۆپەکە هەلگرین بەنزینی زیاتری دەدەینێ و قاچمانی لەسەر قەپات دەکەین. واتە لەپێناوی پتەوکردنی هەڵوێستەکەماندا گوشاری زیاتر دروست دەکەین و قسەی باقو بریقەداری زیاتر و زانیاری لۆجیکی زیاتر و زیاتر دەخەینەرو.

کێشەکە لەوەدایە کە ئەو کەسانەی زۆر پشتبەستون بە خەڵکی دیکە هەوڵ دەدەن لە نێوەندی واقیعێکدا سەرکەوتن بەدەست بهێنن کە خەسڵەتەکەی هاوکاریکردنی خولقێنەر بێت. ئەوان سەرچاوەی هێز و پشتو پەنایان دوو شتە. یاخود ئەوەیە کە هێز و توانا لە ناوەندی دەسەڵاتەوە وەردەگرن و گەمەیەك دەکەن لەسەر شێوازی براوە/ دۆڕاو، یان پشت بەوە دەبەستن کە لەناو خەڵکیدا خۆشەویست و ناسراون و گەمەیان لەسەر شێوازی دۆڕاو/ براوە دەبێت. ئەمانە رەنگە لە قسەکردندا شێوازی براوە/ براوە و قازانجی هەموان، ویردی سەرزمانیان بێت، بەڵام لەراستیدا نایانەوێت گوێ بگرن، بەڵکو هەمو هەوڵێکیان بۆ کۆنترۆڵکردنە. دیارە ئەمەش ژینگەیەکی باش نییە بۆ برەوپەیداکردن و گەشانەوەی هاوکاریکردنی خولقێنەر.

مرۆڤ ئەگەر لە ناخەوە هەست بە ئاسایش و ئارامی نەکات، وا دەزانێت پێویستە هەمو واقیعەکان لەگەڵ پارادیمی ئەمدا بگونجێن. بە پێویستی دەزانێت هەمو خەڵکەکە بکاتە فۆتۆکۆپییەکی هاوجوتی خۆی و دنیا بە شێوەیەك دابڕێژێتەوە کە لەگەڵ دید و بۆچونی خۆیدا بگونجێت. مرۆڤی ئاوا لەو راستییە بێئاگایە کە هێزی راستەقینەی پەیوەندی ئەوەیە گۆشەنیگایەکی دیکەت هەبێت. جیاوازییەکان سەرچاوەی هێزن لە پەیوەندییەکاندا؛ لێکچون یەکسان نییە بەوەی هەموان یەك

شت بن. یەکێتی یاخود یەکبون شتێکە لەگەڵ خۆیدا دەگاتە کامڵبون نەك بەوەی هەمو پێکهێنەرەکان کتومت لەیەکتری بچن. لەیەکچون شتێکی بێزارکەرە و نابێتە مایەی داهێنان. کرۆکی هاوکاری خولقێنەر لەوەدایە رێز لە جیاوازییەکان بگرێت.

من لەو باوەڕەدام کە کلیلی هاوکاریکردنی خولقێنەر لەگەڵ خەڵکیدا بریتییە لە هاوکاریکردنی ناخی خۆت، واتە هاوکاریکردنی خولقێنەر لەناوەوە. دیارە رۆحی ئەم جۆرە هاوکاریکردنە خولقێنەرەش لە ناوەوە ئەوەتا لەناو پرنسیپی خووەکانی یەکەم و دووەم و سێیەمدا کە بایی هێندە ئاسایش و ئارامی دەبەخشن بە مرۆڤەکە بتوانێت بەرگەی مەترسییەکانی کرانەوە و رەخنەلێگرتن بگرێت. ئێمە ئەگەر بتوانین ئەو پرنسیپە رەسەنانە هەڵبهێنجێنین بە دڵنیاییەوە دەبینە خاوەنی ئەقڵێکی بەرچاوتێر کە ئەقڵی براوە/ براوە و قازانجی هەموان و ناوەڕۆکی پێنجەمین خووە.

مرۆڤ ئەگەر پرنسیپەکان بکاتە سەنتەری خۆی، یەکێك لە ئەنجامە باشەکانی ئەوەیە کە بەراستی مرۆڤەکە لە دڵ و دەرونـدا دەکاتـە کەسێکی کامڵ. ئیتر ئەوکەسانەی کە پابەندی بیرکردنەوەی لۆجیك و شێوازە گفتارییەکەی نیوەی چەپی مێشکن، بۆیان دەردەکەوێت ئەو بۆچون و بیرکردنەوەیەی ئەوان چەندە ناتەواوە لە چارەسەرکردنی ئەو کێشانەدا کە برێکی زۆر داهێنانیان پێویستە. ئاگادار دەبن لەمەو دەست دەکەن بە کردنەوەی بەشێکی نوێ لە نیوەی راستی مێشکی خۆیاندا. ئەمە مانای ئەوە نییە کە پێشتر نیوەی دەستەراستی مێشکیان نەبووە، بەڵکو تەنیا هەر ناچالاك بووە. واتە ماسولکەکانی ئەو نیوەیە لە زگماکییەوە گەشەیان نەکردووە، یاخود لە قۆناغێکی سەرەتایی تەمەنی منالیدا پوکاونەتەوە بەهۆی جەختکردنەوەی زۆری نیوەی مێشکی چەپ لەسەر خوێندنی فەرمی و پەیرەوکردنی دەقە کۆمەڵایەتییەکان.

خەسڵەتەکانی بەشی لای راستی مێشك بریتین لە خولقاندن و پەیپێبردن و بینین. خەسڵەتەکانی بەشی لای چەپیش بریتین لە لۆجیك و قسەو لێکدانەوە. مرۆڤ ئەگەر دەستی بگاتە هەردووبەشەکەی مێشکی خۆی مانای وایە مێشکەکە بە تەواوی کاردەکات. بە واتایەکی دیکە، هاوکاریکردنێکی خولقێنەرانەی دەرونیی لە مێشکماندا هەیە. ئەمەش باشترین کەرەسەو ئامێرە بۆ تێگەیشتن لەوەی ژیان چییە.

**چونکە ژیان تەنیا هەر شتێکی لۆجیکی نییە بەڵکو سۆز و هەستیش ڕۆڵی گرنگی تیا دەگێڕن.**

**ڕۆژێکیان من سیمینارێکم دەگێڕا بۆ کۆمپانیایەك لە (ئۆرلەندۆ) لە ویلایەتی فلۆریدا. ناونیشانی سیمینارەکە خۆم دامنابو بریتی بو لە "بەڕێوەبردن لە چەپەوە، سەرکردایەتیکردن لە راستەوە". لە کاتی پشوودا سەرۆکی کۆمپانیاکە هاتەلام و وتی "لەوەدەچێت سەرم لێ شێوابێت. بەڵام بەراستی بیر لەوە دەکەمەوە بابەتی سیمینارەکە زیاتر لە ژیانی هاوسەرگیریمدا جێبەجێ بکەم وەك لە بواری پیشەکەمدا. من و هاوسەرەکەم لە مەسەلەی پەیوەندیی نێوانماندا کێشەیەکی جددیمان هەیە. نازانم ئاخۆ بۆت دەکرێت نانی نیوەڕۆمان لەگەڵدا بخۆیت و تەنیا هەر تەماشا بکە بزانە من و ئەو چۆن قسە لەگەڵ یەکتریدا دەکەین؟!".**

**وەڵامم دایەوە: "بەسەرچاو"**

**کە پێکەوە دانیشتین، هەندێك قسەی خۆشمان بۆ یەکتری گێڕایەوە، پاشان کابرا رووی کردە ژنەکەی و وتی: "دەزانیت چی گیانەکەم" من (ستیڤن)م بانگهێشت کردووە تا نانی نیوەڕۆمان لەگەڵدا بخوات و بزانێت تا چەند دەتوانێت لە گفتوگۆی نێوانماندا یارمەتیمان بدات. دەزانم تۆ پێت وایە پێویستە من وەکو مێردێك هەست و پێزانینی زیاترم هەبێت بەرامبەرت. ئایا دەکرێت بە نمونەیەکی دیاریکراو بۆم روون بکەیتەوە کە پێویستە من چی بکەم؟. (بەشی چەپی مێشك کۆنترۆڵی بەدەستەوەبو، دەیویست بە دیاریکراوی شتەکانی پێ بوترێت).**

**ژنەکە وتی: (زۆرچاکە، وەك پێشتریش پێم وتیت، شتێکی دیاریکراو نییە: مەسەلەکە زیاتر لە هەستێکی گشتییەوە نزیکە، دەربارەی ئەو شتانەیە کە بەلای منەوە بایەخی زۆریان هەیە). (ئەمە بەشی راستی مێشکە کە باڵادەستە و سەروکاری لەگەڵ هەست و شتە گشتییەکاندا هەیە، لەگەڵ (هەمو)دا و لەگەڵ پەیوەندی نێوان پارچەکاندا.)**

**"تێناگەم؟ مەبەستت چییە لە هەستی گشتی و مەسەلە گرنگەکان. چیت لە من دەوێت بیکەم؟ شتێکی دیاریکراوم پێ بڵێ. شتێك بتوانم بەدەست بیگرم**

"پـێم وتیـت، شـتەکە تـەنیا هەسـتە". (بەشـی راسـتی مێشکی ئـەم ژنـە خـەریکی وێنەکان و هەستەکانە) "وا هەست دەکەم پەیوەندییەکەمان ئەوەنـدە بەلاتـەوە گـرنگ نیـیە کە بە قسە پێمی دەڵێیت"

"باشە، چی بکەم بۆ ئەوەی گرنگتر بێت؟ شتێکی کۆنکرێتی و دیـاریکراوم پـێ بڵـێ لەسەری بڕۆم".

"زەحمەتە. بە قسە ناوترێت".

ئـا لێـرەدا کـابرا نـەختێك چـاوی گێـڕا و ئینجـا تەماشـایەکی کـردم، وەك ئـەوەی بیــەوێت بڵێــت (ســتیڤن تــۆ لەگــەڵ هاوســەرەکەی خۆتــدا بەرگــەی بــێ ئــەقڵیی وا دەگریت؟).

"مەسەلەکە هەستە هەست، هەستێکی زۆر بەهێز"

پیاوەکـە پێـی وت: "گیانەکـەم ئـەوە کێشـەی خۆتـە .. دایکیشـت هـەمان کێشـەی هەیــە. لەراســتیدا ژن نــیــە ئــەم کێشــەیەی نــەبێت". پاشــان دەســتی کــرد بــە پرسیارلێکردنی، وەك ئەوەی لە دادگادا بێت و ئیفادەی لێ وەربگیرێت"

"ئەمماڵەی کە تیا دەژیت بەدڵتە؟"

ژنەکە بە هەناسەیەکی ساردەوە وەڵامی دایەوە

"مەسەلە ئەوە نییە. بە هیچ جۆرێك ئەوە نییە،

مێردەکەی دەیویست تۆڕەییەکەی خۆی بشارێتەوە، وتی:

"دەزانم ئەوەنییە. بەڵام ئەگەر تۆ بـەدیاریکراوی پـێم نـەڵێیت مەسـەلەکە چییە ناچارم یەك یەك شتەکانت لێ بپرسم، بزانم رێك کامەیانە. وەڵامـم بـدەرەوە ئایـا ئـەم ماڵەت بەدڵە؟

"وابزانم"

"بەقوربان، ستیڤن زۆر ناتوانێت لێرە بمێنێتەوە. هاتووە یارمـەتیمان بـدات. تکات لێ دەکەم وەڵامەکەت خێرابێت، بەڵێ یان نەخێر. ئایا ئەم ماڵەت بەدڵە؟"

"بەڵێ"

"زۆرچـاکە. کەواتـە ئەمـەیان هـیچ. ئـەی باشـە هەرچییەکت حـەز لێ بێـت بـۆت دابین کراوە؟"

"بەڵێ"

"زۆرباشە. ئەو شتانەی دەیانکەیت هەمویان بە دڵی خۆتن؟"

ئـەم جـۆرە پرسـیار و وەڵامانـە ماوەیـەك درێـژەیان کێشا. هەسـتم کـرد دۆخەکـە ئەگەر ئاوا بەردەوام بێـت مـن هـیچ یارمەتییـەکم لەدەست نایـەت. بۆیـە قسـەکەم پـێ بڕین و وتم: "بەراست ئێوە پەیوەندییەکەتان ئاوایە"

مێردەکە وەڵامی دامەوە "هەمو رۆژێك. ستیڤن"

ژنەکە بەدەم هەنسکەوە وتی "ژیانی ئێمە ئەمەیە"

تەماشـای هـەردوکیانم کـرد و یەکسـەر ئـەوە هـات بـە خەیاڵمـدا کـە ئـەمان (دوو نیوە)ن و پێکەوە دەژین.

پرسیم: "هیچ منداڵتان هەیە؟"

"بەڵێ . دوان"

بە سەرسوڕمانەوە پرسیم: "بەڕاست؟ باشە چۆن دروستتان کردن؟"

"مەبەستت چییە دەڵێیت چۆن دروستتان کردن؟"

وتم: "لە دروستکردنی منداڵەکانتاندا ئێوە هاوکاری خولقێنـەر بـون. یـەك کـۆ یـەك دەکاتە دو، یەکتر تەواوکردنە، بەڵام ئێوە کردتـان بـەوەی یـەك کـۆ یـەك بکاتـە چوار. هاوکاریکردنی خولقێنەر ئەمەیە. (هەمو) لە کۆی گشتی پارچەکان گـەورەترە. چۆن کردتان؟

مێردەکە وەڵامی دامەوە: "خۆت دەزانیت چۆن کردمان"

بە سەرسوڕمانەوە وتم: کەواتە حەتمەن نرخی جیاوازییەکانتان زانیوە؟

## رێزگرتنی جیاوازییەکان

لەراسـتیدا رێزگرتنـی جیاوازییـەکان .. جیاوازییـە ئـەقڵی و دەرونـی و سـۆزدارییەکانی نێـوان خـەڵك کرۆکـی یەکترتەواوکردنـە. کلیلـی ئـەم رێزگرتنـەش ئەوەیە کە بزانیت هەرکەسەو جیهان لـە چاوی خۆیـەوە دەبینێـت، نـەك وەك ئـەوەی کە هەیە بەڵکو خۆی چۆن بێت ئاواش جیهان دەبینێت.

من ئەگەر وابزانم دنیا وەکو خۆی دەبینم و بەو شێوەیە دەیبیـنم کـە هەیـە، ئیتر چ پێویست دەکات حساب بـۆ جیاوازییـەکان بکـەم؟ بـەڵکو بۆچـی خـۆم بـە کەسـێکەوە خەریك بکەم کـە جۆرێکی دیکەیـە؟. پـارادیمی مـن ئەوەیـە کـە مـن بابـەتیم و سـەدی

سەد راستم. جیهان وەکو خۆی دەبینم. بەڵام ئەوانی دیکە، هەتا بیناقاقایان نوقمی وردەکارییەکانە. کەچی من تەماشای وێنە گەورەکە دەکەم. لەبەر ئەوە ناویان لێ ناوم چاودێر چونکە توانایەکی دیارم هەیە لە تێبینیکردندا. ئەگەر پارادیمی من بەم شێوەیە بێت، هەرگیز ناتوانم کەسێکی کاریگەر بم و هاوکارییەکی خوڵقێنەر لەگەڵ هیچ کەسێکدا دابمەزرێنم. پارادیمەکەم کە زادەی پێکهاتەی تایبەتی خۆمە دەبێتە کۆت و پێوەند و لە سنورێکی دیاریکراودا زیندانیم دەکات.

ئەو کەسە کاریگەری راستەقینەیە کە لوتبەرزی بخاتە لاوەو هێندە بوێر بێت بتوانێت سنوری توانا و هەستی خۆی بزانێت و رێز بۆ ئەو دەسکەوتە زۆرانەش دابنێت کە هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەقڵ و دڵی خەڵکانی دیکەدا پێی دەبەخشن. کەسی ئاوا رێزی جیاوازییەکانی لایە چونکە ئەو جیاوازییانە زانیارییەکانی زیاد دەکەن و وای لێ دەکەن راستییەکان چاکتر تێبگات. مرۆڤ ئەگەر تەنیا بەدیار ئەزمونەکانی خۆیەوە دابنیشێت وای لێ دێت بەدەست کەمی زانیارییەوە بناڵێنێت. ئایا هیچ لۆجیکێك لەوەدایە دوکەس لەسەر مەسەلەیەك بیرو بۆچونی جیاوازیان هەبێت و هەردوکیشیان لەسەر هەق بن؟ نەخێر ئەمە شتێکی لۆجیکی نییە، سایکۆلۆجییە. زۆر راستیشە تۆ کچە گەنجەکە دەبینیت و منیش خاتونە پیرەکە. ئێمە هەردوکمان تەماشای یەك وێنە دەکەین و هەردوکیشمان راستین. هەردوکمان هەمان هێڵی رەش و هەمان پانتایی سپی دەبینین، بەڵام هەریەکەمان بە جۆرێکی تایبەت لێکیان دەدەینەوە چونکە وا دروست کراوین بە شێوازی جیاواز لەیەکتری شتەکان لێك بدەینەوە. ئێمە هەتا رێزی ئەو جیاوازییانەی خۆمان نەگرین کە شتەکانیان پێ لێك دەدەینەوە و هەتا نرخی یەکتریمان لەلا نەبێت و ددان بەوەدا نەنێین کە زۆر ئاساییە هەردوکمان لەسەر هەق بین و هەتاکو نەزانین کە ژیان ئاوایە و شتێك نییە دابەش بوبێت بەسەر دوو جەمسەری دژبەیەکدا و تەنیا هەر رەش و سپی نییە و زۆرجار ئەڵتەرناتیڤی سێیەمیش لەئارادایە، هەتا ئەمانە یەکلانەبنەوە لەلامان مەحاڵە بتوانین کۆت و پێوەندەکانی ئەو پێکهات و راهاتنە بشکێنین.

من رەنگە تەنیا هەر ژنە پیرەکە ببینم. بەڵام دەزانم کە تۆ شتێکی دیکە دەبینیت. رێزی بۆچوونەکانت دەگرم و دەمەوێت تێبگەم. کاتێك من ئاگاداری ئەم

جیاوازییەی نێوانمان دەبم، دەڵێم: "زۆرچاکە، تۆ شتەکە بە شێوەیەکی جیاواز دەبینیت، دە یارمەتی منیش بدە. ئەوەی تۆ دەیبینیت منیش بیبینم."

ئەگەر دووکەس هەمان بیروبۆچوونیان هەبێت، کەواتە یەکێکیان زیادەیە. من هەرگیز هیچ سودێك لەو پەیوەندییە نابینم کە بە کەسێکمەوە دەبەستێت ئەویش وەك من تەنیا ژنە پیرەکە دەبینێت. من نامەوێ قسە و پەیوەندییم لەگەڵ کەسێکدا بێت کە لە هەمو شتێکدا وەکو خۆم وابێت و هاوڕای من بێت، بەڵکو ئەو پەیوەندییەم مەبەستە کە شتەکان بە شێوەیەکی جیاواز لە من دەبینێت. من جیاوازییەکانم لەلا گرنگە.

مرۆڤ کە بایەخ بە جیاوازییەکان دەدات، تەنیا هەر زانیارییەکانی خۆی زیاد ناکات بەڵکو مانای وایە حساب بۆ بەرامبەرەکەشی دەکات و بە هەندی وەردەگرێت. ئۆکسجینێکی دەرونی پێ دەبەخشێت. قاچ لەسەر ئیستۆپ هەڵدەگرێت و ئەو وزە نەرێنی‌یە دەردەپەڕێنێت کە ڕەنگە بەکاری هێنابێت لە بەرگریکردن لە هەڵوێستێکی دیاریکراودا. بەمەش ژینگەیەك بۆ یەکتەتەواوکردن دەخوڵقێنێت.

چیرۆکێکی ئەفسانەیی هەیە کە مامۆستای پەروەردەکار، د. ئار. ئێچ. ریڤیز نوسیوێتی بە ناونیشانی (قوتابخانەی ئاژەڵان). ئەم چیرۆکە زۆرجار سودی لێ وەرگیراوە وەکو سەرچاوەیەك بۆ ڕوونکردنەوەی بایەخی جیاوازییەکان. چیرۆکەکە دەڵێت:

"ڕۆژێك لە ڕۆژان ئاژەڵەکان بڕیاریان دا بۆ ڕووبەڕووبونەوەی کێشەکانی (جیهانی نوێ) قارەمانێتییەك بنوێنن. لەبەر ئەوە قوتابخانەیەکیان کردەوە و مەنهەجێکی وایان بۆ دانا کە ڕاکردن و مەلە و دارەوانی و فڕین وانەکانی پێك بهێنن. جا بۆ ئەوەی کارەکە بۆ بەڕێوەبەر ئاسان بکەن هەمو ئاژەڵەکان هەمو وانەکانیان هەڵبژارد.

مراوی لە مەلەکردندا زۆر شارەزابو، تەنانەت لە مامۆستاکەش شارەزاتربو، هەروەها لە فڕینیشا نمرەی بەرزی هێنا، بەڵام لە ڕاکردندا لاوازبو. بۆیە ناچارکرا پاش دەوامی فەرمیش لە قوتابخانە بمێنێتەوە و ڕاهێنان بکات لەسەر ڕاکردن، تەنانەت مەلەکردنیشی پشتگوێ خست لەپێناوی ڕاکردندا. ئەمە درێژەی کێشا تا وای لێ هات قاچەکانی کە بۆ مەلەکردن خوڵقابون، لەکەڵك کەوتن و بە زەحمەت

دەیتـوانی لـە دەرسـی مەلەکردنـدا نمـرەی (مامناوەنـد) وەربگرێـت. ئـەم نمرەیـەش چـونکە لـە قوتابخانەکـەدا قبـولکراو بـو لەبـەر ئـەوە تـەنیا هـەر خـۆی نیگـەرانی دابەزینی ئاستی مەلەکردنی بو.

لە راکردنـدا کەروێشـک بـووە یەکـەمی پـۆل، بـەڵام ئەوەنـدە سـفری وەرگرتبـو لـە مەلەکردندا خەریك بو شێت دەبو. سمۆرە لـە دارەوانیـدا پلـەی نایـابی وەرگـرت، بـەڵام لە دەرسی فڕیندا توشی نائومێدییەکی گـەورەبو؛ بەتایبـەت کـە مامۆسـتاکە لـە تۆڵـەی ئەوەدا ناچاری دەکرد لـە خـوارەوە سـەرکەوێت بـۆ سـەرەوە نـەك لەسـەر درەختەکـەوە دابەزێتـە خـوارێ و ئـەم مەشـق و راهێنانـە زۆر و سـەختەش بونـە هـۆی رەق بـونی دەستەکانی و لەئەنجامدا وای لێ هات نمرەکانی لە دارەوانی و راکردندا زۆر زۆر دابەزن.

هەڵۆش وەکو منـاڵێکی لاسار و سـەربەگۆبەند وابـو، زۆریـش نارەحـەت دەکـرا. لـە دەرسـی دارەوانـی و سـەرکەوتندا بـۆڕی هـەمو ئـەوانی دیکـەی دەدایـەوە و لـە چاوتروکانێکدا دەگەیشتە لوتکـەی دارەکـە، بـەڵام هەمیشـە بـە شـێوازی خـۆی ئـەم کارەی دەکرد.

لە کۆتایی ساڵدا لەناو هەمو ئاژەڵەکانـدا مارماسییەکی نائاسایی بـەرزترین نمـرەی هێنا لەکۆی گشتی نمرەکاندا چونکە هـەم لـە مەلەوانیـدا ئەوپـەڕی شارەزایی نوانـد و هـەم لـە راکـردن و مەلـەکردن و بەرزبونەوەشـدا هەنـدێك توانـای هـەبو، تەنانـەت دەشـیتوانی تۆزقاڵێـك بفڕێـت، لەبـەر ئـەوە خوێندنـەوەی وتـاری ماڵئـاوایی بـەم سپێردرا.

ئەوەی شیاوی باسە، سـەگ ئامادەنـەبو بچێتە ئـەو قوتابخانەیـە و تەنانـەت کەوتـە دژایەتیکردنیشی، چونکە هەردو وانـەی چاڵهەڵکەندن و گـەڕان نەخرابونـە بەرنامـەی خوێندنەوە. سەگەکان لە تۆڵەی ئەمـەدا راهێنـانی توتکەکانی خۆیـان بـە گۆڕهەڵکەن سپاردو دواتریش لەگەڵ بەرازەکاندا قوتابخانەیەکی تایبەتیان کردەوە.

## شیکاریکردنی هێزەکانی گۆڕەپان

هاوکـاریکردنی خولقێنـەر بەتایبـەت لـەو هەڵوێسـتانەدا بـەهێز دەبێـت کـە هاوکارییکردنت لەگەڵ خەڵکیدا بۆ چارەسـەرکردنی ئـەو هێـزە نەرێنیـیانـە بێـت کـە دژی گۆڕان و گەشەکردن کاردەکەن.

(کورت لوین Kurt Lewin) کە مامۆستایەکی ناسراوی کۆمەڵناسییە مۆدێلێکی داناوە بۆ (شیکارکردنی هێزەکانی گۆڕەپان) کە دەڵێت ئاستی ئێستای هەمو پێکهاتە و کارێك بریتییە لە هاوسەنگی نێوان هێزە پاڵنەرەکانی کە یارمەتی جوڵەکە دەدەن بەرەو سەرەوە لەگەڵ هێزە خاوکەرەکانی کە کار بۆ دامرکاندنەوەی جوڵەکە دەکەن. خەسڵەتی هێزی پاڵنەر ئەوەیە کە ئەرێنی و ئەقڵانی و هوشیار و لۆجیکییە و مەسەلە ئابورییەکان بەهەند وەردەگرێت.

بە پێچەوانەی ئەمەشەوە هێزە خاوکەرەوەکە نەرێنی و ناهۆشیار و سۆزداری و کۆمەڵایەتی دەرونییە. ئەم دوو کۆمەڵە هێزە لە واقیعدا هەن و پێویستە لە مەسەلەی هەڵسوکەوتماندا لەگەڵ خەڵکیدا بەهەند وەریان بگرین.

تۆ ئەگەر خێزانێك بە نمونە وەربگریت، لەو خێزانەدا "کەش و هەوایەکی تایبەت" دەبینیت – ئاستێکی دیاریکراو لە کارلێکی ئەرێنی / نەرێنی و لە هەستکردن / هەستنەکردن بە ئارامی لە مەسەلەی دەربڕینی هەستی راستەقینەی خۆت یاخود لە باسکردنی ئەو شتانەی بەلاتەوە گرنگن، لە رێزگرتن / رێزنەگرتنی ئەندامانی خێزانەکە لە یەکتری، وە رەنگە تۆ بەراستی ئارەزومەندی گۆڕینی ئەو ئاستەبیت و حەزبکەیت کەش و هەوایەکی ئەرێنی و رێزدارتر و کراوەتر و متمانەداتر بخوڵقێنیت. هۆکارە لۆجیکییەکانی تۆ بۆ ئەنجامدانی ئەوکارە هێزە پاڵنەرەکانن کە کار بۆ بەرزکردنەوەی ئاستەکە دەکەن.



بەڵام ئامانجەکە تەنیا بەوە نایەتەدی کە ئەو هێزە پاڵنەرانە زیادبکەیت. چونکە کۆمەڵێك هێزی خاوکەرەوە هەن روبەروی هەوڵەکانت دەبنەوە – لەرێی ئەو رۆحە رکابەرییەوە کە لەنێوان منداڵانی ناوخێزانەکەدا هەیە و هەروەها لەرێی ئەو شەقڵ و نەریتە جیاوازانەی کە هەرکام لە تۆ و هاوسەرەکەت لە خێزانەکەدا هێناوتانە ئاراوە و هەروەها لەرێی کارو داواکارییەکانی دیکەی کە کاریگەرییان هەیە لەسەر کات و وزەکانی تۆ.

زیادکردنی هێزە پاڵنەرەکان رەنگە ئەنجامگەلێکی کاتییان هەبێت، بەڵام هەتا هێزە خاوکەرەوەکان هەبن، کێشە و ناڕەحتییەکان لەزیادبوندا دەبن و مەسەلەکە رێك لەوە دەچێت گوشار بخەیتە سەر زەمبەلەکێك: هەتا زیاتر پاڵی پێوە بنێیت ئەویش زیاتر پاڵت پێوە دەنێت و ئینجا لەپڕ هێزی زەمبەلەکەکە شتەکە هەموی دەگێڕێتەوە بۆ خاڵی سەرەتا. ئەم ئەنجامە سەربەرەوژووروو سەربەرەوخوارە کە لە یاری (یو-یو) دەچێت وات لێ دەکات پاش چەندین هەوڵوتەقەلا بگەیتە ئەو باوەڕەی کە (خەڵکەکە هەر ئەمەندەیان لەبارادایە) و (گۆڕین کارێکی زۆر زەحمەتە). بەڵام کاتێك گە پرنسیپی خوڵقێنەر جێبەجێ دەکەیت، تۆ بە کردەوە هێزە پاڵنەرەکەی خووی ژمارە چوار و شارەزاییەکەی خووی ژمارە پێنج و کارلێکە ئاشکراکەی خووی ژمارە شەش دەخەیتە گەڕ بۆ ئەوەی راستەوخۆ کاربکەنە سەر هێزە خاوکەرەوەکان. تۆ کەش‌وهەوایەکی وا دەهێنیتە ئاراوە کە قسەکردن دەربارەی ئەو هێزانە هیچ مەترسییەکی لەسەر نەبێت. تۆ بەستەڵەکی ئەو هێزانە دەتوێنیتەوە، وردو خاشیان دەکەیت و تێڕوانینی تازەی وا دروست دەکەیت کە ئەو هێزە خاوکەرەوانە بگۆڕن بە هێزی پاڵنەر. تۆ خەڵکەکە بەشدار دەکەیت لە کێشەکەدا، نەك هەر ئەوە بەڵکو نوقمیشیان دەکەیت لەناویاندا بەو مەبەستەی کە تەواو تیایدا بخوسێن و بە کێشەی خۆیانی حساب بکەن و هەوڵ بدەن ببنە بەشێك لە چارەسەرەکە.

لە ئەنجامی ئەمەدا کۆمەڵێك ئامانجی هاوبەش و نوێ پەیدا دەبن و پرۆژەکە هەموی پێکەوە دەچێتە پێشەوە، کە زۆرجار ئەم چوونە پێشەوەیە بە شێوازی وا دەبن پێشتر کەس پێشبینی نەکردون. ئەوسا ئیتر لە دوتوێی ئەم جوڵەیەدا چالاکییەك دروست دەبێت کە بەشداری دەکات لە دروستکردنی کەلتورێکی تازەدا. ئەوانەش کە سەر بەو کەلتورە دەبن وایان لێ دێت بایەخی تەواو بە بارودۆخە

مرۆڤایەتییەکانی یەکتری بدەن و دەبنە خاوەنی گوشەنیگای تازە و بیرکردنەوەی ئەلتەرناتیف و هەلی نوێ و خولقێنەر. من خۆم چەندین جار چوومە ناو دانوستاندنی نێوان خەلکی واوە کە زۆر دوژمنایەتی یەکترییان کردووە و پارێزەریان گرتووە بەرگری لە هەلوێستی خۆیانی پێبکەن. ئەنجامی ئەو کارانەشیان تەنیا گەورەبونی کێشەکەی لێ کەوتۆتەوە چونکە بردنی ئەو مەسەلەیە بەناو پرۆسە یاساییەکاندا دەبێتە مایەی لاوازکردن و شێواندنی پەیوەندییەکانی نێوانیان. بەلام لەبەر ئەوەی متمانەکردنیان بە یەکتری هێندە لاواز بووە، هیچ چارەیەکی دیکەیان نەبووە جگە لەوەی مەسەلەکە بەرنە دادگا. ئەمانە وا رەفتار دەکەن بەلام کە لە هەرکامێکیشیان بپرسیت بلێیت "ئایا پێت خۆشە کێشەکە بە شێوازی براوە/ براوە چارەسەر بکەیت و هەردوولاکە رازی بکات". لە وەلامدا هەموویان دەلێ: بەلێ ...، بەلام لەراستیدا کەم کەسیان لەوباوەڕەدان کە بتوانرێت چارەسەری وا بدۆزرێتەوە.

"ئەگەر لایەنەکەی دیکەم رازی کرد، ئایا تۆش پێت خۆشە راستەوخۆ قسە لەگەل یەکتریدا بکەن؟". لەمەشدا هەر دەلێن "بەلێ". لە زۆربەی هەرە زۆری حالەتەکاندا ئەنجامەکان سەرنجڕاکێش بون، توانرا لە ماوەی چەند رۆژێك و بگرە هەندێك جار لە چەند سەعاتێکی کەمدا ئەوکێشانە چارەسەر بکرێن کە چەند مانگێك بو بەدەست ئالۆزبونە دەرونی و یاساییەکانیانەوە دەیاننالاند. زۆربەی ئەم چارەسەرانەش جیاوازبون لە چارەسەرە مامناوەندییەکانی دادگا و بریتی بون لە کۆمەلە رێگا چارەیەکی خولقێنەری هاوکارانە و زۆر چاکتربون لەو چارەسەرانەی کە لایەنەکان هەر یەکە لای خۆیەوە پێشنیاری کردبو.

هەروەها، لە زۆربەی حالەتەکانیشدا، پەیوەندییەکان گەشەی زیاتریان کرد، هەرچەندە لەسەرەتادا وا دەردەکەوت کە متمانەکە هێندە لاوازە و پەیوەندییەکە بەجۆرێك تێك چووە کە چاککردنی مەحالە.

لە یەکێك لە پرۆگرامەکاندا بەڕێوەبەرێك چیرۆکی خاوەن کارگەیەکی بۆ گێڕاینەوە کە یەکێك لە کڕیارە کۆنەکانی چووە لە دادگا شکاتی لێ کردووە لەسەر ئەوەی پابەندی رێکەوتنەکەی خۆی نەبووە و لەکاتی دیاریکراودا بەلێنەکەی جێبەجێ نەکردووە .. دوو لایەنەکەش هەریەکەیان باوەڕی تەواوی بەوە هەبو کە هەر خۆی لەسەر هەقە و لایەنەکەی بەرامبەرە کە نە پرنسیپی هەیە و نە

**شایستەی متمانەشە. بەڵام هەر کە دەستیان کرد بە جێبەجێکردنی پرنسیپەکانی خووی ژمارە (٥) دوو مەسەلەیان بۆ روون بووەوە: یەکەمیان ئەوەبو کە کێشە سەرەتاییەکانی گفتوگۆ و پەیوەندی نێوانیان خەتای ئەوەبو خراپ لە یەکتری حاڵی بون و دواتر کە کەوتونەتە تاوانبارکردنی یەکتری کێشەکە خراپتری لێ هاتووە .. مەسەلەی دووەمیش، ئەوەبو کە هەردوکیان نیازیان چاك بووە و حەزیان لە شەڕ و بگرەو بردەی دادگایان نەبووە، بەڵام لە ناچاریدا ئەو ڕێیەیان هەڵبژاردووە.**

**پاش روونبونەوەی ئەم دوو مەسەلەیە، رۆحی هەرسێ خووەکەی ژمارە چوار و پێنج و شەش باڵی بەسەریاندا کێشاو کێشەکەش بەخێرایی گەیشتە چارەسەر و پەیوەندییەکانی نێوانیان گەشانەوە.**

**لە هەڵوێستێکی دیکەدا، من بەیانییەکیان زوو، تەلەفۆنێکم بۆ کرا لە سەرمایەگوزارێکی زەوی و خانووەوە و زۆر پاڕایەوە کە یارمەتی بدەم. لە قسەکانییدا دیاربو زۆر نائومێد و گرفتارە. بانق دەیویست دەست بەسەر ملکەکانیدا بگرێت چونکە ئەم نەیتوانیبو لە وادەی خۆیدا قەرزەکەی بانق بداتەوە کە سودیشی خرابووە سەر. ئەمیش لەلای خۆیەوە دەعوایەکی لەسەر بانقەکە تۆمار کردبو بەمەبەستی راگرتنی ئەم حیجزە، کابرای سەرمایەگوزار پێویستی بەوەبو بڕێ پارەی دیکەی بدرێتێ تا بتوانێت زەوییەکە تەخت و ئامادە بکات بۆ ئەوەی بتوانێت قەرزی بانقەکە بداتەوە، بانقەکەش دەیوت هەتا قەرزە کۆنەکە نەدەیتەوە قەرزی تازەت نادەمێ. مەسەلەکە رێك وەکو ئەوی لێ هات هێلکە لە مریشکە یان مریشك لە هێلکەیە. نەبونی پارە و سەرمایەش کێشەکەی ئاڵۆزتر کرد. لەهەمان کاتیشدا پرۆژەکە هەرسی دەهێنا و شەقامەکان زیاتر لە دەشتێك دەچون گژوگیای کێویان لێ روابێت. خاوەنەکانی ئەو چەند خانووە کەمەش کە دروست کرابون هەڵوێستیان کردبو بە (یەك) بۆ ئەوەی نرخی خانووەکانیان بە بەرزی بمێنێتەوە. شارەکەش تێکڕا ئاژاوەو نیگەرانی تێکەوتبو بەهۆی دواکەوتنی پرۆژەکە لە وادەی دیاریکراوی خۆیدا و بوبوە مەرافێکی گەورە. خەرجی دەعوا و پارێزەرەکانیش کە هەردولا (بانقەکە و کابرای سەرمایەگوزار) دایان شەست حەفتا هەزار دۆلار زیاتر بو کەچی هێشتا وادەی دادگاییەکردنەکە چەند مانگێکی مابو.**

سەرمایەگوزارەكە بە نابەدڵی و لە ناچاریدا رازی بو هەوڵ بدات پرنسیپەكانی خووی چوارەم و پێنجەم و شەشەم تاقی بكاتەوە، هەروەها پاش دودڵییەكی زۆر فایل بو لەگەڵ بەپرسانی بانقەكەدا كۆببێتەوە. كۆبونەوەكە لە هۆڵێكی كۆبونەوە لە بانقەكەدا سەعات هەشتی بەیانی دەستی پێكرد بە نائارامییەكی زۆر و لەوپەڕی بێ متمانەییدا بەیەكتری. پارێزەری بانقەكە بە كاربەدەستانی بانقەكەی وتبو كە نابێت هیچ بڵێن و تەنیا هەر گوێ بگرن. قسەكردن بۆ ئەو جێ بهێڵن نەبادا شتێك روبدات كاری خراپ بكاتە سەر هەڵوێستی بانقەكە لە دادگادا.

سەرەتا من سەعات‌ونیوێكی رەبەق باسی خووەكانی چوارەم و پێنجەم و شەشەمم بۆ دەكردن. لە سەعات نۆو نیودا چومە لای تەختە رەشەكەوە ئەو مەسەلانەم یادداشت كرد كە بە باوەڕی من بونەتە مایەی نیگەرانبونی بانقەكە. لە سەرەتادا كاربەدەستانی بانقەكە یەك وشەیان لەدەم نەهاتە دەرەوە. بەڵام كە ئێمە بەردەوام بوین لەسەر رونكردنەوەی مەبەست و نیازەكانی شێوازی براوە — براوە و هەوڵدانی ئەوەی سەرەتا لە بەرامبەرەكەمان تێبگەین، ئیتر ئەوان زیاتر ئامادەییان تیا دەركەوت بۆ باسكردن و رونكردنەوە.

كاتێكیش كە هەستیان كرد ئێمە لە دیدو بۆچوونەكانی ئەوان تێگەیشتوین، رەوشەكە بە تەواوی گۆڕا و هەمو لایەك بە ئاشكرا هەستمان بەوە دەكرد كە هێزێكی پاڵنەر هەیە و بە پەرۆشەوە سەرنجی ئەوەمان دەدا كە دەتوانین كێشەكە بە ئاشتی یەكلابكەینەوە و نوێنەرانی بانقەكە زیاتر كرانەوەیان نیشان دەدا بەرامبەر بە نارەزاییەكانی پارێزەری بانقەكە و بگرە بەرامبەر مەراقە تایبەتییەكانی خۆیشی كە دەیوت "كە لێرە چوینە دەرێ، یەكەم پرسیار كە سەرۆكی بانقەكە دەیپرسێت دەڵێت ئایا ئێمە پارەكەمان دەست كەوتووە؟ من چی پێ بڵێم؟ لە سەعات یانزەشدا كاربەدەستانی بانقەكە هێشتا باوەڕی تەواویان بە هەڵوێستی خۆیان هەبو، بەڵام لە هەمان كاتیشدا هەستیان دەكرد كە ئێستا بەرامبەرەكەیان لێیان تێگەیشتووە و ئیتر پێویست بەوە ناكات هەڵوێستی بەرگریكاری و نارەسمی وەرگرن. كاربەدەستانی بانقەكە تا ئەو ئەندازەیە كرابونەوە كە گوێ لە مەراقەكانی كابرای سەرمایەگوزار بگرن، ئەو مەراقانەی كە ئێمە لەبەری ئەوبەری تەختە رەشەكە نوسیبومان. بەمەش زیاتر لەیەكتری تێگەیشتین و هەمومان بۆمان ئاشكرابو كە پەیوەندی

سەرەتایی خراپ چۆن کاری کردۆتە سەر ئەوەی لەیەکتری تێنەگەین و پێشبینییەکان وا دەرنەچن. ئەو راستییەشمان بۆ یەکلایی بووەوە کە گفتوگۆی بەردەوام لەسەر بنەمای گیانی براوە/ براوە دەتوانێت رێ لە سەرهەڵدانی کێشەی گەورەتر بگرێت.

هەستکردنی هەردوولایەنەکە بە ئازارە کۆن و تازەکان و هەروەها بەوەش کە گفتوگۆکان بە باشی چونەتە پێشەوە و وایان کرد بەشداران زیاتر گفتوگۆ بکەن. لە نیوەڕۆی ئەو رۆژەشدا، کە وادەی کۆتایهێنانی کۆبونەوەکە بو، ئامادەبوان بوبونە خەڵکی ئەرێنی و داهێنەر و هاوکار و ئارەزومەند لەسەر بەردەوامبونی گفتوگۆکە.

ئینجا هەمویان هاتنە سەر ئەو باوەڕەی کە یەکەمین پێشنیاری لەمەولای سەرمایە گوزارەکە حسابی سەرەتایەکی بۆ دەکرێت بۆ شەقڵی براوە/ براوە و قازانجی هەموان. هەمو لایەك لەسەر ئەمە هاوڕاو هاوکاربون و لە سەعات دوانزە و چل‌وپێنج خولەکدا کابرای سەرمایەگوزار و دوکەس لە کاربەدەستانی بانقەکە پێکەوە پلانێکیان گەڵاڵە کرد بۆ (کۆمەڵەی خاوەنماڵەکان) و ئەنجومەنی شارەوانی و سەرەنجام مەسەلەکە بەوە شکایەوە کە توانرا رێ لەوە بگیرێت کێشەکە ببرێتە دادگا و پرۆژەی بیناسازییەکە بەردەوامی پەیدا کردەوە و لە کۆتاییدا سەرکەوتنێکی بەرچاویشی بەدەست هێنا.

من نالێم خەڵکی بە هیچ شێوەیەك نەچنە دادگا، چونکە هەندێك مەسەلە هەن کە پێویستییان بە دادگا هەیە، بەڵام پێم وایە پەنابردنە بەر دادگا بکرێتە دوایین پەناگاو چارەسەر، نەك لەسەرەتاوە ئەو رێیە بگرینە بەر، چونکە ئەگەر لە قۆناغە هەرە سەرەتاییەکاندا ئەم شێوازە پەیڕەو بکەین و تەنانەت ئەگەر بۆ خۆپاراستینیش کێشەکە بەرینە دادگا، ئەوا ترس‌و تێڕوانینێکی وامان لا دروست دەبێت کە پێچەوانەی هاوکاریکردنی داهێنەرانەن.

## سروشت هەموی هاوکارییە

ژینگە، یاخود دەوروبەر، لە زمانی ئینگلیزیدا پێی دەوترێت (ئیکۆلۆجی) کە وشەیەکە لە بنەڕەتدا وەسفی خەسڵەتی هاوکاری خوڵقێنەر دەکات لە سروشتدا – واتە هەرشتێك پەیوەندی بە شتێکی دیکەوە هەیە و لەو پەیوەندییەشدا هێزە

داهێنەرە خولْقێنەرەکان مەزنتر و مەزنتر دەبن. ڕێك وەکو ئەو هێزە ڕاستەقینەیەی کە لە حەوت خووەکەدا و لە پەیوەندی نێوانیاندا هەیە، نەك تەنیا لە ناوەڕۆکی هەر خویەکدا بەتەنیا.

هەروەها پەیوەندی نێوان پارچەکانیش ئەو هێزەیە کە لە پشت خولْقاندنی کەلتورە هاریکارییەکەدا هەیە لەناو خێزان و دامودەزگاکاندا و هەتا پەیوەندییەکە ڕەسەنتر و ڕاستگۆتر بێت، بەشداریکردنەکە لە شیتالْکردن و چارەسەری کێشەکەدا دلْسۆزتر و تەمەن درێژتر دەبێت و هەروەها زیاتریش دەتوانرێت وزەی داهێنەرانەی خەلْکەکە ئازاد بکرێت و زیاتریش پابەندبکرێن بە داهێنانەکانیانەوە. ئەمەش، بە باوەڕی من، ڕۆحی ئەو هێزەیە کە ژاپۆنییەکان کردیانە پەیڕەوی خۆیان لە مەسەلەی پیشەسازیدا و بووە مایەی گۆڕینی بازاڕی جیهانی.

هاوکاری خولْقێنەر پرنسیپێکی ڕاست و دروستە و هەمیشە بەرەو پێشەوە دەچێت. لوتکەی دەستکەوت و تاجی سەری هەمو خووەکانی پێشوترە. کاری دەستەجەمعی و بنیادنانی بەکۆمەلْە و برەودانە بە داهێنان و یەکپارچەیی لەگەلْ مرۆڤەکانی دیکەدا.

تۆ ئەگەرچی ناتوانیت لەم هاوکارییەدا و لەناو خودی پرۆسەکەدا پارادیمی خەلْکەکە کۆنترۆلْ بکەیت، بەلاّم بەشێکی گەورەی ئەم هاوکارییە خولْقێنەرە دەکەوێتە ناو بازنەی دەوروتەئسیرتەوە.

هاوکارییە تایبەتە ناوخۆییەکەی خۆت بەتەواوی دەکەوێتە ناو ئەم بازنەیەوە. مرۆڤ دەتوانێت ڕێز لە هەردولایانە شیکاری و داهێنەرەکەی سروشتی خۆی بگرێت و جیاوازییەکانی نێوانیان هەلْبسەنگێنێت و ئەو جیاوازییە بخاتە خزمەت گیانە داهێنەرە خولْقێنەرەکەیەوە.

مرۆڤ دەتوانێت لە ناخی خۆیدا هاوکاری خولْقێنەر بێت تەنانەت لەو ڕەوش و دۆخانەشدا کە سیخناخن لە ناحەزیی و دوژمنایەتی، هیچ پێویست بەوە ناکات سوکایەتیکردنەکان بهێنیتە سەرخۆت و وای لێك بدەرەوە کە مەبەستەکە تۆ نیت .. مرۆڤ دەتوانێت حالْەتە خراپ و وزە نەرێنییەکان تێبپەڕێنێت و بەدوای خەسلْەتە باشەکاندا بگەڕێت لە خەلْکیدا و سەرمایەگوزارییان تێدا بکات. دەتوانێت بیروبۆچونەکانی چاکتر بکات و سنوری زانیارییەکانی فراوانتر بکات.

**مرۆڤ ئەگەر کراوە بێت دەتوانێت لە هاوکاریکردنی خەڵکیدا بە ئازادی رەفتار بکات و هەست و بیروبۆچوون و رای خۆی و ئەزموونەکانی خۆی بە شێوازێك دەربېڕێت خەڵکەکە وا لێ بکات ئەوانیش بکرێنەوە.**

**تۆ دەتوانیت رێز لە جیاوازییەکانی خەڵکی بگریت و ئەگەر کەسێك لە مەسەلەیەکدا پێچەوانەی رای تۆی هەبو پێی بڵێ: باشە، تۆ مەسەلەکە بە شێوەیەکی جیاواز دەبینیت. کەس ناچارت ناکات بچیتە سەر بیرو باوەڕی ئەو، هەر هێندە بەسە کە جەخت لە هەڵوێستی ئەو بکەیتەوە و بزانیت ئەو بە شێوەیەکی جیاواز لە تۆ بیر دەکاتەوە.**

**ئەمە زۆر بە سادەیی مانای وایە تۆ کەسێکیت هەوڵ دەدەیت تێبگەیت.**

**تۆ لەوحاڵەتەدا کە تەنیا دوو ئەڵتەرناتیف دەبینیت – ئەوەی خۆت و ئەڵتەرناتیڤە هەڵەکەی ئەو – دەتوانیت بۆ ئەڵتەرناتیڤی هاوکارانەی سێیەم بگەڕێین و دڵنیابە هەمیشە ئەو ئەڵتەرناتیڤە سێیەمینە هەیە. مرۆڤ ئەگەر شێوازی براوە/ براوە بکاتە فەلسەفەی خۆی و بەڕاستی هەوڵ بدات تێبگات، دەتوانێت چارەسەرێك بدۆزێتەوە کە بەلای هەمو لایەنە پەیوەندیدارەکانەوە باشترین چارەسەر بێت.**

## چەند پێشنیارێك بۆ جێبەجێکردن

١. بیر لە کەسێك بکەرەوە کە شتەکان دەقاودەق بە شێوازێکی دیاریکراو دەبینێت و تۆ بە شێوەیەکی جیاواز. بیر لەو ڕێگایانە بکەردوە کە دەتوانیت بەکاریان بهێنیت وەکو خاڵی دەستپێکردن بە مەبەستی دۆزینەوەی ڕێگا چارەی ئەڵتەرناتیڤی سێیەم. دیارە ئەمەش رەنگە وا پێویست بکات هەوڵ بدەیت دیدو بۆچونی ئەو کەسە وەربگریت سەبارەت بە پرۆژەکە یاخود بە کێشەکەی ئێستا. ئینجا ئەو دیدو بۆچونانە یەك یەك هەڵبسەنگێنە کە رەنگە بکەونە بەرگوێت.

٢. لیستێك دروست بکە بە ناوی ئەو کەسانەی کە بێزارت دەکەن. ئایا ئەمانە هەریەکەیان دیدو بۆچونێکی جیاوازیان هەیە و ئایا تۆ ناتوانیت بیانکەیتە هاوکاریی خولقێنەر، ئەگەر ڕێز لەو جیاوازییانە بگریت و زیاتر متمانەت بە خۆت هەبێت.

٣. مەسەلەیەك دیاری بکە کە ئاواتەخوازیت هاوکاری زیاتر و کاری دەستەجەمعی زیاتری تیابێت. بۆ پتەوکردنی ئەو هاوکارییە پێویستت بە بارودۆخێکی چۆنە؟ ئایا تۆ چیت لەدەست دێت بۆ خولقاندنی ئەو بارودۆخە.

٤. ئەمجارەیان ئەگەر ناکۆکیت بۆ دروست بو لەگەڵ کەسێکدا، یاخود هەستت کرد بیروڕایەکت هەیە جیاواز لە بیروڕای ئەو، هەوڵبدە بزانیت ئەو کەسە بۆچی هەڵوێستەکەی وایە و کێشە و مەراقەکانی چین. ئینجا بە شێوەیەکی داهێنەرانە مامەڵەیەکی وا لەگەڵ ئەو هۆکارانەدا بکە کە ئەنجامەکەی بەسودی هەردوکتان بشکێتەوە.

# بەشی چوارەم

# نوێبونەوە



# خووی حەوتەمین
# مشارەکە تیژبکەرەوە

## پرنسیپەکانی نوێبونەوە

هەندێکجار کە تەماشای دەرەنجامە خراپەکانی مەسەلە بچوکەکان دەکەم دەگەمە ئەو باوەڕەی کە لە ژیاندا هیچ شتێک نی‌یە شایستەی بایەخپێدان نەبێت.

بروس بارتون

گریمان تۆ لە دارستاندا کابرایەك دەبینیت بە هەمو هێز و توانای خۆیەوە خەریکە درەختێك دەبڕێتەوە.

تۆ لێی دەپرسیت: ئەوە خەریکی چیت؟

بە بێزارییەوە وەڵامت دەداتەوە: یەعنی چاوت لێ نی‌یە؟ ئەی ئەوە نی‌یە خەریکم ئەم درەختە دەبڕمەوە

تۆش پێی دەڵێیت: زۆر ماندو دیاریت؟ لەوە دەچێت دەمێك بێت خەریك بیت.

وەڵامت دەداتەوە: پێنج سەعات زیاترە. هێزی لێ بڕیوم. بەڕاستی ئیشێکی زەحمەتە

لێی دەپرسیت: باشە بۆچی تۆزێك ئیسراحەت نادەیت بە خۆت و مشارەکەت تیژناکەیتەوە؟ من دڵنیام ئەگەر تیژی بکەیتەوە ئیشەکە خێراتر دەبێت.

وەڵامت دەداتەوە: تۆش سەیریت ها. لەکوێوە فریا دەکەوم مشارەکە تیژبکەمەوە؟! نابینیت چەند سەرقاڵم؟

خووی حەوتەم لەوەدا بەرجەستە دەبێت کە کاتی گونجاو تەرخان بکەیت بۆ تیژکردنەوەی مشارەکەت. ئەم خووە لە ئەڵقاوئەڵقی هەمو خووەکانی دیکەدا پێویستە چونکە بەبێ ئەم، هیچکام لە خووەکانی دیکە قابیلی جێبەجێکردن نابن.

**چوار ڕەهەندەکەی نوێبوونەوە:**

ئـەم خـووە لەراسـتیدا بەرجەسـتەکەری توانـا کەسـێتییەکانی تۆیــە. ئامێرێکـە گرنگترین و بەهادارترین سەرمایەی تۆ دەپارێزێت و زیـادی دەکـات، ئـەو سـەرمایەیەی کە بریتییـە لـە خـودی خـۆت. خـووی حەوتـەم نوێکـەرەوەی هـەر چـوار ڕەهەندەکـەی سروشتی تۆیە کـە پێکهاتوون لـە ڕەهەنـدی جەسـتەیی. ڕەهەنـدی ڕۆحـی و ڕەهەنـدی هزری و ڕەهەندی کۆمەڵایەتی/ سۆزداری.




بەڕاسـتی سـەرەڕای بـەکارهێنانی زاراوە و گوزارشـتی جیاجیـا، بـەڵام زۆربـەی فەلسـەفەکانی ژیـان چ بـە ئاشـکرا و چ بـە ناڕاسـتەوخۆ، ئـەو چـوار ڕەهەنـدەیان چارەسەرکردووە. بۆ نمونە فەیلەسوفێکی وەکو (هێـرب شیفەرد) دەڵێـت ژیـانی ڕاسـت

و هاوسەنگ ئەو ژیانەیە کە وەکو خولگەیەك بە دەوری چوار بنەمادا بخولێتەوە کە بریتین لە بنەما رۆحی و هزری (خودی) و کۆمەڵایەتی و جەستەییەکان. کەسێکی وەکو (جۆرج شیلهان)یش کە مامۆستایەکی رۆحی‌یە باسی چوار رۆڵمان بۆ دەکات: گیانلەبەرێکی تەندروست (جەستەیی)، پیشەسازێکی کارامە (هزری)، هاوڕێیەکی چاك (رەهەندی کۆمەڵایەتی) و پیاوێکی ئایینی (رۆحی). بەپێی تیۆری (رێکخستن و پاڵنەر)یش ئەو رەهەند و پاڵنەرانە بریتین لە پاڵنەری ئابوری (جەستە) و چۆنێتی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ خەڵکیدا (رەهەندە کۆمەڵایەتی) و چۆنێتی مەشقکردن بە خەڵك و سود لێ وەرگرتنیان (هزر) و کارکردن و ئەرك و بەکارهێنانی ئەو شتانەی کە دەزگاکە دەیانبەخشێت (رۆحی).

مەبەست لە (تیژکردنەوەی مشارەکە) لە بنەڕەتدا پەیڕەوکردنی هەر چوار پاڵنەرەکەی سروشتی ئێمەی مرۆڤە، پەیڕەوکردنێکی رێکخراو و هاوئاهەنگ بە شێوەیەکی حەکیمانە و هاوسەنگ.

بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە، پێویستە ئەرێنی بین و تەرخانکردنی کات بۆ تیژکردنەوەی مشارەکە بەو چالاکی‌یە لە قەڵەم بدەین کە گرنگە بەڵام پەلە نییە. پێویستە فەرامۆشی نەکەین. واتە دەکەوێتە خانەی چالاکییەکانی کۆمەڵەی دووەمەوە. نەك چالاکییەکانی کۆمەڵەی یەکەم کە لەبەرئەوەی کاری پەلەن بەردەوام گوشارمان لەسەر دروست دەکەن. بەڵام ئەم چالاکییەی خووی حەوتەم پێویستە بە جۆرێك جەختی لەسەر بکرێتەوە کە ببێتە راهاتنێکی تەندروست. ئەم توانا تایبەتە لەبەر ئەوەی کەوتۆتە چەقی (بازنەی کاریگەرییەکان)ی مرۆڤەوە، لەو کەسە خۆی زیاتر کەسی دیکە ناتوانێت بۆی ئەنجام بدات. واتە پێویستە خۆمان بۆ خۆمانی بکەین.

ئەمەش لە ژیاندا گەورەترین سەرمایەگوزاری‌یە، سەرمایەگوزاری لە خودی خۆماندا کە تاقە ئامێرێکە ملکی خۆمان بێت و پێویستە لە رێگەیەوە هەڵسوکەوت و بەشداری لە ژیاندا بکەین. ئێمەی مرۆڤ لەراستیدا کەرەسەی ئەو شێوازەین کە هەڵسوکەوتی پێ دەکەین. جا بۆ ئەوەی کاریگەرییمان لەسەر دەوروبەرەکەمان هەبێت پێویستە لە بایەخی (ئەوکاتە) تێبگەین کە تەرخانی دەکەین بۆ تیژکردنەوەی مشارەکە بەو چوار رێگایەی کە باسمان کردن.

## ڕەهەندی جەستەیی:

ڕەهەندی جەستەیی بایەخدان بە جەستە دەگرێتەوە، بایەخدانێکی کاریگەر – خواردنی خۆراکی باش، حەسانەوە و ئیسراحەت. وەرزش بە شێوەیەکی ڕێكوپێك.

ڕاهێنانە وەرزشییەکان هەم مەسەلەیەکی گرنگن و هەم پەلەو کتوپڕیش نین و زۆربەشمان بە شێوەیەکی ڕێكوپێك ئەنجامیان نادەین. جا لەبەرئەوە – درەنگ بێ یا زوو- ناچار دەبین مەسەلەی مامەڵەکردن لەگەڵ تەندروستی و کێشەکانیدا بخەینە خانەی مەسەلە گرنگ و پەلەکانەوە چونکە پێشتر فەرامۆشمان کردووە و بە ڕێکوپێکی وەرزشمان ئەنجام نەداوە.

زۆربەمان وا هەست دەکەین کاتمان نییەو ناپەرژێینە سەر مەشقە وەرزشییەکان. نای کە بۆچوونێکی هەڵەیە. چۆن کاتمان نییە و ناپەرژێین وەرزش بکەین؟! مەسەلەکە هەموی حەفتەی سێ سەعات تا شەش سەعاتی پێویستە. دەشتوانین ڕۆژانە یان ڕۆژ نارۆژێك نیو سەعاتی بۆ تەرخان بکەین. ئەمەش هەرگیز کاتێکی زۆر نییە ئەگەر بەراوردی بکەین بەو سودە زۆرانەی کە وەرزش پێمانی دەبەخشێت و کاری چاك دەکاتە سەر ١٦٢-١٦٥ سەعاتەکەی دیکەی حەفتە.

ئەم وەرزشەی کە لێرەدا مەبەستمانە پێویستی بە کەرەسەی تایبەتی وەرزش نییە. خۆ ئەگەر ویستت بچیتە وەرزشگایەك ئامێری وەرزشی بەکاربهێنیت یاخود لە یاریگایەکدا تێنس یان هەر وەرزشێکی دیکە بکەیت، ئەوا هەلێکی زیادەیە بۆ خۆتی دەخولقێنیت بەڵام بۆ تیژکردنەوەی مشارەکە شتێکی پێویست نییە.

بەرنامەی چاکی وەرزشی ئەوەیە کە لە ماڵیشەوە بتوانیت بیکەیت و لە سێ بواری گرنگدا جەستەت بەهێز بکات. سێ بوارەکەش بریتین لە بەرگەگرتن و لەش نەرمی و هێز.

بەرگەگرتن: لە ئەنجامی وەرزشی ئەیرۆبیکەوە بەدەست دێت و لە ناوەڕۆکدا بریتییە لە بەتوانایی دڵ و کۆئەندامی سوڕی خوێن. واتە بریتییە لەوەی کە دڵ بتوانێت خوێن بگەیەنێتە هەمو بەشەکانی جەستە.

هەرچەندە دڵ خۆی ماسولکەیە، بەڵام ناتوانیت ڕاستەوخۆ مەشقی پێبکەیت. ناشتوانێت مەشقی بۆ بکەیت تەنیا لەڕێی ماسولکە گەورەکانەوە نەبێت. بەتایبەت ماسولکەکانی قاچ. لەبەرئەوە ڕاکردن و مەلە و ڕۆیشتنی خێراو پاسکیلسواری و خلیسکێنە بەسەر ئاودا لەو وەرزشانەن کە سودی زۆریان هەیە.

تۆ ئەگەر توانیت ژمارەی ترپەکانی دڵت بەو وەرزشە بەرزبکەیتەوە بۆ سەد ترپە لە خولەکێکدا مانای وایە لانی کەم توانای وەرزشکردنت هەیە و پێویستە ماوەی (٣٠) خولەك ئەو ئاستە بپارێزیت.

پێویستە ژمارەی ترپەکانی دڵت لانی کەم بەرزبکەیتەوە بۆ ڕێژەی ٦٠٪ی ئەوپەڕی ترپەکان کە زۆرترین ژمارەیە دڵ بتوانێت هەیبێت و لەهەمان کاتیشدا توانای ئەوەی هەبێت خوێن بگەیەنێتە شوێنە جیاجیاکانی جەستە. بەشێوەیەکی گشتی بەرزترین تێکڕای لێدانی دڵ یەکسانە بە: ٢٢٠ — تەمەنی کەسەکە.

بۆ نمونە ئەگەر تۆ تەمەنت ٤٠ ساڵ بێت ئەوا پێویستە ژمارەی ترپەکانی دڵت بگەیەنیتە ١٠٨ ترپە/خولەك، چونکە

٢٠٠- ٤٠ = ١٨٠

١٨٠ × ٦٠\١٠٠ = ١٠٨

(کاریگەری ڕاهێنانەکەی)یش بریتییە لە ٧٢٪ - ٨٧٪ی ئەوپەڕی تێکڕای لێدانەکە

لەشنەرمی: ئەمەیان دەرئەنجامی گرژکردنی جەستەیە. زۆربەی شارەزاکان وای بەباش دەزانن پێش ئەنجامدانی وەرزشەکە ئیحما بکرێت و کە وەرزشەکەش تەواو بو، ڕاکشان و حەوانەوە زۆر بەکەڵکن، هەروەها پێش ڕاهێنانەکەش ئەو حەسانەوە و ڕاکشانە یارمەتی گەرمگرتنی ماسولکەکان دەدات خۆئامادە بکەن بۆ ڕاهێنانێکی بەهێزتر. لەپاش ڕاهێنانەکەش یارمەتی بڵاوبونەوەی ترشی لاکتیك دەدات بۆ ئەوەی سوتانەوە و ڕەقبونی ماسولکەکان ڕوونەدات.

هێز: دەرئەنجامی ئەو وەرزشانەیە کە بەرهەڵستکردنی ماسولکەکانن وەك وەرزشە سوکەکانی پاڵنان و ڕاکێشان و دانیشتن و شناو و کێش هەڵگرتن. ڕێژەی بایەخدانت بە زیادبونی هێزت پەیوەستە بە هەڵوێستی خۆتەوە. ئەگەر بەشداریت کرد لە کارێکی ماسولکەیدا یاخود لە چالاکییەکانی کە بە یارییەکانی هێز ناسراون، ئەوە زیادبونی هێز دەبێتە هۆی چاککردنی شارەزاییەکانت. خۆ ئەگەر پیشەکەت بە جۆرێك بێت پێویست بکات ماوەیەکی زۆر دابنیشیت و لە ژیانی ڕۆژانەتدا هێندە پێویستت بەوە نەبێت هێزی زۆر بەکاربهێنیت ئەوا کەمێك یاری جیمناستیك و وەرزشی سوك و حەسانەوە بەسن بۆت.

من جارێکیان لە هۆڵێکی وەرزشدا لەگەڵ هاوڕێیەکدا بوم کە بڕوانامەی دکتۆرای هەبو لە فیسیۆلۆجیای راهێنانە وەرزشییەکاندا و ئەم هاوڕێیە سوربو لەسەر بەهێزکردنی جەستەی. داوای لێ کردوم یارمەتی بدەم بەوەی کە لەکاتی وەرزشی سنگدا کە پێی وتم یەکسەر (کێشە)کە لاببەم. زۆری جەخت کردەوە کە: (هەتا پێت نەڵێم لای نەبەیت).

بۆیە منیش راوەستام چاوەڕێم دەکرد پێم بڵێ (کێشە)کانی لاببە و ئاستەکان لەسەر سنگی بەرزو نزم دەبونەوە. هەستم کرد راهێنانەکە بەرەبەرە زەحمەتتر دەبێت، بەڵام ئەو هەر بەردەوام بو لەسەر مەشقەکە و بەسنگ کێشە ئاسنینەکانی بەرز دەکردەوە. لە دڵی خۆمدا وتم: ((بە هیچ شێوەیەك ناتوانێت مەشقەکە تەواو بکات)) کەچی کردی. بە هێواشی ئاسنەکانی لەسەر سنگی دەهێنایە خوارەوە ئینجا جارێکی دیکە بەرزی دەکردنەوە. بەم شێوەیە ئاسنە سەنگینەکان لەسەر سنگی بەرز دەبونەوە و نزم دەبونەوە.

دواجار کە تەماشای روخساریم کرد ماندوبونێکی زۆری بە ئاشکرا پێوە دەبینرا و بۆرییە خوێنەکان لە پێستییەوە دەرپەڕین، لە دڵی خۆمدا وتم: ئاسنەکان دەکەون بە سنگیدا و وردو خاشی دەکەن. رەنگە ئێستا کاتی ئەوە هاتبێت ئاسنەکان لاببەم. رەنگە کۆنترۆڵی لەدەست نەمابێت و نەزانێت چی دەکات. بەڵام بەبێ هیچ مەترسییەك ئاسنەکانی لەسەر سنگی داگرت و ئینجا جارێکی دیکە مەشقەکەی دەست پێ کردەوە. نەمدەتوانی بڕوا بکەم.

لە کۆتاییشدا کە داوای لێ کردم ئاسنەکان لاببەم لێم پرسی: (بۆچی ئەو ماوە زۆر چاوەڕێت کرد؟) وەڵامی دامەوە وتی: (ستیڤن، بەشی هەرە زۆری سودەکانی ئەم راهێنانە لە کۆتایی مەشقەکەدایە. من دەمەوێت خۆم بەهێز بکەم و ئەمەش هەر ئەوکاتە روودەدات کە ریشاڵە ماسولکەییەکان دەتەقن و دەمارە هەستیارەکان ئازار تۆمار دەکەن، پاشان سروشت قەرەبوی ئەو ئازارەت بە شتێکی چاکتر بۆ دەکاتەوە و لە ماوەی چل و هەشت سەعاتدا ریشاڵەکان بەهێزتر دەبنەوە.

من لەم لێکدانەوەو و گۆشەنیگایەی هاوڕێکەم تێگەیشتم و زانیم کە دەتوانرێت هەمان پرنسیپ بەسەر ماسولکە ویژدانییەکانی دیکەی وەکو پشودرێژیدا (سەبردا) جێبەجێ بکرێت. مرۆڤ کاتێك راهێنان لەسەر سەبر و پشوودرێژی دەکات و زیاتر لە

توانـای جـارانی بەرگـە دەگرێـت، ئـەوا ریشـاڵە ویژدانییـەکان دەقـرتێن و سروشـت قەرەبوویەکی باشی دەکاتەوە، بـەوەی کـە ریشاڵەکانی بـەهێزتر دەکات و جار لـەدوای جاریش بەهێزتر و بەهێزتر دەبن.

هاوڕێیەکەم مەبەستی ئەوەبو هێزی ماسولکەیی لە جەستەی خۆیدا بنیادبنێت و دەشزانێت ئەو کارە چۆن دەگرێت. بەڵام مەرج نییە ئێمە هەمومان پێویستمان بـەو هێـزە زۆرە بێـت بـۆ ئـەوەی کاریگـەر بـین لـە کۆمـەڵگادا. ئـەو پەنـدە بەناوبانگـە زۆر راسـتە کـە دەڵێـت (ئەگـەر دەتـەوێت هـەنگ ببڕیـت پێویسـتە بەرگـەی پێـوەدانی هەنگـەکان بگریـت). بەهـەرحاڵ ئەمـە کرۆکـی باسـەکەی ئێمـە نییـە کـە مەسـەلەی راهێنانە کاریگەر و گرنگەکانە.

کاکڵەی نوێکردنـەوەی رەهەنـدی جەسـتەیی لەراسـتیدا تیژکردنـەوەی مشارەکەیە واتـە وەرزشـکردنە بەشـێوەیەکی رێـك‌وپێکی وا کـە ببێتـە کـارکردن و پێکـەوە ژیـان و چێژوەرگرتنمان.

لە مەسەلەی هـەمو پرۆگرامێکـی راهێنانـدا کـەمێك حیکمـەتمان پێویسـتە چونکە هەنـدێك کـەس زیـادەڕەوی دەکـەن لـە وەرزشـدا بەتایبـەت ئەوانـەی کـە لـەوەوپێش هـەرگیز وەرزشـیان نـەکردووە. ئەمـەش رەنگـە زیـان و ئـازار و ناڕەحـەتی و تەنانـەت پەککەوتنی هەمیشـەیی لێ بکەوێتـەوە کـە پێویسـت نـین. باشـترین رێگـا ئەوەیـە بـە هێواشی دەست پێبکەین. پێویستە ئەو وەرزش و بەرنامە وەرزشییەی کـە پـەیڕەویان دەکـەین هاوئاهـەنگ بـبن لەگـەڵ ئامۆژگارییـەکانی پزیشـك و لەگـەڵ تـازەترین لێکۆڵینەوەدا و هەروەها لەگەڵ ئاستی هوشیاری خودی خۆشماندا.

مـرۆڤ ئەگـەر وەرزش نـەکات، ئـەوا بـە دڵنیاییـەوە جەسـتە بـە شـێوازی خـۆی نـاڕەزایی دەردەبڕێـت. دور نییـە لەسـەرەتای دەسـتپێکردنی ئـەو بەرنامەیـەی کـە دانـاوە مـرۆڤ حـەزی بـە ئەنجامـدانی کارەکـە نـەبێت. بگـرە لەوانەیـە رقیشـی لێ ببێتەوە. لەم حاڵەتەدا پێویستە کەسـەکە ئـەرێنی بێت. هەرچۆنێك بێت وەرزشـەکە بکـات. بـۆ نمونـە ئەگـەر ئـەو رۆژەی کـە داتنـاوە راکردنـی تیابکـەیت و بـاران بـاری پێویستە تـۆ وەرزشـەکەت هـەر بکـەیت. بـە خـۆت بڵـێ: "قـەی چێکا بـا ببارێت. مـن کارێك دەکەم هەم جەستەم و هەم وزەمی پێ بەهێز ببن".

ئەو وەرزشـەی کـە مەبەسـتمانە راهێنـانی خێـرا نـین، بـەڵکو کۆمەڵە چالاکییەکی

گرنگ و لەهەمان کاتیشدا پەلەپروزێیان ناوێت و دەتوانن کۆمەڵە ئەنجامێکی درێژخایەن و ئاشکرایان لێ بکەوێتەوە. وردە وردە هەست بە رازیبون دەکەیت و توانای دڵ و کۆئەندامی هەناسەدانت زیاتر دەبن و بەمەش وات لێ دێت ئاسانتر کارەکانی سەرشانت ئەنجام بدەیت و لە کۆتایی مەشقەکەشدا هەست دەکەیت وزەت پێیە. ئەو ماندوبونەی کە جاران هەستت پێ دەکردو داوای لێ دەکردیت واز لە وەرزشکردن بهێنیت وردە وردە دەبێتە وزەو ئارەزویەکی گەورە بۆ ئەنجامدانی کارو ئەرکەکانت بە زەوق و دڵخۆشییەوە.

رەنگە گرنگترین سودی وەرزشکردن بەهێزکردنی ماسولکەکانی ئەرێنیبون بێت (ئیجابی بون). ئەگەر رەفتاری مرۆڤ لەسەر بەهاکانی لەشساغی دروست بوبێت نەك لەسەر ملکەچی بۆ ئەو هێزانەی کە ناهێڵن وەرزش بکات ئەوا ئەوکەسە لەڕوی هزری و کامڵبونی جەستەیی و رۆحییەوەوە بەهێزتر دەبێت.

**رەهەندی رۆحی:**

دیاریکردنی رەهەندی رۆحیە وا لە مرۆڤ دەکات سوکانی ژیانی خۆی بەدەست خۆیەوە بێت. ئەم رەهەندە پەیوەندییەکی بەهێزی هەیە بە دووەمین خووەوە.

رەهەندی رۆحیی بەرجەستەکەری گەوهەر و کاکڵەی مرۆڤە و ئەوەش نیشان دەدات کە ئەو مرۆڤە تا چەند پابەندی بەها تایبەتەکانی خۆیەتی. ئەو ناوچەیە ناوچەیەکی زۆر تایبەتی ژیانی مرۆڤە و بایەخێکی زۆر گەورەشی هەیە. رەهەندی رۆحیی هێزی خۆی لەو سەرچاوانەوە وەردەگرێت کە ئیلهامبەخشی مرۆڤن و دەیبەستن بەو راستییانەوە کە لە هەمو سەردەم و شوێنێکدا کاریگەرن و هەر کەسەو بە شێوازێك ئەنجامیان دەدات.

من خۆم لە رێی تێفکرین و رامان و نوێژی رۆژانەی کە کتێبە پیرۆزەکان باسیان کردووە و بەهاکانی منیان پێك هێناوە هەست بە نوێبوونەوە دەکەم و تا زیاتر بیربکەمەوە و نوێژ بکەم زیاتر هەست بە نوێبونەوە و هێز و وریایی دەکەم و کارەکەمم زیاتر لەلا خۆشەویست دەبێت.

خولیابوون بە جیهانی ئەدەب و مۆسیقای باڵاش رەنگە بۆ هەندێکی دیکە هەمان کاریگەرییان هەبێ. هەندێکی دیکەش نوێبونەوەی رۆحیان لە گفتوگۆدا دەبینن لەگەڵ

سروشتدا. چونکە سروشت نیعمەتی خۆی بەسەر ئەو کەسەدا دەبارێنێت کە بە تەواوی لەگەڵیدا تێکەڵ دەبێت. تۆ کاتێك بێ سەروبەری و غەڵبەغەڵبەکانی شار بەجێدەهێڵیت و خۆت دەسپێریت بە ئیقاع و هاوئاهەنگییەکانی سروشت لەراستیدا خۆت نوێ دەکەیتەوە. وات لێ دێت تاکو ماوەیەك گوێ نادەیتە شتە وەڕسکەرەکانی دەوروبەرت و هەست بە ئارامبونی رۆحت دەکەیت تا وردە وردە جارێکی دیکە غەڵبەغەڵب و بێ سەروبەرییەکەی دەرەوە پەلاماری ئەو هەستە ئارامو هێمنەت دەدەنەوە.

لەم بارەیەوە (ئارثەر جۆردون) چیرۆکێکی دڵڕفێنمان بۆ دەگێڕێتەوە کە بەسەر خۆی هاتووەو ئەزمونێکی تایبەتی ئەوە لەمەڕ نوێبونەوەی رۆحی و ناوی ناوە (بانگهێشتی هەڵکشان) و وادەی دەستپێکردنی چیرۆکەکە ئەو کاتەیە کە نوسەر هەست بەوە دەکات ئیتر ژیان تامی نەماوەو بۆتە شتێکی وەڕسکەر و روکەش. ورەی دەڕوخێت و ئارەزوی نوسینیشی نامێنێت و رۆژ بەرۆژ خراپتری لێ بەسەردێت.

لە کۆتاییدا نوسەرەکە بڕیار دەدەات بچێتە لای پزیشك. ئەویش پاش ئەوەی کە فەحسی دەکات و تێدەگات لەڕووی جەستەییەوە ساغو سەلیمە لێی دەپرسێت ئایا ئامادەیت یەك رۆژی تەواو گوێڕایەڵی رێنماییەکانم بیت. گۆردن بە بەڵێ وەڵامی دایەوە، پزیشکەکە داوای لێ کرد سبەی رۆژ بچێتە ئەو شوێنەی کە جێگەی جوانترین بیرەوەرییەکانی سەردەمی منالی ئەون و بۆی هەیە خواردنیش لەگەڵ خۆی ببات، بەڵام بۆی نیە ئەو رۆژە قسە لەگەڵ هیچ کەسێکدا بکات یاخود کتێب بخوێنێتەوەو یان بنوسێت یاخود گوێ لە رادیۆ بگرێت. پاشان پزیشکەکە چوار رەچەتەی بۆ نوسی و داوای لێ کرد یەکەمیان لە سەعات نۆی بەیانیدا بیکاتەوەو دووەمیان سەعات دوانزەی نیوەڕۆ و سێیەمیان سەعات سێی پاش نیوەڕۆ و دوا رەچەتەش لە سەعات شەشی ئێوارەدا بکاتەوە.

گۆردن لێی پرسی: بە جددیتە؟

پزیشکەکە وەڵامی دایەوە: دوایی کە وەسڵی رەچەتەکانت پێگەیشت تێدەگەیت سوعبەت ناکەم.

بۆ سبەی بەیانی، گۆردن چوو بۆ قەراخ دەریاو هەر کە یەکەمین رەچەتەی دەرهێنا تەماشای کرد لێی نوسراوە: چاك گوێبگرە. گۆردن لە دڵی خۆیدا وتی

پزیشکەکە شێت بووە ئەگینا سێ سەعات گوێگرتن لەو شوێنەدا چ واتایەکی هەیە؟ بەڵام ڕێنماییەکەی جێبەجێ کردو سەرەتا گوێی گرت لە دەنگی دەریاو باڵندەکان کە دەنگی ئاسایی بون. پاش ماوەیەك توانی دەنگی دیکە ببیستێت کە لە سەرەتادا روون و ئاشکرا نەبون. لەکاتی گوێگرتندا لەو دەنگانە، گۆردن بیری لەو پەندو وانانە دەکردەوە کە لەسەردەمی منالّیدا لە دەریاوە فێریان بوبو.

وانەی ڕێز و پشوودرێژی و قەدر زانینی هاوکاری و هاوئاهەنگی لەنێوان شتەکاندا. کابرا گوێی لەم دەنگانە و لەم بێ دەنگییانە گرت و لە ناخەوە هەستی بە هێمنی و ئاسایش و ئاشتییەکی مەزن کرد.

لە نیوەڕۆیشدا کە دووەمین پارچە کاغەزی (ڕەچێتەکەی) دەرهێنا تەماشای کرد لێی نوسراوە: ((هەوڵ بدە بگەڕێیتەوە)). لە دڵی خۆیدا پرسیاری کرد: ((گەڕانەوە بۆ کوێ؟)) ڕەنگە بۆ منالّی .. ڕەنگە گەڕانەوەبێت بۆ بیرەوەرییە خۆشەکان. بیری لە رابردووی خۆی کردەوە. لەو چرکەساتە خۆش و کەمخایەنانەی ساڵانی پێشو. هەوڵی دا یەك یەك ئەو چرکەساتانەی بە دورودرێژی بیربکەوێتەوە. گۆردن کە ئەو بیرەوەرییانەی دەهاتەوە یاد هەستی کرد گەرماییەکی خۆش بە ناخیدا تێپەڕ دەبێت.

سەعات سێی پاش نیوەڕۆ، سێیەمین پارچە کاغەزی کردەوە. لەڕاستیدا ڕەچەتەکان تائێستا داواکاری زەحمەتیان تیا نەبووە، بەڵام ئەمەی سێیەمیان لەوانی دیکە جیاواز نەبووە. لێی نوسرابو: (پاڵنەرەکانت تاقی بکەرەوە). کابرا لەسەرەتادا بە ترسەوە بیری لە ئامانجەکانی خۆی دەکردەوە- سەرەکەوتن و ناوبانگ و سەلامەتی، پاشان هەموویانی گۆڕی. بەڵام دواتر بیرۆکەیەك هات بە خەیاڵیدا کە ئەو پاڵنەرانە بەس نین و ڕەنگە پێویست بکات وەڵامی ناخی خۆی بداتەوە کە بۆچی بێزارە.

گۆردن بە قوڵیی بیری لە پاڵنەرەکانی کردەوە. بیری لە بەختەوەرییەکەی رابردوی کردەوە و دواجار وەڵامەکەی دەست کەوت.

قەڵەمەکەی گرت بەدەستەوە و کەوتە نوسین: بەوپەڕی متمانەو ڕاستگۆییەوە دەڵێم کە پاڵنەرەکانی مرۆڤ هیچیان ڕاست نین. بەلای منەوە هیچ جیاوازییەك نییە لەنێوان پۆستەچییەك و سەرتاشێك و ژنێکی ماڵەوەدا و .. تاد. گرنگ ئەوەیە

**هەست بکەیت کە خزمەتی خەڵکی دەکەیت و کەڵکیان پێدەدەگەیەنیت. ئەمانە بەسن بۆ ئەوەی پێت بڵێن کە تۆ باشیت و هیچ کێشەیەکت نییە. بەڵام ئەگەر تەنیا ئەوەت بەلاوە گرنگ بێت کە هەر خزمەتی خۆت بکەیت و بەس، ئەوا ئیشەکەت بە باشی ناکەیت. ئەمە یاسایەکی نەگۆڕە وەکو یاسای کێشی زەوی.**

**کە سەعات شەش لێی دا، گۆردن دوا ڕەچەتەی خوێندنەوە لێی نوسرابو: ((مەرامەکانت لەسەر لم بنوسە)). گۆردن لەسەر ئەژنۆ دانیشت و زۆر وشەی نوسی لەسەر لمەکە بە پارچە هێلکە شەیتانۆیەکی شکاو ئینجا هەستاو ڕۆیی. ئەو هیچ ئاوڕی نەدایەوە لە دواوە چونکە دەیزانی ئێستا هەڵکشانی ئاوەکە کۆمەڵە شەپۆلێك دەنێرێتە ئەوێ. نوێبونەوەی ڕۆح هەندێك کاتی پێ دەوێت. بەڵام پێویستە فەرامۆشی نەکەیت چونکە چالاکییەکی گرنگە، بەڵام پەلەی ناوێت.**

**(مارتن لۆثەر)ی گەورە کە چاکسازێکی مەزنی ئاینییە دەڵێت: ((ئەمڕۆ کاری زۆرم بەسەردا کەوتووە. دەمەوێت سەعاتێکی دیکەش بکەومە سەر ئەژنۆ)). نوێژکردن بەلای ئەوەوە ئەرکێکی ئوتۆماتیکی و ڕۆبۆتئاسا نەبو بەڵکو سەرچاوەی هێزە بو کە وزەو تواناکانی لێ کۆدەکردنەوەو بەکاری دەهێنان.**

**ڕۆژێك لە ڕۆژان پرسیاران لە (زەن ماستەر) کرد لە خۆرهەڵاتی دوور کە بێ گوێدانە هیچ گوشار و ناخۆشییەك هەمیشە لەوپەڕی دڵنیایی سەر ڕەحەتیدایە. لێیان پرسی: "تۆ ئەم هەمو دڵنیایی و سەررەحەتییە لەکوێوە دێنیت؟" وەڵامی دایەوە وتی: "هەرگیز شوێنی تێڕامانەکانم جێ ناهێڵم". ئەم کابرایە بەوە ناسراوە کە ڕۆژ تا ئێوارە خەریکی تێڕامانەو بە گیان و دڵ پارێزگاری چرکەساتە هێمنەکانی دەکات. گەوهەری مەسەلەکە لەوەدایە کە ئەگەر ئێمە کاتی گونجاو ببەخشین بە خۆمان بۆ ئەوەی جڵەوی ژیانی خۆمان بەدەست خۆمانەوە بێت و متمانەی پێبکەین، کە لەڕاستیدا مەبەست و ئامانجی ڕاستەقینەمان ژیانمانە، ئەو ژیانە دەبێتە بابەتێکی پانو بەرینی وا کە سێبەر بۆ هەمو شتەکان بکات. ئەمە دەبێتە مایەی نوێبونەوەمان، بەتایبەت ئەگەر لە جارێك زیاتر پابەند بوین پێوەی.**

**لەبەر ئەوە من باوەڕم بە بایەخی بڕیارەکانی مرۆڤە سەبارەت بە لایەنگری و پابەندبون. ئێمە ئەگەر ئامانجەکان و هاوسەنگییەکانی خۆمان بە باشی تێبگەین**

دەتـوانین چـاوی پێـدا بخشێنینەوە و پابەنـدبونی خۆمـان پێوەی دوبـارە و سێ بـارە بکەینـەوە. مـرۆڤ لـە پرۆسـەی نێوبونـەوەی رۆحیـدا دەتوانێـت رووداوەکانی رۆژانـەی ژیان بهێنێتە بەرچاو و هاوئاهەنگیان بکات لەگەڵ بەهاکانیدا.

دەیڤید ئۆلکای کە سەرکردەیەکی ئاینیە دەڵێت جەنگە مەزنـەکانی ژیـان رۆژانـە لە ژوورە بێدەنگەکانی رۆحدا روودەدەن. تۆ ئەگەر لە جەنگـەکانی رۆحـدا سـەرکەوتن بەدەستبهێنێت و ململانێکانی ناخی خۆتت یەکلایی کردەوە، ئەوکاتە ئـیتر هەسـت بـە ئاسایش و ئاشتی و هێمنـی دەکـەیت، هەسـت دەکـەیت لـە خـۆت تێگەیشتویت و بـۆت روون دەبێتـەوە کـە ئەگـەر بـڕوات بـە کـاری بەکۆمـەڵ و بـە خێـری دەسـتەجەمعی هەبێت و حەزت لە سـەرکەوتنی دەوروبـەر هـەبێت ئـەوا سـەرکەوتنەکان خۆیـان یـەك لەدوای یەك رووت تێدەکەن.

## رەهەندی هزری:

سەرچـاوەی بەشـێکی زۆری گەشـەکردنی هـزری و سـتایلی خوێنـدنی ئێمـە لـە خوێنـدنگا و قوتابخانــە فەرمییەکانەوەیــە. بــەڵام زۆربــەمان پــاش تــەواوکردنی خوێندنی فەرمی بوار دەدەین ئەقڵمان بپوکێتەوە چونکە ئیتر نـە بابـەتێکی جددی دەخوێنینەوە و نە هیچ مەسەلەیەکی وا دەدۆزینەوە کە بەڕاستی قوڵ و بایەخـدار بێت و نە هیچ بیرکردنەوەیەکی شیتالکارییش ئـەنجام دەدەیـن و تەنانـەت دەسـتیش نادەینــە قەڵــەم بــۆ ئــەوەی بــە رۆحێکـی رەخنەگرانــەی وا بنوســین کــە بتــوانین تواناکـانی خۆمـان هەڵبسـەنگێنین لـە بـواری زمـانزانیی و گوزارشـتکردندا. ئێمـە زۆربـەمان ئەمانـە هیچیان ناکـەین و بەشـێکی زۆری کاتەکـەمان بـە تەماشـاکردنی تەلەفزیۆن دەبەینە سەر.

ئامارەکــان دەڵــێن لــە زۆربــەی ماڵەکانــدا حەفتــەی ٣٥-٤٠ ســەعات تەلــەفزیۆن داگیرساوە. ئەمەش لە دەوامی حەفتانەی قوتابخانـەکان زیـاترە و یەکسانە بـەو ماوەیـەی کـە زۆربـەی خەڵکەکـە سـەرقاڵی کـارکردنن تیایـدا. دیـارە تەلـەفزیۆن کاریگەرییـەکی کۆمەڵایەتی گەورەی هەیە لەسـەر خـەڵك و ئێمـە کە تەماشای تەلـەفزیۆن دەکـەین بێ ئەوەی بە خۆمان بزانین دەکەوینە ژێر کاریگەریی بیرۆکەو بەهاکانییەوە.

مرۆڤی دانا پێویستە لـە تەماشـاکردنی تەلەفزیۆنـدا خـووی سێیەم پـەیڕەو بکات

كە بریتییە لەوەی بە شێوەیەكی كارا كۆنترۆڵی خۆت بكەیت و بتوانیت باش لە خراپ جیابكەیتەوە و ئەو پڕۆگرامە هەواڵی و هەمەرەنگانە هەڵببژێریت كە گوزارشت لە ئامانج و بنەماكانت دەكەن و برەویان پێ دەدەن. من لە ماڵی خۆماندا كارێكم كردووە حەفتەی حەوت سەعات زیاتر تەماشای تەلەفزیۆن نەكرێت. واتە رۆژی سەعاتێك. لە كۆبوونەوەیەكی خێزانیدا باسی ئەم مەسەلەیەمان كردو باسی ئەوەمان كرد كە بەهۆی تەلەفزیۆنەوە هەندێك خێزان دوچاری چی بوون. ئێمە كاتێك وەكو (یەك) خێزان مەسەلەكەمان تاوتوێ كرد كەس بەرگری نەكرد لە تەلەفزیۆن و مشتومڕێكی بەتاڵی نەهێنایە گۆڕێ. ئێستا خەڵكەكە هەست بەوە دەكەن كە یاخود ئالودەی زنجیرە تەلەفزیۆنییە درێژەكان بوون یاخود وایان لێ هاتووە بە شێوەیەكی نەگۆڕ تەماشای بەرنامەیەكی دیاریكراو بكەن.

دیارە تەلەفزیۆن بەرنامەی پەروەردەیی و پڕۆگرامی زۆر بەرزی هەمەرەنگ و بەتامی هەیە كە ژیان دەوڵەمەند دەكەن و بەشدارییەكی راستەقینە دەكەن لەوەی بگەن بە مەبەست و ئامانجە گەورەكانمان، بەڵام لەهەمان كاتیشدا تەلەفزیۆن زۆر بەرنامەی بێكەڵكی تێدایە كە مێشك و كاتمان بەفیڕۆ دەدەن و ئەگەر جڵەویان بۆ شل بكەین زیانمان پێدەگەیەنن. تەلەفزیۆنیش وەكو جەستەی مرۆڤ خزمەتكارێكی گوێڕایەڵە، بەڵام لەهەمان كاتیشدا ئاغایەكی لاوازە. لەبەر ئەوە پێویستە پەناببەین بۆ سێیەمین (خوو) بۆ ئەوەی كاریگەرانە كۆنترۆڵی خۆمان بكەین تا بتوانین زۆرترین سود لە سەرچاوەكان وەربگرین و بیانخەینە خزمەت ئەرك و ئامانجەكانمانەوە. دیارە فێركردن و فێركردنی بەردەوام یاخود دەمەزەردكردنەوەی بەردەوامی زەینمان و فراوانكردنی ئاسۆكەی بە نوێكردنەوەیەكی گرنگی هزر حساب دەكرێت. ئەم نوێكردنەوەیە هەندێك جار لە پڕۆگرامەكانی خوێندن و لە خوێندنە دەرەكییەكاندا دێتە دی، بەڵام یەكجار سیستمی خوێندنی بەردەوام دەبێتە مایەی نوێبونەوەی هزر. ئەوە دەكەوێتە سەر مرۆڤەكە خۆی كە چەند ئەرێنییە و چەندێك دەتوانێت بۆ فێركردنی زیاتری خۆی بابەت و رێبازی زیاتر و زیاتر بدۆزێتەوە.

یەكێك لە خاڵە گرنگەكانی ئەم مەسەلەیە بریتییە لەوەی هزر لەسەر سەربەخۆیی رابهێنیت و وای لێ بكەیت خۆی بەرنامە تایبەتەكەی خۆی هەڵببژێریت. بەلای منەوە ئەمەیە فێركردنی ئازاد. واتا پشكنینی ئەو بەرنامانەی

ژیان کە پرسیارەکان و ئامانجە گەورەکان و بۆچوونە هزرییەکان چارەسەر دەکەن و هەر مەشق و راهێنانێکیش ئەم جۆرە فێرکردنەی تیا پەیرەو نەکرێت دەبێتە مایەی تەسکبون و داخستنی ئەقڵ و لێرەوە پەی دەبەیت بە بایەخە کاریگەرەکەی خوێندنەوەی فراوان و ئاگاداربون لە نوسینی بیرمەندە مەزنەکان.

بۆ فراوانکردنی ئاسۆکانی هزر و زیادکردنی زانیارییەکان بە شێوەیەکی رێکخراو هیچ شتێك لەوە چاکتر نىیە خۆت لەسەر خوێندنەوەی بەرهەمە ئەدەبیە چاکەکان رابهێنیت. ئەمە چالاکییەکی گرنگ و کاوە خۆو بەرزەو وات لێ دەکات بگەیتە باشترین ئەقڵەکانی ئێستاو هی سەردەمەکانی رابردوش لە سەرتاسەری دنیادا. ئامۆژگاری من ئەوەیە سەرەتا مانگی کتێبێك بخوێنیتەوە، پاشان بیکەیت بە دوو هەفتە کتێبێك و ئینجا هەر هەفتەی کتێبێك. بەلای منەوە ئەو قسەیە زۆر راستە کە دەڵێت ئەوەی کە ناخوێنێتەوە هیچی زیاتر نىیە لە کەسێکی نەخوێندەوار.

ئەدەبی چاك هۆشیاریی رۆشنبیریمان دەوڵەمەند دەکات و ئەدەبی بالادەستی بوارە جیاجیاکان (بۆ نمونە کلاسیکەکانی هارڤارد، ژیاننامەی کەسێتیەکان، ناشناڵ جیۆگرافیك) دەتوانێت بازنەی بۆچوون و لێکدانەوە هزرییەکانمان و پارادیمەکانمان فراوانتر بکات و مشارەکەی ئەقڵمان تیژبکاتەوە. بەتایبەت ئەگەر لە خوێندنەوەدا خووی پێنجەممان جێبەجێ کردو هەوڵ بدەین دەست بەدەست لە بابەتەکە حاڵی ببین. بەڵام ئەگەر تەنیا پشت بە ئەزمونی خۆمان ببەستین و حوکمی پێشوەخت بدەین بەر لەوەی لە مەبەستەکەی نوسەر تێبگەین، مانای وایە خوێندنەوەکە سودێکی ئەوتۆی پێنەگەیاندوین. شێوازێکی دیکەی تیژکردنەوەی مشارەکەی هزر نوسینە. مرۆڤ بە نوسین دەتوانێت خەیاڵێکی ساف بەخۆی ببەخشێت. نوسەر هەمیشە لە کەسی ئاسایی زیاتر هەست و خەیاڵ و لێکدانەوەی قوڵتری هەیە و کاریگەرانەتر تێدەگات و وردتریش دەتوانێت ئەقڵی بخاتە کار.

رێکخستن و نەخشەکێشانیش شێوازی دیکەی نوێکردنەوەی هزرن کە پەیوەستن بە هەردوو خووی سێیەم و چوارەمەوە. رێکخستن و نەخشەکێشان بەوە دەست پێدەکەن کە سەرەتا ئامانجەکە لە بەرچاوبگریت و لە مێشکی خۆتدا شێوازی بەدیهێنانی ئامانجەکە رێك بخەیت. وەك پێشتریش باسمان کرد ئەو دوو خووە بریتین لە خستنەگەڕی تواناکانی مێشکت تا بتوانێت خەیاڵ بکاتەوە و ئامانجەکە

لەسەرتاوە بهێنێتە بەرچاوی خۆی و بتوانێت هەموو هەنگاوەکانی گەشتەکە بە تەواوی ببینێت یان لانی کەم پرنسیپ و هێڵە گشتییەکانی ببینێت.

وەك دەڵێن سەرکەوتن لە جەنگدا لە چادری فەرماندەکەوە دێتەدی. تیژکردنەوەی مشارەکەش بە هەرسێ ڕەهەندی جەستەیی و ڕۆحی و هزری مەسەلەیەکە من ناوی لێ دەنێم (سەرکەوتنی ڕۆژانەی کەسێتی). ئامۆژگاری من ئەوەیە ڕۆژی تەنیا (یەك) سەعات بۆ ئەم مەبەستە تەرخان بکە: یەك سەعات بۆ هەمو ژیانت.

مرۆڤ زۆر پێویستە ئەو (یەك) سەعاتە تەرخان بکات کە بە بەراوردکردنی سەرکەوتنی ڕۆژانەی کەسەکە بە ئەنجام و بەهاکان دەست پێدەکات ئەمە کاردەکاتە سەر هەمو بڕیارێك و هەمو پەیوەندییەکی تایبەت و هەروەها نرخ و کاریگەرێتی هەمو سەعاتەکانی ژیانت بەرز دەکاتەوە بە سەعاتەکانی خەوتنیشەوە کە قوڵتر و بەسودتریان دەکات. ئەم سەعاتە یارمەتیت دەدات هێزە جەستەیی و هزری و ڕۆحییەکان بەسەرکەوتویی دروست بکەیت لەسەر ئاستێکی درێژخایەن بۆ ئەوەی بتوانیت ڕوبەڕوی کێشە سەختەکانی ژیان ببیتەوە.

(فیلیپس بروکس) لەمبارەیەوە نوسیوێتی:

ڕۆژێك لە ڕۆژان خۆت لە دۆخێکدا دەبینیتەوە کە ڕوبەڕوی هەڵفریوێنە گەورەکان بویتەوە یاخود خەمێکی قوڵ و گەورە باڵی کێشاوە بە ژیانتدا. بەڵام خەباتە ڕاستەقینەکەت لێرەدایە و ئێستا پێویستە بیکەیت. ئێستا ئەو دووڕیانە چارەنوسیە کە سبەی ڕۆژت دیاری دەکات و ئەوە یەکلایی دەکاتەوە کە ئەو سبەی ڕۆژە سەرکەوتنێکی مەزن تۆمار دەکەیت یاخود شکستێکی گەورەت توش دەبێت. بیرت نەچێت کەسێتی تۆ تەنیا لەم پرۆسە نەگۆڕ و بەردەوام و پشوودرێژەوە دروست دەبێت.

## ڕەهەندی کۆمەڵایەتی/ سۆزداری

لە کاتێکدا کە ڕەهەندە جەستەیی و ڕۆحی و هزرییەکان پەیوەندییەکی تۆکمە دەیانبەستێتەوە بە خووەکانی یەکەم و دووەم و سێیەمەوە لەسەر بنەماکانی ویست و سەرکردایەتی و تێڕوانینی تایبەت، ڕەهەندە کۆمەڵایەتییە سۆزدارییەکە جەخت دەخاتە سەر خووەکانی چوارەم و پێنجەم و شەشەم و پرنسیپەکانی سەرکردایەتی بەکۆمەڵ و یەکتر تەواوکردن و پەیوەندی سۆزداری دەکاتە تەوەر.

ڕەهەندە کۆمەڵایەتی و سۆزدارییەکانی ژیانی ئێمەی مرۆڤ گرێدراوی یەکترین، چونکە بەشێکی سەرەکی ژیانی سۆزداریمان دەرەنجامی پەیوەندییەکانمانە لەگەڵ خەڵکیدا و هەر لەرێی ئەو پەیوەندیانەشەوە خۆی بەرجەستە دەکات. نوێکردنەوەی ڕەهەندی کۆمەڵایەتی، سۆزداریی بە بەراورد بە نوێکردنەوەی ڕەهەندەکانی دیکە کاتی کەمتری دەوێت؛ ئێمە بە هەڵسووکەوتی ڕۆژانەمان لەگەڵ خەڵکیدا دەتوانین ئەو ڕەهەندە نوێ بکەینەوە. بەڵام ئەمە ڕەهەندێکە پێویستی بە مەشق و پەیڕەوکردنە و ڕەنگە لە پێناویدا ناچاریش ببین زۆر لە خۆمان بکەین چونکە زۆربەی زۆرمان نەگەیشتونەتە ئاستی سەرکەوتنی تایبەت و شارەزاییەکانی ئەو جۆرە سەرکەوتنەشمان بەدەست نەهێناوە کە پێویستن بۆ خووەکانی چوارەم و پێنجەم و شەشەم کە لە کارلێکە کۆمەڵایەتیەکانماندا بەکاریان دێنین.

گریمان تۆ کەسێکی گرنگیت لە ژیانی مندا، ڕەنگە بەڕێوەبەری کارەکەم بیت، یاخود هاوکارم بیت، یان هاوڕێ و هاوسێم بیت یاخود هاوسەرم بیت یان ...... یان و یان، واتە یەکێك بیت لەو کەسانەی کە دەمەوێت و پێویستم بەوەیە هەڵسووکەوتی لەگەڵدا بکەم. هەروەها با وای دابنێین کە من و تۆ پێکەوە کاردەکەیت و بیروڕا دەگۆڕینەوە لە مەسەلەیەکدا بۆ چارەسەرکردنی کێشەیەك یاخود بەدەستهێنانی ئامانجێك، بەڵام هەریەکەمان مەسەلەکان لە گۆشەنیگایەکی جیاوازەوە دەبینێت، بۆ نمونە ڕەنگە تۆ خاتونە گەنجەکە ببینیت و منیش پیرێژنەکە (مەبەستم لە وێنە بەناوبانگەکەیە).

لەبەرئەوە من خووی ژمارە چوار پەیڕەو دەکەم و دێمە لات پێت دەڵێم: "ئاگام لێیە تۆ بە شێوەیەکی جیاواز تەماشای مەسەلەکە دەکەیت. جا بۆ نەکەوینە گفتوگۆ تا ڕێگا چارەیەکی وا بدۆزینەوە کە هەردوکمان قایل بکات. پێشنیارەکەمت بەدڵە؟" دیارە زۆربەی خەڵکەکە بە دڵیان دەبێت.

ئینجا پاش ئەوە پێنجەمین خوو پەیڕەو دەکەم کە پوختەکەی ئەمەیە: "ڕێگەم بدە یەکەم جار گوێت لێ بگرم. گوێگرتن بەو جۆرە نا کە هەر بۆ وەڵامدانەوە بێت. من بە دڵ و گیان گوێت لێ دەگرم بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی قوڵ و بەربڵاو لێت تێبگەم و کاتێکیش کە توانیم وەك خۆت بیروبۆچونەکەت ڕوون بکەمەوە ئەوا دێم و پارادیمەکەی خۆمت بۆ باس بکەم بۆ ئەوەی تۆش تێی بگەیت.

دواتر دەچینە سەروەختی شەشەمین خووەوە بەهیوای دۆزینەوەی چارەسەرێك هەردو لایەنەکە پێی رازی ببن و قوڵتر لە پارادیم و دید و بۆچونی یەکتر تێبگەن و لەمەشەوە پێکەوە بیر لە دۆزینەوەی چارەسەری ئەڵتەرناتیڤ دەکەینەوە، چارەسەرێکی وا کە باشتربێت لەو چارەسەرانەی هەردولامان پێشنیاری کردبو.

سەرکەوتن لە پەیڕەوکردنی خووەکانی ژمارە چوار و پێنج و شەشدا، لە بنەڕەتدا مەسەلەیەکی ویژدانی و سۆزدارییە نەك هزری و پەیوەستە بەوەی کە تا چەند لە ناخەوە هەست بە ئاسودەیی و ئاسایش دەکەین.

ئەگەر سەرچاوەی ئەو هەستکردنە بە ئاسایشی تایبەت لە ناخەوە بو، مانای وایە ئێمە هێندە هێزمان هەیە بتوانین خووەکانی پەیوەست بە سەرکەوتنی خۆمانەوە پەیڕەو بکەین، بەڵام ئەگەر لەسەر ئاستە ویژدانی و سۆزدارییەکاندا هەست نەکەین بە ئاسایش ئەوا پەیڕەوکردنی جێبەجێکردنی خووەکانی چوارەم و پێنجەم رەنگە ببنە مایەی مەترسییەکی راستەقینە تەنانەت ئەگەر لە بوارە هزری و ئەقڵییەکانیشدا کەسێکی سەرکەوتوبیت.

بەڵام ئایا ئەم هەستکردنە بە ئاسایشی کەسێتی لەکوێوە هەڵدەقوڵێت؟ بە دڵنیاییەوە لەوەوە هەڵناقوڵێت کە چۆن تەماشای خەلکەکەی دەوروبەرمان دەکەین و لەوەشەوە هەڵناقوڵێت کە چەند نوسین و بەرهەمیان پێشکەشکردوین و هەروەها لە بارودۆخ و هەڵوێست و پێگەی کۆمەڵایەتی خۆشمانەوە هەڵناقوڵێت.

ئەم هەستە لە ناخەوە هەڵدەقوڵێت، لەو پرنسیپ و لەو بیروبۆچونە هزرییە وردە راست و دروستانەوە هەڵدەقوڵێت کە رەگی قوولی لە دڵو مێشکماندا داکوتیوە. لەو هاوئاهەنگی و گونجاندنەوە هەڵدەقوڵێت کە دەرەوەو ناوەوە لەگەڵ یەکدیدا هەیانە. لە ژیانێکی پاك و بێگەردەوە هەڵدەقوڵێت؛ واتە لەوەی کە هەڵسووکەوتی رۆژانەمان رەنگدانەوەی بەها قوڵەکان بێت کە بڕوامان پێیان هەیە.

بە باوەڕی من ژیانی پاكو بێگەرد سەرچاوە گەوهەرییەکەی بەهای تایبەتی مرۆڤە، من لەگەڵ ئەو کتێبە بازاڕیانەدا نیم کە باسی سەرکەوتنی مرۆڤ دەکەن و دەڵێن: "رێز لەخۆگرتن لە پلەی یەکەمدا مەسەلەیەکە دەتوانیت خۆت لە مێشکی خۆتدا دروستی بکەیت و وا بکەیت لەڕووی دەرونییەوە ئاسایش و ئارامی دەستەبەر بکەیت".

سەرچاوەی دڵڕەحەتیی و ئاسودەیی ویژدان تەنیا یەك ڕێگەی هەیە و ئەویش بریتییە لەوەی کە ژیانت هاوئاهەنگ بێت لەگەڵ پرنسیپ و بەها راستەقینەکاندا و هیچی تر.

جۆرێکی دیکەی هەستکردن بە ئاسودەیی بەرهەمی جۆرە ژیانێکە کاریگەرانە هاوکاری و یاریدەدان بەرجەستە بکات و لەوەوە سەرچاوە وەردەگرێت کە واقیع هەمیشە ڕێگاچارەی وای تیایە کە هەرگیز شکست قبوڵ ناکات و مەرج نییە ژیان هەمیشە بەدەست خۆمان بێت و بارودۆخ و ژینگە بە هیچ جۆرێك کاریگەرییان نەبێت، بەڵام هەمیشە هەردولامان ئەڵتەرناتیڤی سودمەندی دیکەمان لەبەردەستدایە. هەروەها دڵڕەحەتی لەوەشدا بەرجەستە دەبێت کە بزانیت لە تواناتدا هەیە بە شێوەیەکی کاتی لە چوارچێوەی بیروباوەڕەکانت بێیتە دەرەوە بۆ ئەوەی بە قووڵی و بە چاکی لە بەرامبەرەکەت تێبگەیت. جۆرێکی دیکەی دڵڕەحەتییش بەرهەمی هاوکاری کارلێکی راستەقینە و خوڵقێنەرە لەگەڵ دەوروبەردا و فێربونی راستەقینەی ئەو نەریت و خووانەیە کە لە هاوکاری و یەکتر تەواوکردندا دروست دەبن.

دڵنەئمینییەکیش هەیە زادەی خزمەتکردنی خەڵکییە بێ هیچ مەبەست و بەرامبەر و هەستبەئازار کردنێك. گرنگترین سەرچاوەی ئەم جۆرە خزمەتکردنەش ئەوەیە تۆ ئەرکەکەی خۆت بەئەنجام بگەیەنیت، بە جۆرێکی وا کە خۆت بە کاریگەر و بەشدار و خوڵقێنەر بزانیت لە شوێنەکەی خۆتدا. سەرچاوەکانی دیکەش بریتین لەوەی کارێکی خێرخوازانە بکەیت بێ ئەوەی کەس بزانێت تۆیت، نە ئێستاو نە لە داهاتووشدا، چونکە ئەوەی بەلای تۆوە گرنگە دڵخۆشکردنی کەسەکەیە نەك ناووناوبانگی خۆت.

(ڤیکتۆر فرانکل) دەڵێت ئامانج مەسەلەیەکی گرنگە لە ژیانی مرۆڤدا و وا لەو ژیانە دەکات باڵا بکات و باشترین ماتە وزەکانی ناخمان بهێنێتە دەرەوە. خوالێخۆشبوش (د. هانزسیلای) لەو توێژینەوە بەناوبانگەی کە لەسەر دڵەڕاوکێ کردوێتی دەڵێت: ژیانی تەندروست و بەختەوەر بەرهەمی بەشداریکردنی جددییە لە ژیان و لە پڕۆژە جددییەکانی کە خەڵك پێی بەختەوەر و سودمەند دەبن و لەم ڕووەوە هیچ دەرمانێك هێندەی ئەوە کاریگەر نییە کە کارێك بکەیت هاوسێکەت

دڵخۆش بکات. ئەمەیە چێژی راستەقینەی ژیان ... ئەو ژیانەی کە ئامانجەکەی بەدیهێنانی مەبەستێکە بەلاتەوە زۆر گرنگ و بایەخدارە. لەبری گلەیی و بۆڵەبۆڵکردن و ناڕەزایەتی دەربڕینی خۆپەرستانە کە گوایە جیهان خۆی تەرخان نەکردووە بۆ بەختەوەرکردنی ئێمە، چاکتر وایە ئێمە چێژ و بەختەوەری لە دڵخۆشکردنی خەڵکیدا ببینین. ئەمە هێزێکە لە هێزەکانی سروشت. من لەگەڵ ئەو بیرو بۆچوونەدام کە دەڵێت ژیانی من ملکی هەمو کۆمەلگایە و بە شەرەفێکی گەورەی دەزانم تا دواهەناسەی ژیانم خزمەتی ئەو کۆمەلگایە بکەم بەپێی توانا و دەمەوێت لەو پێناوەشدا هەمو شارەزایی و وزەیەکم بخەمە کار. ژیان بەلای منەوە ئەو مۆمە بچکۆلەیە نىیە کە هەر کاتێك کوژایەوە ئیتر هیچ کاریگەرییەك و شوێن دەستێکی بەجێ نەمێێت بەڵکو ئەو مەشخەڵە مەزنەیە کە پێویستە هەڵی بگرم تا دەتوانم و پاشان بیدەمە دەست نەوەکانی داهاتوو.

لەم بارەیەوە (ئێن. ئیڵدۆن تانەر) دەڵێت: "خزمەتکردن و جێبەجێکردنی ئەرکی سەرشانمان کرێی ژیانمانە لەسەر زەوی". مرۆڤ ئەگەر لە دەزگا خێرخوازیەکانیشدا نەبێت و تەنانەت لە بوارێکیشدا کارنەکات کە خزمەتگوزاری پێشکەش دەکات، هێشتا هەر دەتوانیت بە چەندین رێگا خزمەت پێکەش بکات. مەحاڵە رۆژێك هەبێت لە ژیانی هیچ کەسێکدا کە لانی کەم خزمەتێکی پێشکەشی کەسێك نەکردبێت و بەمەش پاشەکەوتەکانمان لە بواری رێز و خۆشەویستی بێ بەرامبەر و بێ بەرژەوەندیدا زیاد دەکات.

## ئاڕاستەکردنی خەڵك:

زۆربەی خەڵکەکە دەرەنجامی ئاوێنە کۆمەڵایەتییەکەن، واتە دەکەونە ژێر بیرو بۆچوون و کاریگەرێتی و پارادیمی خەڵکەوە. من و تۆش وەك دوو مرۆڤی سەربەخۆ، هەر لەو پارادیمەوە هاتووین و بەشێکین لەو وێنە کۆمەڵایەتییە.

ئێمە دەتوانین وا بکەین خەڵکەکە وێنەیەکی ئاشکراو دەستکارینەکراوی خۆیان ببینین و دەشتوانین سروشتە خوڵقێنەر و لایەنە ئەرێنیەکانیان نیشان بدەین و وایان لێ بکەین خۆیان بە لێپرسراو بزانن. دەتوانین وەکو مرۆڤی سەربەخۆی هاوسەنگ و خاوەن پرنسیپ و بنەما ئاڕاستەیان بکەین. تۆ ئەگەر بەرامبەرەکەت بە

گەورە ببینیت خۆت بچوک ناکەیتەوە، بەڵکو بە پێچەوانە ئەو بەرچاوتێری و ڕێزگرتن و بەگەورە تەماشاکردنەی بەرامبەرەکەت دەبێتە مایەی گەورەبونی خودی خۆیشت چونکە بواری کارو هاوکاریت زیاد دەکات لەگەڵ خەڵکیدا.

هەر کەسێك لە ئێمە ڕۆژێك لە ڕۆژان بەسەری هاتووە کە هیچ بڕواو متمانەیەکی بەخۆی نەمێنێت و لەبیریشمانە کە ئەوساتەوەختە کەسێك دەری خست کە باوەڕی پێمانە، چۆن کاریگەرییەکی گەورەیی لەسەرمان بەجێ دەهێشت. کاتێك کە بەرامبەرەکەت بە هەڵسوکەوتی خۆی دووپاتی دەکاتەوە کە (ئەو) باوەڕی بە تواناکانی تۆ هەیە، مانای وایە (ئەو )بە شێوەیەك لە شێوەکان ئاڕاستەن دەکات و ئەمەش گۆڕانکارییەکی گرنگ بەدی دەهێنێت لە ژیانتدا.

تۆ ئەگەر ئاڕاستەکەرێکی ئەرێنی بیت و پشتیوانیی بۆ بەرامبەرەکەت دەرببڕیت و ئەو کەسە لە ئاوێنەکەی تۆدا خۆی وەك کەسێکی بەڕێزو لێهاتو بینی، بە دڵنیاییەوە ڕێگای سەرکەوتن دەگرێتە بەر. ئەم جۆرە تێڕوانینە بەرپرسیارێتی لە ملی کەسەکە دانامالێت بەڵکو بە پێچەوانەوە هانی دەدات دەستپێشخەر بێت.

ڕەنگە زۆربەمان چیرۆکی ئەو شاعیرە سوارچاکەی سەدەکانی ناوەڕاستمان بیستبێت کە ژنێکی لەشفرۆش دەبینێت. ئەم ژنە لەشفرۆشە ژیانی خۆی بۆ ئارەزووەکانی خەڵك ڕێك خستبو. بەلام ئەم سوارچاکە شاعیرە شتێکی دیکەی لە ژنەکەدا بینی، شتێکی جوان و خۆشەویست. ئەو خەسڵەتە باشەکانیشی دەبینی و بەردەوام جەختی لەسەریان دەکردەوە. تەنانەت ناوێکی تازەشی بۆ ژنەکە دۆزییەوە. ناوی نا - جوانە. کە ناوێکی تازەبو پەیوەست بە پارادیمێکی تازەوە.

سەرەتا ژنەکە کاردانەوەیەکی نەرێنی و خراپی نیشان دا بەرامبەر بە شاعیرەکە. ئەو کەوتبووە ژێر کۆنترۆڵی بیرو بۆچوونە کۆنەکانەوە. شاعیرەکەی بە کابرایەکی ئەقڵ سوك و نائاسایی حساب دەکرد. بەلام شاعیرە کۆڵی نەدا. خۆشەویستییەکی بێ سنور و بێ مەرجی پێبەخشی. بەردەوام بو لەسەر ئەم هەڵوێستەی تا ژنەکە وای لێ هات هیچ کاریگەرییەکی دیکەی لەسەر نەمێنێت. ژنەکە ئیتر وردە وردە وای لێ هات کاردانەوە و بیرو بۆچونەکانیشی بگۆڕێت و بە تەواوی بڕوا بە سوارچاکەکە بکات و بەپێی ئەم پارادیمە تازەیە ڕەفتار بکات بە جۆرێکی وا کە لە سەرەتادا هەمو دەوروبەرەکەی سەرسام کرد.

دواتـریش، کاتێـك کـە ژنەکـە خـەریك بـو دەگەڕایـەوە بـۆ ڕەفتارەکـانی جـارانی، شاعیرە سوارچاکەکە لە سەرەمەرگدا بو، بانگی کردو ئەو شیعرە دڵڕفێنـەی بـۆ وت کـە بە (خەونی مەحاڵ) ناسراوە. ئینجا چاوی بڕییـە چـاوی و پێـی وت: (بـیرت نەچـێت، تۆ جوانیت ..)

یـەکێك لـە چیرۆکە کۆنـەکانی بـواری پێشبینیکردن چیرۆکی کۆمپیوتەرێکە لـە بریتانیا کە بە ڕێکەوت لـەکاتی پرۆگرامکردنیـدا هەڵەیـەکی زەق روو دەدات. هەڵەکـە ئـەوەبو کـە نـاوی قـوتـابـیـیـە زیرەکـەکانی قوتابخانەکـە خرابـووە خانـەی قـوتـابـیـیـە گێلـەکان و لیسـتی قوتـابـیـیـە گێلـەکانیش بەهەڵـە خرابـووە خانـەی زیرەکەکانـەوە. ڕاپۆرتی ئەم کۆمپیوتەرەش پێوەرێکی بنـەڕەتی بـو کـە مامۆسـتاکان لەسـەرەتای ساڵدا پەیڕەویان دەکرد بۆ ناسین و هەڵسەنگاندنی قوتابییەکان.

پێـنج مـانگ و نیـو پـاش ئـەوە، کاتێـك کـە بەڕێوەبەرایـەتی قوتابخانەکـە بـەو هەڵەیەی زانی، بڕیاری دا بـە هـیچ شێوەیەك ئـەم مەسـەلەیە لای کـەس بـاس نـەکات. سـەرلەنوێ، جـارێکی دیکـە قوتابییـەکان تـاقی بکاتـەوە. (ئیمتیحانیـان بکـات). ئەنجامەکـە زۆر سـەرنجڕاکێش بـو. ئـەو خوێندکارانـەی کـە بەڕاسـتی زیـرەك بـون و ناویـان بەهەڵـە خرابـووە لیسـتی تەمـەڵ و گێلـەکانیش بـە شـێوەیەکی بەرچـاو نمرەکانیان دابەزی. چونکە وا مامەڵەیان لەگەڵ دەکرا کە بەحساب تەمـەڵ و لاسارن و توانـای ئەقڵیشـیان سـنوردارە و فێرکردنیـان زەحمەتـە. ئـەم جـۆرە تێڕوانینـە تەقلیدییەی مامۆستاکان وای کرد بەو شێوەیەیان لێ بێت.

بـەڵام ئەوانـەی کـە بەراسـت تەمـەڵ بـون و ناویـان بـە هەڵـە خرابـووە لیسـتی زیرەکەکانەوە نمرەی بەرزیان هێنا چونکە مامۆستاکان بـەو حسابە مامەڵـەیان لەگـەڵ دەکردن کـە زیـرەکن. ئـەم جۆرە تێڕوانینـە دەنگدانـەوەی باشـی دروسـت کـرد لەسـەر وزەو گەشـبینی و خۆشـحاڵکردنیندا. لـە هەفتـە سـەرەکییەکانی سـاڵی خوێنـدنـدا مامۆسـتاکان وا هەڵوێسـت و دۆخەکـەیان لێـك دەدایـەوە کـە: "خـەتای مەنهەجاکانـە چونکە کۆن و شکسخواردون، لەبـەر ئـەوە پێویسـتە بیـانگۆڕین: زانیارییـەکان ئـەوەیان دەردەخسـت کـە قوتابییـەکان زیـرەك بـون و ئـەو شـتەی روی داوە پەیوەنـدی بـە مەنهەجەوە هەیە لەبەر ئەوە مەنهەجەکانیان گۆڕی.

ئاوێنەکەی ئێمە چی نیشانی خەڵکەکە دەدات و ئەم ڕەنگدانەوەیە تا چەند کاردەکاتە سەر ژیانیان؟ ئێمە دەتوانین سەرمایەگوزارییەکی زۆر بکەین لە پاشەکەوتی پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و سۆزدارییەکانمان لەگەڵ خەڵکیدا. مرۆڤ چەند بتوانێت وزە شاردراوەکانی کەسی بەرامبەری ببینێت هێندە دەتوانێت پەنا بۆ خەیاڵ ببات. نەك گەڕانەوە بۆ بیرەوەری لەگەڵ هاوسەر و منداڵ و هاوکار و بەڕێوەبەرەکانیدا. تۆ بەم جۆرە تەماشاکردنەی بەرامبەرەکەت چیدی ئەو لە قاڵب نادەیت و هەر جارەی بە شێوازێکی نوێتر دەبینیت و دەتوانیت هاوکاری بیت لەوەی بیکەیتە کەسێکی سەربەخۆی وا کە لەخۆی ڕازی بێت و بتوانێت پەیوەندی بەسود و چاك لەگەڵ دەوروبەردا دروست بکات.

گۆتە دەڵێت: "ئەگەر مامەڵە لەگەڵ کەسێکدا بکەیت وەك ئەوەی کە هەیە، کەسەکە وەکو خۆی دەمێنێتەوە، بەڵام ئەگەر بەو چاوە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکەی کە پێویستە ببێت بە چی و ئاواتەخوازیت وای لێ بێت ئەوا کەسەکە دەبێتە ئەوەی کە پێویستە ببێت.

## هاوسەنگی لە پرۆسەی نوێبونەوەدا

پرۆسەی نوێبونەوەی خۆیی بریتییە لە نوێبونەوەیەکی هاوسەنگ لە هەمو ڕەهەندەکانی سروشتی ئێمەدا: جەستەیی و ڕۆحی و هزری و کۆمەڵایەتی/ سۆزداریی. سەرەڕای بایەخی نوێبونەوە لە هەر ڕەهەندێك لەو ڕەهەندانەدا، بەڵام کاریگەریی دووروتەئسیری ئەو نوێبونەوەیە دەرناکەوێت مەگەر بە مامەڵەکردن نەبێت لەگەڵ ئەو ڕەهەندانەدا بە شێوازێکی هاوسەنگ و حەکیمانە. هەروەها هەر ڕەهەندێکیش لەو ڕەهەندانە دەتوانێت کاریگەریی نەرێنی دابنێت لەسەر باقی ڕەهەندەکانی دیکە.

ئەم قسەیە هەم مرۆڤیش دەگرێتەوە و هەم دام و دەزگاکانیش. لە دەزگادا ڕەهەندە جەستەییەکە دەبێت بە مەسەلە ئابورییەکان، ڕەهەندی هزریش یاخود دەرونی لەو بوارانەدا بەرجەستە دەبێت کە پەیوەندییان بە ناوبانگ و گەشەکردن و سود وەرگرتن لە بەهرەکان هەیە. ڕەهەندە کۆمەڵایەتی/ سۆزدارییەکەش پەیوەستە بە پەیوەندییە مرۆییەکان و چۆنێتی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ خەڵکیدا. ڕەهەندە ڕۆحییەکەش دەبێت بە ئامانج و واتای دەزگا لەرێی بەشداری و مەبەست و دەستپاکیی ئەندامەکانییەوە.

**ئەگەر دەزگاکە هەر لایەنێك فەرامۆش بکات، ئەوا بە خراپە دەگەڕێتەوە بۆ سەرجەم دەزگاکە و بۆ ئەو هێزە خولقێنەرانەش کە رەنگە هێزێکی گەورەی لێ بکەوێتەوە دژی دەزگاکە بەکارهێنرێت و دەبێتە هۆی پەکخستنی بەرهەم و گەشەکردن.**

**من رێم کەوتۆتە دەزگای واوە کە هیچ پاڵنەرێکی نەبووە جگە لە پاڵنەری ئابوری — واتە زیادکردنی سەرمایە. دیارە ئەم جۆرە دەزگایانە بە ئاشکرا ئامانجەکە دەرنابڕن بەڵکو باس لە شتی دیکە دەکەن. بەڵام لە ناخیاندا هیچ شتێك نییە جگە لە ئارەزوی پارەکۆکردنەوە.**

**دەزگای لەوجۆرە، سیخناخە لە دیاردەی کەلتوری نەرێنی و دەبینین لق و بەشە جۆراوجۆرەکانی لە ململانێ و دژایەتیکردنی یەکتریدا خەریکی فێڵ و تەڵە نانەوەن بۆ یەکتری: دیارە هیچ دەزگایەك بەبێ کۆکردنەوەی پارەو زیادکردنی سەرمایەکەی ناتوانێت پێش بکەوێت، بەڵام ئامانجی دەزگا تەنیا هەر ئەمە نییە. ئێمە بۆ ئەوە ناژین کە بخۆین بەڵکو بۆ ئەوە دەخۆین کە بژین.**

**لەلایەکی دیکەوە، زۆر دەزگام بینیوە کە تەنیا هەر جەخت لە رەهەندە کۆمەڵایەتییەکە دەکاتەوە (کۆمەڵایەتی/ سۆزداری) ئەو دەزگایە بەردەوام تاقیکردنەوەی کۆمەڵایەتییان تێدا ئەنجام دەدرێت و لە بەهاکان و پێوەرەکانیدا هیچ پێوەرێکی ئابوری نابینیت — لە ئەنجامیشدا هەمو تواناو شارەزاییەکان لێیان دەتەکنەوە و ناتوانێت لە یارییەکەیدا بەردەوام بێت.**

**هەروەها زۆر کۆمپانیا و دەزگای واشم دیوە کە بایەخ بە سێ رەهەند دەدات — بۆ نمونە بایەخ بە پێوەرەکانی خزمەتگوزاری چاك دەدات. بڕەو بە پێوەرە ئابورییەکانیش دەدات و پەیوەندییە مرۆییەکانی لەلا گرنگە، بەڵام خۆی بە بەرپرسیاری ئەوە نازانێت خاوەن بەهرەکان دەستنیشان بکات و سودیان لێ ببینێت و رێز لە تواناکانیان بگرێت. لە ئەنجامدا، واتە لە ئەنجامی نەبونی "ئەو هێزە دەرونیانەدا" شێوازێك دێتە ئاراوە کە ئۆتۆکراسییە. خاوەنی کەلتورێکە لێوان لێوە لە بەرهەڵستکاری و دژایەتی و رقەبەرایەتی و زیادەڕەویکردن لە رێکخستندا و چەندین کێشەی دیکەی قوڵ و درێژخایەن.**

**کاریگەربونی مرۆڤ و دەزگا جۆراوجۆرەکان پەیوەستە بە گەشەپێدان و نوێکردنەوەو و برەودانە بە هەمو رەهەندەکان بە شێوەیەکی هاوسەنگ و حەکیمانە.**

فەرامۆشکردنی هەر ڕەهەندێك بەرهەڵستکاری لێ دەکەوێتەوە و گەشەکردن پەك دەخات. ئەو کەس و دەزگایانەی کە هۆشیارییان هەیە دەربارەی ئەو چوار ڕەهەندە، هەمیشە لە بڕیارەکانیاندا چوارچێوەی نوێبونەوەیەکی هاوسەنگ لەبەرچاو دەگرن.

کلیلی سەرکەوتنە ئابورییەکەی ژاپۆن و نهێنی درەوشانەوەکەی لە مەسەلە ئیدارییەکان و چاککردنی بەرهەمدا لەم پرۆسەیەدا دەبینرێن.

## یەکتر تەواوکردن لە نوێبونەوەدا:

نوێبونەوەی هاوسەنگ، خۆی لە خۆیدا پرۆسەیەکی کەڵەکەبووە. ئەو کارانەی کە مرۆڤ ئەنجامیان دەدات بۆ تیژکردنەوەی مشارەکە لە هەر بوارێکدا کاریگەریی ئەرێنی دەبێت لەسەر بوارەکانی دیکە، چونکە ڕەهەندەکان لە ناوەوە زۆر پێکەوە پەیوەندییان هەیە. لەشساغی کاردەکاتە سەر سەلامەتی مێشك؛ هێزی ڕۆح کاردەکاتە سەر هێزی کۆمەڵایەتی و سۆزداریی. کە تۆ لە بوارێکدا چاکتر دەبیت، بوارەکانی دیکەشت چاکتر دەبن.

حەوت خووەکەی کەسانی هەرە کاریگەر باشترین هاوکاری دەخوڵقێنێت لەو ڕەهەندەدانەدا. نوێبونەوە لە هەر ڕەهەندێکدا لانی کەمی ئەو هەلەت بۆ دەرەخسێنێت کە هیچ نەبێت لە یەکێك لەو حەوت خووەدا بژیت. خووەکان هەرچەند یەك لەدوای یەکن بەڵام گەشەکردن لە خوویەکدا توانای زیاترت پێ دەبەخشێت خووەکانی دیکەش بەرجەستە بکەیت.

مرۆڤ هەتا زیاتر دەستپێشخەر بێت (خووی یەکەم) کاریگەرانەتر دەتوانێت ببێتە سەرکردە (خووی دووەم) و ژیانی خۆی بەڕێوەببات (خووی سێیەم). باشتر دەتوانێت چالاکییە گرنگ و کاوەخۆکان و نوێکەرەوەکان ئەنجام بدات (خووی حەوتەم) و هەتا زیاتر هەوڵ بدات سەرەتا ئەو تێبگات (خووی پێنجەم) زیاتر دەتوانێت بگاتە چارەسەرەکانی شێوازی براوە/ براوە (خووی چوارەم و خووی شەشەم). هەتا چاکسازیی زیاتریش بکەیت لەو خووانەی کە دەبنە مایەی سەربەخۆیی مرۆڤ (خووەکانی یەکەم و دووەم و سێیەم) زیاتر دەتوانێت کاریگەرانە دەوروتەئسیری هەبێت لەسەر دەوروبەرەکەی و لەسەر پەیوەندی ئەو لەگەڵیاندا (خووەکانی چوارەم و پێنجەم و شەشەم). بەڵام نوێبونەوە (خووی حەوتەم)

بەرجەستەکردنی نوێکردنەوەی ئەو هەمو خووانەیە.

مـرۆڤ لـەکاتی نوێکردنـەوەی رەهەنـدە جەسـتەییەکەیدا لەراسـتیدا تێـڕوانین و گۆشەنیگای خۆی بەهێز دەکات (خووی یەکەم). هـەروەها ویستی ئـەرێنی و سـەربەخۆی خۆی و پارادیمەکەشـی بـەهێز دەکـات و ئـەو راسـتییەی بـۆ دوپـات دەکاتـەوە کـە مـرۆڤ لـەبری ئـەوەی کارلێکراو بێت دەتوانێت بونـەوەرێکی کـاراو بکـەر بێـت و خـۆی جـۆری کاردانەوەکەی هەڵببـژێرێت بەرامبـەر کارلێکە دەرەکییـەکان. رەنگە ئەمـەش گـرنگترین دەرەنجـامی راهێنـانی جەسـتەیی بێـت، چـونکە هـەمو سـەرکەوتنێکی رۆژانـە دەبێتـە پاشەکەوتێك و دەچێتە لەسەر ژمارە حسابی هەستکردنت بە ئارامی و ئاسایشی ناخ.

مـــرۆڤ هاوکـــات لەگـــەڵ نوێکردنـــەوەی رەهەنـــدە رۆحییەکەیـــدا توانـــای سەرکردایەتیکردنیش لە خۆیدا بەهێز دەکات (خووی دووەم) و وای لێ دێت نـەك هـەر بیرەوەرییـەکانی، بـەڵکو هـۆش و خەیاڵیشی تێبپـەڕێنێت بـە جۆرێـك بتوانێـت قـوڵ ببێتـەوە لـە تێگەیشتنی بۆچـونە ئەقڵییـەکانی و لـەو بەهایانـەی کـە رەگـی قوڵیـان رۆچۆتە ناخییـەوە و سیستمێکی هاوسـەنگ لـەناو خۆیـدا بخولقێنیت پێکهاتبێت لـە پرنسیپە راستەکان و لە دیاریکردنی پەیامە تایبەت و بێ وێنەکـەی خـۆی. لـە ژیانیـدا خـۆی سـەرلەنوێ بـە جـۆرێکی وا ئاڕاسـتە بکـات کـە ژیـانی هاوئاهـەنگ بێـت لەگـەڵ پرنسیپە راستەقینەکانیدا و هەروەها پشت بەستنیش بـە سەرچاوەکانی هێـزی خـۆی. ئەو ئاستە چاکەی کە لە ئەنجامی نوێکردنـەوەی رەهەنـدی رۆحیـت، بەدەسـتی دێنیـت دەبێتــە پاشــەکەوتێك و دەچــێتە ســەر حســابی ئاسایشــی تایبــەتی خــۆت. هــەروەها نوێکردنەوەی رەهەندی هزریش دەبێتـە مایـەی پتـەوکردنی ویسـتی کەسـەکە (خـووی سێیەم). تۆ هەتا زیـاتر پـلان دابڕێـژیت زیـاتر ئـەقڵت وا لێ دەکـەیت ئـەو چالاکییانە بناسـێتەوە و لێیـان تێبگـات کـە گـرنگ و کـاوەخۆن و هـەروەها ئـەو چـالاکی و ئامانجانەش دیـاری بکـات کـە لـە ریزبەندییـەکانی سـەرەوەدان و دەبنـە مایـەی ئـەوەی ئەوپەڕی سود لە کات و لە هەوڵەکانت ببینیت. ئـەم مەسـەلەیە لـە بـواری فێرکردنـی بەردەوامـدا بازنـەی زانیارییـەکانی مـرۆڤ فـراوانتر دەکـات و ئەڵتـەرناتیڤی زیـاتری دەخاتـە بەردەست. مـرۆڤ ئاسایشە ئابورییەکـەی خـۆی لـەو پیشـەو کـارەدا دەسـتەبەر ناکـات کـە خاوەنیانـە، بـەڵکو بـەوە دەسـتەبەری دەکـات کـە تـا چـەند توانـای بەرهـەمهێنانی هەیـە و بیردەکاتـەوە و فێـر دەبێـت و چـەند داهێنـنـەرە و چـەندێك

توانای خۆگونجاندنی هەیە. سەربەخۆییە داراییە راستەقینەکە لەمەدایە. مەسەلەکە بونی موڵك و سامان نىیە بەڵکو ئەوەیە کە تا چەند دەتوانین سامان دروست بکەین.

کلیلی پێشخستنی حەوت خووەکە لە سەرکەوتنی رۆژانەی خۆتدایە و ئەمەش سەرومڕ لە ناو بازنەی دەوروتەئسیردا حەشار دراوە. رۆژانە لانی کەم یەك سەعات تەرخان بکە بۆ نوێکردنەوەی رەهەندە جەستەیی و رۆحی و هزرییەکان. بەم کاتە تەرخانکراوە دەتوانیت مەسەلە گرنگ و کاوەخۆکان بخەیتە ژیانتەوە و ببیتە کەسێکی هاوسەنگ.

لە سەرێکی دیکەشەوە ئەم بناغەی سەرکەوتنی رۆژانەیە و سەرچاوەی ئەم ئاسایشەی ناخە کە هەموان پێویستمان پێیەتی بۆ تیژکردنەوەی مشارەکە لە رەهەندە کۆمەڵایەتی و سۆزدارییەکەدا. هێزی ئەوەمان پێدەبەخشێت کە لە مەسەلەی پەیوەندییەکانماندا فۆکەس بخەینە سەر بازنەی دەوروتەئسیرمان و رێز لە جیاوازییەکانی نێوانی خۆمان و خەڵکی بگرین و بەرچاوتێر بین لە بەرامبەر سەرکەوتن و کامەرانیاندا. سەرکەوتنی رۆژانەی تایبەتی ئێمە ئەو بناغەیەمان بۆ دابین دەکات کە پێویستە بۆ تێگەیشتنێکی راستەقینە لە خەڵکی و هەروەها بۆ دەستەبەرکردنی ئەو چارەسەرانەی کە سودی هەموانیان تیایە و ئەنجامدانی خووەکانی چوارەم و پێنجەم و شەشەمیان لە بارودۆخێکی پڕ لە هاوکاری و یەکتر تەواوکردندا پێ ئەنجام دەدرێت.

## سەرکەوتنە لولپێچییەکە

لەراستیدا نوێکردنەوە سەرەتاو تەنانەت خودی ئەو پرۆسەیەشە کە توانامان پێ دەبەخشێت بە لولپێچی گۆڕان و گەشەسەندندا سەربکەوین. کە لولپێچی گەشەکردنی بەردەوامە.

گەر بمانەوێت پێشکەوتنێکی راستەقینە و هەمیشەیی لەم سەرکەوتنەدا بهێنینە دی پێویستە لایەنێکی دیکە لە لایەنەکانی نوێکردنەوە بەهەند وەربگرین کە ویژدانە. خەسڵەتی مرۆڤ وا دروست بووە کە ویژدان رۆڵێکی گرنگی هەیە لە ئاراستەکردنی بزووتنەوە لولپێچەکە بەرەو سەرەوە. سەبارەت بە ویژدان "مادام دی. ستاڵ" قسەیەکی جوانی هەیە و دەڵێت: "دەنگی ویژدان هێندە ناسکە بە ئاسانی دەتوانیت کپی بکەیت، بەڵام هێندەش ئاشکرایە مەحاڵە لێمان تێك بچێت" ویژدان

نیعمەتێکی خوایە کە سەبارەت بە پرنسیپە راست و دروستەکان چوونیەکبومان یاخود جیاوازییەکانمان پێکەوە دەبەستێت و ئەو کەسەی کە خاوەنی ویژدانێکی پێگەیشتوبێت مانای وایە ویژدانەکەی هێندەی ئەو پرنسیپانە بەرزە.

وەك چۆن یاریزانە نایابەکانی ئاسن زۆر گرنگە شارەزای دەمار و ماسولکەکان بن و خوێندکاری زانستە سروشتیەکانیش پێویستە شارەزای کارکردنی ئەقڵ بن، ئا بەو شێوەیەش مرۆڤە ئەرێنی و هەرە کاریگەرەکان پێویستە ویژدانیان فێر بکرێت. بەلام راهێنان و مەشقکردن لەسەر ویژدان و فێرکردنی مەسەلەیەکە پێویستی بە سیستمێکی فێرکردنی زۆر هاوسەنگ و بە مرۆڤی ئەمین هەیە و کەسەکە دەبێت دڵ و مێشکی لای ئەو بابەتە بێت. هەروەها خۆی لەسەر خوێندنەوە و شارەزایی پەیداکردن لە ئەدەبی بەرزدا رابهێنێت و مێشکی بخاتە گەڕ بۆ دەرخستنی بیرۆکەی جوامێرانە و لە هەموشی گرنگتر پێویستە ژیانی وا رێك بخات کە هاوئاهەنگ بێت لەگەڵ دەنگە ناسك و نەگۆڕەکەی ویژداندا.

دیارە وەك چۆن وەرزشنەکردن و خۆراکی خراپ بۆ باری تەندروستی وەرزشکارەکانی ئاسن خراپە، بەو شێوەیەش ئەو مەسەلانەی کە ناشیرین و ناڕەوشتی و قێزەونن دەبنە هۆکاری ئیفلیجبونی هەستە ناسك و جوانەکانمان و دروشمی ویژدانە کۆمەلایەتییەکەمان دەگۆڕێت. جاران ترسەکەمان ئەوەبو کە خەڵك پێمان نەزانێت و بەو کارە ناشایستەیەوە نەمانبینێت، بەلام کە ویژدانمان ئیفلیج دەبێت، چاك و خراپمان لێ تێك دەچێت. لەم بارەیەوە (هامارسکجوۆڵد) دەڵێت:

تۆ ئەگەر لەگەڵ گیانلەبەرەکەی ناخی خۆتدا یارییت کرد بە دڵنیاییەوە دەبیتە گیانلەبەرێکی تەواو. ئەگەر لەسەر فێڵ و ساختەچێتیش بژیت مافی ئەوە لە خۆت دەستێنیتەوە کە راستیەکان بناسیت. ئەگەر لەسەر توتدوتیژییش بژیت تواناکانی ئەقڵت لەدەست دەدەیت. کەسێك بیەوێت کاروانەکەی بگەیەنێتە مەنزڵ، نابێ گوێبداتە سەگوەڕ.

ئێمە کە لە خۆمان تێگەیشتین پێویستە هاوزەمانیش پرنسیپ و ئامانجەکانی ژیانمان دیاری بکەین ئەگینا ئەو تێگەیشتنەمان لەکیس دەچێت و رێك وەکو ئاژەڵمان لێ دێت کە هەر لەپێناوی خواردن و زاووزێدا دەژین. ژیانی مرۆڤی لەوجۆرە بە ئێکسپایەر لەقەڵەم دەدرێت. تەنیا هەر رووداوەکانی دەوروبەریان کاردانەوەیان لا

دروست دەکات و ئاگاداری ئەو بەخشش و نیعمەتە زۆرانە نین کە لە ناخیاندا بەفەرامۆشکراوی ماونەتەوە. دیارە لەم رووەوە هیچ رێگەیەکی قەدبڕ نییە بۆ پێشخستنی ئەو خەسڵەتە نایابانەی مرۆڤ. لێرەشدا هەر یاساکەی دروێنە باڵادەستە و ئێمە هەر ئەوە دەدروێنەوە کە چاندومانە. یاسای دادپەروەری شتێکی نەگۆڕە و هەتا زیاتر لە پرنسیپە راستو دروستەکان نزیک ببینەوە باشتر دەتوانین جیهان و رووداوەکانی جیهان هەڵبسەنگێنین و بۆچوونەکانیشمان وردتر دەبن.

بۆ گەشەکردن و پێشکەوتنمان بەپێی ئەم سەرکەوتنە لولپێچیە پێویستە چالاکتر بین لە پرۆسەی نوێکردنەوەدا ئەویش لەرێی فێرکردنی ویژدان و گوێڕایەڵبونەوە بۆی. ویژدان ئەگەر بەردەوام فێربکرێت کەسەکە هان دەدات شێلگیرتر و بەردەوامتر بێت لەسەر رێگای ئازادی و حیکمەت و زۆرتر هەست بە ئاسایشی ناخی خۆی بکات و دەوروتەئیسیریشی لە فراوانبونێکی بەردەوامدا بێت. بەردەوامبون لەسەر ئەم سەرکەوتنە لولپێچیە پێویستی بەوە هەیە بەردەوام فێر ببین و پابەند ببین و ئاستی کارو چالاکییەکانیشمان رۆژ بەرۆژ بەرزتر بکەینەوە. ئێمە فێڵ لە خۆمان دەکەین گەر وابزانین ئەم فێربون و پابەندبون و کارکردنە سنوریان هەیە و ئیتر بەسن. بەردەوامبونی پێشکەوتن پێویستی بەوەیە بەردەوام فێربیت و پابەندبیت و کاربکەیت. فێربیت و کاربکەیت.



١. لیستێك ئامادە بكە بەو چالاكییانەی كە هەم بۆ جەستەت باشن و هەم لەگەڵ شێوازی ژیانیشت دەگونجێن و لەهەمان كاتیشدا بە تێپەڕبونی كات چێژیان لێ دەبینیت.

٢. چالاكییەك هەڵبژێرە و بیكەرە ئامانجی حەفتەی ئایندەت. لە كۆتایی حەفتەدا بیروبۆچونەكانت هەڵبسەنگێنە و ئەگەر نەگەیشتبویتە ئامانجەكەت پرسیار لە خۆت بكە بزانە هۆكارەكە چییە؟ ئایا لەبەر ئەوەیە كە ئەو ئامانجەت بەستۆتەوە بە بابەتێكی گرنگەوە یاخود هۆكاری شكستەكەت ئەوەیە هەڵسوكەوت و بەهاكانت پێكەوە ناگونجێن؟

٣. لە بوارە هزری و رۆحییەكانیشدا چەند چالاكییەكی هاوشێوە ئامادە بكە. ئەو پەیوەندییانە باس بكە كە نیازت وایە گەشەیان پێبدەیت. هەروەها ئەو بارودۆخە تایبەتانەش كە سەركەوتنی بەكۆمەڵ رۆڵی گەورەتری تیا دەبینن. بۆ ئەم حەفتەیە و لە هەر بوارێكدا ئامانجێك دیاری بكە. ئەنجامی بدەو دواتر هەڵیبسەنگێنە.

٤. هەمو حەفتەیەك چەند چالاكییەكی دیاریكراو لای خۆت تۆمار بكە بۆ تیژكردنەوەی مشارەكە، لە هەر چوار رەهەندەكەدا. چالاكییەكان ئەنجام بدە و پاشان شێوازی ئەنجامدانەكان و ئەنجامەكانیشیان هەڵبسەنگێنە.

# دیسانەوە لە ناوەوە بۆ دەرەوە

"کاری خواوەند لە ناوەوە بۆ دەرەوەیە. کاری جیهان لە دەرەوەیە بۆ ناوەوە. جیهان خەڵکەکە دەباتە دەرەوەی گەڕەکە هەژارەکان. مەسیح گەڕەکە هەژارەکان رزگار دەکات. جیهان رەنگە بتوانێت بە گۆڕینی ژینگە خەڵکەکە بگۆڕێت. مەسیح خەڵک دەگۆڕێت و ئەوانیش ژینگەکەیان دەگۆڕن. جیهان رەفتاری مرۆڤ دیاری دەکات بەڵام خواوەند دەتوانێت رەفتاری مرۆڤ بگۆڕێت."

ئارزا تافت بینسۆن

پێم خۆشە بەشداریم بکەیت لەم چیرۆکە تایبەتەی مندا کە پێم وایە گەوهەری ئەم کتێبەی لەخۆگرتووە. بەشداریکردنەکەش بەوە دەبێت خۆت پەیوەست بکەیت بە بنەما سەرەکییەکانی ناو چیرۆکەکە.

چەند ساڵێك لەمەوبەر بە مەبەستی خۆتەرخانکردن بۆ نوسین مۆڵەتم وەرگرت لەو زانکۆیەی کە وانەم تیا دەوتەوە و بە خاوو خێزانەوە یەك ساڵی لە (هاوای) نیشتەجێ بوین کەوتۆتە کەناری باکوری (ئۆهۆ)ەوەوە.

پاش جێگیربونمان لەوێ ماوەیەکی کەم لە بواری گوزەران و ئیش‌وکاردا ژیانێکی رۆتینیمان دەست پێکرد کە نەك هەر بە بەرهەم بو، بەڵکو ئەوپەڕی کامەرانییشی تێدا بو.

بەیانیانی زوو لەو کەنار کامەرانییشی دوان لە منداڵەکانمان بەپێ خاوسی دەناردە قوتابخانە و خۆیشم دەچومە خانویەکی پەناوە لەنزیك کێڵگەیەکی قامیشە شەکر کە نوسینگەیەکی تیابو، لەوێ خەریکی نوسین دەبوم. شوێنەکە تا بڵێی بێدەنگ بو. خۆش‌و هێمن. نە تەلەفۆن و نە کۆبونەوە و نە چاوپێکەوتن.

نوسینگەکەم لە دەرەوەی بینای کۆلێژ بو. رۆژێکیان کە لە بەشی پشتەوەی کتێبخانەی کۆلێژەکە بەناو کۆمەڵە کتێبێکدا دەگەڕام، بە رێکەوت کتێبێك سەرنجی راکێشام و هەر کە بەیانیانی زوو لەوکەنار دەریایەوە کردمەوە چاوم کەوت بە بڕگەیەك کە زۆر کاری کردە سەر ژیانی لەوەو دوام.

چەندین جار ئەو بڕگە سەرنجڕاکێشەم خوێندەوە کە بیرۆکەیەکی زۆر سادەی لەخۆگرتبو. بڕگەکە ئەمەیە: لەنێوان کارلێك و کاردانەوەدا ماوەیەك یاخود بۆشاییەك هەیە. بناغەی پێشکەوتن و کامەرانیمان پەیوەستە بەوەی چۆن ئەو ماوەیە دەقۆزینەوە.

هەرچەندە من خۆم باکگراوندێکی چاکم هەبو لەسەر فەلسەفەی دیاریکردنی چارەنوس، بەڵام شێوازی داڕشتنی گوزارشتەکە (بۆشایی نێوان کارلێکەرو کاردانەوە) بە تەواوی بوژاندمییەوە. کاریگەرییەکە بە جۆرێك بو خۆیشم باوەڕم نەدەکرد. لەوە دەچو یەکەمین جار بێت هەستم بە راستییەکی لەوجۆرە کردبێت. رێك وەکو شۆڕش وابو لە ناخمدا، بەو پێیەی کە (شۆڕش بیرۆکەیەکە کاتی هاتبێت).

چەندین جار بیرم لێ کردەوەو هەستم دەکرد مێشکی داگیرکردوم. وام لێ هات شتەکەم لە خۆمدا تاقی دەکردەوە و چێژێکی زۆرم وەردەگرت لەوەی کە ئەم بڕگەیە وای لێ کردوم ئازادبم لە هەڵبژاردنی کاردانەوەکەمدا و بگرە بشتوانم کاریگەر بم و تەنانەت بیشیگۆڕم.

پاش ماوەیەکی کەم و لەئەنجامی ئەم بیرۆکە شۆڕشگێڕانەیەدا وامان لێ هات من و ساندرا جۆرێك لە گفتوگۆی قوڵ پەیڕەو بکەین. پێش نیوەڕوان بە پاسکیلەکەم ئەو و دوو منداڵە بچوکەکەم هەڵدەگرت کە هێشتا نەچوبونە بەر خوێندن و ماوەی نزیکەی یەك سەعات قسەمان دەکرد. منداڵەکان زۆر حەزیان لە سواری پاسیکل بو، لەبەر ئەوە هیچ دەنگە دەنگێکیان نەدەکرد و بە ئاسانی گوێمان لە یەکتر دەبو. کاتێکیش دەگەیشتینە قەراخ ئاوەکە، لەو شوێنە بێدەنگە پاسکیلەکەمان دادەناو نزیکەی ٢٠٠ مەترێك بە پیاسەکردن دەڕۆیشتینە شوێنێکی بێدەنگ و لەوێ نانی نیوەڕۆمان دەخوارد.

کەناری ئاوەکەو ئەو روبارەی کە لە دورگەکەوە دەهات بە تەواوی منداڵەکانیان سەرگەرم دەکرد، من و ساندراش دەمانتوانی درێژە بە قسەکەمان بدەین بێ ئەوەی کەسێك پێمان ببڕێت.

ئەم گفتوگۆیە، کە ماوەی ساڵێکی تەواوی خایاند و رۆژانە لانی کەم دوو سەعاتی پێدەچو، ئاستی متمانەو لێکتێگەیشتنی نێوانمانی بەرزتر کردەوە.

لە سەرەتادا باسی هەمو مەسەلە خۆشەکانمان کرد – خەڵك، بیرۆکە، رووداوەکان،

منالآن، نوسینەکەم، خێزانەکەمان، کەلوپەلی مال، پلانەکانی ئایندەو .. تاد. بەلام وردە وردە گفتوگۆکانمان قولبونەوە و وامان لێ هات زیاتر و زیاتر باسی جیهانی ناوەوەی خۆمان بکەین – پەروەردەکردنمان، پلانەکانمان، هەستو سۆزمان، متمانە بەخۆکردن، ئێمە لە قولایی ئەو گفتوگۆیانەدا بابەتەکانمان دەبینی. هەروەها خۆیشمان دەبینی لەناو باسو بابەتەکاندا. ئینجا هەولمان دەدا بە هەندێك رێگەی تازەو سەرنجڕاکێش و خۆش سود لەو پانتاییە وەربگرین کە لەنێوان کارلێکەرەکە و کاردانەوەکەدا هەیە و ئەمەش وای لێ کردین بیر لە حالی خۆمان بکەینەوە کە چۆن پرۆگرام کراوین و چۆن ئەو پرۆگرامانە بونەتە پارادیمی ئێمە و جیهانبینیەکەمانی دروست کردووە. پاشان سەرکێشییەکی سەرنجڕاکێشمان لە جیهانی ناوخۆی خۆماندا دەست پێکرد و تەماشامان کرد شتێکی زۆر سەرنجڕاکێشە و زۆر بەهێزتر و بەتامتر و گەورەتر و پڕدەستکەوتترە لەو شتانەی کە لە جیهانی دەرەوەدا هەستمان پێ کردبون.

دیارە هەر هەمو ئەنجامەکان خۆشوشیرین نەبون، چونکە گەلێك جار بەر ناوچە هەستیارەکان و تەلە روتەکانی ژیانمان دەکەوتین و روبەروی چەند ئەزمونێکی بەئازار و ناخۆش دەبوینەوە. هەروەها بەشێك لەو ئەزمونانەشمان هاتەڕێ کە تەواو لەبەردەم یەکتریدا کردینیەوە و خستینیە بەر رەحمەتی رەخنەکان. هەستمان کرد ئەو جۆرە ئەزمونانە پێویستن. پاشان کە چوینە ناو مەسەلە قولتر و هەستیارترەکانەوە و لێیان دەرچوین هەستمان کرد تا ئەندازەیەکی بەرچاو رزگارمان بووە لە ئاکامە خراپەکانیان.

ئێمە لەناو ئەو ئەزمونانەدا هاوکارو پشتیوانی یەکتری بوین. هەروەها هاندەر و هاوسۆزی یەکتریش بوین. بە ئەندازەیەکی وا کە وردە وردە گەیشتینە ئەو باوەڕەی کە پێویستە دوو یاسای گرنگ پەیڕەو بکەین بێ ئەوەی ناویان بهێنین. یەکەمین یاسا بریتی بو لەوەی کە چینە قولەکانی ناخمان، ئەگەری ئەوەیان هەیە ئازارمان بدەن و بریندارمان بکەن، کەواتە دەسەلاتی ئەوەمان نیە لێکۆلینەوە لە یەکتری بکەین، بەلکو دەبێت جەخت لەو راستیە بکەینەوە کە (وردبونەوە) خۆی مەسەلەیەکی دوژمنکارانەیە و ئەوپەڕی لۆجیك لەخۆدەگرێت و کۆنترۆلکەریشە. ئێمە لەراستیدا ئەو شتە زەحمەت و تازانەمان دەشاردەوە کە ترسناك بون و ترسو

گومان و نیگەرانییان دروست دەکرد. دەشمان ویست زیاتر و زیاتر بیشارینەوە، بەڵام لەهەمان کاتیشدا کارێکمان کرد کە هەرکەسە رێگە بدات بەرامبەرەکەی لەکاتی تەرخانکراوی خۆیدا دڵی خۆی بکاتەوە.

یاساکەی دیکە ئەوەبو: ئەگەر مەسەلەکە زۆر بریندارکەر و بەئازار بو، ئەوا ماوەی رۆژێکی تەواو واز لە گفتوگۆکە بهێنین و پاش ئەوە یان لەو شوێنەوە دەست پێدەکەینەوە کە گفتوگۆکەمان تیا راگرتبو، یاخود چاوەڕێ دەکەین تا کەسەکە هەست دەکات دیسان دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ یاساکە. هەمیشە کۆتاییەکانمان بە کراوەیی دەهێشتەوە، چونکە دەمانزانی پێویستمان پێی دەبێت. هەروەها لەبەرئەوەش کە هەم کاتمان بەدەستەوە بو هەم ژینگەکەش لەباربو. ئێمە لەبەرئەوەی زۆر مەبەستمان بو بچینە قوڵایی ناخی خۆمانەوەو گومانمان لە مەسەلەکان هەبو، هەر زوو لەو راستییە تێگەیشتین کە مەسەلەکە درەنگ و زوویی کەوتووە ئەگینا ئیشمان هەر دەکەوێتە ئەم کۆتاییە کراوانەوە و بە شێوەیەك لە شێوەکان تەواوی دەکەین.

زەحمەتترین بەشی ئەم گفتوگۆیە – کە دواجار باشترین بەرهەمی لێ کەوتەوە – ئەوەبو کە هەستمان کرد منیش و ساندرایش دەتوانین بەرامبەرەکەمان بریندار بکەین. ئینجا پاش ئەوە بۆمان دەرکەوت کە هیچ دوورییەك نەماوە لەنێوان کارلێکەر و کاردانەوەدا، چونکە ئەم مەسەلەیە تەواو سەرقاڵی کردوین، لەئاکامدا هەستە رقاوییەکان دەرکەوتن. بەڵام ئارەزوی قوڵی هەردوکمان و رێکەوتنە رانەگەیەندراوەکەی نێوانمان توانییان وامان لێ بکەن لەو شوێنەوە دەست پێبکەینەوە کە لێی وەستابوین و بەردەوام کار لەسەر ئەم هەستە رقاوییانە بکەین تا بەسەریاندا زاڵ دەبین.

کاتێك کە یەکێك لەو چرکەساتە زەحمەتانە هاتە رێم هاوئاهەنگ بو لەگەڵ ئارەزوییەکی بنەڕەتی ناخی خۆمدا. کەسایەتی باوکم کەسایەتییەکی تایبەت بو. زۆر بە وریاییەوە هەڵسوکەوتی دەکرد و زۆریش خۆی کۆنترۆڵ کردبو. دایکم ئەوساش و ئێستاش کەسێکی زۆر کۆمەڵایەتییە. قسەی دڵ و قسەی زمانی یەکێکن و کەسێکی زۆر راشکاوە. بۆم دەرکەوت کە ئەو دووجۆرە هەستکردنە لە ناخمدا

زیندون. کاتێك کە هەست بە نەبونی ئاسایشی و سەلامەتی دەکەم هەوڵ دەدەم وەکو باوکم و لە ناخی خۆمدا بژیم و تایبەتمەندییەکانم بپارێزم و چاودێری دۆخەکە بکەم.

ساندرا وەکو دایکمە. کۆمەڵایەتی‌یە. باوەڕپێکراو و قەسە لەڕووە. من و ئەو ساڵەهای ساڵ پێکەوە بوین و چەندین ئەزمونمان تێپەڕاندووەو لەو ئەزمونانەدا من هەستم دەکرد کە ئەو کراوەیی و زۆر کۆمەڵایەتیبونە شتێکی گونجاو نی‌یە بۆ ئەو. ئەویش هەستی دەکرد کە دڵەڕاوکێ و نیگەرانییەکە نیشانەی جۆرە ناتەواوییەکەی هەم لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتی و هەم بۆ خودی خۆیشم چونکە ئەو دڵەراوکێ‌یە وام لێ دەکات بێ شعور بم بەرامبەر بە هەست و ناڕەحەتیی خەڵکەکە. ئەم هەمو زانیاریانە و زیاتریش، لە ئاکامی ئەو رۆچونە قوڵەوە بەدەستمان هێنا کە بۆ ناوناخی خۆمان ئەنجامان دەدان. وام لێ هات سوپاسی ساندرا بکەم، کە بەرامبەر ئەو نیگەرانی‌یەی من چیتر نەیدەتوانی خۆی رابگرێت و بە حیکمەت و زیرەکییەکی شایستەوە هاوکاری کردم بگۆڕێم و ببمە کەسێکی کراوەتر و بەخشندەتر و هەستیارتر و کۆمەڵایەتیتر.

تەنگانەیەکی دیکەشمان هاتەڕێ کە خۆم پێم وابو ئەمە واسواسییەکە و چەند ساڵێکە یەخەی ساندرای گرتووە. واسواسی بەرامبەر ئامێرە کارەباییەکانی مارکەی (فریجیدەر). زۆر هەوڵم دا لەم مەسەلەیە حاڵی ببم، چونکە ساندرا وای لێ هاتبو بێجگە لە کەلوپەلی مارکەی (فریجیدەر) هیچ ئامێرێکی دیکەی نەدەکڕی. تەنانەت کاتێك کە لەسەرەتای ژیانی هاوسەریماندا بوین و داهاتێکی بچوکمان هەبو، بڕیاری دا ماوەی ٥٠ میل ببڕێت بۆ ئەوەی بگاتە ئەو شارە گەورەیەی کە ئامێری مارکەی ناوبراوی تیا چنگ دەکەوت و لە شارۆچکە بچوکەکەی خۆماندا ئەوکاتە نەبو.

ئەمە لای من ئاماژەیەکی دروست کرد، بەڵام خۆشبەختانە کاتێك کە ئامێرەکەمان کڕی مەسەلەکە چارەسەرکرا. کاتێکیش بابەتەکەمان خستە بەرباس و گفتوگۆوە، وەك ئەوەی پەنجە بنێین بە دوگمەی وەڵامدانەوەیەکی توندوتیژدا، شتەکە لای من وەك ئەوەی لێهات سیمبولێك بێت بۆ هەمو جۆرە بیرکردنەوەیەکی نائەقڵانی و زنجیرەیەك هەستی نەرێنی تیا دروست کردم.

من بەهۆی ئەو رەوشتە تایبەتەی خۆمەوە کە شتێکی ناتەواو بو لە حاڵەتی

روبەروبونەوەی مەسەلەی وادا کۆنترۆڵ لەدەست دەدەم و قسەی خراپ لە دەمم دێتە دەرێ، لەبەر ئەوە بڕیارم دا باشترین هەڵسوکەوت ئەوەیە ئەم هەڵسوکەوتە پەیڕەو نەکەم چونکە رەنگە قسەی خراپ بکەم و لە دواجاردا ناچار ببم داوای لێبوردن بکەم.

ئەوەی زیاتر بێزاری کردم ئەوەبو کە ساندرا ئامێرەکانی ئەو مارکەیە دەکرێت لەبەر ئەوەنییە مارکەکەی زۆر خۆش دەوێت بەڵام لەبەر هۆکارێکە من بە نا لۆجیکیی دادەنێم و ئەو داکۆکیانەی ساندرا لە (فریجیدەر)ی دەکات هیچیان فریان بەسەر راستییەوە نییە.

ئێمە کە ئەم مەسەلەیەمان کۆتایی پێهێنا لەسەرەتای وەرزی بەهاردا بوین. گفتوگۆکانمان ئامادە کردو یاسا بنەڕەتییەکان چەسپین، بەوەی کە ئەگەر مەسەلەکە ئازاری هەردوکمان یان یەکێکمانی دا ئەوا پێویستە وازی لێ بهێنین و زیاری لەسەر نەڕۆین.

هەرگیز من ئەو رۆژەم بیر ناچێتەوە کە باسی ئەم مەسەلەیەمان کرد. ئێمە بەدەم قسەوە چوینە ناو کێڵگەکانی گەنمەشامییەوە و وەکو رۆژانی پێشو رێی کەناری دەریاکەمان نەگرتە بەر، وابزانم لەبەر ئەوەی کەسمان تەماشای ئەوی دیکەی نەدەکرد. کۆمەڵێك بیرەوەری هەستی ناخۆش و مێژوویەکی دورودرێژی دەرونی هەبون پەیوەست بەم مەسەلەیەوە. ئەمانە ماوەیەکی زۆر شاردرابونەوە و کولاندنەوەی کارێکی زەحمەت بو چونکە دورنەبو ببێتە مایەی لێك جیابونەوەمان. بەڵام کاتێك کە پێکەوە هەوڵی ئەوەمان دەستپێکرد کە پەیوەندییەکی یەکگرتووی جوان برەو پێبدەین ئیتر هەمو مەسەلەیەکی یەکلاکەرەوە بو بە مەسەلەیەکی گرنگ.

ئەنجامەکانی ئەم کارلێکە بۆ من و بۆ ساندرا سەرسوڕهێنەر بو. بەراستی شتێکی بەکەڵك و هاریکار بو. واپێدەچو ئەمە یەکەمینجار بێت ساندرا بزانێت لەبەرچی هێندە خولیای ئەو ئامێرانەیە. کەوتە قسەکردن دەربارەی باوکی، کە چۆن وەك مامۆستای مێژوو لە خوێندنگایەکی ئامادەیی کاری کردووە و پاشان چەند جارێك بۆتە مامۆستای تایبەت و دواتر بۆ دابینکردنی ژیانی خێزانەکەی چۆتە بواری ئامێرەکانەوە. سەردەمێکیش کە گرانی رووی کردۆتە وڵات ئەم زەحمەت و نارەحەتی زۆری هاتۆتە رێ و تاقە شتێك کە لەو قۆناغە زەحمەتەدا پاراستویەتی و نانبڕاوی نەکردووە کۆمپانیای (فریجیدەر) بووە.

پەیوەندی نێوان ساندراو باوکی پەیوەندییەکی زۆر قوڵ و جوان بووە .. هەمو رۆژێك کە هیلاكو ماندو لەسەرکار دەگەڕایەوە، ئەچووە سەر قەنەفەیەك پاڵ دەکەوت و ساندراش گۆرانی بۆ دەوت. ماوەی چەندین ساڵ رۆژانە پێکەوە بون. باوکی ساندرا دڵی بەو کچەی زۆر دەکرایەوە و لە ئاکامی ئەم پێکەوەبونە بەردەوامەدا وای لێ هات قسەی دڵی خۆی بۆ بکات و باسی نیگەرانییەکان و کێشە وخەفەتەکانی بۆ بکات. باسی رۆڵی کۆمپانیای فریجیدەر لە رزگارکردنی ژیانی ئەو خێزانەدا یەکێك بو لەو باسە گەرموگوڕانەی کە باوکی ساندرا رۆژانەی گوێی کچەکەی پێ ئاودەدا کە چۆن لە تەنگانەدا ئەو کۆمپانیایە فریای خۆی و خێزانەکەی کەوتووە.

ئەم گفتوگۆیەی نێوان باوك و کچەکە لە رۆژگارە ئاساییەکاندا هێندە خۆرسك بوو کە توانی بەهێزترین کاردانەوە لەلای ساندرا دروست بکات. دیارە ئەمەش لە نەستی ساندرادا چەسپی. ئەوساڵەش کە ئێمە ئەو گفتوگۆیەمان کرد رەنگە ساندرا پێشتر بە تەواوی مەسەلەکەی بیرچوبێتەوە و گفتوگۆکە وای کردبێت بیرۆکەکە بەوشێوە سروشتی و خۆڕسکە دەربکەوێتەوە. زەینی ساندرا توانی رۆبچێتە قوڵاییەکانی ناخی خۆیەوە و بگاتە ریشە سۆزدارییەکانی. ئەو هەستو خۆشەویستییەی کە ساندرا هەیەتی دەرهەق بە (فریجیدیەر): منیش لە ئاکامی ئەمەدا زانیارییەکی گرنگم بەدەست هێناو رێز و پێزانینیشم لەلای ساندرا زیادی کرد. گەیشتە ئەو باوەڕەی کە ساندرا لە باسکردنی کۆمپانیاکەدا باسی ئامێرەکان ناکات بەڵکو باسی باوکی و باسی ئەمەك و خۆشەویستی باوکی دەکات دەرهەق بەو کۆمپانیایە.

بیرمە ئەو رۆژە هەردوکمان چاومان پڕبو لە گریان، نەك لەبەرئەوەی شتێکی نوێمان بۆ دەرکەوتوە بەڵکو لەبەر ئەوەی رێزی یەکتریمان لەلا زۆر گرنگ بو. بۆمان دەرکەوت، کە هەمو شتێك ریشەی قوڵی سۆزداری هەیە، تەنانەت ئەو مەسەلانەش کە بە رواڵەت بێبایەخن. مامەڵەکردن لەگەڵ مەسەلە کەمبایەخەکاندا بێ تەماشاکردنی مەسەلە قوڵ و هەستیارەکان وەك ئەوە وایە بچیتە ناو قوڵایی مەسەلەیەکی پیرۆزی دڵی کەسێکی دیکە. ئێمە لەو چەند مانگەدا کۆمەڵێك دەستکەوتی باشمان هەبو. گفتوگۆکانمان هێندە بەهێز بوبون کە دەمانتوانی زۆر بە

خێرایی بیروبۆچونی یەکتری بخوێنینەوە. کاتێکیش (هاوای)مان جێهێشت بڕیارمان دا لەسەر ئەم رەفتارەمان بەردەوام بین. بۆیە وەکو جاران بە سواری پاسکیل دەسوڕاینەوە ئەگەر کەشوهەواکە لەبارنەبوایە سواری ئوتومبیل دەبوین تەنیا لەبەر ئەوەی ئەو ماوەیە پێکەوە خەریکی دەمەتەقێ ببین. هەستمان کرد بناغەی بەردەوامبونی خۆشەویستییەکەمان گفتوگۆکردنە، بەتایبەت دەربارەی هەستو سۆزمان. ئەم گفتوگۆ و بیروراگۆڕینەوەیە رۆژانی دیکەش پێویست بون، تەنانەت ئەگەر لە سەفەریش بومایە، هەر قسەمان کردووە. چونکە ئەمە وەکو گەڕانەوە وایە بۆ ماڵەوە و مرۆڤ وا لێ دەکات هەست بە کامەرانی و ئاسایش بکات.

لەمەوە دەتوانین بڵێین (تۆماس وۆڵف) چاکی نەپێکاوە چونکە مرۆڤ دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە ئەگەر ماڵەکە بریتی بێت لە پەیوەندییەکی بەنرخ و لە هاوڕێیەتیەکی گرانبەها.

### پێکەوە ژیانی نەوەکان:

لەو ساڵە دڵفڕێنەدا کە لەگەڵ (ساندرا)دا بۆمان دەرکەوت مرۆڤ دەتوانێت ماوەی نێوان کارلێکەر و کاردانەوە بەکاربهێنێت بەشێوەیەکی حەکیمانە، وزەی پێویستیشی داینێ لە ناوەوە بۆ دەرەوە. بە مەبەستی برەودان بە هەرچوار بەخششە بێهاوتاکەی سروشتی مرۆڤ.

پێشتریش ئەو رێبازە پەیرەوکراوەمان تاقی کردەوە کە لە دەرەوە بۆ ناوەوەیە. یەکتریمان خۆشویست و هەوڵمان دا لەرێی جیاوازییەکانمانەوە کۆنترۆڵی هەڵوێست و رەفتارەکانمان بکەین ئەویش بە خۆڕاهێنان لەسەر شێوازە بەسودەکانی کارلێکی مرۆڤانە. بەڵام ماوەیەکی دوورودرێژیش تەنیا هەر لە روکەشدا بوین و وەك ئەوە وابو نەخۆشییەکان بە حەبی ئازار چارەسەر بکەین تا ئەوکاتەی کە دەستبەکاربوین و گفتوگۆکانمان بردە ئاستی پارادیمە بنەڕەتییەکان و ئیتر بۆمان دەرکەوت کە کێشە بنەڕەتییەکان هێشتا هەر ماون و لەوێدان.

کارکردن لەناوەوە بۆ دەرەوە (لە ناخەوە بۆ ئاشکرا) وای لێ کردین بتوانین پەیوەندییەك بنیاد بنێین لەسەر متمانە و راشکاویی. هەروەها یارمەتیشی داین ئەو گیروگرفتانە بە شێوەیەکی قوڵ و هەمیشەیی چارەسەر بکەین کە دەرەنجامی

ناتەواوییەکی تەندروستی و دەروونییە و هەرگیز بەو شێوازە نایگەیێنێ کە بمانەوێ لە دەرەوە کاربکەینە سەرناوەوە. هەروەها ئەو شێوە کارکردنەی لە ناوەوە بۆ دەرەوە بەرهەمە بەتامەکانیشی پێگەیاند کە بریتین لە پەیوەندی نێوان سودی گشتی و هاوئاهەنگی و لێکتێگەیشتنی قوڵی نێوانمان. بەرهەمەکان ئەو رەگ و ریشانە دروستیان کردن کە ئێمە دامانمەزراندبون لەکاتی چاوخشاندنەوە بە بەرنامەکان و سەرلەنوێ خۆئاراستەکردن و بەڕێوەبردنی ژیانی خۆماندا بە رادەیەکی وا کە توانیمان کاتێکی زۆر بگێڕینەوە بۆ چالاکییەکانی چوارگۆشەی دووەم کە زۆر گرنگە بۆ مەسەلەی گفتوگۆی قوڵی دووبەدوو.

دیارە ئەو شێوە کارکردنەمان بەروبومی دیکەشی هەبوو. توانیمان قوڵتر ببینین و وەك چۆن ژیانمان کەوتبووە ژێر کاریگەرییەکی بەهێزی باوك و باپیرانمان، ئاواش ژیانی منالەکانمان کەوتنە ژێر کاریگەریی ئێمەوە بە چەند شێوازێکەوە کە ئێمە تەنانەت لێشیان تێنەدەگەیشتین. ئەمە وای لێ کردین تێبگەین کە ئاراستەکردن هێز و بایەخی زۆری هەیە لە ژیانی ئێمەدا، بۆیە ئارەزوی ئەوەمان لادروست بو هەمو هەوڵێکی خۆمان بخەینە گەڕ بۆ دڵنیابون لەوەی کە هەر ئامۆژگاری و نمونەیەك بۆ نەوەکانی داهاتو جێدەهێڵین. ئامۆژگاری و وەسێت نمونەی چاکن و لەسەر بناغەی راست و دروست دامەزراون.

من لەم کتێبەدا بایەخێکی تایبەتم داوە بەو ئامۆژگاری و رێنماییانەی کە فێرکراوین و کە زۆر بە جددی هەوڵ دەدەین بیانگۆڕین. بەڵام کە بە وردی چاو بەو ئامۆژگاری و رێنماییانەدا دەخشێنینەوە زۆربەمان هەست دەکەین ئەو ئامۆژگاری و رێنماییانەی کە بە میراتی لە باوباپیرانمانەوە وەکو راستیگەلێکی بەڵگە نەویست پێمان گەیشتوون هەمویان ئەرێنی و جوانن. مرۆڤ ئەگەر بەراستی خۆی ناسی ئەوا نرخی ئەو رێنماییانەی لادەبێت و رێزی ئەوانەش فەرامۆش ناکات کە پێش ئەو ژیاون و ئەمیان پەروەردە کردووە لەسەر بنەماو پرنسیپی وا کە نەك هەر رەنگدانەوەی بارودۆخی ئێستامانن بەڵکو دارێژەری ئایندەشمانن.

لەناو خێزاندا هێزێکی بەتین هەیە پەیوەندی بەهێزی نێوان نەوەکان دیاری دەکات. ئەو خێزانە گەورانەی کە منال و باوك و دایك و نەنك و باپیر و مام و خاڵ و پور و منالەکانیان لەخۆ دەگرن و هاوکارییەکی کاریگەر لە نێوانیاندا هەیە، لە

ناتەواوییەکی تەندروستی و دەرونیەیە و هەرگیز بەو شێوازە نایگەینێ کە بمانەوێ لە دەرەوە کاربکەینە سەرناوەوە. هەروەها ئەو شێوە کارکردنەی لە ناوەوە بۆ دەرەوە بەرهەمە بەتامەکانیشی پێگەیاند کە بریتین لە پەیوەندی نێوان سودی گشتی و هاوئاهەنگی و لێکتێگەیشتنی قوڵی نێوانمان. بەرهەمەکان ئەو رەگو ریشانە دروستیان کردن کە ئێمە دامانمەزراندبون لەکاتی چاوخشاندنەوە بە بەرنامەکان و سەرلەنوێ خۆئاراستەکردن و بەڕێوەبردنی ژیانی خۆماندا بە رادەیەکی وا کە توانیمان کاتێکی زۆر بگێڕینەوە بۆ چالاکییەکانی چوارگۆشەی دووەم کە زۆر گرنگە بۆ مەسەلەی گفتوگۆی قوڵی دووبەدوو.

دیارە ئەو شێوە کارکردنەمان بەروبومی دیکەشی هەبوو. توانیمان قوڵتر ببینین و وەك چۆن ژیانمان کەوتبووە ژێر کاریگەرییەکی بەهێزی باوك و باپیرانمان، ئاواش ژیانی منداڵەکانمان کەوتنە ژێر کاریگەریی ئێمەوە بە چەند شێوازێکەوە کە ئێمە تەنانەت لێشیان تێنەدەگەیشتین. ئەمە وای لێ کردین تێبگەین کە ئاراستەکردن هێز و بایەخی زۆری هەیە لە ژیانی ئێمەدا، بۆیە ئارەزوی ئەوەمان لادروست بو هەمو هەوڵێکی خۆمان بخەینە گەڕ بۆ دڵنیابون لەوەی کە هەر ئامۆژگاری و نمونەیەك بۆ نەوەکانی داهاتو جێدەهێڵین. ئامۆژگاری و وەسێت نمونەی چاکن و لەسەر بناغەی راستو دروست دامەزراون.

من لەم کتێبەدا بایەخێکی تایبەتم داوە بەو ئامۆژگاری و رێنماییانەی کە فێرکراوین و کە زۆر بە جددی هەوڵ دەدەین بیانگۆڕین. بەڵام کە بە وردی چاو بەو ئامۆژگاری و رێنماییانەدا دەخشێنینەوە زۆربەمان هەست دەکەین ئەو ئامۆژگاری و رێنماییانەی کە بە میراتی لە باوباپیرانمانەوە وەکو راستیگەلێکی بەلگە نەویست پێمان گەیشتوون هەموویان ئەرێنی و جوانن. مرۆڤ ئەگەر بەراستی خۆی ناسی ئەوا نرخی ئەو رێنماییانەی لادەبێت و رێزی ئەوانەش فەرامۆش ناکات کە پێش ئەو ژیاون و ئەمیان پەروەردە کردووە لەسەر بنەماو پرنسیپی وا کە نەك هەر رەنگدانەوەی بارودۆخی ئێستامانن بەڵکو داڕێژەری ئایندەشمانن.

لەناو خێزاندا هێزێکی بەتین هەیە پەیوەندی بەهێزی نێوان نەوەکان دیاری دەکات. ئەو خێزانە گەورانەی کە منداڵ و باوك و دایك و نەنك و باپیر و مام و خاڵ و پور و منداڵەکانیان لەخۆ دەگرن و هاوکارییەکی کاریگەر لە نێوانیاندا هەیە، لە

خێزانە بچوکەکان زیاتر دەتوانن کار بکەنە سەر ئەندامەکانیان و باشتر دەتوانن یارمەتییان بدەن لە خۆناسین و لە پێناسەکردنی ئامانجەکانیاندا.

مەسەلەیەکی باشە مرۆڤ بتوانێت پەیوەندی بە خێڵەکەیەوە هەبێت و خەڵك زۆربناسێت و بایەخیان پێبدات، تەنانەت ئەگەر ئەو خەڵکەش پەرش‌وبڵاو بن لەسەرتاسەری وڵاتدا. چونکە ئەمە لە پەروەردەکردنی خێزانەکەتدا یارمەتیت دەدات. لەبەرئەوەی ئەگەر بەهۆی بارودۆخێکی تایبەتەوە یەکێك لە منداڵەکانت لە قۆناغێکی دیاریکراودا نەیتوانی بە تەواوی پەیوەندی بکات بە تۆوە، رەنگە بتوانێت پەیوەست ببێت بە برایەکتەوە یاخود بە خوشکێکتەوە کە جێگەی ئەو دایك‌و باوکەی بۆ پڕبکاتەوە یاخود ببێتە مامۆستا و قارەمانی ئەو منداڵە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو.

مەزنترین مرۆڤ ئەو نەنك‌و باپیرانەن کە بایەخێکی مەزن بە نەوەکانیان دەدەن. ئەمە ئاوێنەیەکی کۆمەڵایەتی زۆر ئەرێنییە. دایکم نمونەیەکی ئەو جۆرە نەنکانەیە، کە ئێستاش لە کۆتایی هەشتاکانی تەمەنیدا، بایەخێکی تایبەت بە هەمو نەوەکانی دەدات. نامەی زۆر ناسك و جوانیان بۆ دەنوسێت. چەند رۆژێك لەمەوبەر لەناو فڕۆکەدا بوم کە یەکێك لەو نامانەیم خوێندەوە و چاوم پڕبو لە گریان. ئەو ژنە مەزنە هەرکاتێك قسەی لەگەڵ بکەم دەڵێت "ستیڤن، حەزدەکەم بزانیت زۆرم خۆش دەوێیت و زۆر بە سەرنجڕاکێشت دەزانم"

ئەو خێزانە گەورانەی کە نەوەکانیان پەیوەندییان پێکەوە هەیە باشترین و هاوئاهەنگترین و پڕبەرهەمترین جۆری پەیوەندییەکانن. زۆربەشمان بایەخی ئەم جۆرە پەیوەندییانە دەزانین. شتێکی زۆر جوانە کە ببینین رەگ‌و ریشەمان دەگاتەوە ساڵانی پێشو. هەر یەکێك لە ئێمە رەگی هەیە و دەتوانێت بەدوای ئەو رەگەدا بچێت بۆ ئەوەی باووباپیری خۆی بناسێت. بەهێزترین و جوانترین پاڵنەر بۆ ئەو گەڕان و بەدواداچونە تەنیا لەبەر خاتری خۆمان نییە، بەڵکو لەبەر خاتری نەوەکانی خۆمان و نەوەی هەمو مرۆڤایەتییە. خاوەنی ئەو قسەیە زۆر جوانی بۆچووە کە دەڵێت:

"ئێمە هەمیشە تەنیا دوو وەسێتمان هەیە بۆ منداڵەکانمانی بکەین. یەکێکیان رەگ‌و ریشەیە و ئەوی دیکەیان باڵە."

## کەسی گوێزەرەوە

بە بۆچونی من، "باڵ بەخشین" بە منالەکەت یاخود بە خەلکی دیکە مانای وایە تۆ ئەو ئازادییەت پێ بەخشیون کە هەمو رێنمایی و ئاراستەکردنە نەرێنییەکانیان تێبپەڕێنن کە بە میراتی بۆیان بەجێماوە. ئەم باڵبەخشینە رێک ئەو شتەیە کە هاوڕێیەکی نزیکم (د. تێری وارنەر) ناوی لێ ناوە کەسی "گوێزەرەوە". تۆ لەبری ئەوەی رێنماییە بۆماوەییەکان بگوێزیتەوە بۆ نەوەی دوای خۆت، دەتوانیت بە جۆرێکی وا دەستکارییان بکەیت و بیانگۆڕی کە ببنە مایەی دروستکردنی پەیوەندی باش.

بۆ نمونە ئەگەر بە منالی باوک و دایکت خراپ بوبن لەگەڵتدا و هەمیشە (جوێن)یان پێ دابێت، ئەمە مانای وا نییە کە پێویستە تۆش جوێن بە منالەکانت بدەیت. کەسی ئاسایی رەنگە ئەو رێنماییە دووپات بکاتەوە. بەڵام ئەوانەی رۆحی دەستپێشخەرییان تێدایە دەتوانن رێنماییەکە سەرلەنوێ دابڕێژنەوە. دەتوانن نەک هەر جوێن بە منالەکانیان نەدەن بەڵکو بایەخی باشیان پێ بدەن و بە شێوەیەکی ئەرێنی ئاراستەیان بکەن. تۆ دەتوانیت ئەمە لە پەیامە تایبەتەکەی ژیانی خۆتدا تۆمار بکەیت. هەروەها لە ئەقڵیشت و لە دڵیشتدا. دەتوانیت وابکەیت ئەم ئاراستەو رێنماییە نوێیە هاوئاهەنگ بێت لەگەڵ سەرکەوتنی تایبەتی رۆژانەتدا. هەروەها دەشتوانیت لە باوك و دایکت ببوریت و خۆشت بوێن. ئەگەر لە ژیانیشدا مابون دەتوانیت پەیوەندی چاکیان لەگەڵدا دروست بکەیت بە مەبەستی لێکتێگەیشتن.

دەکرێت لە تۆوە ئیتر ئەو جۆرە ئاراستە و رێنماییە باوەی ناو خێزانەکەت بوەستێت کە نەوە دوای نەوە بە میرات بۆتان ماوەتەوە. کەواتە تۆ کەسێکی گوێزەرەوەیت. تۆ ئامرازی پەیوەندییت لەنێوان رابردو و ئایندەدا. ئەم گۆڕانکارییەی تۆ دەیهێنیتە ئاراوە دەتوانێت کاریگەریی گرنگ بەجێ بهێڵێت لەسەر نەوەکانی داهاتو.

یەکێك لە کەسایەتییە گوێزەرەوەکانی سەدەی بیستەم (ئەنوەر سادات)ە. ئەو سەبارەت بە سروشتی گۆڕان تێگەیشتنێکی قوڵی بۆ بەجێهێشتین. رابردوو بریتی بو لە دیوارێکی گەورەی گومان و رق و خراپ لێکحاڵیبون لەنێوان عەرەب و

ئیسرائیلیەکاندا. ئایندەش لەوە دەچو هیچ نەبێت جگە لە گۆشەگیری زیاتر و ململانێی زیاتر. سادات لەنێوان ئەم رابردووە و ئەم ئایندەیەدا وەستا. هەوڵەکانی سادات بۆ گفتوگۆکردن، لە هەمو ئاستەکاندا بەرپەرچ درایەوە. تەنانەت لەو مەسەلانەشدا کە روکەش بون و هیچ بایەخێکیان لە دەقی رێکەوتنە پێشنیارکراوەکاندا نەبو.

ئەوکاتەی کە خەڵکی دیکە لەپێناوی رێگرتن لە تەقینەوەی دۆخەکە هەوڵیان دەدا گەڵاکان ببڕن (پەیوەندییەکان) سادات بڕیاری دا کار لەسەر رەگەکان بکات ئەویش بە پشتبەستن بەو ئەزمونەی کە لە سەرەتای ژیانیدا لە زیندانە یەك کەسیەکەدا فێری بوبو. سادات بەم جۆرە کارکردنەی توانی ئاراستەی ژیانی ملیۆنەها مرۆڤ بگۆڕێت.

ئەو لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا دەڵێت:

"بێ ئەوەی بە خۆم بزانم پشتم بەو هێزە ناوخۆییەی خۆم بەست کە لە ژووری ژمارە (٤٥)ی زیندانی قاهیرەدا بەدەستم هێنا. دەتوانین ئەم هێزە ناوبنێین توانای گۆڕین. من لەو ژوورەدا روبەروی هەڵوێستێکی زۆر ئاڵۆز بومەوە و هیچ هیوایەکم بە گۆڕینی نەبو تا ئەوکاتەی خۆم چەکدار کرد بە توانا دەرونی و هزرییە پێویستەکە. من لەو شوێنەدابڕاوەدا لە ژیانی خۆم و لە سروشتی مرۆڤ رامام و ئەو رامانە فێری کردم کە ئەو مرۆڤەی نەتوانێت بناغەی بیرکردنەوەی خۆی بگۆڕێت ناتوانێت واقیع بگۆڕێت و هیچ پێشکەوتنێك بەدەست ناهێنێت. گۆڕانی راستەقینە لە ناوەوەیە بۆ دەرەوە. گۆڕان بەوە دروست نابێت گەڵای هەڵوێستەکان و لق‌و پۆپی رەفتاری کەسایەتییە نەگۆڕەکان ببڕیت، بەڵکو پێویستە بچیت بەلای رەگ‌و ریشەکانەوە، بەلای بناغەکانەوە. بیرکردنەوەو پارادیمە بنەڕەتییە پێویستەکانەوە کە هەر ئەوان کەسایەتی مرۆڤ پێناسە دەکەن و خوڵقێنەری ئەو هاوێنەیەن جیهانی لێوە دەبینێت." (ئامیل) دەڵێت: مرۆڤ دەتوانێت لە هزردا راستییە رەوشتییەکە ببینێت و هەستی پێبکات. بەڵام سەرباری ئەمانەش زۆر جار لەدەستمان دەردەچێت. سەبارەت بە مرۆڤ، شتێك هەیە لە (هۆش) قوڵترە، ئەویش کەسایەتییە واتە گەوهەر و سروشتمان.. ئەم راستییانەی کە بونەتە پێکهێنەری ئێمە و خۆڕسك و خۆویست و خۆنەویستیشن، لەراستیدا ژیانی ئێمەن، واتە لە موڵك زیاترن. کەواتە هەتا بۆشایی هەبێت لەنێوان ئێمە و راستیدا مانای وایە ئێمە لەدەرەوەی ئەو بۆشاییەدایین. رەنگە ژیان بریتی نەبێت لە بیرکردنەوە و هەست و هۆشیاری و

ئارەزوی ژیان بەڵام ئامانجی ژیان هەمیشە کامڵبوونە. کەواتە تاقە شتێك کە مڵکی ئێمە بێت تەنیا راستی‌یە، بێ گوێدانە ئەوەی لەکیسمان دەچێت یان نا. راستی نە لە دەرەوەی ئێمەدایە و لەناو ئێمەدا. راستی ئێمەیە و ئێمەش راستیین.

بەدیهێنانی یەکبون لەگەڵ خۆمان و خۆشەویستانمان و هاوڕێ و هاوکارانماندا چاکترین و بەتامترین و پیرۆزترین میوەی حەوت خووەکەیە. زۆربەمان لە رابردوودا ناوبەناو ئەم یەکبونە راستەقینەیەمان تام کردووە، هەروەها تامی تاڵییەکەی یەکنەبونەشیمان چەشتووە و دەزانین یەکبوون چەندە بەنرخە و لەهەمان کاتیشدا چەند ناسکە.

دیارە بنیادنانی کەسایەتییەکی چاكو کامڵ و ئەوەی کە لەسەر بنەماکانی خۆشەویستی و خزمەتکردن بژیت کە بەرهەمی ئەم جۆرە یەکبونەن کارێکی ئاسان نی‌یە. ناتوانین بە ئاسانی لە ناخی خۆماندا بیچەسپێنین.

بەڵام یەك مەسەلە هەیە کە مەحاڵ نی‌یە. ئەو مەسەلەیەش بەوە دەست پێدەکات ژیانمان چڕبکەینەوە لەسەر پرنسیپە راستەکان و دوربکەوینەوە لەو پارادایمانەی کە پاشماوەی پرنسیپەکانی دیکە و هی ناوچە دڵنیاکانی تایبەت بە خووە خراپەکانن.

ئێمە هەندێك جار هەڵە دەکەین و لە ئاکامی ئەو هەڵەیەدا ئیحراج دەبین، بەڵام ئەگەر دەست بدەینە سەرکەوتنی تایبەتی رۆژانە و گۆڕانکاری ئەنجام بدەین لە ناوەوە بۆ دەرەوە، ئەوا بە دڵنیاییەوە ئەنجاممان دەست دەکەوێت. مرۆڤ ئەگەر تۆو بچێنێت و ئاوی بدات و بژاری بکات، دیارە نەش‌ونمای رووەکەکە و تامی خۆشی بەروبومەکە دڵخۆشی دەکەن.

یا ئەمجارەش قسەکەی (ئیمیرسۆن)تان بیربخەمەوە کە دەڵێت:

"کە دەبینیت ئەوکارەی مەبەستی تۆیە ئاسانتر لە جاران دێت بەدەستەوە مانای وانی‌یە سروشتی پەیامەکەت گۆڕانی بەسەردا هاتووە بەڵکو مانای وایە تواناکانت زیادیان کردووە بۆ ئەنجامدانی."

ئێمە لەڕێی چڕکردنەوەی ژیانمان لەسەر پرنسیپە راستەکان و لەسەر خولقاندنی فۆکەسێکی هاوسەنگ لەنێوان ئەنجامدانی کارێك و زیادبونی توانامان بەسەر ئەو کارەدا دەتوانین ژیانێکی بەکەڵك و پڕ لە ئاشتی و کاریگەر بۆ خۆمان و نەوەکانمان دەستەبەربکەین.

| ئەگەر سەنتەرەکەت بریتی بێت: | ئەمانەی خوارەوە رێگا ئەڵتەرناتیڤەکانن بۆ تێگەیشتن لەوانی دیکەی ژیانت | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | هاوسەر | خێزان | پارە | ئیش | خاوەنداریێتی ملك و ماڵ |
| هاوسەر | * گەورەترین سەرچاوەی تێرکردنی پێویستیەکان | * وەکو خۆی باشە<br>* بایەخی کەمترە<br>* پرۆژەیەکی هاوبەش | * پێویستە بۆ رازیکردن و بەختەوەرکردنی هاوسەر | * پێویستە بۆ بەدیهێنانی پارە بۆ رازیکردنی هاوسەر | * ئامرازی بەختەوەری و گاریکەری و کۆنترۆڵ |
| خێزان | * بەشێکە لە خێزان | * گەورەترین بایەخی هەیە | * بۆ پاڵپشتیکردنی خێزانە لەرووی ئابورییەوە | * ئامرازێکە بۆ بەدەستهێنانی ئامانجێك | * ئیسراحەتی خێزان و فرسەتەکانیشێتی |
| پارە | * یان سەرچاوەیەکی بەهێزی بەدەستهێنانی پارەیە، یاخود رێگرە و بەفیڕۆ دەدرێت | * سەرچاوەی بەفیڕۆدانی پارەیە | * سەرچاوەی ئاسایش و بەدیهێنانی داواکانە | * پێویستە بۆ پارەپەیداکردن | * بەڵگەی سەرکەوتنی ئابوریيە |
| ئیش | * یاخود سەرچاوەی یارمەتیدەرە یاخود رێگرە | * یاخود سەرچاوەی یارمەتیدەرە یاخود رێگر<br>* وەکو تاك پێویستن بۆ رێنماییکردن دەربارەی رەوشتی کار | * بایەخێکی لاوەکی هەیە<br>* بەڵگەی ئەوەیە باش کاردەکەیت | * سەرچاوەی سەرەکی دابینکردنی ئاسودەیی و پێویستییەکانە<br>* بەرزترین رەوشتە | * کەرەسەن بۆ زیادکردنی کارایی ئیشەکە<br>* بەرهەم و بەڵگەی کارن |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| **خاوەندارێتی** | * گرنگترین سامانە<br>* یارمەتیدەرە بۆ بەدیهێنانی کەلوپەل | * ئامرازێکە بۆ بەکارهێنان و چەوساندنەوە. باڵادەستی و کۆنترۆڵ و حوکم کردن<br>* گەنجینەی نمایشەکان | * کەرەسەیەکە بۆ زیادکردنی خاوەندارێتییەکان.<br>* خـــۆی جـــۆرێکی دیکـــەی ئـــەو مڵـــك و ماڵەیـــە کـــە دەتوانرێـــت کۆنترۆڵ بکرێت | * فرسەتێکە بۆ بەدەستهێنانی پێگەو دەسەڵات و دانپێدانانی خەڵك | * نیشانەی پێگەکەتە | |
| **چێژ** | * یان هاوڕێی خۆشییەکانە یاخود ڕێگری بەردەمیانە | * یـــان ئامرازێکـــە یـــاخود ڕێگرە | * ئامرازێکـــــە بـــــۆ زیـــــــــــادکردنی فرســـەتەکانی چێـــژ و بەختەوەری | * ئامرازێکە بۆ بەدیهێنانی مەبەستێك<br>* ئیشەکە رابواردنە؟ باشە | * کەرەسەی رابواردنن<br>* ئـــامرازن بـــۆ چـــێژی زیاتر | |
| **هاوڕێیەك یاخود کۆمەڵێك هاوڕێ** | * یان بە هاوڕێیەتی دەمێنێتەوە یان ئەگەری ئەوە هەیە ببێتە رکابەرت<br>* نیشـــــانەی دۆخـــــە کۆمەڵایەتییەکەتە | * هاوڕێیت یاخود ڕێگری بەهێزبونی هاوڕێیەتیت<br>* نیشـــــانەی دۆخـــــە کۆمەڵایەتییەکەتە | * سەرچـــــــاوەی دڵنیـــــایین لـــــەرووی ئـــــــابوری و کۆمەڵایەتیەوە | * فرسەتێکی کۆمەڵایەتیە | * ئامرازێکە بۆ ئەوەی خەڵك ببنە هاوڕێت.<br>* ئامرازێکـــە بـــۆ چـــێژ یـــاخود بـــۆ دابینکردنـــی بەختــــــــــەوەری کۆمەڵایەتی | |

ئەمانەی خوارەوە ڕێگا ئەڵتەرناتیڤەکانن بۆ تێگەیشتن لەوانی دیکەی ژیانت

| ئەگەر سەنتەرەکەت بریتی بێت: | چێژ | هاوڕێ / هاوڕێکان | دوژمن / دوژمنەکان | دەزگا ئاینییەکان | خود | پرنسیپەکان |
|---|---|---|---|---|---|---|
| هاوسەر | * یان چالاکییەکی دولایەنەی یەکخەرە یاخود گرنگ نییە | * هاوسەرەکەت یان باشترین هاوڕێتە یان تاقە هاوڕێ * هاوڕێ تەنیا هەر هاوڕێیە | * هاوسەرەکەت یاخود بەرگریکارە یاخود دوژمنێکی هاوبەشە و هەموو شت بەدەست ئەوە | * چالاکییەکە با هەمومان چێژی لێ وەربگرین. * لەژێر کۆنترۆڵی پەیوەندییە هاوسەرگیرەکەدایە | * هاوسەرەکە حسابە * هەستیارە و کاریگەری زۆری ڕەفتار و هەڵوێستی هاوسەرەکەی لەسەرە | * ئەو بیرۆکانەن کە پەیوەندی لەگەڵ هاوسەردا دروست دەکەن و پەرەی پێدەدەن |
| خێزان | * یان چالاکییەکی خێزانە یاخود زۆر گرنگ نییە | * یان هاوڕێی خێزانن یخود ڕکابەرن * مایەی هەڕەشەن بۆسەر ژیانی بەهێزی خێزان | * خێزان دیارییان دەکات * سەرچاوەی هێز و یەکپارچەیی خێزانن * ڕەنگە ببێتە مایەی هەڕەشە بۆسەر خێزان | * سەرچاوەی یارمەتییە | * بەشێکی گرنگی خێزانە بەڵام ملکەچێتی | * ئەو یاسایەنە دەگرێتەوە کە خێزان بە یەکگرتویی و توانا دەهێڵێتەوە |
| پارە | * سەرچاوەی بەفیڕۆدانی ئابوری یاخود بەڵگەی گوشاری ئابوری بە | * هۆکار و کاریگەرییە ئابورییەکانت هاوڕێ دەستنیشان دەکەن | * ڕکابەرە ئابورییەکانت هەڕەشەن بۆسەر ئاسایشی ئابوری | * بۆ خۆدەربازکردنە لە باج * پارەی پێ پەیدا دەکەین | * نرخ و بەهات لەوەدایە چەندت هەیە | * ئەو ڕێگایانە دەگرێتەوە کە بۆ پارە پەیداکردن چاکن |

Scanned by CamScanner

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| **ئیش** | * کات بەفیڕۆدانە<br>* ڕێ لە کار دەگرێت | * لەڕێی کارەوە پەیدا دەبێت یان ئەگەر هەردولا هەمان خولیاو ئارەزوویان هەبو<br>* زۆر گرنگ و پێویست نییە | * ڕێگرە لەبەردەم بەرهەمهێنندا | * گرنگە بۆ ئەوەی بە یەکگرتوت لەقەڵەم بدات لەگەڵ ئیماندارانادا<br>* کاتت لێ دەبات<br>* فرسەتێکە بۆ ئەوەی تێکەڵی ئیشەکەت بکەیت | * کار پێناسەی (خود) دەکات | * ئەو بیرۆکانەن کە لە ئیشەکەتدا دەتکەنە کەسێکی سەرکەوتو<br>* پێویستە خۆیان لەگەڵ بارودۆخی کارەکەدا بگونجێنن |
| **خاوەندارێتی** | * شت کڕین / چونە بازاڕ / بون بە ئەندامیانەکان | * وەکو کەلوپەل تایبەت وان<br>* دەتوانیت بەکاریان بهێنیت (بیانچەوسێنێتەوە) | * دزن/ ئەوانەن کە (شت) ئەبەن<br>* ئەوانەن کە ڕێزی زیاتر و کەلوپەلی زیاتریان هەیە | * شوێنی خۆپەرستی خۆم، نیشانەیەکە بۆ دۆخی خۆم<br>* سەرچاوەی ڕەخنەی ناعادیلانەیە یاخود هی شتی باشە | * ئەو شتانە دیاری دەکەن کە (من) خاوەنیانم<br>* ڕێز و پێگەی کۆمەڵایەتی دیاری دەکەن | * ئەو بیرۆکانەی کە کەلوپەلەکان زیاد دەکەن و نرخیان بەرزتر دەکەنەوە |
| **چێژ** | * بەرزترین ئامانجی ژیانە<br>* سەرچاوەیەکی گرنگی ئاسایشە | * ئەوانەن کە لە رابواردندا لەگەڵتان | * ئەوانەن کە ژیانیان بە فورسی و جددی گرتووە<br>* بۆ هەڵەیەک دەگەڕێن لێتی بکەن بە هەڵا | * ڕێگرێکی خراپی رابواردنە<br>* خۆ بەگوناهبار زانین | * کەرەسەی رابواردن | * ئەو واقیع و ئارەزووە سروشتییانەن کە پێویستە تێر بکرێن |
| **هاوڕێ / هاوڕێکان** | * هەمیشە لەگەڵ هاوڕێکانتدا چێژ لە شتەکان وەردەگریت<br>* لە پلەی یەکەمدا رووداوە کۆمەڵایەتیەکانن | * ڕەخنە لە بەختەوەری و دڵخۆشی دەگرن<br>* پابەندبون و قبوڵکردن و خۆشەویست بون شتی بەکلاکەرەوەن | * ئەوانەی دەرەوەی بازنە کۆمەڵایەتییەکەن<br>* کۆمەڵێک دوژمنی هاوبەشن و تێڕوانینێکی تایبەتیان هەیە بۆ هاوڕێیەتی | * شوێنێکە بۆ کۆبونەوەی کۆمەڵایەتی | * شتێکە کۆمەڵگا پێناسەی دەکات<br>* ترس لە رەتکردنەوە و لە روودادامان | * ئەو یاسا بناغەییانەن کە توانات دەدەنێ لەگەڵ خەڵکیدا بگونجێنیت |

| ئەگەر سەنتەرەکەت بریتی بێت: | هاوسەر | خێزان | پارە | ئیش | خاوەندارێتی مڵك و ماڵ |
|---|---|---|---|---|---|
| | ئەمانەی خوارەوە ڕێگا ئەڵتەرناتیڤەکانن بۆ تێگەیشتن لەوانی دیکەی ژیانت | | | | |
| دوژمن/ دوژمنەکان | ★ هاوسۆزە یاخود قۆچی قوربانییە | ★ پەناگەیە (پشتیوانی) یاخود قۆچی قوربانی | ★ ئامرازێکە بۆ دومنایەتیکردن یاخود بۆ سەلماندنی سەرکەوتنی خۆت | ★ بۆ خۆدزینەوە باشە یاخود فرسەتێکە بۆ گەڕان بەدوای هەست و سۆزەکاندا | ★ کەرەسەی دوژمنایەتیکردن ★ ئامرازێکە بۆ دەستبەرکردنی هاوپەیمانی ★ پەناگەیە |
| دەزگا ئاینییەکان | ★ لە خزمەتکردنی شوێنەکەدا هاوڕێتە کارئاسانیت بۆ دەکات. یاخود رادەی ئیمانداریت تاقی دەکاتەوە | ★ رادەی پابەندبونی تێدا نیشان دەدرێت بە دەزگا ئاینییەکانەوە یاخود رادەی ئیمانداریی نیشان دەدات | ★ ئامرازێکە بۆ یارمەتیدانی دەزگاکە و هەروەها خێزانیش ★ ئەگەر پارەت لە خزمەتکردنی دەزگاکە پێ گرنگتر بێت دەبێتە بەڵا. | ★ لەکاتی پێویستیدا بەکەڵکە | ★ وەکو شتی کاتی بایەخی وایان نییە ★ ناوبانگ و پێگەی کۆمەڵایەتی زۆر گرنگن |
| خود | ★ مڵکی خۆتە ★ سەرچاوەی ئارامی و بەختەوەرییە | ★ مڵکی خۆتە ★ ئارەزووەکان تێر دەکات | ★ سەرچاوەی تێرکردنی پێویستییەکانە | ★ هەلێکە بۆ ئەنجامدانی شتەکانی خۆم | ★ بەمە دەتوانیت خۆت بناسێنیت و بیپارێزیت و هانی بدەیت |

## پرنسیپەکان

* لەو پەیوەندییە دووقۆڵیانەدا کە سودی هەردولاتانی تێدایە هاوبەشێکە رێك هێندەی تۆیە

* هاورێتن
* فرسەتێکە بۆ خزمەتکردن و بەئەنجام گەیاندن و بەشداریکردن
* فرســـــەتێکە بـــۆ ســـــــــەرلەنوێ رێکخســـتنەوەی نـــەوەکان و هـــــەروەها بـــۆ گۆڕانکارییش

* سەرچـــاوەیەکە بـــۆ بـــەدیهێنانی ئامانجـــە گرنگـــەکان کـــە لـــە پێشەوەن.

* ئامرازێکیشە بۆ دابینکردنی سەرچاوەیەکی ئابوری
* فرسەتی بەکارهێنانی ئەو بەهرەو دەسەڵاتانەیە کە مانایەکی سیمبولییان هەیە.
* سەرمایەگوزاری کردن بۆ ئەوەی هاوئاهەنگ بێت لەگەڵ مەسەلەکان و کاتەکانی دیکە و بگونجێت لەگەڵ بەهاکانی ژیاندا

* دەتوانن ببنە سەرچاوە
* بەرپرسیارێتیتن، پێویستە بە شێوەیەکی گونجاو رەفتاریان لەگەڵدا بکەیت
* لەچـــاو مرۆڤـــدا بایـــەخی کـــەمتریان هەیە.

| ئەگەر سەنتەرەکەت بریتی بێت: | ئەمانەی خوارەوە ڕێگا ئەڵتەرناتیڤەکانن بۆ تێگەیشتن لەوانی دیکەی ژیانت | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | چێژ | هاوڕێ / هاوڕێکان | دوژمن / دوژمنەکان | دەزگا ئاینییەکان | خود | پرنسیپەکان |
| دوژمنێک یاخود زیاتر | * کاتێك بۆ حەوانەوە و ئارامی پێش دەستپێکردنی شەڕی داهاتو | * هەوادار و لایەنگری هاوسۆزن * دوژمنی هاوبەش دیاری دەکات | * سیمبولی ڕق و کینەیە | * سەرچاوەی کێشە تایبەتەکانە * هاندەری بەرگری لەخۆکردن و پاساو هێنانەوەکانن | * قوربانیی پێدەدرێت * دوژمن لە پەلوپۆی دەخات | * پاساوێکە بۆ پۆلێنکردنی دوژمنەکان * سەرچاوەی نارەحەتکردنی دوژمنەکانتە |
| دەزگا ئاینییەکان | * کۆبونەوەت لەگەڵ خەلکی دیکەدا لە دەزگا ئاینییەکاندا چێژت پێدەبەخشێت * خەڵکانی دیکەی گوناهکار و کات بەفیڕۆدەر وا دەکەن خۆفیداکردن بە شێوازێکی ڕاست نەیەتە دی | * بریتین لە ئەندامانی دەزگاکە | * بێ باوەڕەکانن. ئەوانەن کە ناکۆکن لەگەڵ ڕێنمایی دەزگا ئاینییەکاندا یاخود ژیانیان بە ئاشکرا پێچەوانەی ئەم ڕێنماییانەیە | * بەرزترین سەرچاوەی هیدایەت | * خۆ سەلماندن و ڕێز لەخۆگرتن بەوە دێتەدی کە لە دەزگا ئاینییەکاندا چالاکییت هەبێت و بەشداربیت لەو کردەوانەی کە ڕەوشتی دەزگاکە نیشان دەدەن. | * بریتین لەو ڕێنماییانەی کە دەزگا ئاینییەکان دەیلێنەوە. * ملکەچی دەزگاکان دەبن * سەرچاوەی نارەحەتکردنی دوژمنەکانتە. * بریتین لەو ڕێنماییانەی کە دەزگا ئاینییەکان دەیلێنەوە. * ملکەچی دەزگاکان دەبن |

**خود**

* فێرکردنی ئارەزووە شایستەکانە کە هەستیان پێ دەکرێت
* پێویستە
* مافی خۆتە

* پشتیوانی مـن و ئیسراحەتم بۆ دابین دەکەن

* سەرچاوەی پێناسەکردن و پاساوکردنی خودی خۆتن

* ئامرازێکە بۆ خزمەتکردنی بەرژەوەندییە تایبەتەکانت

* مافێکی باشتر و داهێنانەتر و گەورەترە
* پاساو بۆ ئەوە دەهێنێتەوە کە هەمو سەرچاوەکان بخەینە خزمەت تێرکردنی پێویستییەکانی خۆتەوە

* سەرچاوەی پاساو هێنانەوەن
* ئەو بیرۆکانە دەگرنەوە کە دەتوانن خزمەتی بەرژەوەندییەکانم بکەن و لەگەڵ پێویستییەکاندا بیانگونجێنم.

**پرنسیپەکان**

* لە ژیانی ئاراستەدار چێژ لە زۆربەی زۆری چالاکییەکانەوە دەستەبەر دەبێت.
* کاردانەوەیەکی راستەقینەیە وەك بەشێکی گرنگ لە سیستمە ژیانێکی هاوسەنگ و کامڵ

* لەو مەسەلانەدا کە سوودی گشتی تێدایە هاوڕێتن.
* بە پشتگیریکردن و خزمەتکردن و هاوبەشیکردن دەیسەلمێنن کە هاوڕێی نزیکن

* دوژمنی راستەقینە نین بەڵکو تەنیا کەسانێکن خاوەنی ئەجیندا و پارادیمی جیاوازن
* کار دەکەن بۆ تۆ

* ئامرازێکە بۆ بەدیهێنانی پرنسیپە راست و دروستەکان
* فرسەتێکە بۆ خزمەتکردن و بەشداریکردن

* کەسێکی تاقانەی بێهاوتا و داهێنەر و بەهرەدارە لەنێوان کۆمەڵێك کەسی بێ هاوتای تاقانەی وادا کە دەتوانن پێکەوە یاخود سەربەخۆ کاری مەزن ئەنجام بدەن

* کۆمەڵە یاسایەکی سروشتی نەگۆڕن کە هیچ کەس بۆی نییە پێشێلیان بکات.
* کە رێزیان لێ دەگیرێت دەستپاکی کەسەکە دەپارێزن و بەمەش دەبنە مایەی گەشەو بەختەوەرییەکی راستەقینە

**له بڵاوكراوەكانی هیوا فاوندەیشن:**

- ٧ خوومەكەی خێزانی پێشەنگ/ نووسینی ستیڤن ئاڕ. كۆڤی
- پیاوان له مەریخەوه هاتوون ژنانیش له ڤینۆسەوه/ نووسینی جۆن گرەی
- مەریخ و ڤینۆس له خۆشەویستیدا/ نووسینی جۆن گرەی
- مندالّە لێهاتووەكەت/ نووسینی یەسپەر یول
- من مەلالەم/ مەلاله یوسفزەی
- بالێت، یەكەمین پەڕتوكم/ سوسا هێمەرل
- لین ئین(وەره پێشەوه)/ شێرل ساندبێرگ

# پڕفرۆشترین کتێبی نیشتمانیی ئەمریکا

هیوا فاوندەیشن: دامەزراوەیەکی قازانجنەویستی سەربەخۆی ئەهلییە، لە ساڵی (٢٠١٢)دا لەلایەن بەڕێز (هیوا رەوف)ەوە لە شاری سلێمانی هەرێمی کوردستانی عێراق دامەزراوە. هیوا فاوندەیشن کار دەکات بۆ گەشەپێدانی تواناکانی خەڵک لە ڕێگەی بڵاوکردنەوە و پشتگیریکردنی بابەتی داهێنەرانەی پەروەردەییەوە، ئەمەش بە وەبەرهێنان دەزانێت لە سەرمایە مرۆییەکانی کۆمەڵگاکەمان. ئامانجیش لەم کارە گەیشتنە بە ئەنجامی ئەرێنی لە ئەوەکانی داهاتودا و یارمەتیدانی تاکەکانی کۆمەڵگەیە بە ژن و پیاوەوە بۆ پێشخستنی تواناکانیان و گەیشتن بە ئامانجە بەنرخەکانیان.

لە بەرهەمەکانی هیوا فاوندەیشن وەرگێڕانی ئەم کتێبانەی خوارەوەیە بۆ زمانی کوردی:

- یاساکانی باوک- نوسینی تریۆن مۆلەر
- یاساکانی دایک- نوسینی سۆنی و تریۆن مۆلەر
- حەوت خووەکەی مناڵانی شادمان- نوسینی شین کۆڤی
- حەوت خووەکەی ئەوجەوانانی پێشەنگ- نوسینی شین کۆڤی
- حەوت خووەکەی کەسانی پێشەنگ- نوسینی ستیڤن کۆڤی
- حەوت خووەکەی خێزانی پێشەنگ- نوسینی ستیڤن کۆڤی
- هەشتەمین خوو- ستیڤن کۆڤی
- من مەلالەم- نوسینی مەلالە یوسفزەی
- لین نین- نوسینی شێرل ساندبێرگ
- پیاوان لە مەریخەوە هاتوون، ژنانیش لە ڤینۆسەوە- نوسینی جۆن گرەی
- مەریخ و ڤینۆس لە خۆشەویستیدا- نوسینی جۆن گرەی
- منداڵان لە بەهەشتەوە هاتوون- نوسینی جۆن گرەی
- منداڵە لێهاتووەکەت- نوسینی یەسپەر یۆل
- بالێت، یەکەمین پەڕتوکم- نوسینی سوسا هێمەرل، ناستریدڤۆڤینکێل
- هونەری بیرکردنەوەی داهێنەرانە- جۆن ئەدایەر



Hiwa Foundation
Enable creativity and perfection

چاپی دووەم ٢٠١٧